مەنوچهێری مۆتیعی

شەش ساڵ لەناو

# ژنە وەحشییەکانی ئەمازۆن

بەرگی یەکەم

وەرگێرانی

زاهیر رەشید پور

# شەش سال لەناو...
# ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن

## بەرگی یەکەم

نوسینی : مەنوچهێری موتیعی

و: زاهیر محەمەد رەشید

## بەناوی خوای گەورە

### پێناسی کتێب

ناوی کتێب: شەش ساڵ لە ناو ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن

بابەت   بیرەوەری

بەرگی یەکەم

وەرگێڕی فارسی: مەنوچهێری مۆتیعی

وەرگێڕانی   زاهیر محەمەد رەشید

تایپ: سورکێو مستەفا عبداللە

نۆبەتی چاپ : سێیەم ۲۰۱۳

شوێنی چاپ   چاپەمەنی چواچرا

تیراژ : ۲۰۰۰ دانە

نرخ:   ٦۰۰۰ دینار

دیزاین و نەخشەسازی : کامیل محەمەد قادر

ژمارەی سپاردنی ( ۷۳۵) ساڵی ( ۲۰۰٦) ی پێدراوە

لە بەستێنەکانی رووباری ئامازۆن هۆزێك هەیە هەموو دانیشتووانی لەژنانی زۆر جوان و دڵرفێن پێك هاتوون. دەوروبەری ئامازۆن بەدارستانە چڕو مەترسیدارەکان گەمارۆ دراوە. ئەو خەڵکە لەم بەشەی دارستانەکەدا دەژین. تا ئێستا هیچ گەشتیارێکی ناودار و هیچ روداوخوازێکی چاو نەترس نەیتوانیوە بگاتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەوان چوونکە جگە لەمەترسیە زۆرەکانی رێگا، ژنانی ئامازۆن ئەوەندە مەترسیدارن گومان ناکرێت بێگانەیەك بکەوێتە دەستیان و بەزیندوویی رزگاری کەن  و بتوانێت بۆ شارو دیاری خۆی بگەرێتەوە.

ئەم کتێبەی خوارەوە لەیاداشتەکەکانی کەسێك ئامادە و نوسراوە کەشەش ساڵ لە ناو دانیشتووانی ئەم هۆزەدا ژیاوە و لەئەنجامدا بە لێهاتوویی تەواو، لەدەستیان رایکردووە و گیانی بە سەلامەت دەربردووە.

ئەم کتێبە بۆ زۆربەی زمانە زیندوەکانی دنیا وەرگێردراوە و لە هەر زمانێك زیاتر لە دەجار چاپکراوە و لەهەمان رۆژەکانی یەکەمی چاپ و بڵاوبوونەوە بەخێرایی فرۆشراوە. چوونکە نوسەر بینینەکانی خۆی تیادا رەنگ پێ داوەتەوە، لەراستی و دروستی نوسراوەکان ناتوانین گومانمان بێت، هەر بۆیە ژیانی ژنانی ئامازۆن لەئەفسانە دەرچووە و بۆتە راستیەکی حاشا هەڵنەگر.

## ١

من لەبەشی مرۆڤ ناسی پەیمانگای (( میروسترون )) دەم خوێند، دوای تەواو بوون کەوتمە بیری پەیداکردنی کارێکی گونجاو بەڵام ئاشکرابوو لەمرۆڤ ناسێك چ کارێك بەردێت و لە کۆمەڵگادا چ کارێکی پێ دەسپێرن. لەئەمریکای باشوور بۆ ئەندازیارە گەنجەکان کاری زۆر باش بەداهاتێکی گونجاو دەست دەکەوت بەڵام بۆ من کەخوێندنی بەشی مرۆڤ ناسیم تەواو کردبوو، کار نەبوو. چەند حەفتەیەك بیرم کردەوە و لەگەڕان بەدوای کارێکی گونجاو لەهەموو دەرگاکانم دا. سەرئەنجام بەو ئەنجامە گەشتم بۆ مرۆڤ ناس لەم کۆمەڵگادا کارێك بوونی نییە و دەبێت برسیەتی بکێشێت. دەبێت چی بکرێت؟ ئەوەندە بێ پارە و بێ سامان نەبووم بۆ بەسەربردنی بژێوی ژیان لە دژواریدا بم. دەمتوانی چەند ساڵێك بەئارامی و خۆشی ژیان بەسەر ببەم بێ ئەوەی پێویستم بە کارکردن هەبێت بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێت بێکار بێت و شەو و رۆژ بەبێ کاری و هەرزەیی بەسەرببات. بێکاری لەنەخۆشی کولێراوتاعوون مەترسیدارترە. هەرکەس تووشی نەخۆشی بێکاری بێت هیوای چاك بوونەوەی نییە و بۆ هەمیشە تەمەڵ و تەن پەروەر دەبێت. نەم دەویست بەم شێوەیە بم.

شەوێك لەگەڵ چەند لەهاوڕێکانم رۆشتین بۆ قاوەخانەیەکی دوور. ئەوێ مەیخانەیەکی تەنگ و تاریك بوو کە رووداوخوازان و گەشتیاران و زەریا پێوانی تیا کۆدەبوویەوە. هۆڵەکەی سەقفێکی کورت و هەواکەی بۆنی دووکەڵی لێدەهات، پڕ بوو لەم جۆرە خەڵکانە، روخسار پیسەکان، سمێڵە فشەکان و دەستە زبرەکانیان ترسی تیا دروست کردم بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئاسودەییەکی رۆحیم تیا دروست ببوو کەچێژم لێ دەبرد. هەم دەترسام هەم چێژم دەبرد.

ئێمە لەسوچێکدا دانیشتین و دەستمان بەخواردنەوەی ئابجۆ کرد بەڵام لەبیرکردنەوە لەم خەڵکە روداوخوازە کەگیانی خۆیان بۆ بەدەست هێنانی زێڕ دەخستە مەترسییەوە، ئاسوودە نەبووم، بیرم دەکردەوە چ شتێکم لەوان کەمترە. ئەوان دو گوێ و دو چاو و دو دەست و دو پێ یان هەیە و منیش. لەگەڵ ئەوەی زانیاری زۆرم سەبارەت بەهۆز و نەتەوەکان هەیە و بۆ هەر شوێنێك دەڕۆم کارەکانم هاوڕێ یە لەگەڵ زانایی و دوور ئەندێشی.

ئەم فکرانە هێواش هێواش لەگیانم دا رەگیان داکووتا تا شوێنێك جەستەم بە تەواوی بوو بەم فکرە کەمنیش دەبێت وەك ئەم خەڵکە بژیم و لەبوونی خۆم ئەو پەڕی کەڵك ببەم. هەموو شتێك لە بەردەستدایە، خاوەنی پارەی زۆر، زانیاری، خوێندن و لە هەمووی گرنگتر گەنجیم. بۆ کاتەکانی خۆم بە بێکاری بە فیڕۆبدەم. لەم کاتەدا رۆحم سەرنجی بۆ لای دارستانە چڕەکان و کوێستانە ڕێ دژوارەکان و دەربەندە هەڵدێرە گەورەکانی دنیا راکێشرا. سامان لەم جۆرە شوێنانەدا شاراوەیە و من دەبێت بڕۆم بۆ ئەوەی تا وەك پیاوێکی دەوڵەمەند و ناودار بگەڕێمەوە.

لەقووڵایی بیرەکانمدا نوقم ببووم کەدەنگی هاوڕێکانم رشتەی بیرکردنەوەیان پچراندم. کاتێك لە دەوروبەری خۆم ڕوانی بینیم گەنجێکی باڵا بەرز، رەش پێست بە ریش و سمێڵێکی فشە و چاوانێکی پڕ کاریگەر لە بەردەمم دا وەستاوە و پەیوەست بە کۆمەڵی ئێمە بووە.

یەکێك لە هاوڕێکانم ئەوی ناساند و ووتی

یوری تان پێ دەناسێنم. ئێوە کە خوێندکاری بەشی مرۆڤ ناسین، دەتوانن لەزانیارییەکانی یوری کەڵکی زۆر وەربگرن.

بێ ئیرادە هەستم کرد یوریم خۆش دەوێت. یوری چاوانێکی کاریگەر و روخسارێکی تووڕە بەڵام راکێشەڕی بوو. بەڕێکەوت لای من دانیشت و قسە لەمە هاتە پێش کە ئەم دواییانەی لە دارستانە مەترسیدارەکانی بەرازیل بەسەر بردووە.

یوری کە زانی سەرنجم بۆ لای راکێشراوە وتی:

من لەگەڵ مەترسی زۆردا ڕووبەڕو و شتی سەرسوڕهێنەری زۆرم بینیوە. بەڵام لە هەمووی گرنگتر گەڕانم لە دەوروبەری رووباری ناوداری ئامازۆنە. دەزانن لە بەستینی ئەم رووبارە هۆزێك هەیە هەموو دانیشتوانەکەی لە ژنە جوان و دڵرفێنەکان پێك هاتوون.

سەبارەت بە ژنانی ئامازۆن زۆرم خوێندبوویەوە و شتی زۆرم بیستبوو بەڵام ئەو شتانەی یوری باسی دەکرد ئەوانە بوو بە چاوی خۆی بینیبووی و لەراستی ووتەکانی گومانم نەبوو.

پەیڤینی من و یوری کە پیاوێکی بەهێزو چوارشانە بوو درێژەی کێشا لەگەڵ ئەوەی هاوڕێکانم سەبارەت بەشتێتر سەرقاڵی قسە کردن بوون. ئێمە لە درێژەدان بەم باسە بەردەوام بووین و تا ئەو شوێنەی کرا لە یوری زانیاری بەکەڵکم دەستکەوت.

یوری لێی پرسیم

هەست دەکەم خەیاڵی سەفەر بۆ ئەو شوێنانەتان هەیە؟ وانییە؟

بێ سێ و دو لێکردن وتم   راستیت بووێت لە بێکاری ماندوو بووم و هەر بۆیە دەمەوێت لە ئەمریکا بڕۆمەدەر چ باشتر بڕۆمە بەستێنەکانی رووباری ئامازۆن و شتە سەرنج راکێشەکانی بە چاوی خۆم ببینم.

یوری خۆی لەسەر کورسیەکە جووڵاند و ووتی

ئەم کارە سەرمایەیەکی زۆری دەوێت، ئایا سەرمایەتان هەیە؟

لە وەڵامدا وتم   هەڵبەتە ئەوەندەی بتوانم بژیم پاشەکەوتم هەیە، مانگانەیەکی کەمیش لە مڵکەکانی دایکم وەردەگرم و گومان دەکەم ئەمە بەس بێت. وانییە؟

یوری دەستی بەبیرکردنەوە کرد. وەك ئەوەی بیەوێت وەڵامی نا بداتەوە، بەڵام من دەرفەتی بیرکردنەوەم پێ نەدا وتم:

ئەگەر ئارەزومەند بیت ئەم گەشتە پێکەوە ئەنجام دەدەین و گوومان دەکەم قازانجێکی باشمان لەم گەشتە پێ بڕێت. رازی دەبیت هاوڕێیەتیم بکەیت و رێ نیشاندەرم بیت؟

یوری وتی   جگە لەمە کارێکم نییە. بەڵام ئێوە ناتوانن بەرگەی دژوارییە ماندووکەرەکانی ئەم رێگایە بگرن. ئێوە گەنجێکی شارنشین و ناز پەروەردەن هەر لە قۆناغە سەرەتاییەکان گیانی خۆتان لە دەست دەدەن من نەم دەویست بەم قسانە رازی بم، لام پەسەند نەبوو بە لاواز و ناتەوانم دابنێن. دڵنیام کردەوە لە دژوارییەکاندا خۆراگر دەبم ووتم لەلایەن منەوە ئاسوودە بێت. یوری رازی بوو و من کە لە بێکاری وەرز ببووم کاغەزێکم دەرهێنا و دەستم بە نوسینی گرێ بەست کرد. هەمان شەو لەبەرانبەر چاو سەرسوڕماوەکان و نیگا گاڵتە ئامێزەکانی هاوڕێیان، لە نێوان من و یۆری گرێ بەست، نوسرا و بە پێی یەکێك لە خاڵەکان یوری کەوتە بەردەستی من و لە بەیانی ئەو رۆژەوە دەستمان بە ئامادەکردنی کەرەستە و کەل و پەلی سەفەر بۆ کەنارەکانی ئامازۆن کرد.

یوری لەهەمان رۆژە سەرەتاییەکان لێزانی و کارزانی خۆی لە هەڵبژاردنی کەل و پەل و کڕینی کەرەستە و چەکی سارد و تفەنگ نیشان دا و تێگەشتم پیاوێکە بە ئەزموون و ساردو گەرمی بینیوە. کڕینی کەل و پەلی سەفەر دو رۆژ کاتی ئێمەی گرت و رۆژی سێیەم من و یوری بەرەو ئەمریکای باشوور بەڕێکەوتین.

ئەو نەخشەی پێمان بوو جار نەجارێ کەڵکمان لێ وەردەگرت. ناوچەکانی بە جوانی و وردی دیاری دەکرد. یوری بە پەنجە بەشێك لە نەخشەکەی نیشان دا و ووتی :

سەرچاوەی رووباری ( ناپۆ ) لە ((ئیکوادۆر))ی خۆرهەڵاتدایە و لە نزیکی (( پیرۆ )) و (( کۆلۆمبیا )) ناوچەیەکی بەربلاو هەیە کە لانی کەم نەوەد هەزار میلی چوارگۆشە فراوانییەتی و تەنیا لە ژێر ناوی ((ناوچەی هیندیەکان)) دیاری کراوە، بەڵام ئێمە ئێستا بەرەو ((سرودوپاسکۆ)) دەرۆین و لێرەوەیە رووبەرووی کێشە و لەمپەرە فراوانەکان دەبینەوە.

بەوردی گوێم لە ووتەکانی یوری دەگرت بەڵام هەر کاتێك باسی کێشەکانی دەکرد پێی پێدەکەنیم و نەمدەویست رازی بم کە پیاو لە کێشە دەترسێت و لەوەیش گرنگتر ئەوەندە خۆم بەتوانا هەست پێدەکرد کێشەکانم لە بەرانبەر خۆمدا بە بچووك دەزانی.

سێ هەفتە دوای بەڕێکەوتن، لەناوچەی ((کینۆ)) لەئیکوادۆر بووین. لێرەدا پارەکانی خۆمان بۆ ((سوکر)) گۆڕییەوە و من لە سێ سەد دۆلارێك کە کردم بە سوکر، بڕێکی زۆر پارەم بەدەست هێنا و لەبەرئەوەی لەوێ هەرزانی بوو هەستم دەکرد دەتوانم بەڕاحەتی ماوەیەك بگەڕێم.

لەگەڵ یوریدا راوێژم کرد و بڕیاردرا لە جیاتی رۆشتن بۆ سرودو پاشکۆ، بۆ بینینی ((دارستانی زان)) ی ناوچەی (ناپۆ) بڕۆین. ئێرەیش ناوچەیەکی سەرنج راکێشە و لەگەڵ ئەوەیشدا دوای بڕینی مەودایەکی زۆرتر دەمانتوانی بگەینە کەنارەکانی ئامازۆن.

لەوێ سوار عارەبانەیەکی کۆن بووین و رۆشتینە ریوبامبا. پێشنیارم بە یوری کرد لەوێ چەند کەس و رێ نیشاندەر بۆ گواستنەوەی کەل و پەلەکانمان دامەزرێنین بەڵام یوری دژایەتی کرد ووتی

حەماڵەکانی ئەم ناوچەیە بە ژیان لە ناوچە گەرم و نمدارەکان عادەتیان نیە. جیاواز لەوەیش ئەگەر بزانن مەبەستی ئێمە چییە، بەهیچ نرخێك ئامادەی هاوڕێیەتیمان نابن. بەردەوام ئەمەتان لە بیربێت ئەگەر لێیان پرسیت دەڕۆن بۆ کوێ، بڵێ بۆ راوی ئاژەڵە گرانبایییەکان دەڕۆینە دارستانی باران.

لە جیاتی گرتنی کۆڵکێش دوو کەری زۆر باشمان بە نرخی ١٥٠ سوکر کڕی و بەرەو سارایاگۆ بەرێ کەوتین، سارایاگۆ لە سەر نەخشە ئاخرین شار بۆ گەشتن بە ناوچەی ناپۆ بوو و لەوێوە بەدژوارییەکی کەمتر دەگەشتینە دارستانی باران. ئەو رۆژە یوری جل و بەرگی ناوچەیی لەبەرکرد و موی سەرو روخساری وەك دانیشتووانی ناوچەکە لێکرد. سوار کەرەکان بووین و بەرەو ساراگو بەڕێکەوتین. دوای یەك دو کاتژمێر رێپێوان

گەشتینە کوێستان. دیمەنی سەرنج ڕاکێش لە دەوروبەری جادەکە بوو سەرقاڵی دەکردم و بە هیچ جۆرێك هەستم لای ئەوە نەبوو ڕێگاکەمان گەشتۆتە شوێنە مەترسیدارەکان و جادەکە زیاد لە ڕادە باریك بۆتەوە.

یوری پێی وتم من لەم کوێستانە زۆر تێپەڕیوم. بەیانی دەگەینە شوێنێك زیاد لەرادە مەترسیدارە و تا ئەو شوێنەی بیرمە دەتوانم ناوی ٣٠ تا ٤٠ کەس کە لەسەرەوەی جادەکەوە بۆ ناو دۆڵ کەوتونە خوار بژمێرم.

لە بیستنی ئەم هەواڵە ناسازگارە پشتم کەوتە لەرزە و ڕشتەی بیرکردنەوەم بچڕا. داخم دەخوارد بۆچی منی لەوحاڵە خۆشە دەرکرد. لەسەیرکردنی دیمەنە دڵرفێنەکانی دەروبەری جادە و گوڵزارە وەحشییەکانی داوێنی کوێستان چێژێکی زیاد لەرادەم دەبرد و یوری لەم بارودۆخە دا ئەم زانیارییە خراپانەی پێدام و پشتی منی لەرزاند. لە جادەکەم ڕوانی و بینیم ئەوندە باریکە کەکەرەکان بە دژواری هەنگاو هەڵدەگرن. کەر باشترین هۆکاری تێپەڕین لە جادە کوێستانیەکانە. ئەم ئاژەڵە بە لێهاتوویی سەرسورهێنەر، خۆی و خاوەنەکەی لە ڕێگا کوێستانیەکان و هەڵدێرەکان دەپەڕێنێتەوە و بەسەلامەتی دەیگەیەنێتە شوێنی مەبەست. بەڵام ئەو ڕۆژە بینیم کەرەکانی ئێمە بە دژواری دەڕۆنە پێش و هەوڵ دەدەن لە هەڵدێرەکە نەکەونە خوار. لە تاریکی شەو و بینینی ئەو دۆڵە قووڵە تووشی ترس بووم، لەیوریم پرسی

لەکوێ دەبێت شەو بەسەر ببەین؟ ئەم جادە مەترسیدارە تاکەی درێژەی هەیە؟

یوری سەری خۆی وەك کیسەڵ کە لە قاپوغەکەی دەردەکات لە ناو پانجۆکەی خۆی دەرهێنا و سەیرێکی کێوەکەی کرد، وتی

نیو کاتژمێریتر دەگەینە شوێنێکی بەربلاو و لەوێ دەتوانین خێوەت هەڵبدەین و دوایی وتنی ئەم رستە سەری خۆی وەك کیسەڵ کردە ناو پانجۆکە.

هەرچەندە دەڕۆشتینە پێش، هەوا تاریکتر دەبوو و بارودۆخی ئێمە خراپتر. لەشانسی خراپ جادەش باریکتر دەهاتە بەر چاو. سەرەنجام بە هەردژوارییەك بوو نیو کاتژمێر ڕێپێوانیش تەواو بوو و کاتێك هەوا بە تەواوی تاریك وئەستێرەکانیش دەرکەوتبوون، گەشتینە خاڵێك کە جادەکە بە گۆڕەپانێکی بەربلاو و تەخت کۆتایی پێ دەهات. ئەم گۆڕەپانە بەهۆی هەرەس و با کوێستانییەکان بەشێوەیەکی سروشتی بەدیهاتبوو بەڵام بەشێوەیەك بوو دەتوت کۆمەڵێك بەردتاشی کارزان چەندین مانگ کاریان کردووە و ئەم گۆڕەپانەیان لەسەر ئەو کێوە دروست کردوە. خێرا کەرەکانمان بە

دارەوە بەستەوە و کورتانمان لە پشتیان هەڵگرت و پێش هەر شتێك سەرقاڵی ئەوان بووین کە خەیاڵیان لە خواردن و حەوانەوە ئاسوودە بێت و بەیانی باشتر بتوانن خزمەتمان بکەن. دواتر خێوەتی خۆمان هەڵداو سەرقاڵی دروست کردنی خواردن بووین.

هەوا زۆر سارد و بێزارکەر بوو، لە دەورووبەری گۆڕەپانی سروشتی سەرەوەی کێو، لەلابەلای بەردەکان دارەکان ڕوابوون و هەندێکیان بە هۆی زۆری سەرما وشك ببوون، یوری لە لقی ئەم دارە وشکانە ئاگرێکی خۆش کردو کەمێك لە توندی سەرمای کەم کردەوە بەڵام بایەکی ساردی وا هەڵیکرد بوو ئەو ئاگرەیش نەیدەتوانی ئەو جۆرەی ئارەزومان بوو گەرممان بکاتەوە. پاشماوەی ئاگرەکەمان بردە ناو خێوەتەکە، لە سوچێکدا کزۆڵە دانیشتین و بڕیارماندا بەهەمان شێوە شەو بکەینە ڕۆژ. بەڵام خەو بە چاومان بێگانە بوو و لەجیاتی خەو دەستمان بە قسەکردن کرد. بۆ ئەوەی سەرقاڵ بین و سەرماو خەو زەختمان لێ نەکات، یوری دەستی بە گێرانەوەی ژیانی کرد. تازە ئەو کاتە هەستم کرد یوری پیاوێکی ڕوداوخوازو مەترسیدارە. ئاگرەکە کەم کەم ڕوی لە کوژانەوە دەکرد و چاوەکانی ئێمەیش بۆ خەو قورس بوون کەکتوپڕ لەدەرەوەی خێوەتەکە دەنگی سمی ئەسپ بیسترا و ئێمە دووکەس وەك ئەوەی کارەبا لێی دابێتین لەشوێنەکەی خۆمان بەرز بووینەوە. یوری دەست بەجێ تفەنگەکەی گرتە دەست ووتی ئێرە شوێنێکی مەترسیدارەو ڕەنگە دزەکان بە هیوای بەدەست هێنانی پارەو چەك هێرشمان بکەنە سەر.

ئەمەی وت و بە تفەنگەکەوە لە خێوەتەکە ڕۆشتە دەر. من ترسا بووم و هەرسات چاوەڕێی بیستنی تەقەی گوولە و کوژرانی یوریم دەکرد. بەڵام بە خۆشحاڵییەوە ئەم ڕوداوە ڕوی نەدا. لەناوەڕاستی خێوەتەکەدا وەستابووم و چاوەڕێی ڕوداوە چاوەڕوان نەکراوەکان بووم کە دەنگی یوریم بیست بە زاراوەیەکی ناوچەیی هاواری کرد ووتی

بووەستە..... بۆ کوێ دێیت؟ نزیك مەکەوەرەوە وەگەر نا تەقە دەکەم.

دەنگێکی لەرزان لە دوورەوە بیسترا کە بەزمانی ئیسپانیۆلی وەڵامی دایەوە:

منیش ڕێبوارم هیچم پێ نییە. لای خۆتان جێگەم بکەنەوە نزیکە لەسەرمادا ببەستم لەناو ڕێ نیشاندەرانی (( ئەتاوا لوویی )) ڕێورەسم و خورافاتی تایبەت باوە کە خۆیان زیاد لەرادە باوەڕیان پێیەتی. کەسێکی ئاتاوالوویی ئەگەری نییە شەوانە کەسێك بکوژێت و بەتایبەت دەستی خۆی بەمیوانەکەی ئەگەر دوژمنی خوێنیشی بێت،

سور ناکات، ئەم رەسمە هەڵبەت رەسمێکی زۆر باشە بەڵام ئەم خەڵکە باوەڕیان وایە ئەگەر کاتی شەو میوانی ئاوڵە روخسار رویان تیّ بکات، بەدبەختی و پەرێشانی بەسەریاندا دەبارێت. ئەگەر کەسێك بپژمێت بەتایبەت ئەگەر شەو بێت دەڵێن بەیانی باران دەبارێت و ئەگەر هاوین بێت بە نیشانەی هەڵکردنی رەشەباکانی دادەنێن.

یوری بەپێی ئەم رەسمانە کە خۆیان لە چۆنیەتی ئاگادارن بە دەنگی بەرز و تووڕە وتی تۆ دز نیت؟ بە داری ئاروەنی پیرۆز سوێند بخۆ.

ئەو کەسە کە کەمێك نزیکتر ببوویەوە وتی سوێند بەداری پیرۆز کە دز نیم.

ئەوسا یوری وتی بەخێربێیت، فەرمو وەرە ناو خێوەتەکەی ئێمە، دڵنیام گەورەم میهرەبانیت لەگەڵ دەکات. سوێند بە داری پیرۆز لە بەهێزترین سوێندەکانی ئەوانە و ئەگەری نییە کەسێکی ئاتاوالوویی سوێندی درۆ بەو دارە بخوات و ناوەکەی بە خراپە ببات.

پیاوی نەناسراوی شەرگەر، لە ئەسپەکەی دابەزی و یوری بەرێورەسمی خۆیان سلاّوی لێکرد و ئەوی هێنایە ناو خێوەتەکە و بەمنی ناساند. خۆی وتی

ناوم (( ماچوا )) و لەدانیشتووانی (( ریۆیامبا ))م. کارم فرۆشتنی سیلاحەو بۆ کارێکی تایبەت دەچمە ناپۆ.

یوری سەرەتا ئەسپەکەی کردەوەو بەدارێك لای کەرەکانی خۆمان بەستییەوە و ئاڵفی بۆ ئەو ئاژەڵە دانا و دواتر برێك داری وشکی کۆکردەوە و ئاگرێکی بۆ میوانەکە هەلایساندو قاوەیەکی شیرینی دروست کرد. نەناسراو تەنیا ئەو وشەی وت و دوای خواردنی قاوە تەنیا بە ووشەی سوپاس بەسندەی کرد. لەسوچێکدا کزۆڵەی کرد، بانجۆکەی خۆی کێشایە سەر و خەوت. لەوەی بینیم بەئاسوودەیی خەوت و مرخەمرخی بەرز بوویەوە، چێژم دەبرد. داخم دەخوارد بۆ ناتوانم وەك ئەو بخەوم. یوریش هیلاك ببوو و لای ئاگر پاڵی دایەوە و خەوت. بەدژواری دوکاتژمێر دوای یوری خەوتم بەڵام بەرادەیەك خەوەکەم قورس و شیرین بوو لەتەمەنما بەو شێوە نەخەوتبووم و ناخەوم. گەرمای کەمی ئاگرەکە هەوای خێوەتەکەی تاڕادەیەك گەرم دەکرد. لەگەڵ ئەوەیشدا هەناسەدانی ئێمە سیّ کەس یارمەتی گەرم کردنی هەوای ژوورەکەی دەدا و ئەم گەرما کەمە دەمارەکانی منی ئارام و خەوەکەمی قوڵترو قورستر دەکرد.

نەمزانی تا بەیانی چەند کاتژمێری ماوە و ئێمە چەندە خەوتووین. بەیانی بە دەنگێك کە نەمتوانی تێبگەم لە کوێوە بوو لە خەو هەستام و یەکەم شت کەوتە بیرم

بوونی پیاوێکی بێگانەی ئەتاوالوویی لە خێوەتەکەمان بوو. نیگام بەرەو ئەو شوێنەی ئەوی لێ خەوتبوو، راکێشراو لەو پەڕی سەرسوڕماندا شوێنکەم بە چۆڵ بینی. لەولام ڕوانی یوریشم لەسەر شوێنەکەی نەبینی.

لێرە دڵنیا بووم روداوێکی خراپ روویداوە و زیاتر گوومانم ئەوە بوو نیوە شەو ماچوا ویستوویەتی دزی یا رابکات و بەدەستی یوری کوژراوە. هەرچەندە من لەم گەشتەدا خۆم ئامادەکردبوو، روداوی گرنگتر ببینم و روبەڕوی مەترسی گەورەتر ببمەوە بەڵام حەزم نەدەکرد لە یەکەم شەوی گەشتەکەمدا هۆکاری جنایەتێك بم. لەم ماوەدا لە بیری هۆزی ژنە وەحشیەکانی ئامازۆندا بووم و بیرم لەوان دەکردەوە و حەزم دەکرد هەرچی زووتر ئەم ڕێگایە بەبێ رووداوێك کۆتایی پێ بێت و خۆم بگەیەنمە ئەو ناوچەیە. سەرمایەکی قورس لەدەرەوە دەهاتە ناو خێوەتەکە و قامچی لە روخسارم دەدا. نەمدەویست لە شوێنە گەرم و گونجاوەکەی بۆ خۆمم دروست کردبوو، هەستم بەڵام چارەیەك نەبوو. بە دەنگی کۆکەی من پەردەکە رۆشتە سەرو یوری کاتێك لەناو پانجۆکەی خۆی حەشاردابوو و تفەنگ و فیشەك بەندی لەخۆی بەستبوو هاتە ناوەوە.

لێم پرسی: ماچوا لە کوێیە؟ رۆشت:

یوری وتی: بەیانی زوو لە خێوەتەکە رۆشتۆتەدەر بەڵام کەرەکەی لێرەیە. نازانم بۆ کوێ چووە.

من کە لە ئامادە نەبوونی نابەوەختی ئەو خەمبارو گومانم لێکرد بوو، وتم :

بزانە شتێك ون نەبووە. لەچاوەکان و سمێڵ و روخساری ئەو خەمبارییەکی قووڵی رۆحی هەست پێدەکەم وەك ئەوە وایە مرۆڤێکی ئاسایی نەبێت. دز نەبێت؟

یوری سەری خۆی وەك کیسەڵ لەناو پانجۆکەی دەرهێنار لەدەروبەری ڕوانی و وتی سەرۆك خەیاڵتان ئاسوودەبێت. ئەو دز نیسە. من دڵنیام لێی، چوونکە سوێندی بە داری پیرۆز خواردوە.

لەم قسانەدا بووین کە دەنگێکی پێ لە دەرەوە بیسترا و چەند سات دواتر ماچوا هاتە ناو. لەپاڵ ئەو ئاگرەی یوری تازە داگیرساندبوو، دانیشت و دەستی بە کێشانی تووتن کرد. تووتنێك ئەوان دەیکێشن جۆرێك تووتنی پیسە کە لە شەراب و ئاوی بیبەرو شتی تر لەم جۆرە هەویری دەکەن و دوای وشك بوونەوە دەیکێشن و نەشە دەبن.

لە رووناکی کەم رەنگی بەیانی لەروخساریم ڕوانی. دەمویست لەڕوی هێڵەکانی روخساری ئازارەکانی دڵی بخوێنم و لە نهێنییەکانی ژیانی ئاگادار بم.

ماچوا سەیرێکی کردم و بە دەنگێك کە لە قووڵایی دڵ و ڕۆحییەوە هێزی دەگرت وتی   بەرێز ئێوە زۆر چاو دەبڕنە من، وەك ئەوەیە نەتوانن باوەڕتان بە من بێت. من دزنیم بەڵکو پیاوێکی بەشەرەفم کە لە تەمەندا بەو پەری ڕاستی و ڕاستگۆیی ژیانم بەسەر بردووە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو کەمێکیتر تووتنی هەڵدایە ناو دەمی و لە کاتێکا تووتنەکانی لە دەمیدا ئەمبەرو ئەوبەر دەکرد و تێکەڵاوی ئاوی دەمی دەکرد وتی   ژیانێکی ئاسوودەم بوو لەڕێگەی فرۆشتنی چەك بە دزو یاخیەکان سوودی زۆرم پێدەبرا بەڵام ئەمساڵ کتوپڕ ژیانم گۆڕاو. ئەم گۆڕانە ئەوەندە لەژیانمدا کاریگەرە لەوانەیە شێت ببم. هێزێکی ناخ و هەست پێنەکراو منی ئارەزومەندی بیستنی قسەکانی دەکرد. لەگەڵ ئەوەی بۆ بەڕێ کەوتن لەوێ پەلەمان بوو، ئاگرەکەم دا بەیەکدا و بە حەزەرەوە گوێم لە قسەکانی گرت :

ئەو درێژەی دا و وتی

هاوڕێیەکم بوو بێ ئەندازە خۆشم ئەویست لەگەڵ ئەوەی ئەو دەم رووت و من ژنێکی جوان و دڵرفێنم هەبوو هات و چۆی ماڵی منی دەکرد و خێزانم وەك برایەك هەڵس و کەوت و خۆشەویستی لەگەڵ دەکرد. چەند مانگ پێش برێك چەکی من لە دەرەوەی شاری ریوبامبا لەلایەن هێزەکانی دەوڵەت دەستی بەسەردا گیرا. من ناچار پارەیەکی زۆر غەرامەم دا. دانی غەرامە منی بەرەو ئیفلاس بردن برد و پەرێشانی کردم. بەڵام ((کالوویی)) هاوڕێکەم پێشنیازی کرد ببێتە شەریکم و بەبڕێك سەرمایە یارمەتیم بدات. من کە بە هاوڕێی خۆم دەزانی، بە پێشنیازەکەی رازی بووم و کردمە شەریك. بەڵام نەمدەزانی لە پشت پەردەی هەڵخەڵەتێنەری خۆشەویستی، تاوان و خیانەتی حەشارداوە و دەیەوێت ((سینگوالا)) هاوسەرە جوان و دڵرفێنەکەم برفێنێت و ئەو برە سەرمایە کەمەیشم بە فیرۆ بڕوات.

سەرتان نەێشێنم و کورتی کەمەوە. کالوویی لە دوکانەکەی مندا فرۆشیار بوو. لە فرۆشی دوکانی دەدزی و مامڵەی نهێنی ئەنجام ئەدا. ڕۆژێك هەستم کرد ئیتر شتێك بێجگە لە قەرزەکانم بۆ نەماوەتەوە. ئەو ڕۆژەی هەستم بەمە کرد لەگەڵ کالووییدا کردم بە شەڕ بەڵام لەکاتی شەڕدا تێگەشتم ئەو لەگەڵ ژنەکەشمدا پەیوەندی ڕێ پێنەدراوی هەیە. بە دەستێوەردانی پۆلیس وازم لێهێنا بەڵام بڕیارمدا هەم ئەو هەم سینگوالای هاوسەرم بکوژم بەڵام بەدبەختانە شەو کاتێك گەشتمە ماڵەوە سنگوالام لەماڵەوە نەدی. بەپەلە ڕۆشتم بەشوێن کالوویی بەڵام ئەویش لە شار ڕۆشتبووەدەر. وەك شێت لە شاردا

گەڕام و لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد. ئەگەر یەکێك لەهاوڕێکانم یارمەتی نەدەدام ڕاستیەکەی پێ نەدەوتم ڕەنگە کارم بەشێت بوون کۆتایی پێ بهاتایە. ئەو پێی وتم کالوویی و سینگوالا پێکەوە لە شار ڕۆشتونەتەدەر و بەمەستی سارایاکو و ناپۆ لەم جادەوە تێپەڕبوون بەپەلە سوار ئەسپ بووم و بەدوایاندا بەڕێکەوتم. لەم گەردەنەی خوارەوە، کاتی ئاوابوونی خۆر ئەوانم بینی سوار لەسەر گوێدرێژ لە لاڕێیەوە بەرەو لووتکە دەڕۆنە سەر بەڵام هەرچەندە غارم دا لەبەر تاریکی نەمتوانی پێیان بگەم.

دوێنێ شەو هەموو ئەم کێوە گەڕام و سەرئەنجام روبەڕوی خێوەتەکەی ئێوە بوومەوە، وام دەزانی ئەوان لەم خێوەتەدان بەڵام بەدبەختانە لێرەنەبوون. بەیانی زوو پێش هەڵاتنی خۆر هەستام چوومە سەر لووتکە ڕەنگە شوێن پێیەك لەوان بەدەست بێنم.

قسەکەیم پچڕاند و وتم: هەنووکە چ بڕیارێکت بۆ ئەوان گرتووە؟

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: بەشەڕەف و کەرامەتم هەردوکیان دەکوژم چوونکە تا کاتێك ئەم کووشتوون ئاسوودە نابم.

بەهیچ جۆرێك ناتوانم. ئەو هەستانەی لە چاو پێکەوتنی ماچوا لەمن دا دروست بوو وەسف بکەم. هەم دڵم بۆی دەسوتا و هەم لەهاودەمی ناڕەحەت بووم. روخساری لەبینەردا هەستی بەناڕەحەتی دەکرد و ئەم ناڕەحەتییە پێش ئەوەی ئاگاداری نهێنیەکانی ژیانی بم زۆر بوو دواتر کە تێگەشتم لەبەر شەڕەف و بەرگری کردن لەناموسی خۆی ئەم هەموو ئازارەی کڕیوە، حاڵەتێکی تر لەمندا دروست بوو کە ناتوانم وەسفی بکەم.

ماچوا دوای وتنی ئەم رستە ئیتر قسەی نەکرد. ئەسپەکەی خۆی بەوردی پشکنی. کاتێك لەسلامەتی ئەسپ وقایمی زینەکەی دڵنیا بوو، سوار بوو، هەوسارەکەی بەرەو جادە سوڕاند. یوری بە زمانی ناوچەیی شتێکی پێ وت کەتێنەگەیشتم بەڵام هەستم کرد لەم بێ ئەدەبیە سەرکۆنەی کرد. ماچوا گەڕایەوە و بە قیافەیەکی خەمبار پەشیمانی دەربڕی ووتی: ببوورن من خۆشم لەبیرکردوە. سوپاستان دەکەم کە چاکەکانی خۆتان پێ بەخشیم و میوانداریتان کردم. زۆر سوپاس..

قسەکەیم پچڕاند و وتم: بۆ کوێ دەڕۆیت؟

وتی: بۆ سارایاگو و دواتر لە ناوچەی ناپۆ و دارستانەکانی باران و هەر شوێنێکی تر هەست بکەم سینگوالا و هاوڕێ تاوانبارەکەی دەدۆزمەوە، دەگەڕێم و بە دوایاندا

دەرۆم.

پێم وت: ڕەنگە ئێمە سوودمان بۆت هەبێت. دەتەوێت لەگەڵماندا بیت؟

شانەکانی بەرزکردەوە وتی:

بەداخەوە کە هیچ کەس بێجگە لەم تفەنگەو ئەم فیشەکانە کە بە کەمەرو شانمدا هەڵواسراوە، بەکەڵکم نایەت و ناتوانێت سوودم پێ بگەیەنێت. بەلاّم کێشە نییە لە خزمەتتانابم. کەواتە فەرموون زووتر سوار بن چوونکە جادە وەك هەتاو دەسووڕێت و هەمیشە خۆر ڕاستەوخۆ لەچاومان دەدات. پەلەکەن تا هەتاو بەتەواوی هەڵنەهاتووە لە گەردنە تێپەڕین. وەك ئەوە بوو ماچوای داماو دەیزانی چ چارەنوسێکی شووم چاوەڕێیەتی.

دڵە تەپەی بوو ئەجەل لەسەر سەری هەڵدەفڕی و بۆ گەشتن بە مەرگ پەلەی بوو. یوری بارەکانی بەست و سوار بووین و بەڕێکەوتین.

لە ڕێگادا ماچوا قسەی بۆ دەکردم و دەردە دڵی دەکرد، دەیوت:

دەترسم بمرم و نەتوانم تۆڵە بسێنمەوە. تەنیا ئەم بیرە ئازارم دەدات. خۆزگە کەسێك دەبوو دوای مردنم ئەم ئەرکەی ئەنجام دەدا و ڕۆحمی ئاسوودە دەکرد.

دڵداریم دایەوە و وتم:

ان شاالله خۆت بەم ئارەزوەت دەگەیت و بە دەستی خۆت تۆڵە دەستێنی. باسی مردن مەکە. ئەمەم وت بەلاّم خوازیار بووم لەنێوان ئەو ژن و پیاوەدا ئاشتی جێگیربکەم.

هەتاو هەلاّتبوو. بە هەمان شێوە ماچوا پێش بینی کردبوو تیشکی خۆر ڕاستەوخۆ لە چاوانی دەدا و ئەگەر کەمێك سەرمان بەرزبکردایە، چاومان ڕەشکەو پێشکەی دەکرد و بۆ قولاّیی دۆڵەکە تل دەبووینەوە ، یوری وەك کیسەڵ سەری کردبووە ناو پانجۆکەی و بێجگە جادە لە هیچ کەس و هیچ شتێکی نەدەڕوانی.

ماچوا سەرگەرمی بیرە دوورو درێژەکانی خۆی بوو و منیش چاوم لەیاڵ و گوێ درێژەکانی گوێ درێژەکەم بڕیبوو نەوەك تیشکی خۆر چاوم ڕەش کات و بۆ قوولاّیی دۆڵ سەرنگوم بم. لەبەینی ماچواو یوریدا بووم بەلاّم غیرەتی ئەوەم نەبوو بگەڕێمەوە و لە دەوروبەری خۆم بەتایبەت ماچوا بروانم. جادە لەسەروی گەردەنەوە تێ دەپەڕی و دۆڵەکە ئەوەندە قووڵ بوو ئەگەر بەردێك لەسەرەوە بکەوتایەتە خوار، چارەکە سەعاتێکی دەویست تا بگاتە کۆتایی دۆڵەکە. لە دەوروبەری ئەم جادە باریکە چقڵی ژهراوی گازگرە هەبوو کە هەندێ کات زۆر و هەندێ کات کەم بوو، تا ئێرە چقڵەکان

نەببوونە لەمپەر لەسەر ڕێگامان بەڵام لێرە بە دواوە چڵەکان بەجۆرێک لەسەر جادەکە چەمابوونەوە کە گوێدرێژەکان نەیاندەوێرا بڕۆنە پێش. یوری کە تا ئەو ساتە سەری لەناو پانجۆکەی دەرنەهێنابوو جوڵەیەکی بەخۆی دا، دابەزی و بە شمشێرێکی گەورە چڵەکانی بڕی و ڕێگەی بۆ تێپەڕبوونی ئێمە کردەوە.

ئەم کێشە بووە هۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆر کاتمان بەفیڕۆ بڕوات و درەنگتر لەکاتی خۆی بگەینە شوێنی مەبەست. دەمەو ئاوابوونی خۆر گەشتبووینە سەرەوی گەردەنە. تازە لەم کاتەدا کە هەتاو لە پشت کێوەکانی ڕۆژئاوا هێواش هێواش خۆی حەشاردەدا وێرام لە دەوروبەری خۆم و دیمەنە جوانەکانی ئەو سنوورە بڕوانم. لەم کاتەدا کتوپڕ دەنگێک لەپشت سەری منەوە بە گوێ گەشت. گوێدرێژەکەی ماچوا بوو نەیدەتوانی بێتە پێش. خێرا جڵەوی گوێدرێژەکەی خۆم کێشا و یوریم بانگ کرد ئەویش بکێشێت. بەڵام لەم کاتەدا ماچوا قیژاندی و من کاتێک گەڕامەوە ئەوم بینی بۆ دۆڵەکە سەرنگووم و لە حاڵەتی تل خواردن دابوو. گوێدرێژەکەی بە دژواری بەدوایدا دەکێشرا.

کارێک لە دەستم بەر نەدەهات. ئەگەر بچوکترین پەلە یان خێرایەکم نیشان بدایە، خۆیشم گیرۆدەی ئەو چارە نووسە دەبووم. تەنیا لە بینینی ئەم دیمەنە مەترسیدارە قیژاندم و ورد خۆم گەڕانەوە تا مەرگی دڵتەزێنی ماچوا نەبینم.

لە تاریکیەکی چڕ کە لەپشت پێڵوەکانی چاوی من دروست ببوو، تا ڕوخساری ماچوام دەبینی کە لە کاتی کەوتنە خوار چاوەکانی زەق ببوون و نزیک بوو لەترسا دەرپەڕن. دەستەکانی بەبێ خێرایی ئاوەڵاو نینۆکەکانیش وەک هەڵۆیەک کە چنگ لە هەوا دەدات کرابوونەوە. لە دوایین ساتی کەوتنە خوار هێشتا قاچی لە سەرزین بوو هەوڵی دەدا.

دەنگی ماچوا سەرەتا توندتر و دواتر وردوردە لاواز بوو تا شوێنێک ئیتر بە گوێ نەدەگەشت. بەڵام ئاشکرا بوو هێشتا نەگەشتۆتە کۆتایی دۆڵەکە.

ئارەقێکی سارد کەوتە سەر ناوچەوانم و نزیک بوو، سەرم گێژی دەخوارد. ئەوەندەی نەمابوو منیش بکەومە خوار. یوری فریام کەوت، بازوی گرتم و وتی:

گەورەم، زۆر خۆتان ناڕەحەت مەکەن. ئەمە چل و یەکەمین نەفەر بوو کە لەم شوێنەوە کەوتە خوار. ئەم جادە شوومە بەڵام بە خۆشحاڵییەوە تەواو بوو. وەرە..... خێرا...

یوری دەستی گرتم و لەوێ بردمی بەڵام هەندێ کات سەرم بۆ دواوە دەسوڕاند وەک ئەوەی چاوەڕێ بم ماچوا بە دوای منەوە بێت.

کاتژمێرێك دواتر کە هەوا تاریك ببوو گەشتینە جادەیەکی پان و بەربڵاو کە تا دەشت تا سەرەتایی دارستان درێژەی بوو. لێرەدا کەرەکان بۆ قەرەبووکردنەوەی رۆژی پێشتر کەوتنە جووڵە و بە خێراییەکی زۆر دەڕۆشتنە پێش بە شێوەیەك لەیەك چارەکدا رێگەی کاتژمێرێکیان پێوا و ئێمەیان گەیاندە دەشتەکە.

کاتێك گەشتینە دەشتەکە، ئەژنۆکانم سست ببوون. لەوێ دانیشتین یوری وتی:

سەرۆك ئێرە شوێنێکی ئەمن نییە بەڵام چارە چییە، ئێوە ماندون.

ناچار خێوەتمان هەڵداو ئاگرمان خۆش کرد. ئەو شەوە بە پێچەوانەی شەوەکانی پێش نیازی زۆرمان بە ئاگر نەبوو چوونکە هەوا ئەوەندە سارد نەبوو. جگە لەوەیش کاتژمێرێك دواتر ئەوەندە گەرم بوو من کۆتە پەشمییەکەی خۆیشم دانا. یوری گوێدرێژەکانی بە دارێکەوە بەست و دەستی کرد بە دروست کردنی خواردن و هەڵچرینی قوتووە گۆشتەکان. ئەوەندە هیلاك بووم چاوەڕێی نان خواردنم نەکرد و سەرم خستە سەر زینی یەکێك لە گوێدرێژەکان و خەوێکی قووڵ دایگرتم ، ئیتر نەمزانی چی بوو.

## ٢

### روخساری مەترسیداری مەرگ

مەرگ روخسارێکی مەترسیداری هەیە و من ئەو شەوە بۆ یەکەم جار لەگەڵ ئەو روخسارە قێزەونەدا روبەڕو بوومەوە یانی مەرگم بە چاوانی خۆم دی.

نزیك کاتژمێر چواری دوای نیوەشەو، خۆیشم نەمزانی چی بوو لە خەو هەستام. بەڵام لەگەڵ ئەوەی چاوم کردەوە هەستم کرد هێزو توانایی جوولەم تیانییە. وام زانی رەنگە هیلاکی پێ کووتانی رۆژی پێشتر هێزەی منی بەو شێوە لەناو بردووە و لاوازی کردووم بەڵام بابەتەکە بە پێچەوانەی گوومانی من شتێکی تر بوو کە راستییەکەی مەترسیدار بوو.

بەخۆم وت: (( چارە چییە، هەرچەندە هیلاك بم دەبێت لە شوێنی خۆم هەستم )) و بەم فکرە سەرەتا دەستی چەپی خۆم تەکان دا تا سەیری کاتژمێرەکەم بکەم بەڵام کاتێك دەستم بە دژواری هاتەسەر، شەقەی باڵی باڵندەیەك لە بەرانبەر رووخسارمدا بەرزبوویەوە و هەستم کرد باڵندەیەکی تر لەسەر سکم هەڵفری. سەرم سورما، بەڵام گوێم پێ نەدا چرایەك بە داری خێوەتەکە هەڵواسرابوو. ویستم لەبەر روناکی سەیری کاتژمێرەکەم بکەم بەڵام پێشتر هەستم کرد ژێر قورگم دەخورێت. خورانێکی ئازاردەر و قێزەونم هەست پێکرد. دەستم بۆ ژێرقورگم برد بەڵام کتوپڕ لە شوێنەکەم راچەنیم. چوونکە دەستم هەستی بە شلەمەنییەکی گەرم و لینج کرد کە مووی جەستەمی راست کردەوە. خوێن.. خوێن.

دەستم لە چراکە نزیك کردەوە و تاچاوم بەسوورایی خوێن کەوت قیژانم و وتم:

یوری..... یوری..... خوێن.....منیان کوشتووە !

جلەکانم لە خوێنی ژێرقورگم سوور ببوو، دیمەنێکی مەترسیداری پێ بەخشیبووم. یوری بە دەنگی من لە شوێنەکەی بەرزبووەیەوە و چوونکە دوو وشەی (( خوێن، منیان کوشتووە )) بیستبوو، تفەنگی بەدەستەوە گرت و بەرەو لای من رایکرد. یوری لە رێگا دەستی بە کوشتنی هەندێ شت کرد کە سەرەتا نەمزانی چییە. ئەو بە قۆنداغی تفەنگەکەی لە تاریکی هێرشی دەکردە سەر ئەم لاولا و ئەو باڵندانەی لەسەر زەوی

نیشتبوونەوە و یان لە هەوادا هەڵدەفرین، دەکوشت. نەمدەتوانی لەسەر پێ بێستم، سەرم گێژی دەخوارد زانیم خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆشتووە. لە بارودۆخێکی هاوشێوەی بێهۆشی یوری خۆی پێ گەیاندم و وتی:

سەرۆك مەترسە، هیچ نییە، باش بوو لە خەو هەستان...

یوری بەپەلە برێك چیلکە و داری وشکی کۆکردەوە و لە چەند شوێنێك ئاگری دا. دواتر سەرقاڵی من بوو، دەرمانی لە قورگم داو بەستی. کاتێك کەمێك باشتر بوومەوە یوری وتی:

شەمشەمەکوێرەکانی ئەم ناوچەیە خوێنخۆرو مەترسیدارن. لەبیرم چوو پێتان بڵێم تاوانی منە. ئاشکرا بوو شەمشەمەکوێرە خوێنخۆرەکان خوێنی لەشیان مژیوم بەڵام شانسم بوو تەنیا یەکێك لەوان لەسەر من نیشتبوویەوە و ئەوانی تر بەرەو لای گوێدرێژەکان ڕۆشتبوون. یوری و من بەرەو لای گوێدرێژەکان ڕۆشتین و بەوەمان زانی شەمشەمە کوێرەکان ئەوەندە خوێنی ئەو ئاژەڵەیان مژیوە کە لەسەرەمەرگدان. یوری یەکێك لەدارە ئاگراویەکانی هێناو شەمشەمەکوێرەکانی سەر گوێدرێژەکانی بڵاوە پێکرد. ئەژنۆی گوێدرێژەکان ئەوەندە لاوازببوو نەیاندەتوانی لاشەیان رابگرن و هەرکام بە لایەك لەسەر زەوی کەوتن و دەمیان کراوە مایەوە. هیوام بە چاك بوونەوەی ئاژەڵەکان نەبوو و کاتێك هەوا روون بوویەوە و خۆرهەڵاتی ئاسمان بوو بە زیو رەنگ، لەدووری رێگەی و رەنجی زۆر بیرم دەکردەوە و تێفکریم چۆن پاشماوەی رێگا بەبێ ئاژەڵ برۆین. بەڵام یوری کە بەم جۆرە کارەساتانە ئاشنا بوو، دەرمانی لە برین و شوێنی ددانی شەمشەمەکوێرەکان سوو. نزیك نیوەڕۆ بە دژواری گوێدرێژەکان هەستان و بێ ئەوەی سواریان بین و یان باریان کەین، بە ڕێکەوتین.

ڕێگا سەخت و دژوار بوو. یوری بە ڕاستی پیاوەتی دەکرد و یارمەتی دەدام ئێستا هەست دەکەم گەر یوری نەبوو ئەو هەموو بارەی لەسەر شان و سەر پشتی خۆی دادەنا، من چیم دەکرد چۆن دەمتوانی ئەو ڕێگا دژوارە بپێوم.

بەیانی لە هەمان ساتی هەوەڵ کە خۆر لە ئاسمان دەرکەوت، تێگەشتم ڕۆژێکی گەرم و ماندوکەرم لەبەردەمدایە. یوری پانجۆکەی دانا بوو، تەنیا کراسێکی ناسك کە سینە و بەشێك لە بازووەکانی دا دەپۆشی لە بەردەدا بوو لەگەڵ ئەوەشدا ئارەقی دەکردەوە. سەرم سورما بوو چۆن لە ٥٠ کیلۆمەتر دووری، ئەم هەموو جیاوازییەی کەش و هەوا بوونی هەیە، ٥٠ کیلۆمەتر ئەولاتر لە سەرمادا ئاگرمان پێ کردبوو و لەگەڵ هەڵکردنی

ئاگر شەو نەمانتوانی بخەوین بەڵام لێرە هەوا بەرادەیەك گەرمە هەست دەکەیت لەدارستانەکانی ئەفریقا دا ڕێ دەکەیت.

بە خۆشحاڵییەوە نزیك نیوەڕۆ گەشتینە دارستانێکی چڕ و لەوێوە ئاسارابیگۆ ڕێگەی ئێمە لەناو دارە گەرمەسێرەکانەوە درێژەی بوو. سێبەری دارەکان لە توندی گەرماو سوتێنەری هەتاوی کەم دەکردەوە بەڵام لەجیاتی ئەوە مێشوولە گازگرو ژەهراوییەکان و مارە مەترسیدارەکان هەرساتێك هەڕەشەی مردنیان لێ دەکردین. یوری پێی وتم:

سەرۆك، بۆ ئەوەی لەناو گژوگیاوە مار هێرش نەکاتە سەرقاچتان، قاچتان لەناو ئاو دانێن و لەوێوە هەنگاو هەڵگرن.

یوری خۆی لە پێشەوە دەڕۆشت ورێگەی نیشان دەدا. زەوی لە قوروچڵپاو داپۆشرابوو و من بە پێشنیاری ئەو قاچم لەشوێنی قاچەکانی ئەو دادەنا و لەناو قوروچڵپاوەوە دەڕۆشتم. گژوگیای دەوروبەری ڕێگاکەمان خشە خشیان دەکرد و دەنگیان لێوە دەبیسترا. ئەم دەنگانە وەك دەنگی پشیلە و جریوەجریوی باڵندەکان بوو. ئەگەر کەسێك بێ ڕێ نیشاندەری ناوچەیی لەوێوە تێپەڕیایە، بۆ گرتنی سمۆرە و یان بینینی باڵندە خۆش ڕەنگەکان دەستی دەبردە ناو گژوگیاکە بەڵام یوری لەو کاتەدا پێی وتم: سەرۆك ئاگادار بن، ئەم دەنگانەی دەیبیستن دەنگی مارە. نەکەن قاچ لە گژوگیا بدەن و یان دەستی خۆتانی لێ نزیك بکەنەوە.

من ترسابووم و زۆر لەسەرخۆ هەنگاوم هەڵدەگرت. هەندێ کات مارێکی گەورە لەم لاوە سەری دەردەهێنا و لەولاتر دەڕۆشتەوە ژێرگژوگیا و شوێنەکەی لەسەر قوڕوچڵپاوی قەراغ جادە بەجێ دەما. لەبینینی ئەم مارانە دەلەرزیم و دەترسام بەڵام یوری نەدەترسا و وەك منداڵێك کە لە بینینی بووکەڵە شادمان بێت، شادمان دەبوو. یوری گەمەی لەگەڵ مارەکان دەکرد و دارەکەی خۆی لە پشت و ملیان ڕۆدەکرد.

یوری تۆ بۆ بە من دەڵێیت دەست لە مارەکان نەدەم و نزیك نەبمەوە لێیان بەڵام خۆت بەم کردەوە چاو نەترسانە گیانت دەخەیتە مەترسیەوە.

یوری وتی:

سەرۆك ئێمە لە منداڵییەوە دژی ددانی مار بە دۆعا دەپارێزرێین. کاتێك تازە لە دایك دەبین دایك و باوکی ئێمە بە ئامادەکردنی دۆعای دژەمار سەرقاڵ دەبێت کاتێك ئەم جادووە ئامادەکراو و دەرخواردیان داین و لەملمانیان بەست، ئیتر مار توانای گەستنی

ئێمەی نییە.

باوەڕم بە دۆعاو جادو و شتی لەم جۆرە نەبوو. نەمدەتوانی بە قسەکانی رازی بم، ویستم بنچینەی راستەقینەی ئەم باوەڕە بدۆزمەوە.

زۆرێك لە خورافات و باوەڕەکان لای خەڵك بوونیان هەیە کەڕیشەیەکی زانستیان هەیە. ئەمەیش یەکێك لەو باوەڕانەیە هەست دەکەم ریشەی زانستی هەبێت.

رێگەی ئێمە لەناو دارەگەرمەسێرەکان بەردەوام بوو تا ئەوەی نزیك ئێواریٚ گەشتینە شوێنێکی بەرز کە قاوەخانەیەك لەسەر بەرزی تەپۆڵکەکەی دەبینرا. چراکانی لە دوورەوە چاویان دادەگرت و گیانی منیان کە لە هیلاکی رێگا بەگیان هاتبوو، بەرەو لای خۆیان رادەکێشا. یوری وتی: سەرۆك، شەو لێرە بەسەر دەبەین چوونکە جەنگەڵ مەترسیدارە، بەڵام ئاگادارین دانیشتووان نەزانن ئێوە ئەمریکایین. قسەم لەگەڵ دامەکەن و ئەگەر کارتان بوو بینوسن یان بە نیشارە بیڵێن.

لە یوریم پرسی:

ئەگەر بزانن ئەمریکاییم چی دەبێت؟ مەگەر لە ئەمریکاییەکان بێزارن؟

یوری وتی: نە سەرۆك، هۆیەکی تایبەتی نییە بەڵام چوونکە ئەم ناوچەیە حەشارگەی دزەکانە و ئەمریکاییەکانیش بە دەوڵەمەندی بە ناوبانگن، ئەگەری ئەوە هەیە لە بەر پارە هێرش بکرێتە سەر گیانی ئێوە.

ناچار رازی بووم قسە نەکەین بەڵام چۆن دەکرا ١٢ کاتژمێرێك بێدەنگ بم و زمان بۆ قسە کردن نەکەمەوە؟ ئەویٚ قاوەخانەیەکی تەنگ و تاریك بوو، چرایەکی دەریایی کە لوولەیەکی دووکەڵ گیراوی بوو، لە سەقفەکەوە هەڵواسرابوو، بەدژواری دەورروبەری رووناك دەکردەوە. یوری منی بۆ ناو ئەو ژووورە ناردو و خۆی گوێدرێژەکانی بۆ تەویلە برد. لەو ژوورەدا بێجگە لە قاوەچی کە سمێڵێکی زل و چاوانی خوێناوی بوو کەسیتر نەدەبینرا. ئەویش لە سوچێکدا باوێشکی لیٚ دەدا و لەگەڵ بینینی من لە شوێنی خۆی هەستا. نیگایەکی ژێر چاوی لە سەراپای من کرد و کە تفەنگە بەلجیکیە جوانەکەی منی بینی بە زمانی ناوچەیی بەخێر هاتنی کردم.

من لەسەر یەکەم کورسی دانیشتم بەڵام لە ژێر چاوەوە چاودێری قاوەچیم دەکرد و دەمبینی چاو لە تفەنگ و جانتا و کۆڵەپشتییەکەی من هەڵناگرێت. بەتایبەت تفەنگە بەلجیکیەکەی من سەرنجی راکێشا بوو. دەیویست بێتە پێش. تەنانەت بۆ یەك جاریش بووە بیکاتە شان و ئەمبارەو باری بکات. دەترسام، ناڕەحەت ببووم. هەرچەندە رووی

خۆم وەرگەڕاند و لەم لاولام ڕوانی، سوودی نەبوو قاوەچی چاوی لێ هەڵنەدەگرتم.

لە ناو کتێب و گەشتنامەکاندا خوێندبووم کە قاوەچی ئەم جۆرە ناوچە گەرمانە پەیوەندیان لەگەڵ دزەکاندا هەیە و کاتێك گەشتیارێکی چەور ڕوویان تێ دەکات دەست بەجێ دزەکان ئاگادار دەکەنەوە. منیش لەوە دەترسام. قاوەچی لەشوێنی خۆی هەستا و لەژوورەکە ڕۆشتە دەرو دوای یەك دوو خولەك گەڕایەوە.

لای خۆم دڵنیا بووم ئەو لەم دەرفەتەدا کەسێکی بۆ ئاگادار کردنەوەی دزەکان ناردوە و لەعنەتم بۆ خۆم دەنارد کە بۆ شەو هاتووم بۆ ئێرە و باشتربوو لەناو جەنگەڵ دا دەمامەوە. قاوەچی گەڕایەوە و لەڕووناکی کزی چرا دەریاییەکە لە شوێنی خۆیدا دانیشت و چاوە سوور ڕەنگ و ناڕەحەتەکانی خۆی بڕییە من.

بۆ یوری نایەت؟ لە ئاخوردا چی دەکات؟ دەترسام قاوەچی قسەم لەگەڵدا بکات و نەتوانم وەڵامی بدەمەوە و ئەو کات تێبگات ئەمریکاییم. دڵم دەکولاً و زۆر ناڕەحەت بووم. چەند جار بڕیارمدا لە شوێنەکەم هەستم و بڕۆمە ئاخور بە شوێن یوریدا، بەڵام پەشیمان دەبوومەوە و دەترسام ئەم جووڵەیە ببێتە هۆی ئەوەی قاوەچی زوتر قسە بکات. لە ناڕەحەتی زۆر قاچەکانم لە زەوی گیر دەکرد کە کتوپڕ دەرگا کرایەوە و پیاوێکی چوار شانە هاتە ناو. پیاوی تازە هاتوو، باڵایەکی بەرز، گەردنێکی کێشراو، سمێڵێکی پان و ئەستووری هەبوو، پارچەیەکی ڕەنگاورەنگی بە شێوەی بەرازیلی و مەکسیکیەکان لەسەر شان دانا بوو تفەنگەکەی سەرەوخوار لە شان کردبوو. ئەو پیاوە ڕوخسارێکی مەترسیداری بوو. هەر کەس لەجیاتی منیش بووایە لە بینینی دەترسا بەڵام من تا ئەو شوێنەی کرا توانیم خۆم ڕاگرم و هەوڵم دا سەیری نەکەم تا هەستەکانی بەرانبەر بە من نەبزوێنرێت. ئەو لەسەر سەکۆی قاوەخانە دانیشت و بە دەنگێکی گڕ کەشووشەکانی دەجووڵاند، پرسیارێکی کورتی لە قاوەچی کرد و بێدەنگ بوو. لەهەموو تەمەنمدا کەمتر ئاوا ترسابووم و ڕەنگم پەڕابوو بەڵام ئەو شەوە بە ڕاستی ترسام. زۆربەی ترسی من لە قسەکانی یوری بوو.

لە یوری هەواڵێك نەبوو، نەمدەزانی بۆ کوێ چووە و چی دەکات؟ بۆ ئەوندە درەنگی کرد، ئێستا ئەگەر ئەم دو غوولە بێ شاخ و کلکە قسەم لەگەڵ بکەن، چی بکەم و ئەگەر بزانن من ئەمریکاییم چ بەڵایەکم بەسەر دێنن.

چەن کاتژمێرێك بە بێدەنگی تێپەڕی. خۆم بە تەماشای ڕاگەینەراوێك کە لەسەر دیوارەکە هەڵواسرابوو، سەرقاڵ کرد و هەوڵم دا ڕوی خۆم بۆ لای ئەوان نەسوڕێنم. لەم

بێدەنگیەدا تەنیا دەنگی سینە و هەناسەی تازە هاتووی وەك غوول دەبیسترا. وەك وورچ هەناسەی دەکێشا و سینگی بە هۆی کێشانی سیگار و مادە سڕکەرەکانیتر کە لەو دەوروبەرەدا باوە، خش خشی دەکرد و وەك پەمپی هەوا دەنگێکی ئازاردەری لێ بەرز دەبوویەوە.

تازە هاتوو سەرەنجام لە شوێنەکەی هەستا و بەرەو لایەکتری قاوەخانە ڕۆیشت. من لەژێرچاو چاودێریم دەکرد. ترسم لەوە بوو ئەوەك بەرەو لام بێت و بە مشت بکێشێت بە سەرمدا.

دەستەکانی ئەوەندە گەورە و زبر بوو ئەگەر بە ڕێکەوت مشتێکی لە مێشکم بدایە، دەست بەجێ گیانم ئەسپەردە دەکرد و پێویستی بە بەکارهێنانی چەك نەبوو. لوولەی تفەنگەکەم بە بەهێزی لە دەستم دا گرتبوو. وام دانابوو بە هیچ جۆرێك تفەنگ کە تەنیا هیوای دڵخۆشی من بوو، لە دەست نەدەم لەم کاتەدا هەستم بەوە کرد تازەهاتوو سەرخۆشیشە و ڕەتەڵ دەبات و ئەم دۆزینەوە تازەیە زیاتربووە هۆی ترسی من. لەم کاتەدا دەنگێك لە دەرەوە بیسترا و من زیاد لە ڕادە خۆشحاڵ بووم چوونکە گوومانم دەکرد یوری کاری خۆی لە تەویلەدا تەواو کردوە و سەرەنجام هات. بەڵام کاتێك دەرگا کرایەوە وەك ئەوە بوو سەتڵێك ئاوی ساردیان بە سەرا کردبێتم چوونکە بینیم غوولێکی تر گەورەتر لەوەی پێشو هاتە ژوور.

ئەمەیان لەو دەرگاوەی من لێی هاتبوومە ژوور و نزیکی دانیشتبووم هاتە ناو و لەهەمان سەرەتاوە دەرفەتی بوو، لە سەراپای من بە وردی بڕوانێت. ڕوخساری لەگەڵ کەسی یەکەمدا جیاوازی زۆری نەبوو مەگەر ئەوەی سمێڵی ئەو کەمێك لەسمێڵی یەکەمی گەورەترو پانتر بوو. چاوی سوورو درەوشاوە بوو، دوو خەنجەری گەورە لە ڕاست و چەپی کەمەری دەبینرا. بە دەسکی یەکێك لەخەنجەرەکان بە پەڕۆ کۆنەیەکی سوور ڕەنگیان بەستبوو کەهەستم کرد لە خوێنی گەشتیارانی وەك من سوور کراوە.

دووەمی لەگەڵ هاتنە ناو ڕاستەوخۆ هاتە لام و بەرامبەرم وەستا و بە دەستی ڕاستی کڵاوەکەی لەسەر لابرد و سڵاوی کرد. هەڵبەت هەستم کرد کە سڵاوی کرد بەڵام توانای ئەوەم نەبوو وەڵامی بدەمەوە. وەڵامی سڵاوی کەسەکان بەتایبەت ئاوا کەسێك نەدانەوەی، بێ ئەدەبیە بەڵام چۆن دەمتوانی. بە دەست و پێی لەرزان لەشوێنەکەم هەستام بۆ ئەوەی بەعادەتی دانیشتووانی ناوچەکە کوڕنوش بەرم و سڵاو بکەم؟

سەرئەنجام هەر چۆنێك بوو جووڵەیەکم بە خۆم دا، قاچەکانم لە زەوی گیرکرد و

وەڵامی سڵاوەکەم دایەوە. لێرەدا پێکەنینێك لێوە پیس و قەوی و ڕەشەکانی ئەوی کردەوە. وام زانی لەڕێزی من خۆشحاڵ بووە بەڵام دواتر تێگەشتم ئەم پێکەنینە بۆ ئەوەیە چاوی بە تفەنگەکەی من کەوتووە و لەوە خۆشی هاتووە.

دەستی دو سێ جار بێ ئیرادە تەکانی خوارد و سەرەنجام بەرەو لای من درێژبوو و بە دەنگێکی زیاد لەڕادە ترس ئەنگێز و مەترسیدار وتی: تفەنگەکەت ببینم...

ئەم رستەی بەزمانی ناوچەیی وت، هەرچەندە ئەو زمانەم نەدەزانی، لەمەبەستەکەی تێگەشتم و بێ ئیرادە تفەنگەکەم بەرەولای درێژکرد. تەنیا دڵگەرمیم ئەو تفەنگە بوو و ئێستا تێگەشتم تفەنگەکە لەدەستم دەرچووە و ڕۆشتووە. هیچ هیوایەکم بە گەڕانەوەی نەبوو چوونکە دەمزانی تفەنگ بۆ ئەوان لە هەموو شتێك گرانباییترو و پیرۆزترە. ئەو بە خۆشحاڵییەوە تفەنگەکەی لەدەستیدا هەڵسەنگاند، لەسەرو خواری ڕوانی لەبەرامبەر چاوە سەرسوڕماوەکانی من بە پشکنینی گەلەنگەدەن و قۆناخ و دەرزی و شتەکانی تر سەرقاڵ بوو. بەخۆم وت: تفەنگێکی باشە، قەدری بزانە...

تفەنگەکەی دایەوە دەستم، هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی کێشا، وەك ئەوە بوو دنیایان پێ بەخشیبێتم. چوونکە تەنیا شتێك بیرم لێ نەدەکردەوە هیوام پێی نەبوو، ئەوە بوو تفەنگەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە. ئەو تفەنگەکەی دا و ڕۆشتە سوچێکی تری ژوورەکە، کەوتمە ئەو بیرەی رەنگە تفەنگەکەی دابێت تا باوەڕی من بە دەست بێنێت و دواتر بە خەیاڵێکی ئاسوودە سەرم لە جەستە جیاکاتەوە. لەم بیرانەدا بووم کتوپڕ دەنگێکم بیست کە بەهەمان تۆن بەڵام بە ئینگلیزیەکی ڕاست و ڕەوان پێی وتم:

بەرێز فەرموون دەستێك وەرەق.

بە سەرسوڕمانەوە ڕوی خۆم سوڕاندو بینیم ئەو دوو کەسە لەپشت مێزێك دانیشتبوون و دەستێك وەرەقی یاریان لەبەردەم خۆیاندا دانابوو و چاوەڕێی بوون بڕۆمە ناو یاریەکە. دڵم لەم پێشنیازە گوتی:

ئەو وتی یاری بکەین؟ چ جۆرە یاریەکی دیاری کردووە؟

ئەم دوو پرسیارە دەست بەجێ لەمێشکم دا نەخشی بەست و وەڵامم بۆ بەیان کرد. نەمدەزانی مەبەستی چ جۆرە یارییەکە بەڵام گوومانم لەوەدا نەبوو هەرچی هەیە دەیەوێت رووتم کاتەوە.

سەرتا بە زمانی خۆش دەیەوێت پارەکانم ببات و دواتر ئەگەر بەم کارە ڕازی نەبووم ئاساییە رووتم دەکاتەوە. لەو کاتەی لەزانکۆ وانەم دەخوێند، لەگەڵ یارییە

جۆراوجۆرەکاندا ئاشنا بووم و شەوانە لە شوێن خەوی کۆلیژ دوور لەچاودێرانی زانکۆ کۆ دەبووینەوە و بەکارت قومارمان دەکرد. ئەوەندە لە زانکۆ قومارم کردبوو کە لە هەندێك لە یاریەکاندا بە تەواوی شارەزا بووم و دەمتوانی بە چاوی بەستراو یاری بکەم بەڵام ئەم یاریانەی زانکۆ بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئاوا غوولێکی بێ شاخ و کلك بەس نەبوو. ئەو مەبەستی پارەکانی من بوو ئەگەر نەیتوانیایە بیباتەوە بە زۆر دەیسەند. کەواتە چ سودێکی هەیە یاری بزانم یان نە.

ئەم بیرانە چەند ساتێك سەری منیان قاڵ کرد بەڵام لەم کاتەدا چاو و نیگام کەوتە سەر ئەو. لەبەر رووناکی لەرزانی چرای دەریایی قاوەخانە روخساری ترس ئەنگێزیم بینی کە وەك ئاژەڵێکی خوێنخۆر سەرنجی لای منە و چاوە سوورەکانی لە روخساری ترساو و نیگەرانی من هەڵناگرێت. خۆشبەختانە لەم کاتەدا بوو یوری لە ئاخور هاتەدەر. هاتە ژووری بچوکی قاوەخانە و کاتێك گەشتە لای من کە ئەو کەسە دووبارە منی بۆ یاری بانگهێشت کرد و بە زمانی ناوچەیی وتی:

فەرموون یاری بکەین.

بۆ ئەوەی لەمەبەستەکەی تێبگەم دەستبەیەك کارتی یاری لە گیرفان دەرهێنا و خستیە سەرمێزەکە و ئیشارەیەکی پێکرد و کورسیەکی چۆڵیشی نیشان دا.

ئیرادی کار لەوەدا بوو نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە، بیرم دەکەوتەوە یوری وتبووی ئەوان نابێت تێبگەن من ئەمریکاییم، ئەی چی بکەم،... چی بڵێم؟

لەم کاتەدا بوو.

لەم کاتەدا بوو یوری هاتەپێش و بە زمانی ناوچەیی چەند رستەیەك قسەی لەگەڵ کردن و دواتر هات بۆی لای من و وتی:

ئەم پیاوە دەڵێت مەبەستمان سەرگەرمی و یاری کردن بۆ بە سەربردنی کاتەو لەگەڵ ئەوەیشدا دەڵێت دەزانم ئەم گەنجە ئەمریکاییە.

کاتێك یوری قسەی لەگەڵ دەکردم ئەو پیاوە لە شوێنی خۆی هەستا هاتە پێش و دەستی لەسەر شانم دانا و بە زمانی ئینگلیزی روون دەستی بە قسەکردن کرد. جوان ناتوانم بۆ نیشان دانی ترسی خۆم چ ووشە و رستەیەك بەکارببەم کە خوێنەران لە مەبەستەکەم بگەن و راستیەکانیان بۆ دەرکەوێت کە چەندە ترسابووم. لەو کاتەی بۆ یاری کردن دەمویست بڕیار بدەم وەك کەسێك بووم حوکمی ئیعدامی بەسەردا سەپابێت و قەشەیش هاتبێت وەسیەتت لێ وەربگرێت و بڕواتە بەردەم تەنافی دار.

دەستم لە گیان و ماڵی خۆم شۆرد و تامرۆۋ ئاوا حاڵەتێکی بەسەردا نەیەێت ناتوانێت دڵ و گیانی ئارام بکات.

بە خۆمم وت: وا هەست دەکەم هیچ شتێکم نییە. نە تفەنگ، نە پارە، نە جل و بەرگ، لەچی دەترسم، بۆ بەبێ هۆ خۆم ناڕەحەت دەکەم. خێراکە ! پیاو بە و بڕیار بگرە.

ئەمەم بە دڵی خۆم ووت، لە شوێنی خۆم هەستام و پێکەنینێکم لە ڕووی پاکی ناخ و ئاسوودەی خیاڵ هێنایە سەر لێو و لەگەڵ ئەو پیاوە بەرە و مێزە شکاوەکەی ئەوان رۆشتم. لەژێر چاو سەیری یوریم کرد. دەمنەکەی بەلێویەوە هەڵواسیبوو، لەم کردەوە چاونەترسانەی من زیاد لەڕادە سەری سوڕمابوو. هەستی کرد ئەگەر بە یاری کردن رازی نەدەبووم ئەوان نەیاندەتوانی بەزۆر بۆ ئەم کارە ناچارم کەن و ئێستا کە خۆم رازی بووم، هەموو شتێك تەواوە و هەموو شتێکی خۆم لە دەست دەدەم.

لەسەر مێزەکەیان دانیشتم و خۆم و دەستەیەك کارتم هەڵگرت و چەند جار بڕم لێدا و کاتێك ئەوان ئامادە نەبوون پرسیم: چ یاریەك دەکەن؟

پوکێر ! حەزتان لێیە؟

پوکێرم باش دەزانی و ئاشنایی نهێنی و فەنەکانی بووم بۆیە بەبێ ترس یاریەکەم دەست پێکرد. بە هیچ جۆرێك گوومانم نەدەکرد ئەوان فێڵ و تەڵەکە بزانن و ئەمەیش زیاتر بووە هۆی دڵگەرمیم لە یاریکردندا. ئەوەی منی دەترساند ڕوخسارو قیافەی وەحشیانەی ئەوان بوو، ناوچاوانی گرژ و ڕەش هەڵگەڕاو، سمێڵی قەوی و لە هەمووی خراپتر دەستە بەهێزو پۆڵایینەکانی ئەوان و پەنجە زلەکانیان بوو. چەند دەستی سەرەتای یاری بێ شتێکی گرینگ تەواو بوو. ئاشکرابوو ئەوان رکەبەرێکی بەهێزن و من لەم بابەتە خۆشحاڵ بووم بەڵام کاتێك گەشتە دەوری شەش و حەوت بارودۆخ گۆڕا و من پێش کەوتم.

وەك ئەوە وابوو کەسێك لە کاتێکی دیاریکراو دا ناچار بە فشەکردنم بکات، کاتێك فشەم دەکرد ئەوان دەترسان و لە ئەنجامدا دەدۆڕان بەم شێوەیە بڕێکی زۆر پارەم بردەوە. تا ئەو شوێنەی پارەی براوەی من چەند بەرانبەری ئەو پارە بوو کە لەگیرفانمدا بوو.

یوری بە پێچەوانەی ئەوەی لەم بابەتە و لە بردنەوەی من شادمان بێت زیاتر ترسا بوو. بە ڕەنگی پەڕاو لای من دانیشتبوو، سەیری دەکرد. سەرەتا سەرنجم بە هۆکاری ترسەکەی ئەدا و بەرانبەری بەو ڕەش بینیش بووم بەڵام کاتێك سەیری روخساری ئەو

دووانەم کرد و لە ڕووناکی کەم ڕەنگی چرا ڕوخساری تووڕە و چاوە خوێناوییەکانی ئەوانم بینی، تێگەشتم بردنەوەی من لەیاریەکەدا کاری گەیاندۆتە شوێنی ناسك و هەرئێستا لەوانەیە میل بێنێتەوە و سینەی من بکەنە مەبەستی گوولە گەرمەکانی خۆیان. لەژێر مێزەکەوە یوری قاچی لە قاچم دا و بەم شێوەیە تێی گەیاندم دەبێت بدۆڕێم و منیش دەست بەجێ دەستم بەدۆڕان کرد. چەند جار بە ئەنقەست بڕێك پارەم دۆڕاند بەڵام دواتر یاری لە دەستم دا نەما و هەرچەندە هەوڵم دا ڕێگە لە دۆڕانی خۆم بگرم، ئەگەری نەبوو. کەم کەم ناڕەحەت و تووڕە دەبووم و چاوم لەو پارانەی لای منەوە دەبرایە لای ئەوان، هەڵ نەدەگرت. هێشتا زۆر خەمم نەدەخوارد وام دەزانی لە پارە براوەکاندا دەدۆڕێم بەڵام دوای کاتژمێرێك زانیم ئێستا سەرەی دۆڕاندی پارەکانی خۆیشم هاتووە.

هەرچەندە زیاتر دەمدۆڕاند زیاتر کۆنترۆڵی خۆم لە دەست دەدا تا ئەوەی هەستم کرد هەرچەندە پارەم هەبوو، هەموویم دۆڕاند. دەست و پێم دەلەرزی، ئارەقێکی سارد کەوتە سەر ناوچاوانم و سات بەسات زیاتر گرفتاری ناڕەحەتی دەبووم. ئیتر پارەم بۆ یاری کردن نەبوو. یەکیان کە گەورەتر و بەهێزتر بوو، سەیری تفەنگەکەی کردم وتی:

تفەنگەکەت بە ۱۰۰ دۆلار دەکڕم.

دەست بەجێ تفەنگەکەم داو ۱۰۰ دۆلارم لێ وەرگرت. هیوادار بووم بەم ۱۰۰ دۆلارە پارە دۆڕاوەکانم ببەمەوە و هەرگیز بیرم نەدەکردەوە ڕەنگە ئەوەیش بدۆڕێنم. یوری وەك مردوویەکی بێ ڕەنگ و ڕوو لەوێ کەوتبوو و توانای جووڵەشی نەبوو. ئەو زیاتر لەمە نیگەرانی بارودۆخ بوو، دەترسا.

یاری دەستی پێکردەوە و ئەم ۱۰۰ دۆلارەیشم لە نیو کاتژمێردا لە دەست چوو، نیوە شەو نزیك ببوویەوە و کاتێك تێگەشتن چیتر نە پارەم هەیە و نە شتێك بۆ فرۆش لە شوێنی خۆیان هەستان و بەدەست ماڵئاواییان کرد و لەولاتر لەسەر سەکۆی قاوەخانە دانیشتن و دەستیان بە خواردنەوەی قاوە کرد. من و یووریش لەولاوە دانیشتین و خواردنێك کە بە هێلکە بۆمان دروست کرابوو، خواردمان. کاتێك لەخواردن بووینەوە قاوەچی لەدوو پیاڵەی ناحەزی بێ ئەندازە پیس قاوەی بۆ هێنایین. قاوە ئەوەندە تاڵ و ناخۆش بوو شیاوی وەسف کردن نییە بەڵام ئەوندە ناڕەحەت و پەرێشان بووم بەبێ گوێدان خواردم و بۆ ئارام کردنەوەی خۆم لەسەر سەکۆکە پاڵ کەوتم.

لە زۆری خەفەت توانای قسەکردنم نەبوو، دڵم گوشرابوو و بۆ ئەوەی خۆم سەرگەرم

کەم و لەبیرکردنەوە رزگارم بێت، رۆژنامەیەکی کۆنەم لە کیفەکەی خۆم دەرهێنا و دەستم بەخوێندنەوەی کرد. قاوەچی بۆ ئەوەی بتوانم رۆژنامەکە بخوێنمەوە چرایەکی نزیك کردەوە، بەڵام چۆن دەمتوانی بخوێنمەوە؟ بیرم دەکردەوە بەبێ پارە لەم وڵاتە دوورە دەبێت چی بکرێت. بۆ کەر بووم و قومارم کرد؟ لە هەمووی گرنگتر بۆ تفەنگەکەم فرۆشت.

ئەم فکرانە منی شێت کرد بوو نەمدەزانی چۆن خۆم سەرگەرم کەم. لەم کاتەدا دەنگی مرخەمرخی ئەوان بەرزبوویەوە ئەو دوو نەفەرە بەهەمان جل وبەرگ و سیلاحەوە خەوتن لە کاتێکدا سیلاحەکانیان لە باوەش گرتبوو. دەنگی مرخەیان بەرادەیەك بەرز بوو، بیسەر هەستی دەکرد ورچێکی زل لەوێدا خەوتووە.

رژدیم پیێ دەبردن چۆن ئاسوودە خەوتوون و منیش ناڕەحەت، روی خۆم بەرەو یوری سوڕاند بەڵام چاوم بە دیوار کەوت و راگەیەندراوی سەر دیوارەکە سەرنجی راکێشام. جوان ورد بوومەوە، قیافەی رەسمێك بە دیوارە لکێنرابوو ئاشنا هاتە بەرچاوم. راگەیەنراوەکە پیاوێکی نیشان دەدا کە بە جل وبەرگی ناوچەیی و کڵاوی حەسیری تفەنگێکی لە دەستدایە و بابەتێك بە زمانی ئیسپانیۆلی نوسراوە کە من لێی تێنەگەشتم.

بەسەر ئیشارەم بە یوری کرد بێتە پێش و ئەو بڵاوکراوەیە بخوێنێتەوە. کاتێك نزیك بوویەوە ئاشکرابوو هاودەمەکەی من دزێکی مەترسیدار و ناودار بەناوی کالوویە کە بۆ دەستگیری ئەو بنکەکانی پۆلیس چەندین دەوڵەت وەك بەرازیل، ئیکوادۆر، پیرۆ، کۆلۆمبیا خەڵاتێکی بەرچاویان تەرخان کردووە. گەورەترین ژمارە خەڵاتێك بوو دەوڵەتی بەرازیل دیاری کردبوو کە زیاتر لە دەهەزار بوو، کۆی خەڵاتەکان ۳۰ هەزار دۆلار بوو. جوان لە ڕەسمەکە وردبوومەوە بینیم کالوویی دزی ناودار ئەو کەسە بوو لە سەرەتای شەوەوە یاریم لەگەڵ دەکرد. یوری تەواوی بڵاوکراوەکەی خوێندەوە و بەهێواشی لای من لەسەر سەکۆکە دانیشت و بە شێوەیەك کەس دەنگی نەیبیستێت وتی:

لە بڵاوکراوەکەدا نوسراوە ئەو بەکوشتنی ۲۷ سەربازی بەرازیلی و، ۱۲ بازرگانی کۆلۆمبیایی، ئاگردانی دێیەك لە سنووری پیرۆ تۆمەتبارە.

من لەترس و سەرسوڕمان دەمم کراوەبوو و تازە تێگەشتم شانس لەگەڵمدا یاربوو، کە لەم قومارەدا گیانی ئازیزیشم لە دەست نەداوە. بۆ پارە لەو خولەکە بە دواوە خەمم

نەدەخوارد چوونکە ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماسی گرانباییم بوو کە لە دایکم بە میرات بۆم مابوویەوە و دەمتوانی بە فرۆشتنی لەسارایاگۆ خەرجیەکانی گەشتەکەم دابین بکەم، شادمان بووم لەوەی لانی کەم گیانم پاراستووە.

ئێستا ترسێکی تر منی داگرتبوو. بیرم دەکردەوە ئەم پیاوە غوول ئاسایە کە من یاریم لەگەڵدا کرد کالوویی دزی ناودارە، ئەو بەو دەستانەی یاری دەکرد چەند خەڵکی بێ تاوانی کوشتووە و خنکاندووە.

دەنگی مرخەمرخی ئەو دوانە لە ژوورەکەدا بڵاوببوویەوە و زیاتر بووە هۆی ترسی من. خەو لەچاوانم پەڕیبوو دەترسام لەنیوە شەو یەکێك لەوان هەستێت و بەگومانی پارە سەرم لە جەستە جیاکاتەوە. مرۆڤ کوشتن بۆ کەسێکی دڵ رەقی وا کارێکی ئاسانە.

قاوەچی و یووریش خەوتن. ئیتر هیچ دەنگێك نەدەبیسترا و تەنیا من بە ئاگا بووم و کاتژمێرێك دواتر نەوتی چراکەش تەواو بوو سوولەکەی وردەوردە بەرەو کوژانەوە رۆشت تا بەتەواوی خامۆش و تاریکی بوو بە فەرمانڕەوا. لەم کاتەدا دەنگێك بەرگوێم کەوت. وەك ئەوەی کەسێك لە شوێنەکەیدا هەستا بێت. لە تاریکیدا چاوم هیچ شوێنێکی نەدەدی بەڵام گوێچکەم بچوکترین دەنگی دەبیست. گوومانم کرد کالوویی یان هاودەستەکەی لەخەو هەستاون و دەیانەوێت سەرم لە جەستە جیاکەنەوە..... مووەکانی جەستەم گرژببوون و بە شێوەیەك لەم گوومانەدا نوقم ببووم کە گوومانم بوو بە دڵنیایی و دەمویست لەترسا هاوار بکەم...

بەڵام دەنگەکە دوورکەوتەوە، دەنگێك وەك خشەخش دەبیسترا و دواتر دەرگای ژوورەکە کرایەوە. روناکیەکی کەم لە مانگ و ئەستێرەکان، دنیای رووناك کردبوویەوە و کاتێك دەرگا کرایەوە لە ڕووناکی مانگە شەوی کەم رەنگ قیافەی قاوەچیم بینی کە لە دەرگا رۆشتەدەر.

هەستی فزولیم بزوێنرا، بیرم دەکردەوە بۆ کوێ دەچێت. ئەگەر کارێکی بوو لەو دەرگاوە کە پێشتر هاتوچۆی لێدەکرد دەڕۆشتەدەر. ئەی بۆ لەم دەرگا کە بۆ کێو و کوێستان دەکرایەوە، رۆشت. ئەم بیرە وردەوردە بەهێز بوو تا ئەو شوێنەی ئیتر نەمتوانی ئۆقرەبگرم. لایتەکەم دەرهێنا و چەند خولەك دوای قاوەچی، لەدەرگا رۆشتمەدەر.

نەسیمێکی فێنك هەڵیکردبوو کە لە هەمان سەرەتاوە رۆحێکی تازەی پێ بەخشیم. لە دوورەوە سێبەری قاوەچیم بینی کە لە تاشە بەردێك سەردەکەوت و لەولاوە سەرەو

خواردەبووەیەوە. لەسەر نووکی پێ بەدوایدا ڕۆشتم. ئەم کردەوە کارێکی جوان نەبوو بۆ گەنجێکی خوێنەوار و پەروەردەکراو ناپەسەندە بەڵام وەك ئەوە وابوو دەستێکی بەهێز من بەرەو پێش دەبات تا بە شوێن قاوەچیدا بڕۆم. سەر ئەنجام منیش گەشتمە تاشەبەردەکە بەڵام لە جیاتی ئەوەی بەسەریدا سەرکەوم بەدەوریدا سوڕام. هێشتا ۲۰ هەنگاو لەلایەکی تاشەبەردەکە دوور نەکەوتبوومەوە کە دەنگی وت و وێژێك سەرنجی ڕاکێشام و خێرا پشتم بەبەردەکەوە چەسپاند و گوێم گرت.

جوان لە زمانیان تێ نەدەگەشتم بەڵام ئەوەندە زیرەك و وشیاربووم بزانم لە بارەی کالوویی قسەدەکەن و دەستگیری ئەو: قاوەچی وتی: ئەمشەو بڕیاربوو بێتە ئێرە و هاتووە و ئێستا خەوتووە، کەسێکی تریشی لەگەڵدایە.

کەسی تر لەوێ نییە.

با، دوو گەشتیاری تریشی لێیە، یەکێکیان ئەمریکاییە و ئەویتریان ڕێ نیشاندەریەتی.

سەرم کێشاو بینیم بیست سوار لای تەپۆڵکەکە وەستاون و لە ڕووناکی ڕازاوەی شەو بە جوانی دەبینرێن. دوو فەرماندەکەی ئەوان لە پشت تاشەبەردەکە لەگەڵ قاوەچیدا قسەیان دەکرد. کاتێك دەستور درا دەرگاکان لەدەرەوە ببەستێ کە نەتوانێت رابکات. چیتر درەنگ کردنم بەرەوا نەزانی و بە خێرایی بەرەو قاوەخانە گەڕامەوە. لەرێگا کەوتمە شەڕی نێوان عەقڵ و نەفس. پیاوەتی فەرمانی پێدەدام کالوویی هەستێنم و لە ڕوداوەکە ئاگاداری کەمەوە بەڵام عەقڵ پێی دەوتم ئەو دزو تاوانبارە و لەویژدانەوە دورە دەستگیر بکرێت و ئیعدام بکرێت. چەند چرکەیەك زیاتر گیرۆدەی دوودڵی و گومان نەبووم، سەرئەنجام نووری چرا گیرفانییەکەی خۆم لە کالوویی گرت و ڕۆشتمە پێش تا ئاگای بکەمەوە. ئەو ترسا و دەمانچەکەی کێشاو ڕوی کردە من بەڵام خێرا بە ئینگلیزی پێم وت: مەترسە من لاوی ئەمریکایی هاویاریتم.

دەست بەجێ لە ڕوداوەکە ئاگادارم کردەوە. ئەو دەستی بەسەر شانمدا کێشاو هاوڕێکەی بە ئاگاهێنایەوە و دەست بەجێ لە شوێنەکەی خۆمدا خەوتم و چرا گیرفانیەکەم لەبەرگە تایبەتیەکەی خۆی دا دانایەوە. هاوڕێی کالوویی بە خێرایی لە دەرگای ژوورەوە ڕۆشتە ئاخورەکە و هێشتا قاوەچی نەهاتبوو کە گەڕایەوە. بە کالوویی وت: قاچی ئەسپەکانم لە نمەد پێچاوە و ئامادەم کردووە، خێراکە.

کالوویی بەرەولام هات، هاوڕێیانە دەستی گوشیم و تفەنگەکەی پێدامەوە و بێ

ئەوەی قسەیەك بكات یان دەمی بۆ سوپاس كردن بكاتەوە، بەخێرایی رۆشت و ئیتر تێنەگەشتم چۆن رایان كرد. كالوویی و هاورێكەی رایان كردو لەبەر ئەوەی قاچی ئەسپەكانیان بە نمەد پێچابوو دەنگی سمی ئەسپەكانیان بە هیچ جۆرێك بەگوێ نەدەگەشت. لەم كاتەدا قاوەچی گەڕایەوە بەڵام چوونكە چرای ژوورەكە كوژاوە بوو، هەستی بەنەمانی كالوویی و هاورێكەی نەكرد و بەهەمان شێوە كە دەستووری پێدرابوو دەرگاكانی داخست. دەمزانی ئێستا چ هەراو هوریایەك دروست دەبێت و چی دەقەومێت بەڵام خۆم كرد بە خەوتوو و چاوەكانم بەست.

چەند خولەك دواتر قاوەخانەیان گەمارۆدا و دوو ئەفسەرەكە وەك دوو قارەمان هاتنە ژوورو بە دەنگی بەرز هاواریان كرد: دەستان بەرزكەنەوە..... نەجوڵێن. گیانتان لە دەست دەدەن. قاوەچی دەست بەجێ چراكەی رۆشن كرد بەڵام كاتێك چراكە رۆشن بوو هەموو لەسەرسوڕماندا دەمیان كرایەوە.

كاتێك چرا رۆشن كرا خۆم كردبوو بە خەوتو بەڵام دەمزانی چ هەرایەك لە ناخیاندا دروست بووە. كالوویی چی لێ هات ! بۆ كوێ رۆشت؟ ئەم پرسیارانە لە نیگا وەحشیەكان و سەرسوڕماوەكانی ئەوان دەخوێندرایەوە. بۆ چەند ساتێك بێدەنگییەكی قورس فەرمانڕەوابوو و بێجگە دەنگی هەناسە كێشانی قاوەچی كە لەهەمووان زیاتر ترسابوو هیچ شتێك بەگوێ نەدەگەشت. قاوەچی لەبارودۆخی مردندابوو، ترسێكی سەرسوڕهێنەر ئەوی داگرتبوو و لەترسا چاوەكانی زەق ! دەمی كراوە و لێوەكانی وشك ببوو. گوومانی دەكرد كالوویی دەستگیر دەكرێت بۆیە ئاوا كارێكی پر مەترسی ئەنجام داوە، ئێستا كە دەیبینی كالوویی رای كردووە، مردنی لەپێش چاوی خۆی دەبینی، رزگار بوون لە تۆڵەی كالوویی بە باوەڕی ئەو ئەگەری نەبوو بە ڕاستیش وابوو. لەم كاتەدا كتوپڕ ئەفسەری فەرماندەی سوارەكان قیژاندی و بە زمانی ناوچەیی كە من بەدژواری تێگەیشتم وتی: ئەوان ئێستا ڕایان كردووە. بە دوایاندا بڕۆن.

چەند كەس سواربوون و رۆشتن. وام نیشان دا بە دەنگی ئەفسەرەكە لەخەو هەستاوم. چاوەكانم كردەوە و لە شوێنەكەی خۆمدا دانیشتم. ئەفسەرەكە سەیرێكی منی كرد و دواتر زۆر بە وردی لە سەرتاپای یوری ڕوانی و بە خێرایی لە قاوەچی سەبارەت بە ئێمە زانیاری ویست؟

لەشێوەی پرسیارەكانی هەستم كرد گوومانی لێمان هەیە. بە گوومانەوە سەیری دەكردین. بەڵام قاوەچی ڕوونی كردەوەو وتی:

ئەمانیش ئەم شەو لە مەترسیدا بوون. کالوویی پارەکانیانی بە قوومار بردەوە. تفەنگی ئەو لاوە ئەمریکاییەی کڕی بەڵام ڕستەکەی تەواو نەببوو کە لەم کاتەدا چاوی بە تفەنگەکەی من کەوت کە لەسەر زەوی لای من دانرا بوو. لەوپەری کەمتەر خەمی تفەنگەکەم لای خۆم دانابوو خەوتبووم.

قاوەچی سەری سوڕما، ئەگەر کالوویی تفەنگەکەی بیر چووە بۆی لای منە و ئەگەر بە ئەنقەست نەیبردوە گەڕاندویەتیەوە بۆ من هۆکارێکی هەیە.

قاوەچی بە ئیشارەت ئەفسەرەکەی بردە ژووری تەنیشت و چەند ساتێك پێکەوە قسەیان کرد و ئەوکات ئەفسەرەکە بە خێرایی گەڕایەوە وبێ ئەوەی مۆڵەت لە من وەربگرێت دەستی هێنایە پێش و چراگیرفانیەکەمی لەبەرگەکەی کە بە کەمەرمەوە هەڵواسرابوو دەرهێنا و بەدەستیەوە گرت.

چەند جارێك ڕۆشنی کرد و کوژاندییەوە، دواتر چرای ژوورەکەی کوژاندەوە و چراکەی منی ڕۆشن کرد و دایە دەست یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی و لەژوورەکە ڕۆشتەدەر.

من تێگەشتم کاتی هاتنی بەرەو قاوەخانە لەهەمان کاتدا کە چراکەم ڕۆشن کردوەو کالوویم بێدارکردەوە، نووری چراکەی منی لە پشت پەنجەرەوە بینیوە و ئێستا بۆ تاقی کردنەوەی دووبارە ڕۆشتەدەر تا لێکۆڵینەوە بکات. ئەنجام ئەوە بوو کە دەیویست. من و یوری کە هەستمان بە ئەنجامی کارەکە کرد، ڕەنگ بە ڕوخسارمانەوە نەما و یوری وەك داری بی کەکەوتبێتە بەر هەرەشەی با، دەلەرزی.

هەوڵم دا خوێنساردی خۆم بپارێزم و لەهەمان کاتدا پەشیمان بووم بۆ ئاواکارێکم کردوە..... پەیوەندی بە منەوە بوو...

بە ڕاستی کارێکی قێزەونم کردبوو بەڵام هەرچی بوو ئەنجام درابوو و هیچ ڕێگایەکم بیجگە لە قبووڵ کردنی دواهاتەکانی نەبوو.

ئەفسەرەکە گەڕایەوە ژوورەکە و وتی:

بەرێز من ئێوە بە ناوی یاساو بە تۆمەتی هاوکاری لەگەڵ دزی ناودار کالوویی و ئامادەکردنی کەرەستەکانی راکردنی ئەو بازداشت دەکەم.

تێگەشتم کە چی ووت بەڵام یوری بۆ پاراستنی رووکەش و سەلماندنی ئەوەی من زمانی ئەفسەرەکە تێناگەم ووتەکانی بۆ وەرگێڕامەوە.

ڕوخسارێکی تووڕەم بە خۆم گرت و پرسیم بۆ لەبەر چی؟ هەرگیز بە فەرمانەکەتان

رازی نابم من گەشتیارێکی ئەمریکاییم ئێوە مافی بازداشتی منتان نییە.

دەمە بەدەمەی ئێمە زۆری خایاند و سەرئەنجام کە بینیم هیچ چارەیەك بێجگە لە فەرمانبەرداری ئەوم نییە و ئەگەر فەرمانی ئەفسەرکە بەجێ نەهێنم بە زۆر دەمبەن، بە تووڕەییەکی دەسکرد هەستام و لە کاتێکدا جلەکانی خۆم ڕێك دەکرد وتم:

بەم زووانە هەست دەکەن کارێکی زۆر ناشیرینتان ئەنجام داوە بازداشتی گەشتیاری دەرەکی لە دەسەڵاتی ئێوەدا نییە و تۆمەتەکانتان بە من رەوانییە. ئەمڕۆ یان سبەی بە فەرمی داوای لێبووردنم لێ دەکەن.

ئەفسەر قسەکەمی بڕی و بە پەنجە دەرگای نیشان دا و وتی:

خێرا بەڕێکەون و کەمتر قسە بکەن. چوونکە ناچار دەبم دەستبەند لە دەستتان بدەم.

ترسام، چوونکە ئەفسەر وەك دانیشتوانی ئەو ناوچە دیار بوو وەك دێوێکی بێ شاخ و کلك پیاوێکی بەهێز و پەنجە زل دەهاتە بەرچاو. بەدوری نەدەزانی دەستەکانی من بە دەستبەند ببەستێتەوە و ئەگەر خۆراگری بکەم و قسەبکەم فەرمان بەیەك دوو کەس دەدات لێم بدەن.

ناچار بێدەنگ بووم و کەوتمە ڕێ. تازە هەوا ڕووناك ببوویەوە کە لە قاوەخانە هاتینەدەر. قاوەچی گوێدرێژ و بارەکانی ئێمەی ئامادەکردبوو، دەست بەجێ سوار بووین و بەڕێ کەوتین. هەرچەند زیاتر دەڕۆشتینە پێش، زیاتر ترس بەسەرمدا زاڵ دەبوو و پەشیمانیم لەو کردەوەی ئەنجامم دابوو، زیادی دەکرد.

بە خۆمم وت: بە راستی کارێکی قێزەونم کرد.

ئەم کالووییە جگە لەوەی پارەکانی منی برد و منی ترساند، چ کەڵکێکی تری بۆ من بوو کە خزمەتێکی وام بۆ ئەنجام دا. چی بکەم؟

بیرم دەکردەوە لەگەڵ گەشتن بە سارایکۆ بڕۆمە قونسوڵگەریی ئەمریکا و روداوەکەیان بۆ باس بکەم و داوای هاریکاریان لێ بکەم بەڵام یوری خێرا لە گوومان دەرهێنام و وتی: تەنیا لە ((ناپۆ)) قونسوڵگەریی ئەمریکا هەیە. ئەویش تەنیا لە ساڵدا سێ مانگ کراوەیە و قونسوڵ وەرزەکانیتر بە هۆی گەرمای زۆر دەڕواتە پشوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بۆ سارایکۆ نابەن.

هێواش و بەترس و لەرزەوە پرسیم: ئەی بۆ کوێمان ئەبەن؟

لە ١٥ کیلۆمەتری ئێرەدا بنکەیەکی پۆلیسە کە دەمانبەن بۆ ئەوێ. خوا فریامان بکەوێت چوونکە بەدبەختیەکی گەورە چاوەڕێمان دەکات بە هیچ جۆرێك بەخشین و

تێبینی کردن لەئارادا نییە و ئەگەر تاوانی پیاو کوشتن و دزی و گەردنە گرتنمان لێبدەن، چاوەڕوانی بەخشین و کەم کردنەوەی سزامان نابێت ببێت.

ئەوندە یوری لەم بابەتانەی باس کردو شتەکەی گەورە نیشان دا، لە ترسا مووەکانی جەستەم گرژبوونەوە و لەدڵمدا جنێوم بە کەریەتی خۆم دا. لە تەپۆڵکە سەرەوخوار بووینەوە و کەوتینە باریکە رێگایەك کە قاوەخانەی لێوە نەدەبینرا. لەم کاتەدا کە دوایین کەس لە تەپۆڵکەکە سەرەو خوار دەبوویوە و من لە دەریای قوڵی خەمە بێزارکەرەکانم دەست و پێم لێ دەدا، کتاوپڕ دەنگی گوولە لەدەشتەکەدا بڵاوبوویەوە و هەموومانی لە شوێنەکەماندا چەقاند، ئەفسەر دەستی خۆی بەرز کردەوە و بەم ئیشارە جڵەوی گوێدرێژەکانی کێشاو وەستاین. دەنگی گوولەیەکی تریش بیسترا و هاوارێکی دڵتەزێن بە گوێ گەشت و بێدەنگی هەموو شوێنێکی داگیر کرد.

یوری سەری خۆی بەداخەوە تەکان داو لەهەمان کاتدا پێکەنینێکی نامۆ و لاواز جوڵەیەکی هەست پێنەکراوی خستە سەر لێوە ئەستوورە ڕەشەکانی. من بە ئیشارەی سەر لێم پرسی کە چی تێدەگەیت؟ ئەو بەهێواشی وتی:

کالوویی قاوەچی کوشت.....؟

ئەفسەر فەرمانی بەڕێکەوتنی دا و دەستەی سەربازان بێ گوێدان بە قاوەچی کە گوولەی بەرکەوتبوو و مرد بوو، درێژەیان بە ڕێگەی خۆیان دا.

هێواش گوێدرێژەکەم لە یوری نزیك کردەوە و پرسیم:

ئەگەر کالوویی قاوەچی کوشت ئەی بۆ بۆ گرتنی ناگەڕێنەوە.

یوری پێکەنی و بەهەمان هێواشی جاری یەکەم وتی:

سەربازان ئەگەر لەشکرێکیش بن نابنە حەریفی کالوویی و کەسانی وەك ئەو. هیوایان تەنیا بەوەیە ناکاو گیری بکەن و یان وەك ئەوەی ئەمڕۆ بینیمان لەخەو دا بیگرن و بازداشتی بکەن.

تازە زانیم دەسەڵاتی کالوویی و مەترسی پیاوێك کەهاوڕێیانە یاری لەگەڵدا دەکردم چەندە؟ کاروانی ئێمە هێواش هێواش دەڕۆشتە پێش. لە دەشتێکی بەرزو نزم تێپەڕمان کرد و لەناو دوو ڕیزی داری گەرمەسێر کەوتینە سەرەو لێژییەك کە گوێدرێژەکان بە دژواری و هەناسەبڕکێ دەڕۆشتنە پێش.

هەتاو هەڵهاتبوو، هەموو جێگایەکی ڕووناك کردبووەیەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژ هێشتا گەرم و بێزارکەرنەبوو. یوری بە ڕەنگی پەڕاو چاوی بڕیبووە گوێچکەی

گوێدرێژەكەی. وەك مراوی گەردنە درێژو ڕەشەكەی دەجوڵاند. وەك ئەوە وابوو لەگەڵ سمی گوێدرێژێكە زیكرێكی دەست پێكردبێت چوونكە لێوەكانیشی دەجوڵاند.

نوقمی بیرو خەیاڵ بووم كە كتوپڕ دەنگی چەند گوولەی یەك لەدوای یەك بە گوێ گەشت.

ئەم جارە گوولەكان بە ویزەویز لە چەپ و راستی ئێمەوە دەڕۆشتن و دەدران بەسەر زەویدا. نەمدەزانی چی بووە، لەسەر گوێدرێژەكە گێژبووم و لەچەپ و راستم دەڕوانی. دیاربوو ئێمە ئامانجی گوولە كانین بەڵام تیر هاوێژ و تەقە كەرەكان بە هیچ جۆرێك نەدەبینران.

لەلای چەپی ئێمە تاشەبەردێكی گەورەبوو كە بە گیای سەوز و گوڵە وەحشیەكان داپۆشرابوو و گوڵەكان لە كەلێنی بەردەكانەوە سەریان دەركردبوو. لەلای راست چەند ریز داری كۆن و لەپشت دارەكان هەڵدێرێكی قووڵ و سەرئەنجام كێوێكی كورت دەبینرا كە ئەوێش بە دار و سەوزە گیا داپۆشرابوو.

لە گوێدرێژەكەم دابەزیم دەستم بەرەو تفەنگەكەم درێژكرد بەڵام دەنگی یوری منی وەستاند. یوری قیژاندی و خۆی بە من گەیاند و وتی: چی دەكەیت؟ سوار بە.

سەرم سورما كە بۆ لەمپەرە لەبەرگری كردنی من. مرۆڤی عاقڵ بێ بەرگری نابێت تەسلیمی مردن ببێت.

یوری سەری خۆی هێنایە پێش و وتی:

كالوویە ! بۆ رزگاركردنی ئێمە هاتووە، خەیاڵتان ئاسوودە بێت، سوار بن.

نزیك بوو لە شادمانیدا بقیژێنم بەڵام بەسەر خۆمدا زاڵ بووم سوار گوێدرێژەكە بووم و لە دەوروبەرم دەڕوانی. دەنگی قیژەیەكی دڵتەزێن بیسترا و دوای ئەوە یەكێك لە سوارەكان وەك مانگایەك كە لە بەرزاییەوە بیدەن بە زەویدا، لەگوێدرێژەكەی جیابوویەوە و كەوتە سەر زەوی. هەر ئەوەندەی ئەو كەوت ئەوانیتر ئەنجامی كاری خۆیان زانی، سوار بوون و بەخێرایی ڕایان كرد.

تەنیا من و یوری لە شوێنی خۆماندا ماینەوە و جگە لە ئێمە لاشەی خوێناوی ئەو سوارە چەند مەترێك ئەولاتر لە ژێر دارەكاندا كەوتبوو، هێشتا تفەنگەكەی لە دەستدا بوو چاوەكانی كراوە بوو و لەئاسمانی دەڕوانی.

تەپ و تۆزێك هەستابوو، دوای ئەوەی تەپ و تۆز نەما و سوارەكان نزیكەی ٢ كیلۆمەتر لە ئێمە دوور كەوتنەوە، هەناسەیەكم بە ئاسوودەیی هەڵكێشا و بە قوڵی

کراسەکەم عارەقی ناوچاوانم سڕی.

لەم کاتەدا دەنگی قاقای پێکەنینێك بە گوێم گەشت. لە سەرسوڕماندا دەمم کرایەوە چوونکە ئەمە دەنگی ژنێك بوو پێدەکەنی. ژن؟ ئەویش پێبکەنێت ! یانی چی. زەق زەق لە دەورووبەرم ڕوانی لەبەرئەوەی نەمتوانی شوێنی دەنگە کە بدۆزمەوە، لە یوری کە ئەویش سەری سورمابوو، ڕوانیم.

جارێکیتر دەنگی قاقای پێکەنین بەرزبوویەوە.

چەند جارێکیتر ئەمە دوبارە بوویەوە و سەرئەنجام دەنگی خشەخشی شاخە وشکەکان و گیاکان بیستراو ساتێك دواتر قیافەی ژنێکی لە ڕادە بەدەر جوان لە پشت بەردی لای چەپ دەرکەوت. ژنێك بوو بالاّ بەرز، قژ خورمایی بە چاوانی خۆڵەمێشی ! ڕوخساری ڕوون و زیاد لەڕادە جوان بوو، کراسێکی تەسکی لەبەرکردبوو کە یەخەکەی کراوە بوو. شەڕواڵێکی شین ڕەنگی لەپێ کردبوو کە چەند شوێنێکی پینەی ناجۆری پێوەبوو. جگە لەم جل و بەرگە و ئەو جوانییە سەرسورهێنەرو ئەو بەژن و بالاّ ڕێکە تفەنگ و چەند ریز فیشەکی ئەو سەرنجیان ڕادەکێشا.

لەبینینی ئەو دەمم کراوەبوو. هەم بەجوانییە سەرسورهێنەرەکەی داگیرکرابووم و هەم گێژی بارودۆخی نائاسایی و سەرسورهێنەری ئەو ببووم.

ئەم ژنە کێیە؟ لێرە چی دەکات. ئایا ئەو بۆ بلاّوەی بە سوارەکان کرد.

ژنە جوانەکە هەرئەوەندەی دەرکەوت، سەیرێکی من و یوری کرد و دواتر وەك ئاسکێکی خەرامان و لەهەمان کاتدا وەك شێرێکی وەحشی بەرەو لاشەی سەربازە کوژراوەکە ڕۆشت. تفەنگ و فیشەکەکانی هەڵگرت و دواتر بەرەو لای ئێمە هات و کاتێك گەشتە لای گوێدرێژەکەی من بەنەرمییەکی شیرین وتی: زۆر ترسان؟

یوری وتی: ئەم بەڕێزە، گەورەی من ئەمریکاییە. ئینگلیزی دەزانێت.

و دەست بەجێ ژنە جوانەکە بە ئینگلیزیەکی پاراو بە منی وت.

دەتانەوێت بەرەو کەنارەکانی ئامازۆن برۆن؟

من کە لە سەرسوڕماندا دەمم کراوە بوو، ئاوی دەمم قوت دا ووتم:

بەڵێ، بۆ گەشت و لێکۆڵینەوەی زانستی !

ئەو پێکەنینێکی مەستانەو شیرینی کرد و لەهەمان کات کەتفەنگی سەربازە کوژراوەکەی لەشان دەکرد و تاقی کردەوە، وتی:

لێکۆڵینەوەی زانستی؟ سەیرە؟ بۆ تەنیا ئەمریکاییەکان و ئەویش گەنجەکان بۆ

لێکۆڵینەوەی زانستی دەڕۆنە کەنارەکانی ئامازۆن؟ بۆ مەگەر ناکرێت لێکۆڵینەوەی زانستی لە شوێنێکی تردا ئەنجام بدرێت؟

ئەوسا نیگایەکی پڕ مانای لە ڕوخسارم کرد و زیادی کرد.

بڵێن بۆ دۆستایەتی لەگەڵ ژنانی ئامازۆن و لەوانەیش سەر لەسەر ئەم ڕێگادانان.

من یوری هێشتا لەسەرسوڕمان ڕزگارمان نەببوو و زەق لەومان دەڕوانی. ئەو هەستی بە نیگا نائاساییەکانی ئێمە کرد وەك ئەوەی تازە هەستی بەم حاڵە کردبێت وتی:

ببوورن، بیٚ ئەدەبیم کرد، هەرچەندە ئێمە وەحشی و بیابان گەڕین بەلام ڕۆژێك مرۆڤ بووین وەك شارنشینەکان ژیانی شاریمان هەبوو ! ببوورن من خۆم بە ئێوە نەناساند. من سینگوالاو ژنی کالوویيم ئەو خۆی بۆ کوشتنی قاوەچی و ئاگردانی قاوەخانەکە ڕۆشت و منی بۆ ڕزگاری ئێوە نارد. نازانم بۆچی سوور بوو کە هەرچی زووتر ئێوە لە دەست ئەم سوارانە ڕزگار بکەم؟

((سنگوالا)) ژنێکی جوان بوو بەلام نازانم چۆن جوانی ئەو وێنەبکەم. دەترسم بڵێم جوان نەبوو چوونکە ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێنن و سینگوالایان بینیوە. ئیرادم لێدەگرن و بە کەسێکی بیٚ زەوق و هەست ناوم دەبەن. کەواتە سینگوالا جوان بوو.

لەم کاتەدا دەنگی سمی چەند ئەسپێك لە پشت سەری منەوە بیسترا، سینگوالا وەك سەگێك کە گوێچکەکانی خۆی هەڵدەخات و گویٚ لە دەنگی با دەگرێت، جوان گوێی گرت و چەند سات دواتر لێوی بە بزەکرایەوە وتی: کالووییە...

کالوویی و هاوڕێکەی کە لە قیافەدا دەستەکەمێکی لەو نەبوو گەشتنە ئەویٚ و لە ئەسپ دابەزین. یوری دابەزی منیش تێگەشتم کە دەبێت دابەزم.

بیابان ئیمپراتۆری بەربلاوی دزەکانە. ئەوان لە بیابان بۆ هەرکارێك بەتوانان. بۆیە هەرکەس لە ئیمپراتۆری بیاباندا ڕوبەڕویان دەبێتەوە ئەرکی سەرشانیەتی ڕێزیان لیٚ بگرێت. دابەزینی من لەئەسپ بۆ ڕێزلێنان لە کالوویی کە ئیمپراتۆری بیابان بوو، پێویست بوو.

کالوویی لەم جوولەی من زیاد لە ڕادە شادمان بوو پێکەنینێکی قووڵ لێوە ڕەش و ئەستوورەکانی کردەوە و سمێڵەکەی درێژتر کرد، ددانە زەرد و پیسەکانی نیشان دا و وتی: ئێوە تەندروستن؟

سوپاس هیچ زیانێکمان بەرنەکەوت.

کالوویی هاتە پێش و دەستی لەسەر شانم دا و وتی:

سینگوالا ناپرسێت بۆ بۆ رزگارکردنی ئەم بەرێزەو نۆکەرەکەی پەلەم بوو.

سینگوالا هاتە پێش، نیگایەکی مانادراری لە من کردو وتی:

نەت وت و رۆشتی. پێش هاتنی تۆ ئەم پرسیارەم دەکرد.

کالوویی بە خۆشەویسیتیەوە جارێکیتر دەستی لەشان و پشتم دا وتی:

بەڵێ، ئەم بەرێزە منی لە مردن رزگار کرد. من تا ماوم چاکەی ئێوە لەبیرناکەم و بۆ قەرەبووکردنەوە یەك هەفتە لای خۆم راتان دەگرم و تا قەراغ جەنگەڵیش دەبمە هاوڕێتان کە گیرۆدەی ئەم منالانە نەبن.

مەبەستی لە منالەکان، سەربازەکان بوو ! ئەو هەمیشە بە منالْ ناوی دەبردن و بەراستیش ئەوان وەك منالێك کە لە مامۆستا یان باوکی دەترسێت لە کالوویی دەترسان و لەهەر شوێنێك سێبەری ئەویان بدیایە رایان دەکرد.

من میوانییەکەی ئەوم رەت کردەوە و وتم:

بەداخەوە ناتوانم لای ئێوە بمێنمەوە چوونکە بۆ گەشتن بە جەنگەڵ پەلەمە و دەترسم پێش گەرم بوونی هەوا نەتوانم خۆم بگەیەنمە ئەوێ.

لەم کاتەدا بەرێکەوت چاوم بە سینگوالا کەوت، برۆکانی هێنابووەیەك و روخساری لەلایەکیتر سەرنج پێدابوو بەڵام بە جوانی گوێی لە قسەکانی ئێمە دەگرت. ئەوکات تێنەگەشتم بۆ سینگوالا برۆکانی هێناوەتەیەك و گاز لە لێوە جوانەکانی دەگرێت. بەڵام دواتر زانیم. بەداخەوە کاتێك تێگەشتم کە زۆر درەنگ ببوو. کالوویی خەنجەری لە کەمەر دەرهێنا و بەنووکی خەنجەر نەخشەی ئەو ناوچەیەی لەسەر خۆڵە نەرم و نمدارەکەی ئەوێ کێشا. بێ ئەوەی قسەمان لەگەڵ بکات چەند ساتێك بەم کارە سەرقاڵ بوو. لەم لاوە جادەی لە کوێستانەکان تێپەراند تا گەشتە ناپۆ و لەلایەکیتر رێگەی کوێستانی کە لە ناو نەخشەی جوغرافیاییدا نەبوو و کالوویی خۆی ئاگاداری بوو، کێشای و دوای بەراوردکردنێك کەلای خۆی کردی هەستاو وتی:

لەم رێگەوە برۆن بۆ سارایگۆ و چەند رۆژ دواتر دەگەنە ناپۆ. ؟

یوری توانای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی بوو، هاتە پێش و وتی:

یەك هەفتەی تر لە ناپۆ دەبین.

و دە رۆژی تر دەگەینە جەنگەڵ.

راستە.

زۆر باشە من لە رێگەی کوێستانەوە بە سێ رۆژ ئێوە دەگەیەنمە ناپۆ و چوار

ڕۆژەکەی تر لای ئێمە بمێننەوە تا ڕاو بکەین و ڕابووێرین.

لەم وت وێژانەدا سینگوالا بەشداری نەکرد بەڵام بە جوانی گوێی گرت و هێشتا روخساری گرژ بوو. تێنەگەشتم کە چی بوو و چییان وت کە کالوویی دەستی برد بۆ گیرفانی و وتی: ببوورن بەرێزی ئەمریکایی، دەترسم بڕۆنەوە ئەمریکا و بەرۆژنامە ئەمریکاییەکان بڵێن کالوویی دزێکی جوامێر نەبوو.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: بۆ؟

وەڵامی دایەوە.

ئێوە چاکەیەکی قەرەبوو نەکراوەتان لەگەڵ مندا کرد بەڵام هێشتا پارە و خەرجی گەشتەکەتان لە گیرفانی مندایە ئەمە لە پیاوەتیەوە دوورە لە پاداشتی پیاوەتیەکەتان پارەکەتان بخۆم.

دەست بەجێ دەستەیەک ئەسکەناس، ئەو ئەسکەناسانەی لە منی بردبوویەوە لە گیرفانی دەرهێناو دای بە من. من زۆر شادمان بووم بەڵام ووتم:

ئێوە لە یاریدا پارەی منتان بردۆتەوە، وەرگرتنی ئەو پارە لە ئەخلاقی منەوە دوورە.

کالوویی لەم قسە زۆر شادمان بوو بەڵام پێی داگرت و کاتێك پارەکەی خستە گیرفانم ووتی: بە هەڵەدا چوون. ئێمە پارەی ئێوەمان لەیاری و بە پاکی و راستی نەبردەوە. کالوویی بەبێ فێڵ یاری و قومارکردن نازانێت نیگایەك لە نێوان من و یوریدا ئاڵ وگۆر کرا. ئەم نیگا وەك راوێژێك بوو کە دەمانکرد. یوری سەری خۆی وەك گوێ نەدان لەقاند و بەم شێوەیە تێی گەیاندم رازی بوون یان نەبوون پەیوەندی بە حەزو ئیرادەی خۆم هەیە.

چەند ساتێك بیرم کردەوە، دڵنیابووم لەم جۆرە دزانە پیاوەتی زیاترە لە فێڵ. ئەگەر بیەوێت بمکوژێت لێرەدا دەمکوژێت و هەرچیم هەیە هەڵی دەگرێت و دەروات. بۆ بەبێ هۆ کاتی خۆی بەفیڕۆ بدات و مەودایەکی زۆر من لە شوێنی ئارام ئاسوودە دوریکاتەوە.

بەدوای ئەم فکرانە ئەنجامێکم گرت و بەسەر بە پێشنیازەکەی کالوویی رازی بووم. کالوویی جارێکیتر کێشای بە پشتمدا دوای قاقایەکی بەرز وتی:

هەوڵ دەدەم ئەم چەند رۆژە ئەوەندە شەوانە خۆش بگوزەرێت لەهەموو تەمەنتا بە زیندوویی یادی بکەیتەوە. سینگوالا پێش کەوت.

روخساری سینگوالا کرایەوە و شادمان بوو. برۆکانی کردەوە و روخسارە خەمبارو خەماوییەکەی نەما و درەوشانەوەی چەند سات پێشتری بە دەست هێنایەوە.

سەرئەنجام بەڕێکەوتین، نەمدەزانی چی دەبێت و چی ڕوودەدات. خۆم دایە دەست چارەنووس و کاتێك بە دوای کالوویدا بەڕێکەوتم ماڵئاوایم لە هەموو شتێکی دنیا کرد.

لەناو ڕێدا ئەم گوومانەم لا دروست بوو کە ئەگەر بە پێشنیارەکەی کالوویی رازی نەبوومایە ڕەنگە تووڕەببووایە و ئەم کارەی منی بە جۆرێك لەبیٚ ڕێزی بژماردایە، ئەوسا منی دەکوشت. کەواتە ئێستا خۆم بە خۆشەویستی ئیلاهی و بە دەستی قەزاو قەدەر و چارەنووس دەسپێرم. هەرچی دەبێت ببێت.

کەم کەم بە تەڵقین کردن لە توندوتیژی نیگەرانی خۆمم کەم کردەوە و چون بزوێنەرێکی نییەت خراپیم لەوان نەدی بە سەیرکردنی دەوروبەری ئیشەکانی کوێستان سەرقاڵ بووم.

سینگوالا لە پێش کاروانە ٥ کەسیەکەی ئێمەوە دەڕۆشت. ئەسپێکی زۆر جوان و یاخی بوو، بە دوایدا یوری و دوای یوری من و لەدواوەی کاروان کالوویی و هاوڕێکەی بوون.

ڕێگەی کوێستانی دەگۆڕا، هەندیٚ کات باریك و هەندیٚ کات پان و بەربلاٚو، بەلاٚم لەهەر حاڵێکدا بووینایە سینگوالام دەبینی کە دەگەڕێتەوە سەیری دواوە دەکات و هەر کە چاوی بە من دەکەوێت بزەیەکی جوان لێوە سوور ڕەنگەکانی دەکاتەوە.

من هەرگیز گوێم بەو پێکەنینە پڕ مانایانە نەدەدا.

کاتێك هەتاو گەشتە ناوەڕاستی ئاسمان، سینگوالا لەسەر ئەسپەکەی بەرزبوویەوە و سەری بۆ دواوە سوڕاند و بە دەنگی بەرز وتی:

هۆو کالوویی هۆ.... لەکویٚ دابەزین !

لای کانی..... چارەکە کاتژمێرێك زیاتر ڕێگە نەماوە...

چارەکێکی تریش ڕێگەمان کووتاو سەرئەنجام بە شوێنێکی زۆر خۆش کە داری کۆن و دیمەنی سەرنج ڕاکێش و کەش و هەوایەکی زیاد لە ڕادە فێنك و دڵتەڕ گەشتین.

سینگوالا لای کانی ئاوەکە کە لەدڵی کێو دێتەدەر و لە چاڵێکدا کۆ دەبێتەوە و لەولاوە لە بەرزاییەکی چوار مەتری بە دەنگێکی دڵرفێن دەڕژایە خوار، لەئەسپ دابەزی. پێش هەر شتێك هەوساری گوێدرێژەکەی منی گرت بە مشت کێشای بە ئیسقانی قاچی مندا و بە گاڵتە و پێکەنینێکی دڵرفێن وتی:

ئای ئەمریکایی چاو باز، دابەزە، لێرەدا نان دەخۆین.

لە هەموو ئەو سنوورەدا و لە مەکسیك و وڵاتانی تری ئەمریکای باشور،

ئەمریکاییەکان بە کەسانێکی خۆش رابووێر و هەوەسباز دەناسن. پێشتر وابوو کە هەر ئەمریکاییەك بۆ گەڕان یان پیاسە و یان ئەنجامی هەر کارێك گەشتی بۆ ئەو ناوچانە کردبێت، بۆ ئەوینی کچە چاوڕەشەکان قەوماندویەتی. هەر بۆیە ئەوان ئەمریکیەکان بە یەك چاو سەیر دەکەن و بە گشتی بە خەڵکێکی هەوەسبازیان دەناسن. بۆیە کاتێك سینگوالا بە چاو باز بانگی کردم سەرم سور نەما بەڵام سەرسوڕمانم بۆ ئەوەبوو کە گاڵتەی لەگەڵ دەکردم و لە هەمووی گرنگتر بۆ بە مشت کێشای بە قاچی مندا؟

دوبارە گرنگیم پێ نەدا و دابەزیم. سینگوالا بە دەست کێشای بە سمتی کەرەکەی من و ناردییە لای یوری تا زین و بەرگەکەی بکاتەوە و ئاڵفی پێ بدات. من لای کانییەکە دانیشتم و دەم وچاوم شۆرد و کالوویش لای من دانیشت و جزمەکانی داکەند و قاچی خستە ناو ئاوەکە.

من و کالوویی دەستمان بە قسە کردن کرد. ئەو باسی جوانییەکانی ئەو دەوروبەرەی دەکرد و دەیوت: لەو کاتەوە من و سینگوالا گەشتینە ئێرە و بڕیارماندا لەم کوێستانەدا ژیان بەسەر بەرین پیر نەبووین و دڵنیام ئەگەر مناڵەکان نەمانکوژن بەم زووانە بە مردنی سروشتی نامرین.

دەمویست بپرسم بۆ بوون بە دزو بۆ لەکۆمەڵگا ڕاتان کردوە کە کتوپڕ کەوتمە بیری چەند شەو پێشتر و چاو پێکەوتنی ناکاتمان لەگەڵ ماچوا.

نازانم بۆ ڕەنگم پەڕا. وەك ئەوە وابوو دۆزینەوەیەکی گرنگم کردبێت. قیافەی ماچوا ئەو کاتەی سەبارەت بە هاوسەرەکەی و مەعشووقەکەی قسەی دەکرد کەوتە بیرم. زەختم لە مێشکم کردو کتوپڕ ناوی ئەوانیشم بیرکەوتەوە. ماچوا بە ئێمەی وت ناوی ژنەکەی سینگوالا و ناوی هاوڕێیەکەی کە لەگەڵ سینگوالا دا ڕای کردوە کالوویی بوو.

چی بوو ئەمریکایی..... بۆ ڕەنگت پەڕا..... وەك ئەوەیە لە من دەترسیت.

بەپەلە ووتم: نا ناترسم. ئێوە کەسێك نین مرۆڤ لێتان بترسێت و هۆکارێکیش بۆ ترس لەئارادانییە.

بۆ قەرەبووکردنەوە زیادم کرد:

ئێوە پیاوێکی ئازان بەڵام بە هەمان ئەندازە پیاوەتیش و میهرەبانیتان هەیە. بۆیە لە ئێوە ناترسم.

ئەی بۆ ڕەنگت پەڕاوە؟

چارەیەك بێجگە لە ووتنی ڕاستی نەبوو. لەلایەکیتر ئەگەر دەمویست بۆ درۆکردن

بیربکەمەوە ئەو پێی دەزانی کە من بەڵگەیەکی درۆینەم بۆ رەنگ پەڕانی خۆم هێناوەتەوە. بۆیە بێ درەنگ وەڵامم دایەوە کەوتمە بیری ماچوای داماو.

کتوپڕ کالوویی وەك ئەوەی هەورە بروسکەیەك لێی دابێت لە شوێنەکەی هەستا، خەنجەرەکەی لە کەمەر دەرهێناو بە چاوانی پڕ لەتووڕەیی و خوێن سەیری کردم و لە کاتێکدا دەنگی لە تووڕەییدا دەلەرزی ووتی:

ها... تێگەشتم. تۆ منت لە دەست سەربازەکان رزگار کرد تا بمدەیتە دەست ماچوا. تۆ لە گانگێستەرەکانی ئەمریکاییت تۆ پارەت لە ماچوا وەرگرتووە؟

ئەوەندە بەرز قسەی دەکرد لەگەڵ دەنگی تاڤگە یوری و سینگوالا دەنگیان بیست.

یوری بەرەو لای من و سینگوالا بەرەو لای مێردەکەی ڕایکرد. ژنی جوان خۆی خستە نێوان من و ئەو و هەوڵیدا کالوویی ئارام بکاتەوە بەڵام پێش ئەوەی لەم کارەدا سەرکەوێت، بزەیەکم گرت و وتم:

خوا لە ماچوا خۆش بێت.

بە بیستنی ناوی ماچوا سینگوالا ڕوی لە من کرد و نیگایەکی پڕ لە گوومانی لە من کرد. بەڵام من هەواڵی مردنی ئەوم دەدا و ئەم رستەیە ئەوانی ئارام کردەوە. سینگوالا خەنجەرەکەی کالوویی گرت و بەرەولام هات و پرسی:

ئێوە ماچوا لە کوێوە دەناسن؟

لە مەبەستەکەی سینگوالا تێگەشتم. ئەو دەیویست تێمبگەیەنێت ئەگەر بە ڕاستی لەلایەن مێردەکەیەوە راسپێردراوم درۆبکەم. خۆم رزگارکەم. درۆی لە دەمی من دادەنا بەڵام پێش ئەوەی شتێك بڵێم یوری بە زیرەکی تەواو سیاسەتێکی عاقڵانە لە منی پرسی: گەورەم... ئەم ناوە ناوچەییە ! ماچوا کێیە؟

دەمزانی یوری ئەو پیاوەی لە بیرە. ووتم:

ئەو پیاوەی لە ڕێگادا بینیمان و لە خێوەتەکەماندا مایەوە و ڕۆژی دواتر کەوتە ناو دۆڵەکە.

ئەم جارە دەنگی کالوویی بیسترا بە سەرسوڕمانەوە دەیپرسی:

کەوتە ناو دۆڵ ! مرد ! ئێوە رزگارتان نەکرد؟

من بەداخەوە روداوی چاو پێکەوتنی ماچوام باس کرد و وتم:

ئەو چیرۆکی عەشقی خۆی بە سینگوالا و ڕاکردنی ئێوە دوو کەس بە دنیایەك فرمێسك و ئاخەوە بۆ ئەگێرامەوە بەڵام بەیانییەکەی کەوتە ناو دۆڵ و تیکە تیکە بوو.

هەردوکیان، کالوویی و سینگوالا خەمباربوون. دیاربوو باوەڕیان بە قسەکانی من کردووە چوونکە بە بیستنی مردنی ماچوا زیاد لە ڕادە خەمباربوون. کالوویی هاتە لام و جارێکیتر دەستی لەسەر شانمدا و بە دەنگێك پڕ شەرمەزاری ووتی:

داوای لێبووردن، خراپ تێگەشتم. ببوورن. بەڵام ماچوا هەرچی بوو هاوڕێم بوو و چەندین ساڵ هاوڕێیەتیمان بوو، حەیف، زۆر بەداخم بۆی.

سینگوالا لەوەی بینی کالوویی جارێکیتر بەرامبەر بە من میهرەبان بوو، شادمان دەهاتە بەرچاو. جارێکیتر لای کانییەکە دانیشتین و کالوویی، قومقومەی شەڕابی خۆی لە کەمەر کردەوە و بەمنی دا. من قومقومەم لە لێو نزیك کردەوە و یەك دو قومم خوارد. شەڕابێکی خۆش و زیاد لە ڕادە بۆنی خۆشی تیابوو کە هیلاکی ڕێگای لێ سەندمەوە. کالووییش یەك دوو قومی خوارد، سەرەکەی بەست و لە بیست هەنگاوییەوە هەڵیدا بۆ سینگوالا و قومقومەکە گەڕایەوە بۆ لای کالوویی و ئەو تەکانی داو هەستم کرد خاڵییە.

سینگوالا هەموو شەڕابی ناو قومقومەی خوارد بوو و شەڕاب ئەوەندە زۆر بوو نەتەنیا بووە هۆی سەرسوڕمانی من بەڵکو کالووییش سەری سورما و ووتی:

ئەو هیچ کات ئاوا شەڕابی نەدەخوارد، چی بووە؟

دواتر کالوویی بۆ دڵدانەوە دەستێکی خستە سەرشانم و ووتی:

بۆم بگێڕەوە هاوڕێی ئەمریکاییم، ماچوا چی پێوتن و چۆن مرد. من چۆنیەتی کەوتنە خوارەوەیم جارێکیتر گێڕایەوە. کالوویی هەمان پرسیاری دەکرد. تێگەشتم کە دەیەوێ دڵنیابێت کە من درۆبکەم یان نە. درۆزن هەرچەندە لێهاتوانە درۆ بکات توانای ئەوەی نییە بابەتێك دووجار یەك جۆر باس بکات، بیسەر ئەگەر زۆر وشیار بێت خێرا تێدەگات.

مەبەستی کالووییش ئەمە بوو بەڵام چوونکە درۆم نەکردبوو نەدەترسام و ئەگەر دەجاری تریش پرسیاری بکردایە دەمگێڕایەوە. ئەم جارەیان چۆنیەتی بینین و مانەوەی لە خێوەتەکەی ئێمەدا، بۆ گێڕایەوە و هەموو ئەو شتانەی لەبارەی سینگوالا و ئەو ووتبووی، باسم کرد.

کالوویی پیاوێکی زیرەك و مەترسیداربوو، شتێك دەبووە هۆی ناڕەحەتی من، سەیرکردنی سینگوالا و بزەکانی بوو. لە خۆم پرسی:

یانی چی؟ ئەو بۆ پێدەکەنێت؟ بۆ لەیەکەم ڕووبەڕووبوونەوەدا گاڵتەی لەگەڵ کردم.

هۆکەی ئەوەی زۆر بیرم لێدەکردەوە ئەوە نەبوو کە دڵم دەیوت سینگوالا منی خۆش

بوویت بەڵکو لەم بابەتە دەترسام.

لەو کاتەی تازە گەرمی شەڕاب خۆی دەردەخست و من و کالوویی سەرقاڵی قسەکردن بووین کتوپڕ دەنگی هاوڕێی کالوویی بیسترا کە دەیووت:

هۆی کالوویی هۆو، کەڵەکێوی... سەیرکە.

وەك ئەوەی من چاوەڕوانی ئاوا رووداوێك بوو بیتم. تەنیا یەك رووداوی وا دەیتوانی من لەشەڕی قسەکردنی کالوویی رزگار بکات. کالوویی هەستا و منیش هەستام و بەرەو ئەو شوێنەی ئەو پیاوە بە دەست نیشانی دەدا، ڕامان کرد.

لە خاڵێك کە نزیك... ٢ مەتر دوری لە ئێمە بوو، نزیك ١٠ کەڵەکێوی یەك بەدوای یەك دەڕۆشتن. یەك لەوان لە پێشتر دەڕۆشت و وەك ئەوە وابوو پارێزگاری ئەوانی لە ئەستۆدا بێت چوونکە بە چاوە جوانەکانی سەیری دەوروبەری دەکرد. لمۆزی دەبردە سەر و بۆنی دەکرد.

کالوویی بە هێواشی پرسی: دەتوانین بیپێکین؟

من بە ئەندازەی تفەنگەکەم سەیرم کرد و ووتم: نا دەبێت بڕۆینە پێش.

من و کالوویی چەماینەوە و بە هەمان شێوەی چەمانەوە هەرکام لەلایەکەوە دەڕۆشتین. یوری نەهات بەڵام سینگوالا تفەنگەکەی خۆی هەڵگرت و هات. کەڵەکێوییەکان هێدی هێدی لە کەلێنی کێوەکە دەڕۆشتنە سەرو من بۆ ئەوەی تیرم بە هەڵەدا نەڕوات هەوڵم دەدا تا ئەو شوێنەی دەکرێت نزیکتر ببمەوە و ئەو کات تەقەبکەم کە لەسەدا سەد بیپێکم. بێ ئەوەی ئاگام لە پشت سەری خۆم هەبێت ڕام کرد.

لە پشت تاشەبەردێکی سەر سەوز کە گیای لەسەر سەوز ببوو، حەشارم گرت و نێچیری سێیەمم نیشانە گرت و تەقەم کرد.

کەڵەکێوی لە شوێنەکەی بەرزبوویەوە و کەوت. ئەوانیتر بڵاوەیان لێکرد بەڵام دوو سێ چرکە دواتر پەیوەستی یەك بوون و لە کێوەکە رۆشتنە سەرو لەولا سەرەو خوار بوونەوە. نێچیرێك کە بووە نیشانەی گوولەی من، ئیتر لە شوێنەکەیدا هەڵنەستایەوە، بۆ برینی سەری ڕام کرد، پێش ئەوە بگەمە ئەوێ کالوویيم بینی، گەشتۆتە سەر نێچیرەکە و سەری بڕیوە. من رێگەی خۆم خوارکرد و بە دوای کەڵەکێوییەکاندا ڕۆشتم. هیوادار بووم یەك دوانێکی تر ڕاو بکەم و لەبەرئەوەی بە خێرایی ڕام دەکرد هەستم بەوە نەکرد سینگوالا بانگم دەکات.

دە خولەك دواتر بە هەناسەبڕکێ خۆم گەیاندە لووتکەی کێوەکە و لە پشت

تاشەبەردێك كە دەیڕوانییە ئەولای كێوە، بە دوای نێچیرەكاندا گەڕام، بەڵام شوێنەواریان لێ بەدی نەدەكرا. چوونكە لەوبەر كێوەكە بۆنی باررووت و بە لووت ناگات و دەنگ ناداتەوە، كەڵەكێوییەكان ئارام دەگرن و دەست بە لەوەڕین دەكەنەوە، بۆیە هێواش لە پشت تاشەبەردەكەوە هاتمەدەر و بەرەو ئەولا شۆڕ بوومەوە و هەموو شوێنێك بە دوای نێچیرەكاندا دەگەڕام.

سەرەو خواری ئەولای كێو زۆرنەبوو، لەلایەكیتر بە درێژایی رۆژ زیاتر لەیەك دوو كاتژمێر هەتاوی نەدەبینی بۆیە لەو شوێنانەی خۆڵی لێ بوو، شوێنەواری نمی باران هەستی پێدەكرا و لەسەر ئەو خۆڵە نەرم و نمدارانە شوێن پێی كەڵەكێویەكانم بینی و بە دڵگەرمی سەرەوخوار بوومەوە. زیاتر لە نیو كاتژمێر گەڕام بەڵام هیچم دەست نەكەوت. لەبەرئەوەی زۆر هیلاك بووم لە شوێنێكی پان لەسەر كێوەكە كە لە ژێر تاشەبەردێكی گەورەدا جێگیربوو دانیشتم و جگەرەیەكم داگیرساند  و بە ئاسوودەیی ناخ دەستم بە كێشانی كرد. لەهەمان كاتدا لە بارودۆخی خۆم و رێگای بەردەم و ئەم رووبەڕووبوونەوە سەیرە، بیرم دەكردەوە.

هێشتا سیگارەكە نەگەشتبووە نیوە، لەلای راستمەوە دەنگێك بیسترا، وام زانی كەڵەكێوییەكان لێم نزیك دەبنەوە، تفەنگەكەم هەڵگرت و خۆم كێشایە دواوە تا ئاژەڵەكان نەترسن. یەك دو خولەك تێپەڕی. دەنگەكە نزیك و نزیكتر دەبوو، سەرئەنجام هەستم كرد دەنگی پێی مرۆڤە. لەم كاتەدا سینگوالام بینی، دەم بەبزە لێم نزیك دەبێتەوە.

نازانم بۆ بەبینینی ئەو لەجیاتی ئەوەی خۆشحاڵ بم، دەترسام، بێ ئیرادە لێدانی دڵم بەرزبوویەوە و ڕەنگم گۆڕا. نەمدەزانی چی بڵێم، دەمویست لە لایەكیترەوە رابكەم و خۆم بگەیەنمە كەسانیتر، بەڵام ئەم كارە پەسەند نەبوو. دڵم دا بەدەریا و دانیشتمەوە و دەستم بە دوكەڵ كردنی پاشماوەی سیگارەكەم كرد.

سینگوالا نزیك بوویەوە وتی:

بەڕێز ئەمریكایی، كالوویی لە ئێوە تووڕەیە.

بەترس و سەرسوڕمانەوە پرسیم:  بۆ؟ لەبەرچی؟

ئەو پێكەنی و وتی:  ئێستا تێدەگەن من لەدەست ئەم شێتە چی دەكێشم و چ خوێناوێك دەخۆمەوە.

ئەمە وەڵامی پرسیاری من نەبوو و لەلایەكیتر پەیوەندی بە منەوە نەبوو. بۆیە دوبارە پرسیم  بۆ لێم تووڕەیە؟

وەڵامی دایەوە: لێرە باوە کاتی ڕاو سەرەتا ئەو کەسەی گەورەترە تەقەدەکات و دواتر ئەگەر ڕێگەی دا ئەوانی تر تەقە دەکەن. ئێوە ئەم ڕێزەتان لەو نەگرت و زۆر تووڕەیە.

من بەڕاستی تووڕەو لەهەمان کاتدا ترسابووم و دەمویست بڵێم ((مەگەر من نۆکەری ئەوم)). بەڵام نەموت تەنیا بێدەنگ بووم. سینگوالا لام دانیشت، تفەنگەکەی لەسەر زەوی داناو قاچی ڕاکێشا. لەوێ کە بیجگە من و ئەو کەسیتر لەوێ نەبوو، بە جوانی لێی وردبوومەوە، بەڕاستی جوان و ئەندام ڕێك بوو چاوی شین، قژی خورمایی و برۆ و برژانگی ڕەش بوو.

ڕەنگم پەڕابوو، نەمدەزانی ئەم ڕەنگ پەڕانە لە ترسی تووڕەیی کالووییە یان لە تەنیا بوون لەگەڵ سینگوالا لە سوچێکی چۆڵی کوێستان؟ هەرچی بوو ڕەنگ پەڕانی من سەرنجی سینگوالای ڕاکێشا و دوای ئەوەی چەند ساتێك بە چاوە جوان و خومارەکانی لە منی ڕوانی، وتی:

بۆ ڕەنگت پەڕاوە؟ لە کالوویی دەترسی یا منت خۆش دەوێت؟

لە پرسیارەکەی پشتم لەرزی ! چۆن بیر و هزری منی خوێندەوە ! پرسیارێك ئەو لێی کردم هەمان شت بوو کە من بیرم لێ دەکردەوە. نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە. بەهەمان ڕەنگ پەڕاوی چاوم تێ بڕی و بە ناڕەحەتی ووتم:

هیچ کام...

ئەو ژنێکی وەحشی و سەرکێش و کوێستانی بوو. کاتێك ئەم وەڵامەم دایەوە هەستم کرد تووڕە دەبێت و چەند سەرم سوڕما کە بینیم بە دەنگی بەرز پێدەکەنێت. پاکەتە سیگارەکەی لێ سەندم. سیگارێکی ئاگر دا، مژێکی توندی لێدا و وتی:

درۆ دەکەیت. هەم لە کالوویی دەترسی و هەم منت خۆش دەوێت.

ئەو نهێنیەکانی دڵمی هێنایە سەر زمان و سەیر ئەوەبوو بێ شەرم وبێ پەردە قسەی دەکرد. ئەو ڕاستی دەوت. چوونکە من هەم لە کالوویی دەترسام و هەم سینگوالام خۆش دەویست. بۆ خۆم هەڵخەڵتێنم ئەگەر ئاوا ژنێك لە ئەمریکا دا ڕووبەڕووم ببووایەتەوە، عاشقی نەدەبووم و دڵ و دینم پێ نەدەدۆڕاند، بۆ نا؟

لەگەڵ ئەوەشدا ڕوخسارم گرژ کردو وەڵامم نەدایەوە. مژێکی تری لە سیگارەکەدا و سەری خۆی لە من نزیك کردەوە و ووتی:

گوێ بگرە، سەیری چاوەکانم بکە تا نەتوانیت درۆبکەیت.

کە من روم تێنەکرد، دەستی هێنایە پێش و بە پەنجە ناسکەکانی چەناگەمی گرت و روی کردمە خۆی و ووتی:

سەیری چاوەکانم بکە.

دەلەرزیم و حاڵەتێکی سەیر کە تا ئەو ساتە بۆم کەم وێنەبوو، هەموو جەستەمی گڕاوی کرد. ئەم گەرمییە کاتێك زیاتر بوو کە لە ناو چاوە شین و جوانەکانیدا نوقم بووم.

ئەو وتی:

ئەگەر منت خۆش دەوێت لە کالوویی مەترسە. گوێ بگرە تۆ یەکەم پیاویت لە یەکەم رووبەڕووبوونەوەدا دڵمت لەرزاند: زیاتر لە چل کەس لە رێگای عەشقی مندا کوژراون کە بەلایەنی کەم ١٥ یان کالوویی کوشتوویەتی بەڵام تۆ ئەگەر منت خۆش ئەوێت لە کالوویی مەترسە. چوونکە ئەو لە دەستمدا وەك مۆمێك وایە، گەرمی دەکەم نەرمی دەکەم و بەهەر شێوەیەك بمەوێت دەری دێنم ! تێگەشتیت. سەیری چاوەکانم بکە و راست بڵێ ! ئەو ئەم قسانەی دەکرد و منیش دەمویست باوەڕ بە قسەکانی بکەم بەڵام چوونکە خۆم پیاوم، دەمزانی بەبێ ترس ناکرێت لەگەڵ بوونەوەرێکی وەحشی و خوێنخۆردا گاڵتە بکرێت.

لەو کاتەی لە چاوەکانی سینگوالام دەڕوانی و جەستەم دەلەرزی، ئارەزوم دەکرد خۆزگە دەمتوانی بەبێ ترس خۆشم بووێیت بەڵام لە کالوویی دەترسام.

یەك دو سات بە بێدەنگی تێپەڕی و خۆیشم نەمزانی چی بوو کە بێ ئیرادە دەستیم لە دەست گرت و وتم: ئاخ سینگوالا تۆ شێتم دەکەیت... ناتوانم رازی بم بەوەی هەرچی دەیڵێیت راستە. هەڵبەت تۆ درۆناکەیت بەڵام...

بەڵام چی؟ یەك ووشە وەڵام بدەرەوە کارەکانیتر لە ئەستۆی خۆم.

چ وەڵامێکت دەوێت؟ تێبگەیت کە من تۆم خۆش دەوێت یان نە؟ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە ناتوانم درۆت لەگەڵدا بکەم... بەڵێ تۆم خۆش دەوێت.

سینگوالا هیچی نەوت تەنیا بینیم چاوەکانی لە شادمانیدا پڕ بوون لە فرمێسك.

نەمزانی چەند خولەك و چۆن تێپەڕی، لە هەموو دنیا ئاسوودە و تەنانەت خۆیشم لە بیرکردبوو کە کتوپڕ دەنگی پێ بیسترا. هەردوکمان لە شوێنەکەماندا هەستاین.

من شڵەژاو پەرێشان بووم و نەمدەزانی چی بکەم. چوونکە دڵنیابووم دەنگی پێی کالووییە ئەگەر ئەو ئێمەی لێرە پێکەوە دەدی و چەند قونچکە جگەرەی دەبینی، دەست بەجێ منی دەکوشت. نازانم چی لە سینگوالا دەکات بەڵام کاری من تەواو بوو. چی

بکەم.

نزیک بوو لە ترسا لە کێو و لە بەرزایی هەزار مەترییەوە بکەومە خوار، کتوپڕ سینگوالا فریای رۆحی پەرێشانم کەوت خێرا دەستی لە ملم ئاڵاند و تفەنگەکەی وەك داردەستێك گرتە دەست و لە کاتێکدا پاڵی بە من دابوویەوە و تفەنگەکەی وەك داردەست بەکاردەهێنا و لەوکاتەی کالوویی لە پشت تاشەبەرد وەك شێرێکی تووڕە دەرکەوت قاچێکی بەرزکردەوە و دەستی بەناڵاندن کرد.

ئاخ... ئاخ... قاچم شکاوە. کالوویی تۆ لەکوێیت ئەم پیاوە داماوە هیلاك بووە...

من دەلەرزیم نازانم چۆن باسی ترس و لەرزی خۆم بکەم تاخوێنەران تێبگەن چ حاڵێکم هەبووە. رەنگە ئەگەر باشترین ووشە و رستە بۆ باس کردنی ئەم حاڵەتە بەکاربەرم نەتوانم لە ئەستۆدەی بەربێم. هەرکەس دەبێت یەك جار بکەوێتە بارودۆخی هاوشێوەی من تا بزانێت لەو کاتەدا چیم بەسەرهات. سینگوالا لە دوایین ساتدا پشتی بە مەکری ژنانە بەست. ئەم گەمەی دەست پێکرد و گەمەیەکی زۆر چاك بوو. جگەلەوە ئەگەری نەبوو بیانوویەکیتر درەنگ کردنی ئێمە لە گەڕانەوە و لای یەك بوون بەڵگەدار کات.

زۆرباش سینگوالا ئەم فێڵەی بەکارهێنا بەڵام ئەگەر کالوویی باوەڕ نەکات چی دەبێت؟ ترسی من لەوە و بەرێکەوت لە ساتی یەکەم کالوویی بەد گوومان بوو.

چەند چرکەیەك وەستا. لە هەردوکمانی ڕوانی. چاوی وەك چاوی گورگ بوو. بینیوتانە لە شەوێکی تاریك و سارد و سوتێنەری زستان، لەناوەڕاستی بیابان، چاوی گورگ چۆن دەدرەوشێتەوە. چ کاریگەریەکی هەیە و چ کارتێکەرییەك لەسەر بینەر بەجێ دێڵێت. چاوی کالووییش لەوکاتەدا بەهەمان شێوە دەدرەوشانەوە و وەك ڕمی ژاراوی لە دڵ و گیانی من رۆدەچوو.

دەلەرزیم و بەخۆشحاڵییەوە لەرزینی ئەژنۆکانی من کەمێك گوومانی ئەوی کەم کردەوە چوونکە وایدەزانی لەبەر هیلاکی زۆر قاچ و ئەژنۆکانم دەلەرزن.

کالوویی هێشتا زەق زەق لە ئێمەی دەڕوانی، زیاتر لە چەند چرکەیەك سەیری نەکردین بەڵام بۆ من چەند ساڵ بوو سینگوالا هەستی بەگوومانی ئەو کرد. مەکری ژنانەی گەیاندە ترۆپك و خۆی خستە سەر زەوی و قورە قور دەستی بەگریان کرد. دڵۆپە روونەکانی فرمێسك لە چاوە جوانەکانی جیادەبوونەوە و لەسەر کوڵمەکانی تلیان دەخوارد. لەم کاتەدا کەسینگوالا خۆی لەناو خۆڵدا خستبوو و دەگریا و قاچی خۆی بەرزکردبوویەوە، بەدەم ناڵەوە ووتی:

ئاخ کالوویی... چەند بێ ڕەحم بوویت، بۆ یارمەتیم نادەیت. ئەم پیاوە هیلاك بووە. زووکە... خێراکە. کالوویی یەکسەر هەرچی گوومانی هەبوو فڕیدا، هاتە پێش، تفەنگەکەی دایە دەستم و خۆی سینگوالای خستە سەر دوودەست و بەڕێکەوت و منیش بەدوایاندا بە دووری دوو هەنگاو بەڕێکەوتم.

کالوویی وەك ئەوەی بێچووە پشیلەیەکی لەباوەش گرتبێت دەڕۆشت و سەرولێژی توند و مەترسیداری کێوی دەبڕی و بەجێی دەهێشت. دەبووایە بگەشتینایەتە لووتکە و لەوێوە سەرەو خوار بووینایەتەوە بۆ کانی.

سینگوالا سەری خۆی لەسەر بازوی راستی کالوویی هێنابووە دواوە و دەگریا، بەڵام کاتێك لەچاوەکانیم ڕوانی، بەنیگا بە من پێدەکەنی، لەو هەموو زیرەکی و وشیارییەی ئەو سەرم سورما و پێکەنیم، و چاوێکی داگرت و بێدەنگی کردم.

سینگوالا بە ئاسوودەیی تەواو لەسەر دەستی کالوویی خەوتبوو. سەرو لێژی کێوی بێ دژواری بڕی. لەو هەموو مەکرە سەرم سورمابوو بەڵام سەرسوڕمانم زیاتر بوو کاتێك بینیم سینگوالا بە هێواشی لە پشت سەری کالوویی دەستی خۆی بۆ من کردەوە و من لەبەری دەستیدا دو قونچکە سیگارەکەم دی. تازە تێگەشتم بۆ سینگوالا لەوێ خۆیدا بە ئەرزدا و گریا. گریانی ئەو بۆ باوەڕهێنانی کالوویی و خۆ بە ئەرزدانی بە مەبەستی هەڵگرتنەوەی قونچکە سیگارەکان بووە. ئەگەر کالوویی قونچکە سیگارەکانی لەوێ دەبینی، بە هیچ جۆرێك بەتایبەت لەمن خۆش نەدەبوو و دەست بەجێ دڵمی بە خەنجەرەکە کون کون دەکرد.

لە مەترسییەکی گەورە رزگارم بوو و لە شوکرانەی ئەم ڕوداوە کە بە خێر گوزەرا سوێندم خوارد لەمە بەدوا ئاگاداری خۆم بم و تا ڕۆژێك لای ئەوانم ڕووی خۆش نیشانی سینگوالا نەدەم. ڕەنگە ئەو چاو لە من بپۆشێت بەڵام ئایا ئەمە ئەگەری بوو؟

چەند خولەك دواتر گەشتینە سەر کانی... کەبابی کەڵەکێوی و شەرابمان خوارد و بەڕێکەوتین. کاتی خواردن من و کالوویی و یوری قسەمان دەکرد، پێدەکەنین، بەڵام هەوڵم دەدا سەیری سینگوالا نەکەم.

ئەو تووڕە دەهاتە بەرچاو. لەوەی من لەیەك دو کاتژمێری رابردوودا قسەم لەگەڵدا نەکردبوو و بە درۆ لەحاڵیم نەپرسیبوو، تووڕە بوو. بە تووڕەیی پاڵی بە تفەنگەکەی دابوو و بە ڕێگادا دەڕۆشت و وای نیشان دەدا کوترانی مەچەکی پێی بەڕۆشتن و گەرم کردن نەرم کردووە و ئازارەکەی لادەبات.

کاتێ بەرێکەوتین، کالوویی لەسەر زین داینیشاند و یوری راسپارد ئاگاداری ئەسپەکەی بێت.

رێپێوانی ئێمە تا نزیك ئێوارێ و کاتێك زەردی خۆر لە سەر بەرزترین خاڵی کێوەکە دیار نەما، لەدوور رووناکی چرایەك لەسەر کێوەکە هات بەرچاو و چارەکێك دواتر بەگوندەکە کە ماڵێکی داری کوێستانی تا رادەیەك گەورەبوو، گەشتین.

کالوویی سەرەتا ماڵەکەی خۆی نیشان داین. ماڵێك بوو لە دار و بەرد دروست کرابوو، دو ژوور و ئەمبارێك بوو بەڵام ژوورەکان بێ دەرگا و بە پەردە لەیەکتر جیاکرابوونەوە.

کالوویی یەکێك لە ژوورەکانی دا بە من کە لەماوەی مانەوەی ٣ تا ٤ رۆژیماندا لەوێ بژیم. لێم پرسی: یوری دێتە لای من؟ کالوویی وتی: ئەو دەڕواتە لای پیاوانی من و تازە تێگەشتم کە لە پشت تەپۆڵکەکە خانووی تریش هەیە کە ١١ پیاوەکەی ئەو کە بە گشتی لە دزە خوێنخۆرە ناودارەکانن، لەو خانوانەدا ژیان بەسەر دەبەن بێجگە لەو خانووانە، ئەمبارێکی گەورەیان لەوێ دروست کردبوو کە دەسکەوت و تالآنیەکانیان تیا دادەناو لەبەرئەوەی لەناویاندا ئاسایش و هاوڕێیەتی تەواو جێگیر بوو، بۆ ئەمبارکە کەزیاتر لە ١ ملیۆن دۆلار شتی بەنرخی تیا کەڵەکە کرابوو، دەرگایان دروست نەکردبوو. ئەمەش یەکێك لەوشتە سەرسورهێنەرانەی کە دزەکان لەناوخۆیاندا ئارەزومەندی ئاسایشن و رێزی لێدەگرن.

من بەبیانوی ماندوویی مۆڵەتم وەرگرت بخەوم بەڵام کالوویی وتی:

زوو هەستەو لە جەژنی ئەم شەوی ئێمەدا بەشداری بکە. هاوڕێکان کۆدەبنەوە و شەڕاب دەخۆن و بەیانی زوو بۆ ئەنجامدانی کار دەڕۆن تا هەفتە تا ١٠ رۆژی تر ناگەڕێنەوە. تەنیا کاتێك دەگەڕێنەوە کە پارە و سامانی زۆریان لەگەڵدا بێت.

دواتر قاقایەکی بەرزی کێشاو وتی:

وادیارە کاروبارمان خراپ نییە. ئەم ئەمبارە کە دەیبینی هی هەموومانە.

لەو ئەمبارەدا شتی زۆر هەیە بەڵام بە هیچ جۆرێك کەڵکی لێوەرناگیرێت. هەرشتێکی تیایە بۆ رۆژی تەنگانە بەکار دەهێنرێت.

من بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: رۆژی تەنگانە کامەیە؟

وتی: بۆ نمونە یەکێك لە ئێمە دەستگیر دەکرێت. ئەوانیتر دەست بەجێ دەست بە چالاکی دەکەن و ئەوەندە لەسەرمایەی گشتی یانی کەل وپەلی هەنبار خەرج دەکەن،

بەرتیل دەدەن، میوانی ڕێك دەخەن و میوانداری ئەفسەرو دادوەرەکان دەکەن تا سەرئەنجام ئەو کەسە کەهاوڕێی ئیمەیە، ئازاد دەکرێت و چوونکە بەرتیل لە هەموو شوێنێك چەکێکی کاریگەرە، ئێمە هەمیشە لە ئەنجامی کارەکەمان سەرکەوتووین.

دوای ئەم وتووێژانە کالوویی بەڵێنی لێ سەندم پێش نیوە شەو لەخەو هەستم و لە رابواردنی ئەواندا ئامادەبم. دواتر هاوڕێ لەگەڵ سینگوالا لە ماڵەکە رۆشتنە دەرو لەوێ دورکەوتنەوە. من یوریم راسپارد لەبەردەم دەرگا دابنیشێت و ئاگادار بێت. چاودێری کردنی من هۆیەکی تری جگە لە ترس لە کالوویی و دزەکانیتر نەبوو. پەرێشانی خەیاڵی من بۆ ئەوە بوو نەوەك سینگوالا دوای خواردنی چەند پیاڵە شەڕاب بێت و رسوایی بەبار بێنێت و لە ئەنجامدا گیانی من لەدەست بڕوات.

یوری بەڵێنی پێدام ئاگادار بێت و ئەگەر سینگوالا لە دوورەوە دەرکەوێت، بێدارم بکاتەوە. بەم دڵنیاییە خەوتم بەڵام خەوم لێ نەدەکەوت. ترسێکی سەیر دەیلەرزاندم. چاوەڕوانی روداوی مەترسیدارم دەکرد. لە بیرێکی دووروودرێژدا نوقم بووم و بەتێپەڕبوونی کات، خولەکەکان و کاتژمێرەکان گوێم نەدەدا. هیلاك نەبووم. پێویستم بە خەویش نەبوو بەڵام بۆ ئەوەی لەگەڵ سینگوالا نەبم لە مردن رزگارم بێت هیلاکیم کردبووە بیانو و لەژوورەکەمدا مامەوە بێ ئاگا لەوەی بیانو هێنانەوە و مانەوە لە ژوورەکە زیاتر گوومانی کالوویی دەبزوێنێت. نەمزانی یوری خەوتبوو یان بەئاگایە بەڵام هەرچی بوو هەستی بە سینگوالا نەکرد و کاتێك ئەوم بینی کار لەکار ترازابوو و سینگوالا مەست و خەرامان هاتە ژوورە بێ دەرگا و پەنجەرەکەی من. بە ترسەوە لە شوێنەکەم هەستام و ووتم:

سینگوالا چی دەکەیت زۆر مەترسیدارە... کالوویی

سینگوالا وەك شێری مێچکەی مەست کە شێری نێر لە چنگی رادەکات و پەنا بۆ قامیشەڵان دەبات خۆی لە من نزیك کردەوە ووتی:

دەترسیت... لە کێ دەترسیت لە کالوویی..... ها..... ئەو وەك دێوی درندە وایە. هەیکەلی گەورەیە بەڵام بێ ئەندازە خاڵییە و لەسەریشدا مێشکی تەواو بوونی نییە. وەك منالێ بیردەکاتەوە....

خۆ نابێت لەو بترسیت.

و دواتر تفی دەمی کە لەبەر مەستی زۆر وشك ببوو بە دژواری قووت داو ووتی:

گوێبگرە، مەگەر بەڵێنت پێ نەدام فەرمانبەریم بکەیت..... قسە مەکە

لەو ساتانەی کە من و سینگوالا لە تاریکی ژوورەکەمدا سەرقاڵی قسەکردن بووین، کتوپڕ لە دەرگای دەرەوەی ژوورەکە دەنگی یوری بیسترا.

من بە بیستنی ئەم دەنگە کە نیشانەی راگەیاندنی مەترسی بوو وەك تەرەقە کە لەسەر ئاگر دایدەنێن لە شوێنەکەم هەستام و هەوڵمدا لە پەنجەرەکەوە رابکەم چوونکە لەم کاتەدا دەنگی ترسێنەری کالوویی بیسترا کە ووتی:

بەدبەختی خاین... بووەستە، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ ئەو رۆژە منتان هەڵخەڵەتان، ئێستا چی دەڵێن؟

لەترسا لە شوێنەکەی خۆم چەقیبووم و هەرچی چێژم بردبوو وەك دەرزییەك کە لە ژێر نینۆکی دەکەن یان دەری دێنن لە دڵ و جەستە و ڕۆحم دەرچوو و جێگەی خۆی بە بەئازارترین پەشیمانییەکانی دەورانی ژیانی مرۆڤ بەخشی.

مەرگم لە پێش چاوی خۆم دی و نەمدەوێرا سەرم بسوڕێنم. کالوویی بەهەمان شێوە کە دەمانچەکەی لە دەستا گرتبوو بە دەستەکەی تر شقارتەی لێداو چرای نەوتی ژوورەکەی داگیرساند.

کاتێك ژوورەکە رۆشن بوو سینگوالام بینی لەترسا خۆی کۆکردۆتەوە و توانای هەستان و تەنانەت جوڵانی نییە.

لەوکاتەدا بە خۆمم ووت ئەم ژنە مەگەر ئەوە نەبوو دەیوت کالوویی بووکەڵەی دەستی منە، ئەی ئێستا بۆ وا ترساوە کالوویی لە تووڕەیی زۆر ددانەکانی گیر دەکرد. چاوەکانی لە تووڕەیی و مەستی شەڕاب ببوون بە دوو کاسەی پڕ خوێن. لەقەیەکی بەهێزی لە قولاپەی سینگوالا دا و وتی:

هەستە بەدبەختی نانەجیب، هەستە، حەیف بۆ خۆم فریوی تۆم خوارد. هەستە، سەرەتا مەرگی خۆشەویستەکەت ببینە و دواتر خۆت وەك سەگ بمرە. سینگوالا هەستاو لە سووچێکی ژوورەکە وەك پەیکەرێك لەمەرمەری سپی وەستا.

کالوویی ددانەکانی خۆی گیر کردو خەنجەرەکەی لە کەمەر دەرهێناو بەرەولای من هات.

تیغی خەنجەر وەك ئاوێنە دەدرەوشایەوە. بەخۆمم وت: خوایە دەبێت لێرەو لەم خانە لە دنیادا بمرم. ئەم تیغە تیژە لە دڵمدا رۆچێت. چەند هیوا و ئارەزو لە دڵمدا هەیە. هەموو ئەم هیوایانە دەبێت لەگەڵ خۆمدا ببەمە گۆڕ. مردن گەشتبووە یەك هەنگاویم .لەوساتەدا هیچ هیوایەکم بەڕزگاری نەبوو مەگەر ئەوەی موعجیزەیەك ڕوو

بدات، ئەویش ئەگەری نەبوو.

لەم جۆرە ڕووداوە مەترسیدارانەدا، موعجیزەیەك ئەویش بروسکە ئاسا دەتوانێت مرۆڤ لە مەترسی مردن ڕزگار بکات. ئایا ئاوا موعجیزەیەك ڕوی دەدا.

هەرگیز.. ڕزگاری تەنیایەك ساتی کورت منی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد و زۆر زو لێی هیوابڕاو بووم چوونکە کالوویی وەك ئاژەڵێکی دڕندە نزیك دەبوویەوە و منیش هەنگاو هەنگاو دەڕۆشتمە دوا.

ئارەزوومەند بووم کالوویی کەمێك عاقڵتر بووایە و ڕاستییەکەی لە زمانی منەوە دەبیست و داوەری دەکرد و ڕازی دەبوو. ئەمە گەورەترین بەختەوەری من بوو. بەڵام بەداخەوە کالوویی پیاوی قسە نەبوو و ئەگەر قسەیشم بکردایە ئەو نەیدەبیست. لە گووللە زیاتر وەڵامی نەدەدایەوە. چاوم بڕیبووە دەستی کالوویی چوونکە چاوەڕوانی ئەوە بووم دەستی بباتە سەرو دەمانچە کەمەرییەکەی خۆی دەربێنێت و سینەی و دڵی من کون کون بکات.

ئەم چاوەڕوانییە زۆری نەخایاند و دەستی کالوویی هاتەسەر و دەسکی سیلاحەکەی گرت.

زمانم لەترسا وستابوو. ئەو کاتەی بەرانبەرم وەستا و ویستی بمکوژێت هەزاران دیمەن لەبەر چاومدا وێنەکران. گۆڕی خۆم دەبینی کە لەم کوێستانە دوورەدایەو دەستی من لەگۆڕەکە هاتۆتە دەر و لە ڕێبوواران، لەو خەڵکانەی وەك کالوویی ویژدان و عەقڵیان نییە دەپاڕێتەوە کە پەیامەکەم بگەیەنە دایکم.

بەڕاستی گۆڕی خۆم بە چاوی خۆم دەبینی. بەتایبەت دەستم کە لە گۆڕەکە هاتبووەدەر. ئەولاتر خۆم بەڕزگار بوو دەهاتە بەرچاو. ئاه چەندە بەختەوەربووم لەم مەترسییە ڕزگارم ببوو لەگەڵ سینگوالا ڕامان دەکرد.

لەو کاتەدا خۆم سەرکۆنە دەکردو بەخۆمم دەوت: ئەی بەدبەخت ئێستاش سینگوالا لەبیرناکەیت وازی لێ بێنە.

هەمووی ئەم دیمەن و بیرانە بەخێرایی بروسکە و تەنیا چەند ساتێکی زۆر کورت مێشکی منیان سەرقاڵ کرد و بە خێرایی لەناوچوون چوونکە مەرگ نزیك ببوویەوە.

دەنگی وەحشیانەی کالوویی دەبیسترا کە دەیوت:

بەدبەخت خیانەت لە من دەکەیت و هاوسەرەکەم هەڵدەخەڵەتێنی... دەتوانی حاشای لێبکەیت؟

دەنگی کالوویی بەڕاستی ترسئەنگێزبوو و دەبووایە دوایین وزەی بەرگری لە من بسەندایە بەڵام نازانم چی بوو و چۆن بوو لەخۆمدا هەستم بە ئازایەتی کرد و بڕیارمدا لانی کەم بە زمان بەرگری لەخۆم بکەم پێش ئەوەی دەمم بۆ قسەکردن بکەمەوە دەنگی سینگوالا دەبیسترا کە دەیوت:

گوێ دەگریت؟ باوەڕ بەقسەی من دەکەیت؟

خەفەبە خاین..... بێدەنگ بە بێ حەیا.

دواتر قاچی بەرزکردەوە کە لەقەیەکی بەهێز لە سکی سینگوالا کە هێشتا لەسەر زەوی بوو بدات بەڵام قاچی خۆی لەسەر سکی ئەو ژنە جوانە نەهێنایە خوار و بەهێواشی لەجێگای خۆی داینایەوە و سەرنجی بۆ لای من ڕاکێشرایەوە بەم جووڵەیە تێگەشتم لەگەڵ ئەمەشدا کالوویی سینگوالای خۆش دەوێت و هێشتا قسەی دەتوانێت کاریگەر بێت. دوبارە دەنگی سینگوالا دەبیسترا کە دەیوت:

تۆ دەتوانیت هێشتا باوەڕت بە قسەکانی من هەبێت چوونکە ناتوانیت حاشات لەوەبێت کە هێشتا خۆشم دەوێت. کالوویی ئەم جارەش قیژاندی بەڵام دەنگی لەسەر خۆتر لە جاری پێشو بوو.

سینگوالا وەك ئەوەی ڕوداوێکی گرنگ ڕووی نەدابێت بە ئارامی تەواو لە سەرزەوی ڕاکشاو ووتی:

بقیژێنە..... دەتوانیت لە منیش بەیت بەڵام دەبێت گوێ لە قسەکانم بگریت.

و دواتر بێ ئەوەی چاوەڕوانی ڕەزامەندی کالوویی بێت ووتی:

ئەو بێ گوناحە، تاوانی منە. جیاواز لەوەیش ئەوەندە نییە لای تۆوە هاتووم. دەتوانێت بیربکەیتەوە لەم ماوە کەمەدا خیانەتم لێ کردبێتیت. بەڵێ؟

قسەبکە، لە دە چرکە، یەك خولەك، شیاوی ڕازی بوونە. هیچ پیاوێك باوەڕ دەکات مەگەر ئەوەی وەك تۆ مەست یا شێت بێت.

قسەکانی سینگوالا کەمێك لە توندی و تووڕەیی کالوویی کەم کردەوە و لە ئەنجامدا کالوویی دەمانچەکەی خستەوە بەرگەکەی لەم کاتەدا سینگوالا بە زمانی ناوچەیی ووتی: من مەبەستم هەیە. تۆ چەندە ئەحمەقیت؟

کالوویی بەخێرایی پرسی.

چ مەبەستێکت هەیە..... درۆ دەکەیت.

کالوویی وای دەزانی من لە زمانی ئەوان نازانم و لەم بابەتە شادمان بوو بەڵام

سینگوالا لە ڕووی چرچەکانی ناوچاوم کە کەم کەم دەکرایەوە تێگەشت کە من لە زمانی ئەوان تێدەگەم. کالوویی بە زمانی خۆیان ووتی:

تۆ دەتەوێت هەڵم خەڵەتێنیت !

سینگوالا تەکانێکی بەخۆی دا، لە شوێنەکەی هەستاو ووتی:

بووە تا ئێستا هەڵم خەڵەتاندبێتی. دەزانی چییە. گەنج لە ئارادایە. دەبێت بە فێڵ قسەی لێ بکێشینەوە. ئەم درۆ سەیرو پێکەنیناوییە، سینگوالا بەکەڵك وەرگرتن لە خاڵی لاوازی کالوویی دروستی کرد و ووتی. سەریشی گرت چوونکە کالویی بێ درەنگ بزەیەکی گرت و ووتی: ئەگەر درۆت کردبێت؟

من بکوژە و ئەم ئەمریکاییە ئەحمەقەش وەك سەگ بکوژە.

سینگوالا بۆ ئەوەی بابەتەکە بە ئاسایی لەقەڵەم بدات، درۆی کرد و جنێویشی بە من داو چەند جار منی بە ئەحمەق و بەدبەخت ناوزەدکرد. بەڵام من بەڕووی خۆمدا نەهێنا کە لە زمانیان دەگەم، جیاواز لەوەش هەرچی دەووت لە مردن باشتر بوو.

کالوویی ساتێك بیری کردەوە و دواتر زەق زەق لە چاوەکانی منی ڕووانی و ئەوسا ووتی: من دەبێت لەم گەنجە تۆڵە بستێنمەوە. هەرچیت ووت قبووڵ بەڵام دەبێت قامچی لێدەم.

سینگوالا بیری کردەوە و وەڵامی دایەوە. من مەبەستەکەی لەو وەڵامەی دایەوە، تێگەشتم. ئەو لای خۆی وای دانابوو کالوویی بۆیە باسی قامچی لێدان دەکات کە لەراستی حەزی سینگوالا بەرانبەر بەمن ئاگادار بێت. ئاساییە کە هیچ ژنێك ئامادەنییە خۆشەویستەکەی قامچی و تێهەڵدان بخوات. کالویش دەیویست تێ بگات ئایا سینگوالا بەرگری لە من دەکات یان نە. سینگوالا نیگایەکی پڕ مانای لە من کردو و لە کاتێکا شانەکانی خۆی بەنیشانەی گوێنەدان بەرزکردەوە ووتی:

لێرە، قامچی بۆ ئەمریکاییە بەرەڵاو خۆش ڕابووێرەکان پێویستە. ئەو دەبێت تامی قامچی کالوویی بچێژێت.

بێ ئەوە قیافەی خۆم لە بیستنی ئەم بابەتە ترس ئەنگێزانە بگۆڕم گوێم لێ دەگرتن و هەوڵم دەدا تا ئەو شوێنەی دەکرێت گوێی پێ نەدەم. کالوویی دوای بیستنی وەڵامی سینگوالا قانیع نەبوو و بۆئەوەی لە کردەوە دا ڕاستی و دروستی بۆ بسەلمێنێت دەستوری دا قامچی بێنن.

دەستوری هێنانی قامچی بە ئینگلیزی و بەتایبەت بە جۆرێك ووتی من بترسم و

ناڕەحەت بم. یوری داماو کە چەند لەقەیەکی بەهێز بەر سەری کەوتبوو، لە ڕێڕەوەکەدا کەوتبوو و دەیناڵاند.

یەکێکیتر لە دزەکان بەقامچییەکی بەرز کەسێ مەتر درێژی بوو و وەك مار لەبازوی خۆی ئاڵاندبوو، هاتە سەر سەری من. سینگوالا لەو لاوە وەستابوو ، پێدەکەنی. من تێگەشتم ئاخی چەند پەرێشانە. لەو دوو دانیشتنەدا و لە هەر دانیشتنێك دوو سێ خولەك ووت وێژ لەگەڵ سینگوالا تێی گەیشتم کە منی خۆش دەوێت و بۆ ئێستا کە دەیبینی بێ بەزییانە قامچیم لێ دەدەن ناڕەحەت دەبوو بەڵام بەڕووی خۆیدا نەدەهێنا و پێدەکەنی. قامچی خواردنی من دەستی پێکرد. کالوویی لەولا وەستابوو و دەستی لەکەمەردا بوو و سەیری منی دەکرد. دزەکانی تریش لە من کۆ ببوونەوە و سەیری قامچی خواردنی منیان دەکرد.

قامچی لێدان لەناو ئەواندا ڕێ و ڕەسمی تایبەتی هەیە. بەهەر قامچیەك کە بەر پشتی من دەکەوت و وەك برینی شمشێر پێست و گۆشتی جەستەمی دەدڕی و ئاگری دەدا ئەوان پێکەوە دەیانوت ( ئاه ) ( ئاه ) و ئەم ( ئاه ) دەنگێکی تایبەت بوو کە قامچی وەشێن لێدانەکانی خۆی بەپێی ئەو ئاوازە ڕێك دەخست.

لەلایەکیتر تا کاتێك کالوویی دەستی لە کەمەردا بوو لێیان دەدام و تەنیا کاتێك دەستی لە کەمەری هەڵگرتایە لێدانی من کۆتایی دەهات.

ئەمانە بابەتێك بووم دواتر یوری بۆی باس کردم.

بەرگەی ئازاری قامچیەکانی سەرەتام گرت بەڵام قامچی پێنجەم و شەشەم بەڕاستی بێزارکەر بوو. ئەوەندەی نەمابوو بقیژێنم و بپاڕێمەوە. زۆرم لەخۆم کرد نەناڵێنم بەڵام ئازار ئەوەندە زۆربوو تاقەتم نەما. جارێك سەرم بەرزکردەوە و بەڕێکەوت چاوم بە ڕووخساری سینگوالا کەوت. ئەو بە جووڵەیەکی خێرایی لێو و چاو تێی گەیاندم دەبێت خۆڕاگری بکەم و ئەگەر نیگای ئەو بەو شێوەیە کاریگەری لەسەرم دانەنایە، ڕەنگە بمناڵاندایە و بپاڕامایێیەتەوە.

قامچی لەسەر گۆشتی جەستەم دادەنیشت و لە شوێنەکەی خوێن دەهاتەدەر. بە جوانی هەستم بە دڵۆپە گەرمەکانی خوێن دەکرد کە لە پشت سینەمەوە دەهاتەدەر. تا سی یان سی و دوو قامچیم بیرە و دواتر نەمزانی چی بوو؟ کەم کەم دنیا بە دەوری سەرم دەسوڕا، بەرچاوم تاریك و لەهۆش خۆم چووم.

کاتێك چاوم کردەوە خۆم لە ئاخوری ئەسپەکان بینی. لەولا ئەسپەکانیان

بەستبوویەوە و لەملا منیان لەسەر تەختەیەکی پان و بە جەستەیەکی بریندار فڕێدابوو و خۆیان ڕۆشتبوون. بە خۆشحاڵییەوە یوری لام بوو و لەگەڵ ئەوەی خۆی لە ئازاری لەقەکانی کالوویی دەینالاند و نەیدەتوانی بە جوانی دەست و قاچی بجوڵێنێت، دەست و قاچی منی دەشێلا تا بێمەوە هۆش.

یوری بە بڕێك ئاو کە لەناو سەتڵی ئەسپەکاندا بوو، برینەکانی پشت و سینەی شۆردم.دواتر کراسەکەی خۆی دڕاند و برینەکانی بەست. لەگەڵ ئەوەی ئاوی سەتڵەکە پیس و پارچەیەکی وشکی بێ دەرمان و چەوری لەسەر برینەکانم بەسترابوو، کەمێك لە توندی ئازار و سووتانەکەی کەم کردەوە و چەند خولەکێك ئاسوودە خەوتم. لێرەشدا یوری ئەوپەڕی خۆشەویستی لەگەڵدا نواندم. سەرمی لەسەر ئەژنۆی دانا تا ژێر سەرم نەرم بێت و بتوانم بخەوم. ئەو شەوە تێپەڕی. بەیانی کالوویی خۆی هات و ووتی:

ئامادەبە..... دەمەوێت لە دارت بەم. خیانەتی تۆ بۆ من سەلمێنراوە. ئەو ڕۆشت. دوای ڕۆشتنی ئەو بڕێك گۆشتی کوڵاو و نانیان بە من و یوری داو لەسەر پەینەکان وێڵیان کردین و ڕۆشتن.

یوری بە ڕووی کراوەی خۆی بە منی ووت:

کالوویی دوێنێ شەو چاوی لە تاوانەکەتان پۆشی بەڵام ئەمڕۆ کەسانیتر دەیبزوێنن. و ئەم بزوانانەش بێ مەترسی نییە. دەبێت کارێك بکەین.

چی دەتوانین بکەین؟

هەڵاتن !

لەبارەی چۆنیەتی هەڵاتن و چۆنیەتی ئەنجام دانی و چۆنیەتی ڕاکردن و دوور کەوتنەوە لەوێ من و یوری زۆرمان قسەکرد و کە بینیمان بەبێ سیلاح و پارە و شتە پێویستیەکانی تر ئەگەری ڕاکردنمان نییە، کاتی شەو کۆتایمان بە وتووێژەکانمان هێنا.

کاتێك هەوا تاریك بوو جارێکیتر دەنگی قیژە و پێکەنینی مەستانەی کالوویی و هاوڕێکانی دەبیسترا. یوری لای پەنجەرەی تەویلەکە وەستابوو و سەیری دەرەوەی دەکرد و لەم کاتەدا بەپەلە هاتە لای من ووتی:

گەورەم ئەوان سەرقاڵی بەرزکردنەوەی دارەکانن.

من بەیارمەتی یوری لە شوێنەکەی خۆمدا هەستام. خۆم گەیاندە پەنجەرەکە و سەیری دەرەوەم کرد لەو پەڕی سەرسوڕماندا بینیم دوو داریان لای یەك بەرز کردۆتەوە

و لەو کاتەدا تەنافەکانی بەهێز دەکەن و گرێی لێ دەدەن.

بە بینینی ئەم دیمەنە نزیك بوو بێهۆش ببمەوە. بەڵام یوری ژێر بازوەکانی گرتم. هەردووکمان لەسەر زەوی دانیشتین و کەوتینە بیرکردنەوە.

بێدەنگی و تاریکی هەموو شوێنێکی داگرتبوو، لەناکاو هەستم کرد کەسێك لە پەنجەرەی تەویلەکە پەڕییە ناوەوە. هەردووکمان ترساین و لەشوێنەکەماندا هەستاین بەڵام تازە هاتوو کێشان کێشان خۆی گەیاندە ئێمە و ووتی:

مەترسن، مەترسن، بێدەنگ بن.

ئەمە دەنگی سینگوالا بوو. سینگوالا بێ ئەوەی قسەمان لەگەڵدا بکات لە تاریکی شەودا سەرقاڵی زین کردنی ئەسپەکان بوو و دوای ئەوەی بەخێرایی دوو ئەسپی زین کرد ووتی: دوو تفەنگ و کەل و پەلی پێویستم لە پشت ئەو تەپۆڵکەی کە لای خۆرئاوایە داناوە، خێرا سواربن و ڕاکەن و دوای گەشتن بە تەپۆڵکە تفەنگ و کەل و پەلەکانی سەفەر هەڵبگرن و بەرە و باشوری خۆرهەڵات بڕۆن. شەو بڕۆن و ڕۆژ بحەوێنەوە. خێراکەن.

من لەوکاتەی لە سینگوالا زیاد لە ڕادە توورەببووم و هەمووی ئەم بەدبەختیانەم بە عەشق یان هەوەسە شێتەکانی ئەو دەزانی، دەستخۆشیم لە ئازایەتی و لەخۆبووردنی ئەو کرد.

دڵنیابووم کالوویی بەرانبەر بە سینگوالا سەخت گیرییەکی ئاسایی هەبووە. ئێستا سینگوالا خۆی بە ئێمە گەیاندووە و هۆکارەکانی ڕاکردنمانی ئامادەکردوە، ئاشکرایە ئەم کارانەی ئازادانە ئەنجام نەداوە و لای مێردەکەی ڕایکردووە و گیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە تا هۆکارەکانی ڕزگاری ئێمە ئامادە بکات.

سینگوالا پەلەی بوو کە ئێمە زووتر سواربین و لەوێ دووربکەوینەوە بەڵام دەمویست کامێرای وێنەگرتن و تفەنگ و کەرەستەکانی ترم لەگەڵ خۆمدا ببەم.

لەوێ دوورکەوتینەوە و گەشتینە تەپۆڵکەکە. یوری شتەکانی دۆزییەوە. یەکێك لە تفەنگەکانی دا بە من و تفەنگێکی تری کردە شانی خۆی. دوای ئەوە بووخچەیەك کە مابوو کردییە قۆڵی و وەك هەڵۆ پەڕیەی سەر ئەسپەکە و بێ ئەوەی قسەم لەگەڵدا بکات بەڕێکەوت. ئەگەر بەهەمان شێوە کە ئەم مەودامان بڕیبوو بە ئەسپ غارمان بدایە ئارەقمان نەدەکردەوە بەڵام بەدبەختانە ئەو چەند ساتە وەستان بۆ هەڵگرتنی تفەنگ و پێویستیەکانی تر بووە هۆی ئارەقێکی سارد وکراسە دڕاوەکەم بە پشت و سکمەوە

لکا.

دڵۆپە سوێرو تاڵەکانی ئارەق وەك ئاو وخوێ کە لە برینی بسوون دەڕۆشتە ناو قڵشە خوێناوییەکان کە قامچی لەپشت و سکی مندا دروستیان کردبوو و دەیسوتانەوە.

چ سوتانێکی گیان بڕو کوشەندە بوو ! هێشتا ئەو هەموو ئازارو بەدبەختیەم لەبیر نەکردووە و ساڵیانیش لەیادی ناکەم. مرۆڤ دەبێت گیرۆدەی ئاوا حاڵەتێك بێت تا بزانێت بەدبەختی ئێمە چەندە گەورەو لەوەیش خراپتر، سووتانەوەی برینەکانی من تا چەندە گیانبڕو بێزارکەربوو.

شوێنەواری قامچی و برینە خوێناوییەکانی پشتم ئەوەندە دەسوتا دەمویست بقیژێنم و خۆم لەسەر ئەسپەکە فڕێدەم و پشت و سکم لە خۆڵی بیابان بسووم. ڕەنگە کەمێك ئارام ببمەوە بەڵام چۆن شتی وا ئەگەری بوو و لەوەیش گرنگتر لە کوێوە بزانم باشتر دەبم.

ئەسپ لە تاریکیدا دەڕۆشتە پێش و منیش لەسەری دەمناڵاند. یوری دەنگی ناڵەی منی بیست و لە هۆکەی پرسی و من بەکورتی باسی ئازارەکانم بۆ کرد.

کتوپڕ یوری جڵەوی ئەسپەکەی کێشا و وەستا. منیش وەستام. ئەوەندە ناڕەحەت بووم کە لێم پرسی بۆ دابەزیت ئێستا کاتی وەستان نییە.

ئەو ڕۆشتە ژێر سکی ئەسپەکە. کڵاوەکەی خۆی گرت و نازانم چی کرد ئەسپەکە میزی کرد. دەستوری پێدام رووت ببمەوە و من کەنەمدەزانی ئەو دەیەوێت چی بکات رووت بوومەوە. ئەو میزە گەرم و بۆگەنەی لە برینەکەی من سوو.

بیهێنە بەرچاو من لەبەر ئازاری زۆر ئامادەی ئاوا دەرمان کردنێکی ئەحمەقانە بووم. کاتێك یوری میزی ئەسپەکەی لەپشتم دەسوو، سووتاندی برینەکانی من زیاتر بوو بە شێوەیەك هاوارم بەرزبوویەوە. ئەگەر کەسێك لەو دەوروبەرەدا بووایە تا چەند سەد مەتری دەنگی هاواری دەبیستم.

لە هەمان کاتدا بەتووڕەیی ووتم:

بەدبەخت ئەمە چ کارێك بوو کردت؟ سووتام..... تۆ منت کوشت...

یوری دەستی لەسەر شانم داو ووتی:

خێرا کراسەکەتان لەبەرکەن. خێراکەن. ئەم ئازارە کاتییە و تا چەند خولەکی تر ئارام دەبێتەوە. لە بیاباندا ئەمە تەنیا دەرمانێك بۆ چارەسەر و دەرمانی برینە. من زیاتر لەسەد جار برینەکانی خۆم و کەسانیترم بەم شێوەیە دەرمان کردووە و ئازارەکانیانم

کەم کردۆتەوە ، خێراکەن.

ئەمەی ووت و لە لەبەرکردنی کراس و بەستنی فیشەك بەندەکەم یارمەتی دام. تازە تێدەگەشتم ژیان لە بیابان یانی چی و ئێمە چەندە ناسك و ناز پەروەردە بار هاتووین و شارو شارستانیەت تا چ رادەیەك بێ بەرگری پەروەردەی کردوین. ئەوان یانی کەسانی وەك کالوویی و یوری و پیاوانی وەك ئەو بەڕاستی دەژین و زیندوون کە لەگەڵ ئازار و دژوارییەکانی بێ خەستەخانەو دەرمان خانەو پزیشك و جەراح ڕووبەڕو دەبنەوە و بەهێزی راستەقینە نەخۆشیەکان دەبەزێنن و لەناوی دەبەن. خولەکێك دواتر لەرێگا دابووین و ئەسپەکان کە کەمێك حەوابوونەوە سات بەسات خێرایی خۆیان زیاد دەکرد و لەبەرئەوەی جادە تەخت بوو، بەخێرایی دەڕۆشتن. وەك یوری وتبووی ئازارێکی زۆر کە لە ماڵینی میزی ئەسپەکان بە برینەکانی پشتم دروست ببوو، زۆر خێرا رەنگە کەمتر لە ٢ یان ٣ خولەك دا نەماو ئارامشێکی چێژبەخش دوای ئەو هەموو سووتانەوە کوشەندەیە لە مندا پەیدابوو کە چێژەکەی هیچ کات لەبیرناکەم. بۆ ئەوەی رێزی لەش ساغی و تەندروستی بگرین. دەبێت ئازارێکی بێ دەرد و دەرمانمان گرتبێت و لەوپەڕی بێ هیوایدا بناڵێنین و ئەو کات کە ئازار ئۆقرەی گرت بۆ بەدەست هێنانەوەی سەلامەتی شوکور گوزار بین. ئەمەیش وانەیەك بوو یوری و سوتانەوەی برینەکان فێریان کردم و ڕەنگە هیچ مامۆستا و قوتابخانەیەك نەیدەتوانی ئەم وانە بەکەڵکەم فێربکات.

## ٣

ئەو شەوە تا بەرەبەیان غارماندا و بەبێ وەستان رۆشتینە پێش. کاتێك خۆرهەڵاتی ئاسمان زیوی رەنگ بوو، یوری جڵەوی ئەسپەکەی راکێشا و وەستا. منیش بەدوای ئەودا وەستام.

یوری ووتی: دیار نییە لەکوێین. بەڵام لەهەر کوێدابین باشتروایە رۆژبمێنینەوە و دووبارە شەو بەرێکەوینەوە.

پرسیارم کرد:

لێرەدا چی بخۆین...؟ لەبرسانا دەمرین.

ئەو بووخچەی سینگوالای نیشان داو ووتی:

رەنگە سینگوالا شتێکی بۆ دانابێتین.

خێرا بوخچەکەی کردەوە و چەند تیکەنان و کەمێك گۆشتی کوڵاوی دەرهێنا. من بێ ئەندازە برسی بووم و کاتێك چاوم بە نانی وشك و پلە خۆڵاوییەکانی گۆشت کەوت، وەك درەندەیەکی برسی لە ئەسپەکە خۆم فرێدا و بوخچەکەم لە دەست یوری سەند و سەرقاڵی خواردنی نانی وشك و پلە گۆشتەکان بووم.

لەوێشدا بیرم کەوتەوە کە لەماڵەوە دایکم باشترین خواردنەکانی بە باشترین شێوە دروست دەکرد و بۆ منی دادەنا. لە مناڵیەوە مناڵێکی کەم خۆربووم، کەمێکم دەخوارد و دواتر وەك مناڵ یاریم بە خواردنەکە دەکرد و لەسەر مێزەکە هەڵدەستام.

لەوکاتەدا خۆم سەرم سورمابوو ئەم ئیشتیایەم لەکوێوە هێناوە و چی بوو گەدەی من بە نانی وشك و گۆشتی کوڵاوی سادە و بەبێ تام و پیس ڕازی دەبوو.

دوای کۆتایی هاتنی خواردن، یوری نان و گۆشتەکەی لە بووخچەکە دانا بەڵام کاتێك دەیویست بیبەستێت کتوپڕ پارچە کاغەزێکی لەناو بووخچەکە دەرهێناو ووتی:

ئەمە چییە...؟

کاغەزەکەم بەپەلە وەرگرت و ئەم دێڕانەم خوێندەوە.

دوای خواردنی گۆشتی کەڵەکێوی و نانی وشك بە دڵنیاییەوە تووشی تینویەتی دەبن و ئەم تینویەتیە دەبێتە هۆی ئەوەی پاشماوەی رێگا بەخێرایی بڕن تا زووتر

بگەنە شوێنی مەبەست. دەبینن ئەسپەکانتان برسین و پێویستیان بە ئاو هەیە. ئەگەر لە ڕێگادا نەوەستابێتن بەرەبەیان دەگەنە شوێنێك کە تا قەڵای (نگرت) کەمتر لە چوار کیلۆمەتر ڕێگاماوە، ئەم ماوە تا دەرکەوتنی هەتاو دەتوانن بڕن. خاوەنی قەڵاکە پیاوێکە بە ناوی (نگرت). ئەو هاوڕێی کالوویيە و کارێك بکەن نەزانێت ئێوە لە کام ڕێگاوە هاتوون. ئاگاداربن، چاودێری خۆتان بکەن من بەخێرایی پەیوەستان دەبم.

کاغەزەکە واژۆی پێوە نەبوو، بەڵام سینگوالا دەیزانی پارەمان پێ نییە و ئەگەر پێشمان بێت ئەوەندە زۆرنییە چوار ئەسکەناسی ((ئەکوویی)) لەناو کاغەزەکە دانابوو.

بە بینینی پارەکە زیاتر لە هەرشتێکی تر شادمان بووم چوونکە کاتێك مرۆڤ پارەی هەبێت دەتوانێت بۆ هەرشوێنێك بڕوات و خەڵك بە باشی میوانداری دەکەن.

ڕەنگە کەس پێویستی بە پارەی ئێوە نەبێت بەڵام هەر ئەوەندەی زانیان ئێوە پارەدارن، زیاتر ڕێزتان لێ دەگرن و هۆکارەکانی حەوانەوەتان ئامادە دەکەن.

سەیری یوریم کرد. یوری لەم سەیرکردنە تێگەیشت و ووتی:

بەڵێ دەبێت بڕۆین، درەنگ کردن ڕەوا نییە.

ئەمەی ووت و تفەنگەکەی کردە شان. بووخچەکەی لەسەر خورجینی ئەسپەکە داناو پەڕییە سەر زین و بەڕێکەوت. منیش پشت سەری ئەو سوار بووم و بەڕێکەوتم.

نزیکەی کیلۆمەترێك ڕێگامان پێوابوو کە لە تەپۆڵکە سەرەو خوار بووینەوە، لەوێوە قەڵاکە دەرکەوت و تێگەشتم شەوی پێشتر زیاتر لەوەی سینگوالا بیری دەکردەوە ڕێگامان پێواوە.

کاتێك هەتاو سەرلقی دارەکانی قەڵای ڕۆشن کردبووەیەوە، گەشتینە پشت دەرگا و یوری بێ ئەوەی دابەزێت بە قۆناغی تفەنگەکەی لە دەرگای دا. دەرگا دەست بەجێ کرایەوە وەك ئەوەی نگرت لە پشت دەرگاوە چاوەڕوانی ئێمە بکات. نگرت پیاوێکی ناحەز بوو وەك هەموو پیاوانی ناوچەکە کڵاوێکی خڕ و گەورە و سمێڵێکی ئەستوور و روخسارێکی سووتاو ڕیپسی بوو. دوو دەمانچەی دەسك زیوی بە چەپ و ڕاستی خۆی هەڵواسیبوو. شتێك کە زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشا، قامچییەکی درێژ کە دەسکێکی ئاسنی هەبوو و نگرت لە دەوری سکی ئاڵاندبووی و دەسکەکەی بە جۆرێك دانابوو ئەگەر ڕایکێشایە قامچیەکەی دەکرایەوە.

ئەم جۆرە قامچیانە سادەترین و مەترسیدارترین چەکی خەڵکی ئەم ناوچەیە و من کە لەرۆمانەکاندا خوێندبوومەوە بە باشی دەمزانی چۆن لەقامچییەکەیان کەڵك وەردەگرن.

نگرت بێ ئەوەی قسەیەك بکەین دەرگای کردەوە و ووتی:

فەرموون..... لای کالوویەوە دێن.....؟

یوری بە زمانی ناوچەیی ووتی: نا..... کالوویی کێیە؟

نگرت ئیتر قسەی نەکرد و ئەسپەکانی گرتن و بردی بۆ تەویلە. کاتێك نگرت ڕۆشت قیافەیەکی ئارامی بوو بەڵام کاتێك گەڕایەوە چاوەکانی بێ ئەندازە خەمبارو پڕ بوو لە گوومان. پرسی: چەند ڕۆژ لێرە دەمێننەوە.

یوری وەڵامی دایەوە: ئێوارێ دەڕۆین

نگرت ئەم جارەش هیچی نەوت تەنیا ئێمەی بۆ ژوورێکی دوور لە دەرگای دەرەوەی قەڵاکە ڕێنوێنی کرد و خۆی ڕۆشت.

کاتێك دەیویست لە ژوورەکە بڕواتە دەر لەسەرتاپای من و یوری بەووردی وردبوویەوە، ئەوسا دەرگای داخست و ڕۆشت.

دوای ڕۆشتنی ئەو یوریش ڕۆشتەدەر بەڵام پێشتر بە منی ووت:

ئاگات لێ بوو چۆن سەیری دەکردم. گوومان دەکەم ئەسپەکانی ناسیبێتەوە چوونکە پێشتر ڕوخساری ئارام بوو بەڵام دوای گەڕانەوە لە تەویلە گۆڕا.

بە ناڕەحەتی پرسیم: مەبەستت چییە؟

ئێوە دەڵێن دەتانەوێت بحەوێنەوە بەڵام لە منی ببیستن باشترە نەخەون. من دەڕۆم بۆ تەویلە و دەگەڕێمەوە. دەبێت خێرا بڕۆین.

یوری ڕۆشت و من لە ژوورەکەدا بە دنیایەك گوومان و ناڕەحەتی مامەوە. چەند خولەك دواتر یوری گەڕایەوە و بەخێرایی و ناڕەحەتی تایبەت ووتی:

قەڵا دەرگایەکی تری هەیە کە بەردەمەکەیان بە تەلی دڕکاوی گرتووە. لەلایەکیتر نگرت لێرە بە تەنیایەو دەڵێی ئەوانیتر لە قەڵا ڕۆشتونەدەر و هێشتا نەگەڕاونەتەوە. من دەرگای دواوەم بێ ئەوەی نگرت پێی بزانێت کردەوە و ئەسپەکانیشم زین کردووە.

ووتم: ئارەقی ئەسپەکان هێشتا وشك نەبۆتەوە.

ئیرادی نییە، ئەم ئاژەڵانە ڕاهاتوون. ئەسپی دز وەك وشتر دەتوانێت تاچەند ڕۆژ چڵ بخوات و بە ڕێگادا بڕوات. لەم کاتەدا دەرگا کرایەوە و نگرت بە سینیەك خواردن و شوشە شەڕاب هاتە ژوور، یوری پێی ووت:

تکا دەکەم چەند شووشەیەکی تریش بێنن.

نگرت ڕۆشت و بە چوار شووشەی تر گەڕایەوە و یوری دوای ڕۆشتنی ئەو دوو

شووشەی خستە ناو گیرفانی شەرواڵەکەی و دووانی بە من دا تا لە گیرفانەکانی خۆمدا بیشارمەوە.

دوو شووشە شەرابی یەکەم بە خێرایی خاڵی بوویەوە و تینوویەتی ئێمە تارادەیەك دامرکا بەڵام بەداخەوە دەرفەتی حەوانەوەمان پێ نەبڕا چوونکە یوری سەرقاڵی ئاودانی ئەسپەکان بوو. پاڵم دا بە قەراغ پەنجەرەکەوە کە لەناکاو لەسەر تەپۆڵکەی بەرانبەر چەند سوارێکم بینی کە بەخێرایی دهاتنە خوار.

ئەوەندە بەخێرایی دەهاتنەخوار تەپ و تۆزیان وەك پەردەیەکی تاریك دەورووبەری داپۆشیبوو و نەمدەتوانی بزانم سوارەکان کالوویی و هاوڕێکانێن یان پیاوانی قەلا بەڵام چوونکە ڕێگاکەیان ئەوەبوو ئێمەی لێوە هاتبووین گوومانم برد جگە لە کالوویی کەسێکیتر نییە.

لەم کاتەدا یوری خۆی خستە ژوورەوە تفەنگەکەی هەڵگرت و بەترس و خێرایی ووتی: گەورەم خێراکەن باڕاکەین.

کالوویی هات. لەم ڕێگاوە. منیش بەخێرایی تفەنگەکەم هەڵگرت و پەرپیمەدەر و هەردووکمان بەرەو تەویلە ڕۆشتین. یوری پێشتر هەموو شتێکی ئامادە کردبوو.

ئێستا دەسخۆشی لە هۆش و توانای یوری دەکەم چوونکە ئەگەر ئەو ڕۆژە کەسێکیتر لە جیاتی ئەو بووایە بە دڵنیاییەوە هەردووکمان دەکوژراین و لەناو دەچووین. بەڵام یوری بەتواناو وشیار پێشتر دەرگای دواوەی قەلاکەی بە نهێنی بەکراوەی بەجێ هێشتبوو، ئەسپەکانی زین و ئامادەکردبوو.

ئەگەر بەهەمان خێرایی سواربوویناپە و لە دەرگای دواوە ڕامان کردایە، سوارەکانی کالوویی ئێمەیان نەدەبینی و لە ئەنجامدا لێیان دوور دەکەوتینەوە بەڵام کاتێك ڕۆشتینە تەویلە، کتوپڕ دەنگێك دەبیسترا کە فەرماندەرانە ووتی:

دەستتان بەرزکەنەوە و تفەنگەکانتان دانێن. ئەگەر بچوکترین جووڵەیەك بکەن و بە پێچەوانەی فەرمانی من بجوڵێنەوە، وەك سەگ دەتانکوژم.

ئەمە دەنگی نگرت بوو لەسوچێکی تەویلەکەدا وەستابوو. لەدەستێکیا قامچییە سێ مەترییەکە و لە دەستەکەی تریدا دەمانچەیەك بوو. هەڕەشەی لە ئێمە دەکرد.

بە بینینی نگرت بەو چاوە ترس ئەنگێزانەی و قیافەی مەترسیداری بەتایبەت ئەو قامچییە درێژەی دەستی، دڵم داکەوت. وەك ئەوە بوو بە تیغێکی تیژ دڵم دەڕوشێنن و لەلایەکیتر هەستم دەکرد دنیایان بەو قورسی و گەورییە لەسەر سەری من داناوە و

زەختی لێ دەکەن.

ئەمە چ بەڵایەك بوو لەسەر ڕێگاماندا سەوز بوو؟ خوایە دەبێت چی بکەین.....؟ و چۆن لەم بەڵا ڕزگارمان بێت؟ ئەم بیرکردنەوانە بەخێرایی بروسکە لە مێشکمدا تێپەڕی و بەخێرایی دووبارە دەبوویەوە بێ ئەوەی بزانم یا بتوانم بیر بکەمەوە کە بۆ لابردنی ئەم بەڵایە چ چارەیەك بدۆزمەوە.

زیاتر لە قامچییەکەی دەستی دەترسام. وەك مناڵێك کە یەکجار بە دار لێیانی خواردبێت و بۆ چەندین ساڵی بەردەوام لە دار بترسێت، منیش لە قامچی دەستی نگرت بێ ئەندازە و زیاتر لەدەمانچەکەی دەترسام چوونکە هێشتا شوێنەواری برینەکانی قامچی لەسەر پشتم بوو و ئازاری دەدام.

یوری بەبێ گوێدان سەیری کردم و ووتی: سوارین

بەڵام پێش ئەوەی من و یوری بتوانین دەست بە ئەسپەکانەوە بگرین دەنگی ترس ئەنگێزی نگرت دەبیسترا کە دەیوت:

مەجوڵێن..... وە گەرنە دەکوژرێن.

دەکوژرێین.....؟ بکوژرێین... چ ئیرادێکی هەیە، بیرێك بوو وەك بروسکە لەمێشکی دام و تێپەڕی. چیبکەم ئەو بیرم لەم مێشکدا گەڵاڵە بوو چوونکە هەستم دەکرد ئەگەر لێرەو بەدەستی نگرت بکوژرێین باشترە لەوەی کالوویی و هاوڕێکانی بمانگرن و بەنەنگەوە، دوای لێدان بە قامچی وئازاردان هەڵمانواسن.

ئەم بیرە کاتێك بە مێشکمدا هات کەدەنگی کوترانی دەرگای قەڵا هات. بە خۆشحاڵییەوە کالوویی دەرگای دواوەی قەڵاکەی کە ئێمە کردبوومانەوە، نەیدەزانی و هەر بۆیە هەستی دەکرد قەڵا تەنیا یەك دەرگای هەیە و لەو دەرگای ئەدا.

بە بیستنی تەقەی دەرگا، زیاتر هاتمە سەرحاڵ و بە پەڕینێك خۆم خستە سەر ئەسپەکە بەڵام لەم کاتەدا دەنگی (فشی) قامچی بیسترا و چرکەیەك دواتر نووکی درێژ و مارئاساکەی لە کەمەرم ئالاّ و کراسەکەی دڕاندم.

قامچی بۆ ئەوان چەکێکی باوەڕپێکراوە. بە قامچی لە دوری ۳ تا ٤ مەتر کەسی بەرانبەر دەگرن و لە زەوی دەدەن. نگرت قامچییەکەی بۆ هاویشتم و قامچی دوای ئەوەی سووتێکی کێشاو هەوای بڕی وەك مار لە کەمەرم ئالاّو بەتوندی دەستەکانمی گرت.

ئێستا کاتی ئەوە بوو نگرت بە جووڵەیەکی خێرا، لەسەر ئەسپەکە دامبەزێنێت. ئەگەر دەرفەتی ئەم کارەی دەبوو چوونکە دەستەکانم بە قامچی بەسترابوویەوە، بە

مێشکەوە ئەدرام بە زەویدا و ڕەنگە دەست بەجێ گیانم ئەسپەردەکردایە. نگرت ددانەکانی جیڕ دەکرد و دەستی خۆی بەرزکردەوە کە دەسکی قامچییەکەی بە هەموو هێزییەوە بکێشێتە خوار بەڵام یوری وەك هەڵۆیەك خۆی بۆ لای من فڕێدا و نەمدەزانی چی کرد و چ فێڵێکی بەکاربرد کە قامچی لە کەمەرم کرایەوە.

ئێستا لای خۆم وای دەبەڵگێنم کە یوری بەخێرایی منی بۆ ئەو لای ئەسپەکە فڕێدا. هەرچەندە بە زەویدا درام بەڵام ئەو کەوتنە باشییەکەی لەوەدا بوو لانی کەم کاری نگرتی پوچەڵ کردەوە و بەپێچەوانەوە ئەوی دا بە زەویدا. من لەلایەکیتری ئەسپەکە کەوتمە خوار و نگرت لەبەردەم خۆیدا. یوری لەم کاتە گونجاوە دا دەرفەتی لە دەست نەدا و بە چەقۆ قامچیەکەی قرتاند. کاتێك قامچی لە ناوەراستەوە بڕا، بەخێرایی هەستام و دوای ئەوەی بەتەواوی قامچییەکەم لە کەمەرم کردەوە پەڕیمە سەرئەسپەکەم.

یوری یەك خولەك دوای من سوار ئەسپ بوو لەم یەك خولەکەدا یوری سەرقاڵی لێدانی نگرت بوو.

لە کۆتایی ئەو خولەکەدا یوری توانی بە مشتێکی ئاسنین نگرت بخات و خۆی سواربێت.

دەنگی دەرگای قەڵا دەبیسترا و لەوکاتەی ئێمە سوار بەرەو دەرگای دواوەی قەڵا دەڕۆشتین دەتوت سەرقاڵی شکاندنی دەرگان چوونکە بێجگە لە دەنگی چەکووش دەنگی تریش دەبیسترا.

یوری سەیرێکی دواوەی کرد و ووتی:

دەبێت رابکەین، زۆر بەخێرایی و بەپەلە. نگرت بێهۆش نەبووە و دەرفەتی ئەوەشمان نییە بیکوژین. دوای رۆشتنی ئێمە دەرگای قەڵا دەکاتەوە و کاتێك کالوویی بزانێت لە کام رێگاوە هەڵاتووین بە دواماندا دێت.

لەم کاتەدا گەشتینە دەرگای قەڵا وچوونکە بچووك بوو دابەزین و لێی تێپەڕبووین لەو لای قەڵا کێڵگەی نگرت بوو. بۆ ئەوەی ئاژەڵ کشتوکاڵەکەی لەناو نەبەن دەوری کێڵگەکەی بەتەلی دڕکاوی گرتبوو. تەنیا یەك ڕێگا بوو کە ئێمە دەبوو بە سواری لێی بڕۆین.

دوای هاتنەدەر لە قەڵا یوری دەرگاکەی داخست و ئاسنێکی لەناو ئەڵقەی کێلۆنەکەدا دانا تا نەتوانن دەست بەجێ بە دواماندا بێن و لانی کەم یەك دوو خولەك ماتڵ بن.

من لەپێش یوری ئەسپم غاردەدا. کاتێك گەشتینە دوایین تەلە دڕکاوییەکان و من سەرقاڵی دەرهێنانی کراسە دراوەکەم بووم، دەنگی ویزەی گوولەیەك بیسترا کە لای گوێچکەی من تێپەڕی و لەبەرانبەری سمی ئەسپکەم کەوتە سەر زەوی.

دەنگی گوولە بێدەنگی ئەو بەشەی بیابانی شکاند و ئێمە کە وامان دەزانی لە مەترسی مەرگی کاتی ڕزگارمان بووە، جارێکیتر خۆمان ڕووبەڕوی مردن بینییەوە. بە خۆشحاڵییەوە یوری زۆر لێزان و وشیاربوو.

ئەو وەك شەڕکەرێك کە چەندین ساڵ لە بیاباندا شەڕی کردبێت لە ئەسپەکەی خۆی فرێدایە خوار، قیژاندی و ووتی: دابەزن..... تەقە دەکەن.

دەترسام لە ئەسپەکەم دابەزم نەکا ئەسپەکان لە دەنگی گوولە ڕەم بکەن و ئێمە بێ ئەسپ لەو شوێنە لە بیاباندا بمێنینەوە بەڵام لەناو ئەم فکرانەشدا دوبارە دەنگی چەند گوولەیەکی تر بیسترا و ویزەی گوولەکان کە بەپەنا گوێمدا تێپەڕین بووە هۆی ئەوەی منیش خۆم فڕێدەم.

کە دابەزیم لەسەر زەوی ڕاکشام. هەستم کرد یوری داماو ڕەنگ بە ڕوخسارییەوە نەماوە. وەك گەچ سپی بووە و لێوەکانی لەترسا دەلەرزێت.

ئەو پیاوێکی ترسنۆك نەبوو بەڵام لەوکاتەی من لەسەر ئەسپەکەم دانەئەبەزیم، تووڕە ببوو وبۆ گیانی من دەترسا. حەقی بوو بترسێت چوونکە هەرسات ئەگەری بوو گوولە دڵی من کون بکات و لەولاوە دەرچێت.

بەهەرحاڵ، خۆم فڕێداو تفەنگەکەم ئامادەی بەرگری کرد. شوێنێك کە زیاتر لەهەموو سەرنجی ئێمەی ڕادەکێشا دولای باکوور و باشووری قەڵابوو و هەستم کرد لە پشت دەرگاو ئەو کونانەی لە دەرگاکەدایە، تەقەمان لێدەکەن. بەڵام دوای چەند خولەك زانیمان لە هیچ کام لەو شوێنانەوە مەترسیمان لەسەر نییە. بەردەوام گوولە ویزەویزو بەرەولامان دەهات بەڵام دیار نەبوو ئەوان لەکوێن و لەکوێوە تەقەمان لێدەکەن. یوری کێشان کێشان خۆی گەیاندە لای من و بۆ ئەوەی نەترسم ووتی:

گەورەم. ئەمە دوایین قۆناغی مەترسیمانە. ئەگەر لێرە بە سەلامەتی دەربازبین، ئیتر بۆ گەشتن بە جەنگەڵ ڕێگا تەختە..... ئاسوودە بن.

سەیرێکی دواوەم کرد ووتم بە خۆشحاڵییەوە ئەسپەکانی ئێمە لە سەد هەنگاویدا وەستاون و سەریان بەرز کردۆتەوە و گوێیان هەڵخستووە و گوێ لە دەنگی گوولەکان دەگرن.

یوری بە چاوە وردوتیژەکانی خۆی لەم لاولای دەڕوانی و بەردەوام بە منی دەووت:

گەورەم فیشەکەکان بەفیڕۆنەدەن. تا دڵنیانەبن تیرەکەتان مەبەست دەپێکێت تەقەمەکەن. لێرە فیشەکێک یەکسانە بە گیانی کەسێک.

منیش بە پێشنیاری ئەو تا ئەو شوێنەی دەمتوانی تەقەم نەدەکرد تا ئەوەی یوری کتوپڕ دوو سێ هەنگاو خۆی فڕدایە ئەولاو ووتی:

گەورەم لەسەربانی قەڵاکەن دەیانبینن.

من بە نیگایەک هێڵی راستی قەڵاکەم لە چاو گوزەراند و لەگەڵ ئەوەی خۆیان حەشاردابوو بەڵام لە دووکەڵ و ئاگری تفەنگەکان یەک یەکی ئەوانم بینی و شوێنەکانیانم دەست نیشانکرد.

ئەو کات تەقە لای ئێمە دەستی پێکرد. یوری زۆر جوان تیری دەهاویشت. نازانم تفەنگەکەی باش بوو یان لە تەقەکردندا بەتوانا بوو، هەر گوولەیەک کە لە تفەنگەکەی دەردەچوو ئەگەر مەبەستی نەپێکایە بە جیاوازی یەک دوو سانتیمەتر لەوان دڵی دیوارەکەی دەبڕی و تەپ و تۆزی هەڵدەساند.

نزیکەی نیو کاتژمێر ئەم شەڕە بەردەوام بوو تا ئەوەی یوری پێی ووتم:

گوومان دەکەم فیشەکەکانیان تەواو بووبێت تا ئێستا زیاتر لە ٣٠٠ فیشەکیان تەقاندوە مەگەر چەند فیشەکیان پێیە. دواتر بێدەنگ بوو و دوای چەند چرکەیەک ووتی:

گەورەم ئێستا کاتی هەڵاتنە، دەبینن. ئەسپەکان لەوێن و بەخێرایی دەبێت هەڵبێین. ئەگەر سەد مەتر لەم خاڵە دەرچین ئیتر تیری ئەوانمان پێ ناگات.

یوری ئەمەی ووت و لە شوێنی خۆی هەستاو منیش بەدوای ئەو جەستەی شل و لاوازی خۆم لە خۆڵە گەرم و سووتێنەرەکە جیاکردەوە.

یوری دوو سێ هەنگاو لەپێش منەوە بوو بەڵام هەوڵی بوو من پێش بکەوم تا بەرگری کردن لە من بگرێتە ئەستۆ و لە راستیدا گیانی خۆی بکات بە قەڵغانی بالای من. بۆ ئەم مەبەستە هەرچەندە هەنگاوێک کە دەڕۆشت دەوەستا و تەقەی لێدەکردن و تەقەی ئەو دەبووە هۆی ئەوەی ئەوان چەند ساتێک خۆیان لە پشت دیوار داشارن و منیش بتوانم چەند مەترێک زیاتر دووربکەومەوە.

ئەم کارە چەند جار دوبارە بووەیەوە بەڵام یەکێک لەم جارانە هەستم کرد لاتەنیشتم سووتا وەک ئەوە بوو سیخێکی سوورەبوویان لەلای چەپم چەقاندبێت. شتێکی سووتێنەر رۆشتە ناو جەستەم.

هاوسەنگی خۆم لە دەست داو تفەنگەکەم کەوت و بەدەم و چاوەوە کەوتمە سەر تەلە درکاوییەکان بەڵام هێشتا هەستەکانی خۆم لە دەست نەدابوو بەسەر دەمارەکانی خۆمدا زاڵ بووم.

زانیم گوولەم بەرکەوتووە بەڵام نەمدەزانی گوولە بەرکوێم کەوتووە و دەرچووە یان نە. کاتێك کەوتم تلێکم خوارد خۆم خستە چاڵێك کە لە یەك هەنگاوی ئەوێدابوو. بەم شێوەیە لە مەترسی دووبارە خۆم دورخستەوە بەڵام هەستم دەکرد تەنیا ئەو گوولە بۆ کوشتنم بەس بێت.

دەستی چەپم نەدەجوولا، بەڵام دەستی راستم جووڵاندو هێواش دەستم لە شوێنی بەرکەوتنی گوولەکەدا. کونێك لە خواری دوایین پەراسووی چەپم دروست ببوو کە پەنجەمی تێ دەچوو.

خوێن زەوی سورِ کردبوو. لە ژێر جەستەم گۆلاوێکی خلیسك و لکێنەری دروست کرد کە زیاتر بووە هۆی ترسی من. بیرم دەکردەوە مەگەر جەستەم چەندەی خوێن تیایە کە هێشتا زیندووم. هێدی هێدی سەرم قورس بوو چاوەکانم رەشەکە و پێشکەی دەکرد. یوری لە دوو هەنگاوی چاڵەکە دانیشتبوو تەقەی دەکرد.

هەستم دەکرد دوایین ساتەکانی ژیانی خۆم تێ دەپەرێنم بۆیە بە هێواشی سەرم بەرز کردەوە ووتم:

یوری... یوری..... تۆ راکە..... من دەمرم..... وەرە و ماتڵ مەبە. گیانت رزگارکەو برۆ. بەڵام یوری بە توورەییەوە خێسەیەکی کرد و بە کۆمەکۆم لە چاڵەکە دوورکەوتەوە و لەرێگاوەی هاتبووین لە دیوارەکە نزیك بوویەوە. من لەدڵەوە دەستخۆشیم لەو هەموو ئازایەتیەی یوری کرد بەڵام نەمدەتوانی ئەم کارە بێهۆی ئەو پەسەند بکەم. شتێکی ئاشکرابوو یوریش دەکوژرێت... ئەو خۆی دەخاتە ناو دەمی تاریکی مردنەوە. یوریم بینی لە دیوارەکە نزیك دەبێتەوە و لە چاڵکی یەکێك لە دێراوەکان کە دەرۆشتە مەزراکە دانیشت و تفەنگی ئامادە کرد و ئیتر نەمزانی چی بوو....... سەرم قورس بوو چاوەکانم رەش و سەرئەنجام لەهۆش چووم بەڵام دوایین ساتیش بۆنی باروتم دەکرد و دەنگی گوولەم دەبیست.

نەمزانی چەند کاتژمێر تێپەریوە و یوری چی بەسەرهات کاتێك چاوەکانم کردەوە هەوا تاریك بوو. سەرەتا وام زانی مردوم و ئێرە ناو گۆرە و ئەم هەموو رەش و تاریکییە پەیوەندی بە دنیایەکی ترەوە هەیە. دەستی راستم بە درێژایی جەستەم راکێشا بەڵام

جگە لە خۆڵی تەڕ و زەوی دەستم بە هیچی تر نەکەوت. تەڕی خۆڵەکە ئەم بیرەی لا دروست کردم لەوانەیە یوریش بەرکەوتبێت و مردووە و ئەوان بە گوومانی ئەوەی هەردوکمان تەواوبووین، بەجێیان هێشتوین و ڕۆشتوون و ئەم تەڕییە پەیوەندی بەو خوێنەوە هەیە کە لە ئێمە ڕۆشتووە. سەرم خستە سەرزەوی و بەو هەموو ناتەوانی لاوازیبەی بەبێ یوریم لە خۆمدا هەستم پێ دەکرد، ناڵەیەك لە سینەمەوە دەرچوو کە تا ئەو ساتە هەرگیز وام نەناڵاندبوو هیچ کاتیش بەو شێوەیە ناناڵێنم.

دەموت بەبێ یوری بۆ زیندووماوم؟ زیندووماوم کە بە زەبر و ئازارەوە لەم بیابانەدا لە برسانا و لە تینوانا بمرم؟ بێ ئیرادە قوڵپی گریان قورگمی گرت و دەستم بە گریان کرد. لە هەموو تەمەندا تا ئەو شوێنەی بیرم بوو، یەکەمجارم بوو دەگریام. ڕەنگە یەك دوو جار لە شادمانیدا یەك دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوم هاتبێتە خوار، بەڵام هیچ کات لە لاوازیدا دەستم بە گریان نەکردبوو.

بە خۆمم ووت: ئێستا کە هەوا تاریکە، تا بەیانی لێرەدا دەمێنمەوە و بەیانی ئەگەر هەستم کرد زیندوو نامێنم خۆم بە گوولە دەکوژم. ئەمەم ووت و هەناسەیەکم هەڵکێشا. لەم کاتەدا دەنگێك بەرگوێم کەوت وەك ئەوە بوو دەرگایەك بکرێتەوە. ئەمە چ دەنگێکە.

لەناکاو لەلای ڕاستی منەوە ڕوناکیەك دەرکەوت و دواتر دەنگی یوریم بیست کە دەیوت چراکەت هێنا...؟ وام دەزانی بە هەڵەدا چووم. خوایە ئەمە دەنگی یوریە !

بڵێی یوری زیندوبێت؟ ئەگەر ئەو زیندوو بێت خەمم نییە چوونکە ئەو گەورەترین پشتیوانی منە. لەم کاتەدا چراکە هاتەژوور لە ڕووناکیی ئەو ، قیافە خۆڵاوی یوریم بینی کە لای پیرێژنێك کە چراکەی بە دەستەوە بوو، وەستابوو.

لە خۆشحاڵیدا دەمویست بقیژێنم بەڵام یوری لە کاتێکا بزەیەکی لەسەر لێوبوو، هاتە پێش و دەستی لەسەر سنگم دانا و ووتی:

گەورەم. ئارام بگرن: بە دژواری خوێنەکەتان بەندبووە. ئەگەر بجوڵێن خوێنتان بەر دەبێتەوە. من دوبارە سەرم لەسەر زەوی دانایەوە. پیرێژن چراکەی لە سوچێکدا دانا. لە ڕووناکی چرا ژوورێکی داری بچووکم بینی کە بێجگە لە من هیچ شتێکی تری تیانەبوو. منیش لەسەر خۆڵ کەوتبووم.

بە خۆشحاڵییەوە لە یوریم پرسی: چی بوو...؟ بۆمن زیندووم.... بۆ بریندار نەبوویت..؟ سوپاس بۆ خوا.

یوری ووتی:

کاتێك ئێوەم لە خوێندا بینی. ئەوەندە تووڕەبووم کە سنووری بۆ نەبوو. ڕۆشتمە پێش تا باشتر بیانبینم. مەبەستم ئەوە بوو یا بکوژرێم یا ئەوان بکوژم و بە خۆشحاڵییەوە سیان لەوانم کوشت و دوانەکەی ترکە یەکیان کالوویی بوو، ڕایکرد.

بە ترسەوە پرسیم:

ئەوان بە دواماندا نایەن؟ ئێمە لەکوێین؟

یوری بزەیەکی گرت و ووتی:

هەرگیز... چوونکە ٤٨ کاتژمێر لەو ڕوداوە تێ دەپەرێت و ئێمە ئێستا ٤٠ تا ٥٠ کیلۆمەتر لەوان دورکەوتوینەتەوە. دەزانیت لەکوێین....

نازانم..... ئێرە کوێیە؟

ئێرە سەرەتای جەنگەڵێکە کە ئێمە بۆ بینینی ئەو هەموو ئازارەمان کێشا. ئێرە جەنگەڵی بارانە. تێدەگەن.... و لە چەند کیلۆمەتری ئێمە مەبەستی ئێوە..... کێ دەزانێت ڕەنگە هۆزی ژنانی ئامازۆن لەم نزیکانە بێت...

بە خۆشحاڵییەوە پرسیم؟ ڕوبار لەکوێیە؟

ڕوباری ئامازۆن لێرەدایە. ئەگەر بێدەنگ بن دەنگی خرۆشانی ئاوەکەی دەبیستن...

ئاگاداری لەم بابەتانە گڕوتینێکی تازەی پێ بەخشیم و هێزێکی سەرسورهێنەر لە خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی مندا ڕەوان بوو و دەگەشتە هەرشوێنێك ڕۆحی دەبەخشی و گیان و توانایی گشتی جەستەمی زیاد کرد.

بێ ئیرادە بزەیەك کەوتە سەر لێوم. ئەمە یەکەم بزەبوو لە هەموو تەمەندا لە دڵەوە بە ئاسوودەیی ناخ گرتبێتم. دەمویست یوری ئازیزم ماچ کەم. ئەو ببووە هۆی ئەوەی لە مردن ڕزگارم بێت. ئەگەر ئەو نەدەبوو لەهەمان شوێنی بیابان دەمامەوە و پێش ئەوەی بێمە هۆش خۆم و بتوانم بەرگری لە خۆم بکەم دەبوومە پاروی باڵندەکانی ئاسمان و ئاژەڵە وەحشییەکان و لاش خۆرەکانی بیابان، ڕەنگە ئێستا قەلەڕەشەکان لەسەر کەلەسەری من دانیشتبێتن و چاوەکانیان دەرهێنابێتم. ئێستا کە سەلامەت و بەدوور لەهەر مەترسیەك لێرەم دەبێت سوپاسی یوری بکەم.

ئەو بوو ڕزگاری کردم و گیانی پێ بەخشیمەوە.

زەختم لەخۆم کرد تا لە شوێنەکەم هەستم و لە شوێنی خۆم دانیشم. دەمویست دانیشم تا یوری ماچ بکەم و سوپاسی بکەم بەڵام ئەمجارە یوری بە دەست شانەکانی گرتم و بە نەرمییەکەی برایانە منی پاڵخستەوە و جارێکیتر لەناو جێگەی خاکی و

نمدارەکەی خۆم رایکێشامەوە، ووتی:

ئارام بگرن. مەجوڵێن. هەرچەندە برینەکانتان زۆر کاریگەر نییە بەڵام ئەم برینانەش پێویستیان بە چەند رۆژ حەوانەوە هەیە تا شوێنی گوولەکە باش ببێتەوە.

بەم شێوە منی خەواندەوە و خۆی سەرقاڵی ئامادەکردنی خواردن و شتی تر بوو. ئەو شەوە تێپەڕی. بەیانی و دوو بەیانیش بەسەر چوو.

هەموو رۆژێك یوری برینەکانی دەکردمەوە و دەرمانی دەکرد و دووبارە دەیبەستەوە بەڵام هەر رۆژ کە تێدەپەڕی ئازارم باشتر و هێواشتر ببێتەوە، هەستم دەکرد لاوازیەکی تایبەت بەسەرمدا زاڵ دەبێت و ئەم لاوازییە رۆژ بەرۆژ زیاد دەکات.

نەمدەتوانی شوێنی برینەکەم ببینم. نەمدەزانی لە چ بارودۆخێکدام و برینی کەلەکەم تا چەندە قووڵە. لە یوریم دەپرسی بەڵام هەموو جارێك لەوەڵامدا دەیوت:

زۆرباشە، برینەکەتان پووڵە باش بوونەوەیە و تا یەك دوو رۆژی تر دەتوانن بە ڕێگادا برۆن.

ئەمە وەڵامێك بوو هەمیشە بە منی دەدایەوە بەڵام دەمزانی ئەو بۆ بەهێزکردنی رۆحیەی من درۆ دەکات و راستی شتێکی ترە. یەك دوو رۆژی تر بەم شێوەیە تێ پەڕی و لەم یەك دوو رۆژەدا هەستم کرد ئازارم زۆر توندتر لە پێش بووە بەشێوەیەك ناتوانم هەناسەی قووڵ هەڵبکێشم و سییەکانم لەهەوا پڕو بەتاڵ بکەمەوە. ناچار بووم کورت و پچڕ پچڕ هەناسە بدەم و ئەم بارودۆخەی هاتبووە پێش بووە هۆی ئەوەی تووشی تەنگی نەفەس و توندی لێدانی دڵ بم. ئێوارەیی ئەو رۆژە پیرێژنی خانەخوێکەمان هاتە ناو ژوورەکەمانەوە. پشتی تێکردین و روخسارێکی مۆنی بەخۆیەوە گرت و لە ژوورەکە رۆشتە دەر و دەرگاکەی بەتوندی پێوەدا.

من لەمانای ئەم جووڵەیە نەگەشتم. ئەو بۆ بەم شێوەیە لە ژوورەکە رۆشتەدەر؟ ئایا لە قیافەی من ترسا؟ ئایا من سڕابوومەوە و قیافەم گۆڕابوو. ئەوەندەم ئەم پرسیارانەم لەخۆم کرد کە شەو هات و هەوا تاریك بوو. یوری بۆ ئەنجامدانی کارێك لەوێ دوورکەوتبوویەوە و من دەمزانی زووتر لە کاتژمێر ٨ ناگەڕێتەوە. من لەو ژوورەدا تەنیا دەمناڵاند و لەناو بیروخەیاڵە ئازاردەرەکانی خۆمدا نوقم بووم و هەرسات چاوەڕێی گەڕانەوەی یوریم دەکرد تا ئەوەی یوری نزیك ٩ ی شەو گەڕایەوە.

یوری کە هاتە ژوور، تێگەشتم بۆ ڕێگایەکی دوور رۆشتووە و زۆر هیلاکە. کاتێك چراکەی رۆشن کرد و کەمێك خواردن کە بۆ منی ئامادەکردبوو، گەرمی کردەوە و پێی

دام، باسی هاتن و ڕۆشتنی پیریژنم بۆ کرد و پرسیم:

هۆی ئەم جووڵەیە چی بوو..... بۆ راست ناڵێیت. ئاوێنەیەکم بۆ پەیابکە تا ڕوخسارم ببینم. ئەگەری نییە ئەمجارە بە قسە رازی ببم و لە بەدواداچونی بابەتەکە پاشگەزببمەوە.

یوری وتی: ئامادەکردنی ئاوێنە کارێکی دژوار نییە. بەڵام دڵنیابن هیچ گۆڕانێك لە ڕوخساری ئێوەدا دروست نەبووە و هۆکارێك نییە بۆ بڕینی گوولەیەك مرۆڤ بسرێتەوە.

من زیاتر پێم داگرت و ووتم:

یوری، وا هەست دەکەم گوولەی کالوویی کاری خۆی کردوە کە نابێت هیوایەکم بۆ چاکبوونەوە هەبێت بۆیە بڕیارمداوە خۆم بکوژم... مەگەرنە ئەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ حاڵم خراپتر دەبێت. ئەمە چییە.

یوری کە منی تا ئەم ئەندازەیە پێداگربینی ووتی:

کەلەکەی ئێوە چڵکی کردوە و من هەر ڕۆژ چڵکی برینەکەتان دەشۆم. دەزانن کە لێرە دەرمان دەست ناکەوێت منیش تەنیا بە ئاوی پاك برینەکەتان دەشۆم و بەجۆرێك گەڵای تایبەت کە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەکاری دێنن دەیبەستم. بەڵام ڕۆژ ناچارم کە دووجار چڵکە زیادەکان کە لەناو کوونی گوولەکەدا کۆبوونەتەوە بشۆم. تا دوو سێ ڕۆژ پێش برینەکە ڕوولە باشی بوو بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە برینەکە چڵکی کرد و ئێستا کە بینیتان پیرێژن هاتە ژوور و بەو شێوەیە ڕۆشتەدەر، لەبەرئەوەی بۆنێکی ناخۆش لەناو ژوورەکەدا پەنگی خواردووە و هەرکەس بێتە ژوور هەست بەبۆنێکی ناخۆش دەکات. برینەکەی ئێوە بۆنی کردووە بەڵام ئەمە نابێت ببێتە هۆی دڵساردی ئێوە چوونکە بەڵێنتان پێ دەدەم تا چەند ڕۆژی تر ئێوە لەم ژوورەدا بگەڕێن بێ ئەوەی بچوکترین دەرد و ئازارێك هەست پێ بکەن.

زانیم یوری راست دەڵێت. بەڵام سەرم سورما ئەو بۆ لەو بۆنە ناخۆشە هەست بەناڕەحەتی ناکات. ئایا لووت و هەستی بۆنکردنی لەگەڵ کەسانیتردا جیاوازە، بە دڵنیاییەوە نا، یوری بۆ ئەوەی من لەم بابەتە ناڕەحەت نەبم، بە بۆنی چڵکی برینەکەم رازی دەبوو و ناوچاوی گرژ نەدەکرد و هەر بۆیە من هەستم بەڕاستیەکە نەکردبوو.

لووتی خۆم لە سەرەتای چڵکی برینەکە پڕ ببوو و بۆنی ناخۆشی برینەکەم هەست پێ نەدەکرد..... بارودۆخم خراپ بوو..... نزیك بوو لەخەم و خەفەت بقیژێنم و سەری خۆم بەم بە زەویدا. ئەگەر ڕوخساری ئارام و بێ نیگەرانی یوریم لەبەرچاوی خۆمدا

نەدەدی، ئەگەر دەنگی گەرمی ئەو هێزی پێ نەدەبەخشیم. رەنگە لە داماویدا شێت دەبووم.

زەحمەتی زۆرم لە خۆم کرد تا لە هاتنەخوارەوەی چەند دڵۆپ فرمێسك کە لە چاوەکانمدا قەتیس مابوون، رێگە بگرم و سەرئەنجام ووتم:

یوری..... دەبێت چی بکەین... شیاوە من دوور لە دایك و باوك و لەم دیارە دوورە لەوپەری لاوازی و نەتوانیندا بمرم...؟ ئایا باشتر وانییە خۆم بکوژم؟

یوری بەم بیرە منالأنەی من پێکەنی بەڵام زیاتر گەرمی بە دەنگی خۆی دا تا هێزی زیاتر بە من ببەخشێت. ئەو بە دەنگێکی بەرز قاقا پێکەنی و دوای خولەکێك کە ئارام بوویەوە، ووتی: زۆر منالأنە بیردەکەنەوە..... ئایا مرۆڤی راستەقینە ئەوەندە خۆی بە داماو هەست پێ دەکات کە خۆی بکوژێت.. خۆ کوشتن چەکێکە تەنیا لە دەستی کەسە نەزانەکان دانراوە. پیاوێك کە بۆ شەڕ لەگەڵ سروشت و بڕینی دڵی جەنگەڵە ڕەشەکانی ئامازۆن هەستاوە و ئەم هەموو ڕێگایەی بڕیوە و لەپێ نەکووتووە، نابێت ئەوەندە لاواز بێت لەبەرانبەر برینێکی بچووك و کەمێك چڵکی سپی پشت بە خۆکوشتن ببەستێت. خۆزگە ئەم قسەتان نەدەکرد چوونکە من هەرگیز چاوەڕوانی ئاوا قسەیەك لە زمانی پیاوێکی وەك ئێوە نیم.

بە بیستنی قسەکانی یوری بە تەواوەتی گۆڕام. وەك ئەوە بوو هەر یەك لە ووشە و ڕستەکان کە لە زمانی یوری دەهاتەدەر وەك پارچەیەك لە پۆلاً دەکشا بەسەر رۆحی مندا و لە ئەنجامدا رۆحی لاوازی منی هێز دەبەخشی و بەهێزی دەکرد کاتێك ئارام بوو، چەند خولەکێك بیرم کردەوە و ئەوسا ووتم:

راست دەکەیت... بەڵام تاکەی من دەبێت لەم ژوورەدا کە دەڵێی کولانەی مریشکە، زیندانی بم؟ دەبێت چی بکەین؟ هیچ بیرێکت کردۆتەوە.

یوری سەری بۆ جەخت کردنەوەی پرسیارەکەی من لەقاند و ووتی:

بەڵێ، ئەمڕۆ بۆ ئەنجامدانی کارێك رۆشتبووم بۆ شوێنێکی دوور و ئێستا کە بینیتان بەسەر و ڕوخسارێکی خوڵاوی گەڕاومەتەوە، سەرکەوتنم بە دەست هێناوە.

بە شادمانییەوە پرسیم: چ سەرکەوتنێك..... چی بووە..

یوری پێکەنی و ووتی: دانیشتوان بە منیان ووت لە چوارفەرسەخی ئێوە دێیەکە کە هۆزێکی نیوە وەحشی تیایدا دەژین. ئەوان جادوگەرێکیان هەیە پزیشکە و قورسترین و مەترسیدارترین برینەکان لە دەرمانی سەیرو سەمەرە چارەسەر دەکات. من بڕیارمدا بۆ

هێنانی ئەو بڕۆمە ئەویّ بەڵام دانیشتوان پێیان ووتم جادوگەری ئامازۆ پێدراوە لەناو هۆزکەی خۆی دەرناچێت و ئەگەری نییە لەگەڵتانا بێتە ئێرە. ئێوە بەختەوەرن ئەگەر نەخۆشەکەتان بۆ چارەسەر وەربگرێت.

من بەو پەری بێ هیوایی بەڕێکەوتم چوونکە دەزانم ئەم خەڵکە نیوە وەحشیە باوەڕی وایان هەیە بە گیان و دڵ دەیپارێزن. ئەمڕۆ بەیانی بەڕێکەوتم و بە دژواری زۆر گەشتمە ئەویّ و رۆشتمە لای جادوگەر. جادوگەر بە میهرەبانی وەری گرتم و لە قسەکانم کە بەهۆی یەکێك لە دانیشتوانی ئەویّ، وەردەگێڕدرایەوە، گوێی گرت بەڵام بەداخەوە کە لەکۆتاییدا ووتی:

من نەخۆشەکەی ئێوە تەنیا لێرە دەتوانم پشکنین و چارەسەری بۆ بکەم.

هەرچەندە داوام کرد، رەزامەندی نیشان نەدا. تەنانەت گریام و پاڕامەوە بەڵام ئەو رازی نەبوو ووتی:

هاتنەدەرەوەم لەناو ئەم خەڵکە شوومە و رەنگە بەڵایەکیان لە ئاسمانەوە بەسەردا ببارێت.

لەئەنجامدا بەڵێنم وەرگرت هەموو هەوڵەکانی بۆ چارەسەری ئێوە بخاتە گەڕ و ئەوکات بەرەو مەبەست بەڕێکەوتم.

پێم ووت:

یوری چۆن جادوگەرێك دەتوانێت برینێکی مەترسیدار کە لە کەلەکەی مندا هەیە، چارەسەر و دەرمان بکات. جادو ناتوانێت کاری دەرمانی پاکژکەرەوە ئەنجام بدات. ئەمە چ رێگە چارەیەکە، جیاواز لەوەش من چۆن دەتوانم چوار فەرسەخ بەڕێدا بڕۆم.

یوری بە خۆشحاڵییەوە ووتی:

سەرکەوتنی منیش لەوەدایە. جادوگەر بۆ ئەوەی لەرێگا زیانمان بەرنەکەوێت، شەش کەس لە ئازاترین پیاوانی هۆزەکەی لەگەڵ مندا نارد و چەند دەستورێکی بە یەکێك لەوان داوە کە پێش بەڕێکەوتن لەسەر برینەکەی ئێوە ئەنجامی دەدات.

کەی بەرێدەکەوین.

هەرکات بە باشی بزانن. ئەو شەش کەسە لەدەرەوەی ژوورەکەدان. قسەکانمان گەشتبووە ئێرە لەناکاو دەرگا کرایەوە و وەحشیەکی ڕووت و قووت بە باڵایەکی بەرزو سینەیەکی پان و رووخسارێکی ترس ئەنگێز لە کاتێکدا ئاگردانێك پڕ لە ئاگری لە دەستدابوو، هاتە ژوور، ئاگرەکەی لای سەری من دانا. کاتێك ئاگرەکەم بینی بەترسەوە

پرسیم:

یوری چی دەکەن. ئەم ئاگرە بۆ چییە؟

یوری دەستمی لە دەست گرت و ووتی:

دەبێت خۆراگربن، ئازار هەرچەندە بەهێزبێت لەخۆکوشتن باشترە. تازە ئەوکات بوو تێگەشتم دەیانەوێت چی بکەن و دەبێ بە چ بەدبەختیەکی گەورە رازی بم. بۆیە سەرم خستە ناو دوو دەست و لە ترس و ئازار لە کاتێکدا دڵۆپە گەورەکانی ئارەق لە ڕوخسارم دەتکا، ڕوخساری خۆم داشارد و چاوەکانم بەست.

وەحشیەکان بە تەواوەتی رووت بوون تەنیا پارچەیەکی زۆر تەنك و باریك بۆ داپۆشینی شەرمی خۆیان بەستبوو ولەلای راست و چەپی خۆیان دوو خەنجەری درێژو پانی وەك قەمەیان هەڵواسیبوو. رەنگی جەستەیان قاوەییەکی سووتاو نزیك بە ڕەش و پێستی ئەوان لە رووناکی ئاگر دەدرەوشایەوە و رووناکیەکی تایبەتی هەبوو. یەك لەوان کە دیاربوو، گەورەی ئەوانی ترە، هاتە پێش و بەوردی برینەکەمی پشکنی و دوای ئەوە سەیرێکی روخساری کردم و گەورەیی بازوو و گۆشتی سینگمی تاقی کردەوە. لەمە تێ نەگەشتم وام زانی دەیەوێت لە گۆشتی بازو یان سینەم بۆ پینەکردنی برینی کەلەکەم کەڵك وەربگرێت بۆیە لە یوریم پرسی و بەترس و چاوەڕوانییەوە چاوەڕێی وەڵامم دەکرد

یوری بە زمانێك کە تێنەگەشتم چەند پرسیارێکی کرد و ئیشارەی کرد و دواتر بە منی ووت:

بۆیە دەستی لە بازو و سینەی ئێوەدا تا لە رادەی هێزی ئێوە ئاگادار ببێتەوە. ئەو دەڵێت ئێوە زۆر لاوازن و ناتوانن بەرگەی ئازار بگرن. بەڵام پێم ووت لەگەڵ لاوازی جەستەیەکی بەهێزتان هەیە.

کاتێك ئێمە قسەمان دەکرد ئەو سەرقاڵی کاری خۆی بوو و ڕمێکی لە ئاسنی ڕەش لەناو ئاگردا دانابوو، دەیسوڕاند تا لە هەموو لایەکەوە سووربێتەوە. ڕمەکە بە ئەندازەی پانایی دوو پەنجەی مرۆڤ ئەستور بوو، بەڵام سەرەکەی تیژتر لە کۆتاییەکەی بوو. بە چاوانێکی زەق لێم دەڕوانی و هەرسات کە تێدەپەڕی و ڕمەکە سووورتردەبوو، ترسی من زیاتر و دڵم خێراتر لێی دەدا.

سەرئەنجام ڕمەکە سوربوویەوە، یوری هات. لای سەرم دانیشت و دوو مەچەکی دەستمی بە بەهێزی گرت و ئەژنۆکانی خۆی خستە سەر شانەکانی من و زەختی لێکرد. یوری دەستەکانی منی بە شێوەی خاچ ئاسا گرتبوو. توانای جووڵەم نەبوو.

پیاوە وەحشیەکە بە ڕمە سوورەبووەکە نزیك دەبوویەوە. چوارەکەی‌تر لای ئاگرەکەوە وەستابوون و شتیان دەوت و ئاوازیان دەخوێند و یەکی تریان خۆی خستە سەرقاچەکانی من و قولاپەی قاچمی بە دەستی گرت و بەرادەیەك زەختی لێکرد هەناسە لە سینەمدا توند بوو.

کاتێك ئەو پیاوە ڕەشە بە مێڵە ئاسنیەکە نزیك دەبوویەوە ولای من دانیشت، چاوەکانی خۆم داخست. ساتێك دواتر بۆنی گۆشتی سووتاو لە ژوورەکە هات و من قیژاندم و ئیتر نەمزانی چی بوو.

ئازار ئەوەندە زۆر بوو بێهۆشی کردم. نەمدەزانی چەند کاتژمێر بەو شێوەیە تێپەڕی، کاتێك هاتمە هۆش و چاوی خۆمم کردەوە کە لەسەر تەختەیەکی پان بووم و سەرەوخوار دەڕۆشتین.

وامدەزانی لەسەر عەرەبانە خەوتووم. شاخ و گەڵای دارەکان لەسەر سەرم زۆر نزیك بوو بە شێوەیەك ئەگەر دەستم درێژ دەکرد. دەمتوانی لقی دارەکانی جەنگەڵ بگرم.

دەردی کەلەکەم هێمن تریبوو و تازە ئەوکات بیرم کەوتەوە کاتی سوتاندنی برینەکەم بێ هۆش بووم. بڕیارم دا سەرم بەرز بکەمەوە و لە دەوروبەر بڕوانم بەڵام لەم کاتەدا دەنگی یوریم بیست کە دەیوت:

سەرتان بەرز مەکەنەوە بخەون.

دەست بەجێ دەنگی چەند گوولە بیسترا. زانیم لەسەر دەرگایەکی شکاو خەوتووم و لەسەر شانی چوار کەس لە ڕەشە وەحشییەکان دەگوێزرێمەوە. ئەی دەنگی گوولەکان چییە، ئێرە کوێیە؟ یوری ئەمەیشی ئاشکرا کرد و ووتی:

ئێمە بەناو جەنگەڵدا دەڕۆین بەڵام بەدبەختانە کالوویی و هاوڕێکانی بەدوامانەوەن.

هەرکەس بیەوێت بزانێت من لەوکاتەدا چ حاڵێك و چەند شیاوی بەزەیی بووم، دەبێت چەند خولەکێکی کورت چەند خولەك خۆی بخاتە شوێنی من تا بزانێت چیم بەسەرهات و چۆن ئەو خولەکە پڕ مەترسیانەم بەسەر برد.

بە جەستەیەکی کوون و سووتاو چ کارێکم لە دەست دەهات بەشێك لە جەستەی خۆم بە تەواوەتی نەمدەتوانی بجوڵێنم و بەشەکەی ترم ئەوەندە لاواز بوو توانایی هیچ کارێکی نەبوو، لەو چەند ڕۆژەدا ئەوەندە خوێنم لێ ڕۆشتبوو کە وزەی ژیان و هەناسە کێشانم نەبوو چ بگات بەوەی هەستم و یارمەتی یوری بێچارە، یوری ئەمەکدار و خۆشەویست کە هەمیشە وەك برایەك چاودێری دەکردم بدەم.

زۆر زەختم لە خۆم کرد تا بتوانم سەرم بۆ دواوە بسووڕێنم و یوری ببینم. دوو تفەنگی پێ بوو، یەکێ لە شان و یەکێ لەسەر دەست دانابوو و تەقەی پێ دەکرد بەڵام فیشەکی بەخۆرایی لە دەست نەدەدا و دەیویست لانی کەم بە یەک گوولە یەک کەس بکوژێت. رەشەکان منیان لەسەر شان بوو دەڕۆشتن وەک ئەوەی هیچ روداوێکی شیاوی سەرنج ڕووی نەدابێت. خوێنسارد درێژەیان بەڕێگەی خۆیان دەدا. ئەوسا نەمزانی بۆ ئەوان لە دەنگی ترس ئەنگێز و ویزەی گوولەکان ناترسن بەڵام دواتر کە لێکۆڵینەوەم کرد زانیم ئەو مرۆڤە نیوە وەحشیانە کە تفەنگیان نەبینیبووە و کاریان پێ نەکردوە، دەنگی تفەنگیان بە دەنگی ئاژەڵەکان دەشوبهاند و لەبەرئەوەی لە هیچ ئاژەڵێک نەدەترسان، لەویش نەدەترسان.

یوری ڕووی لەلایەکیترو پشتی لە من کرد بوو لەهەمان کاتدا بۆ دواوە دەڕۆشت و لەبەرئەوەی دارستان چڕ و تێپەڕین لەناو گەڵاو بەرگی دارەکان دژواربوو، یوری هەمیشە دە هەنگاو لە ئێمە دوور بوو هەندێ کات لە نێوان دارەکاندا خۆی دەشاردەوە و چەند سات دواتر خۆی بە ئێمە دەگەیاند و چاودێری منی دەکرد تا گوولەی ترم بەر نەکەوێت.

من بە ناوی خۆی بانگم کرد و پرسیم:

یوری..... تەقە مەکە. رەنگە ونمان کەن:

یوری ئەم بیرۆکەی پەسەند کرد و خۆی لە پشت دارێکی پیردا حەشاردا و ئەوەندە وەستا تا ئێمە لەوێ دوور کەوتینەوە و کالوویی و هاوڕێکانی نزیک بوونەوە.

ئەمە فێڵێکی زۆرباش بوو، یوری بە کاری بەست. کالوویی و هاوڕێکانی بە گوومانی ئەوەی ئێمە سەرقاڵی تەقە کردنین، لە پشت دارەکان سەنگەریان گرت و بەرگریان کرد. ئەم درەنگ کردنەی ئەوان رێگەی بە ئێمەدا مەودایەکی زۆر دورکەوینەوە.

یوری بە هەردوو تفەنگەکەی تەقەی دەکرد و جۆرێك نیشانی دەدا کە ئەوان وا هەست بکەن منیش لای یوریم. من لەسەر تەختەکە و لەسەر شانی رەشەکان بووم، دەنگی گوولەکانم بە جوانی دەبیست بەڵام هەرچی زیاتر لە جەنگەڵدا دەڕۆشتینە پێش، دەنگی تەقەکردن کەمتر دەبوو تا شوێنێك نیو کاتژمێر دواتر بێجگە لە دەنگی هەناسەدانی یەك دەنگی وەحشیەکان ئیتر هیچ دەنگێك بەرگوێم نەدەکەوت.

ئەو نیوە وەحشیانە کە بە هیچ جۆرێك زمانی منیان نەدەزانی و منیش نەمدەتوانی بە زمانی خۆیان قسەیان لەگەڵدا بکەم، بێ گوێدان بەو روداوانەی رویدەدا دەڕۆشتن و

منیشیان لەگەڵ خۆیان دەبرد بەڵام کەم کەم نیگەران بووم وکەوتمە بیری یوری. فکر و خەیاڵێکی ئازاردەر هێرشی کردە سەر ڕۆحم بۆیە بڕیارم دا بیانوەستێنم تا ئەگەر یوری زیندوو بێت و ڕێی ون کردبێت بماندۆزێتەوە. بەڵام هەرچەندە هاوارم کرد و مەبەستی خۆم بە ئیشارە لەوان گەیاند، ئەنجامی مەبەست بە دەست نەهات و ئەوان یان تێگەشتن یان تێنەگەشتن. بێ گوێدان بەوتەکانی منوەی من ووتم درێژەیان بە ڕێگەی خۆیان دا و ڕۆشتن.

زیاتر لە یەك چارەکە کاتژمێر بە جووڵەی دەست وپێ و تەکان دانی تەختەیەك کە لەسەر شانی ئەوان بوو هەوڵم دا مەبەستی خۆمیان تێ بگەیەنم بەڵام ئەوان وەك ئەوەی هەر قسەم نەکردبێت و یان گوێی بیستینیان نەبێت بە هەناسەدان و هن هن کردن درێژەیان بە ڕێگەی خۆیاندا.

چارەکە کاتژمێر دواتر کە بە تەواوی لە وەستانی ئەوان بێ هیوابووم بینیم سەرو کەلەی یوری لەدوورەوە دەرکەوت و بەڕاکردن بەرەو لامان دێت.

یوری کاتێك گەشتە لای ئێمە، ڕووی کردە من و ووتی:

ئەوان ونیان کردووین و لە ڕێگەیەکیترەوە ڕۆشتوون. ئەگەر یەك ڕۆژ لەناو جەنگەڵدا سەرگەردان بن، ئێمە مەبەستەکەی خۆمان ئەنجام دەدەین و دەرۆین و ئەوان ئیتر دەستیان بە ئێمە ڕاناگات.

دوای ئاگادار بوون لەم بابەتە شادمان بووم و هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵکێشا و دواتر لە یوری سەبارەت بە فیشەکەکانم پرسیارم کرد. یوری ووتی:

نیگەران مەبە. هێشتا بیست مەخزەنی بیست دانەیی فیشەکمان هەیە، و ئەم بڕە بەشی یەك ساڵ گەشتی ئێوە دەکات بەومەرجەی دەستی پێوە بگرن.

من و یوری سەرقاڵی وتوێژ بووین کە لەدوور روناکی ئاگر دەرکەوت و یوری وتی:

لە هۆزی وەحشیەکان نزیك دەبینەوە.

دواتر ئاخاوتنی ئێمە سەبارەت بەشێوەی چارەسەری جادوگەر کە بوونەوەرێکی نامۆیە درێژەی پێدرا و ئەوەندە لەم باسە نوقم بووین کە بەتەواوی کالوویی و هاوڕێ مەترسیدارەکانیمان لەبیرکرد.

بێ ئاگا لەوەی کالوویی مەترسیدارترین دزی ئەو چوار وڵاتەی دراوسێ چ پلانێکی بۆ دارشتووین. کۆمەڵێك لە دانیشتوانی هۆز ژن و پیاو، پیرو گەنج رووت و قووت لەکاتێکا هەموویان بەڕمێك لەحەیزەران یان تیروکەوان چەکداربوون، بۆ پێشوازیمان

هاتن و هەراو هوریایەکی سەیریان ڕێك خست بە شێوەیەك من و یوری قسەکانی خۆمان پچڕاند و ئەگەر بشمان ویستایە قسەبکەین بە هۆی ئەو دەنگە دەنگە ئەگەری نەبوو، سەرۆکی هۆز لەپێشەوە و دەستەیەك لە گەورەکانی هۆز بەدوایدا دەڕۆشتن و بەرەو لای ئێمە دەهاتن.

قیافەی سەرۆکی هۆز سەیر بوو هەروەها دەوروبەرەکەی کە بەگشتی لە گەورەکانی ئەو هۆزە دەژمێردران خاڵی سەرگەرمی نەبوو. سەرۆك پیاوێك بوو چوارشانە، باڵا بەرز، روخسارێکی ساف و درەوشاوەی هەبوو.

سەرکوڵم و ناوچاو و خوار ناوچاو و چەناگەی خۆی رەنگ کردبوو. چەندین هێڵی هاوتەریبی لەسەر سنگ و سکی زل کێشابوو و لەناو ئەوهێڵانە چەندین وێنە کێشرابوو کە دەڵێن مانای تایبەتیان هەیە وئێمە لێی تێ ناگەین.

سەرۆکی هۆز بوونەوەرێکی زل و مەترسیدار بوو. دەوروبەرەکەشی هەروا و کەمێك کاڵتر لەو خۆیان رازاندبوویەوە.

شتێك کە لە یەکەم ساتدا سەرنجی هەر بینەرێکی رادەکێشا ئەوەبوو هەموویان رووت و قووت بوون تەنانەت دە ژنی سەرۆکی هۆز کە هەموویان لەگەڵیدا بوون و دەهاتن.

ژنانی سەرۆك هۆز جگە لە دانەیەکیان هەموویان جوان و جوانترینەکەیان کچێك بوو کە زیاتر لە ١١ تا ١٢ ساڵی نەبوو ئەو چوار کەسەی منیان لەسەر شان هەڵگرتبوو کاتێك گەشتینە بەردەم سەرۆك تەختەکەیان لەسەر زەوی دانا و بە کوڕنوش بردن بۆ دواوە رۆشتن و لەناو قەرەباڵغیدا لەچاو ون بوون. سەرۆکی هۆز لەناو بێدەنگی فەرمانڕەوادا، دو سێ هەنگاوی خێرایی بەرەولای من هەڵگرت و لەیەك دو هەنگاوی مندا وەستاو زەق زەق لە روخسارمی ڕوانی. چاوە سووررو زەقەکانی ئەو ترسی لەدڵمدا دروست کردم بەڵام لەبەرئەوەی شتێك شیاوی ترس بێت لەبارەی ئەو هۆزەوە نەمبیستبوو دەمزانی ئەوان بێ ئازارن، خۆم ئارام کردەوە و لەبەرانبەر روانینی ئەو بزەیەکم هێنایە سەر لێو.

ئیتر نەمدەتوانی سەری خۆم بەرز ڕاگرم، هیلاك ببووم ئازارێکی زۆرم لە شوێنی برینەکەدا هەست پێ دەکرد، سەرم لەسەر تەختەکە دانا.

سەرۆك چەند شتێکی لە وەرگێڕەکەی خۆی پرسی و ئەویش لە یوری پرسیاری کرد و سەرئەنجام دوای یەك دوو خولەك سەرۆکی هۆز لەگەڵ دەوروبەرو ژنەکانی خۆیدا رۆشت و رێگەیدا بچمە ناو هۆزەکە. دانیشتوانی هۆز بڵاوەیان لێکرد و رۆشتن بەڵام

کاتێك لای ئێمەوە تێپەڕین بە چاوانێکی پڕ لە سەرسوڕمانەوە لە جل و بەرگ و قیافەی ئێمەیان دەڕووانی و دوورکەوتنەوە، کاتێك ئەو ناوە چۆڵ بوو، ئەو چوار نەفەرە دەرکەوتنەوە و منیان لەسەر تەختەکە بەرزکردەوە بەرەو شوێنی جادوگەری هۆز کە لە ناوەڕاستی هۆزدا بوو بەڕێکەوتن. هێشتا لە قەراغ ماڵە قامیشەلآنەکان تێدەپەڕین کە لەناکاو یوری خۆی بە من گەیاند و ووتی:

ئاخ چ بەدبەختیەکی گەورە؟

بەخێرایی و ترسەوە پرسیم: چی بووە؟

یوری وەڵامی دایەوە: ئێستا کالوویبم بینی هاوڕێ لەگەڵ شەش کەس لە پیاوانی خۆی لە لایەکیتر هاتە ناو هۆز و لەگەڵ سەرۆکی هۆز هاوڕێیانە دەستی بە وتوێژ کرد.

من بێ ئەندازە ترسام بەڵام نەمدەتوانی باوەڕبکەم. ووتم:

ڕەنگە چاوت بە هەڵەدا چوبێت و هەڵەت کردبێت..... چی دەڵێیت؟ ئەوت لەکوێ بینی؟ تۆ کە لەگەڵ مندا بوویت ! یوری لە کاتێکدا بە ووردی لەپێش و دواوەی دەڕووانی ووتی:

من لەناو دوو ڕیز لە ماڵەکان ئەوانم بینی و دڵنیام کالوویی ئێمە لە سەرۆکی هۆز دەستێنێت و یان کارێك دەکات ئەوان ئێمە بکوژن.

ئەم شتانە کە لە زمانی یوریەوە دەبیسترا زیاتر بووە هۆی ترسی من. دان بەوەدا دەنێم لە هەموو دەورانەکانی ژیانم کەسێکی ئازا و چاو نەترس نەبووم و ئێستاش نیم بەڵام جیاوازی ئێستا لەگەڵ کۆندا ئەوەیە ئێستا کەسێکی دنیا دیتو و بە ئەزموونم. بەڵام لە کۆندا لاوێکی ترسنۆك بووم. بۆیە ناتوانم حاشا لەوە بکەم بە هەربیانوویەکی بچووك دەترسام و دڵم دەلەرزی و زمانم دەگیرا.

زیاتر لە هەرشتێك لەوە دەترسام بێ تاوان بکوژرێم و ئەگەر کالوویی منی بکوشتایە بەڕاستی بێ گوناح دەمردم چوونکە خوا دەزانێت لەنێوان من و سینگوالا ژنە جوانە ناشەرعیەکەی هیچ جۆرە پەیوەندیەك نەبوو.

جارێکیتر دەستم لە گیان شۆرد و سەرم لەسەر تەختەکە دانا، بەهۆش و نیوە بێ هۆش بووم نەمزانی چی گوزەرا.

کاتێك چاوەکانم کردەوە لە ژوورێکی داری گەورە و لەسەر تەختەیەکی بەرز دابووم. ژوورەکە پڕ بوو لە دووکەڵ و بۆنی سەیری بێ وێنە، نە لە بۆنی چڵك دەچوو نە لە بۆنی گوڵ و بۆن. ئێستا کاتێك ئەو بۆنانە بیردێنمەوە زیاتر سەرم سوڕدەمێنێت چوونکە

بە شێوەیەك کاریگەری لەسەر دەمارەکانم کرد بە هیچ هێزو هیچ ڕستە و وشەیەك ناتوانم چۆنیەتی و چەندایەتیەکەی باس بکەم.

جیاواز لە بۆن و ڕووناکی و دووکەڵ، قەرەباڵغیەکی سەیر لە ژوورەکەدا دەبیسترا کە دەست بەجێ تێگەشتم دەنگی سەما و ئاوازی وەحشیەکانە.

پێشتر لە سینەمادا بینیبووم کاتێك وەحشیە مرۆڤ خۆرەکان دەیانەوێت گەشتیارێکی سپی بخۆن، چۆن بە دارێکەوە دەیبەستنەوە و لە دەوروبەریدا دەست بە سەماکردن دەکەن و دواتر بە چ شێوەیەك جەستەکەی تیکە تیکە دەکەن و بە کاڵی بەددان دەیچڕن و دەیخۆن.

لەوکاتەی چاوەکانم کردەوە و هاتمە هۆش، ئەم دیمەنانە لەبەرچاومدا وێنەکرا و دڵنیابووم وەحشیەکان سەرقاڵی ئامادەکارییەکانی خواردنی منن و ڕەنگە یوری داماو ئێستا لە سکی ئەواندا بێت. بیهێنە بەرچاو چ حاڵێکم بوو. هێواش زەختم لە گەردنم کرد تا سەرم بەرزبکەمەوە و دەوروبەرم ببینم بەڵام هێشتا سەرم لە سەر دارەکە بەرز نەکردبوویەوە کە کتاوپڕ دەستێکی بەهێز شانەکانی گرتم و دەنگێك بیسترا کە ووتی: مەجووڵێن.

بە دژواری چاوەکانی خۆم کردەوە. سەیرم کرد و بە خۆشحاڵییەوە بینیم یوری لەسەر سەرم وەستاوە. ئەوەندە خۆشحاڵ بووم نزیك بوو بقیژێنم. یوری بەرەو لای چەپ هەنگاوێکی هەڵگرت تا لە من نزیکتر بێت و من بەبێ دژواری بینیم.

جادوگەری هۆز ڕووبەندێکی ترسناکی لە ڕووخسار نابوو و سەری خۆی بە پەڕە ڕەنگیەکانی باڵندەکانی جەنگەڵ ڕازاندبوویەوە.

چەند هەنگاو ئەولاتر، لای ئاگر، سەری بڕاوی مرۆڤێك لەسەر مێڵەیەکی داری بوو و کۆمەڵێك ژن و پیاو لە دەوری سەربڕاوەکە سەمایان دەکرد و بەنێزە درێژەکان کە لە دەستیانابوو هەندێ کات سەربڕاوەکانیان دەجووڵاند. ئەم سەمایە زیاتر لە نیو کاتژمێری خایاند و سەرئەنجام تەواوبوو. وەحشیەکان هیلاك ببوون ئارەقیان کردبوویەوە. جادوگەر لێم نزیك بوویەوە و لەناو کوونی قامیشێکی کورت کە سەرەکەی ئەڵقەیەك گووڵی پێوە بوو، چەند دڵۆپی گیراوەیەك، گیراوەیەك کە نەمدەزانی چییە و چ کاریگەریەکی هەیە و چۆن ئامادەکراوە، ڕژاندییە ناو کوونی برینەکەی من و بە دەستە پیسەکانی خۆی دەستی پیاهێناو دواتر بە ئیشارەیەك هەموویان ڕۆشتنەدەر.

کاتێك جگە لە من و یوری کەس لە ژوورەکەدا نەما، هێواش لە یوریم پرسی.

لە کالوویی چ خەبەر؟ چی لێهات...

قسە بکە. چیمان بەسەر هاتووە.

یوری بێدەنگ بوو و سەری خۆی خستەخوار. ئەم جووڵەیە کە بە پێچەوانەی عادەتی یوری بوو زیاتر بووە هۆی ترسی من و دوبارە پرسیارم کردەوە.

بۆ قسە ناکەیت...

سەرئەنجام یوری لێوی بۆ قسەکردن کردەوە و وتی:

کالوویی لەگەڵ سەرۆکی ئەم هۆزە هاورێیە. هاورێیەتی ئەوان لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە کالوویی یەک جار لە مردن رزگاری کردووە و ئێستاش کە کالوویی ئێمەی لەو داواکردوە سەرۆکی هۆز بێ چەند و چوون رازی بووە بماندات دەست کالوویی.

من بەپەلە و بەداخەوە ووتم:

ئاه..... کارمان تەواوبوو. کالوویی دەمانکوژێت حەیف بۆ ئەو هەموو ئازارەی کێشامان.

یوری ووتی: زۆر نیگەران مەبن و.....

بەڵام چی..... بۆ قسەکەت تەواو ناکەیت؟

بەڵام جادوگەری هۆز نێوەنجیگەری کردوە کە دوای باشبوونەوە ئێمە بداتە دەست کالوویی.

ئەوان کوشتنی دیل و بریندار بە شووم دەزانن و دەبێت ئەسیر باش ببێتەوە و ئەوسا بکوژرێت لەبەرئەوەی ئێستا ئێمە بە دیل دەژمێرن بڕیار دراوە کە:

من قسەکەیم پچڕاند و پرسیم:

من کەی باش دەبمەوە؟ جادوگەر نەیوت؟ خۆزگە باش بوونەوەی من پێی بچێت.

یوری بە خوێنساردی ووتی:

برینەکەی ئێوە دوو تا سێ رۆژیتر سارێژ دەبێتەوە و دەتوانن بە قاچی خۆتان برۆن بۆ کوشتارگا.

من پرسیارم کردەوە: ئێستا ئێمە لە چ حاڵێکداین.....

لەم ژوورەدا زیندانین و دوان لە نۆکەرەکانی کالوویی لە تەنیا دەرگای ئەم ژوورە کە زۆر بەهێزە، پاسەوانی دەکەن دیوارەکانی ژوور زۆر بەهێزە و لە قەدی داری قامیش کە لەسەریەک دانراوە، دروست بووە و تێپەڕین لێی کارێکی ئاسان نییە.

جەستەم لە ئارەقدا شل بوو و کراسەکەم بە جەستەمەوە نوسا. ئەم هەواڵە ترس

ئەنگێزە زیاتر نیگەرانی کردم. راستیەکەی وەك ئەوە وابوو شیشێکی سوورەبوو لە جیاتی ئەوەی کردبێتیانە ناو برینەکەی من، لە دڵمدا ڕۆیان کردبێت. هەستم دەکرد خوێن لە دەمارەکانمدا بە دژواری هات و چۆ دەکات و دڵم بەهێواشی لێ دەدات.

بەوردی سەیرێکی دەرگاو دیوارو سەقفم کرد، سەرئەنجام دوای ئەوەی هەموو شوێنێکی ئەو ژوورە داری و حەسیریەم لەبەرچاو گوزەراند زانیم هەڵاتنمان لەوێ ئەگەری نییە.

یوری وەك ئەوەی بە نیگا کردن هەستی بە مەبەستەکەی من کردبێت، کاتێك چاومان بەرچاوی یەك کەوت ووتی: بەڵێ ڕاکردن لێرە ئەگەری نییە بەڵام......

بەخێرایی پرسیم: بەڵام چی یوری؟ تۆ پیاوێکی وشیاریت، تۆ هەمیشە بۆ من فریشتە بوویت قسە بکە بەڵام چی...؟

بەڵام هیچ کارێك نا ئەگەر نییە... دەبێت هیوادار بین.

لەو پەڕی بێ هیوایدا هەناسەیەکم هەڵکێشاو ووتم:

یوری تۆش بوویتە فەیلەسوف. لە مەبەستەکەت تێ نەگەشتم دەڵێی تۆش عەقڵت لەدەست داوە.

یوری بزەیەکی کورتی گرت و ووتی:

ئێمە عادەتمانە هەمیشە لە دژوارییەکاندا خوێنساردبین. لەم ڕووداوانەدا تەنیا خوێنساردی دەتوانێت مرۆڤ لە مردن رزگار بکات. ئێمە لە منالیەوە وا عادەتمان دەدەن کە لە هیچ ڕووداوێك هەرچەندە گرنگ و پڕ مەترسیش بێت، نەترسین و کۆنترۆڵی بیرو دەمارەکانی خۆمان لە دەست نەدەین، تەنیا لەیەك شتدا بۆمان هەیە زوو تووڕە بین و دەست بەجێ پەچەکردار نیشان بدەین ئەویش ناموسە. ووتم:

تۆ ئامۆژگاری دەکەیت یوری.... ! ئێستا کاتی ئەم قسانەیە. تۆ شێوەی ژیانی خۆتانم بۆ باس دەکەیت و ئێستا دەرفەتی ئەم باسانەم نییە.

یوری ئەم جارەش دەمە گەورەکەی خۆی بە پێکەنین کردەوەو ووتی:

بەڵام سەرۆك ئەوەندەش بێ هیوا مەبن. ئەم جادوگەرە کەسێکی میهرەبانە و یارمەتیمان دەدات. لەناکاو لە شوێنەکەمدا هەستام. ئەم جووڵە خێرایە بووە هۆی ئەوەی ئازارێکی زۆرم پێ ببرێت یوری بە نەرمی منی خەواند و ووتی:

ئارام بن... ووتم جادوگەر پیاوێکی میهرەبانە بەڵام نەئەوەندە میهرەبان ئێوە لەبەر ئەو خۆتان لەناوبەرن و ببنە هۆی خوێن بەربوون.... ئەگەر ئەمشەو بەئاسوودەیی

بخەون بەیانی دەرفەتی بیرکردنەوەمان دەبێت من دەستی یوریم گرت و لەکاتێکا لە ئازاردا دەمناڵاند و لە ئارەقدا تەڕببووم پرسیم:

یوری ! هەست دەکەم پلانێکت داڕشتبێت و دەتەوێت کارێك بکەیت... بڵێ وایە... منیش ئاگادار بکە تا شادمان بم.

یوری بەهێواشی ووتی:

سەرۆك شتێکی گرنگ نازانم بەڵام لەیەك شت سەرم سوڕماوە و ئەوەش ئەوەیە کاتێك جادوگەر ناوی سینگوالای بیست، باوەڕی گۆڕاو بەرانبەر بە ئێمە میهرەبان بوو. ئەگەر ئەو نەبووایە ئێمە ئێستا لە دەستی کالوویدا بووین و ئەویش بەدڵنیاییەوە تا ئێستا ئێمەی کوشتبوو و لاشەمانی لە جەنگەڵدا فرێدابوو و ڕۆشتبوو.

بە سەرسوڕمانێکی زیاد لە ڕادە لە یوریم پرسی:

تۆ هەست دەکەیت چ پەیوەندیەك لە نێوان سینگوالا و جادوگەردا هەبێت.

نازانم سەرۆك... لە پەیوەندی ئەوان ئاگادارنیم. ئەوەندە دەزانم کاتێك جادوگەر ئاگاداربوویەوە، نێوەنجیگەری کرد و بەم شێوەیە لە بەدەستەوەدانی کاتی ئێمە بە کالوویی ڕێگری کرد و ئێمەی لە مردن رزگار کرد.

ئەمە جگە لەرێکەوت یان باوەڕێکی خورافی شتێکی تر هەیە...؟

هەڵبەتە... باوەڕ و ڕێکەوت ئەوەندە گرنگ نین، ئەم جادوگەرە بە حەزو پشت گەرمیەوە کاری کرد تا کارەکەی گەیاندە ئێرە، بۆیە گوومان دەکەم دواتریش هۆکارەکانی رزگاری یان لێ خۆش بوونی ئێمە ئامادەبکات. ئەمانە باوەڕێکن هەرکەسێك لەبوونیاندا ئازادە و یوریش باوەڕی خۆی دەردەبڕی. ئەم بابەتانەی ئەو باسی دەکرد نەیدەتوانی بێتە هۆی دڵگەرمی من. بەبێ هیوایی سەرم لەسەر مێزە چڵکنەکە داناو کەوتمەوە ناو دەریایی بیرکردنەوە.

لە پشت پەردەی ژوورەکە سێبەری دوو پیاوە چەکدارەکەی کالوویم دەبینی کە لە پشت دەرگاکە پیاسە دەکەن و لە کاتێکا تفەنگەکانیان لەسەر شانە، بۆ ئەم لاولا دەڕۆشتن.

لە خولەك و کاتژمێژەکانی دواتر کە بەهێواشی تێپەڕیان کرد، من و یوری قسەمان نەکرد چوونکە هیچ بابەتێکمان بۆ قسەکردن نەبوو. مردنمان نزیك و ئاسایی بوو هەرکەسێکیتریش لە جێگای ئێمەدا بێت بێجگە لە مردن و چارەنوسی خۆی بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە. لەو ساتانەدا ماڵئاواییم لە دنیا دەکردو داخم دەخوارد بۆ ئێستا

کە دەبێت بمرم ئەم هەموو ئازارەم پێ برا و جەستەی خۆم خستە بەردەست چزاندنی ئاسنی سوورەوەبوو.

لە دڵمدا جنێوم بە سینگوالا دەدا و دەموت:

(( خوا لەعنەت لەم ژنە پیس و بێ ئابڕووە بکات کە لەبەر هەوەسبازی ژیانی گەنجێکی وەك منی گیرۆدەی دەمارگیری و لەخۆڕازی بوونی شێتێکی وەك کالوویی کرد ))

داخم دەخوارد بۆ کالوویی لە ڕاستیەکان ناگات؟ بۆ نایەوێت باوەڕبکات من لەگەڵ سینگوالا هیچ پەیوەندییەکی ناشەرعیم نەبووە و بێ گوناحم؟ ئارەزوومەندبووم کالوویی پیاوێکی عاقڵ بووایە و باوەڕی بە قسەکانی من بکردایە و دەستی لەسەرمان هەڵگرتایە.، خولەك و کاتژمێرەکان تێدەپەڕین و ئێمە لە بێدەنگیدا نوقم بووین و هەرکام بە جۆرێك لەگەڵ فکرو خەیاڵدا شەڕمان دەکرد و خۆمان سەرقاڵ.

نەمزانی چ کاتێکی شەو یان ڕۆژ بوو کە کتوپڕ پەردەکە ڕۆشتە سەر و هەمان جادوگەر بە هەمان ڕووبەندی سەیر و ترسێنەر هاتە ناو. یەکسەر هاتە لای من و سەیری برینەکەی کردم. جادوگەر دوای پشکنینی برینەکە لەناو پێستی نارگیلێك کە لەدەستیا بوو، برێك گیراوەی بە پەنجە ڕەش و چڵکنەکانی خۆی دەرهێنا و لە برینەکەی سو و ئەوسا بە زمانێك کە تێنەگەشتم دۆعای خوێند و سەرودەستی خۆی جوڵاند و دوای تەواو بوونی ئەم کارانە ڕوویکردە یوری و ووتی:

دەبینی برینەکە بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا چاك بوویەوە........

یوری بەرەو لای برینەکە نوشتایەوە و بە جوانی لێی ڕووانی. من خۆم نەمزانی چ حاڵێکم هەیە و لەلایەکیتر نەمدەتوانی برینەکە ببینم بەڵام لە کرانەوەی ڕووخساری یوری ووتەکانی جادوگەری هۆز بۆم دەرکەوت برینەکەی من ئەگەر بەتەواوی سارێژ نەبووبێت، زۆر باش بووە.

جادوگەر دوای ئەم کارانە بەرەو لای دەرگا ڕۆشت تا بڕواتە دەر، بەڵام پێش ڕۆشتنەدەر وەستا و بەهەمان قیافە و هەمان دەمامکی ترسێنەر ڕووی سوڕاند و بە یوری ووت: ئایا خواردنیان بۆ هێناون تا بیخۆن.

یوری بە زمانی خۆیان وەڵامی دایەوە:

نە.... هیچمان نەخواردوە بەڵام برسیمان نییە. خۆزگە فەرمانتان دەدا چەکەکانمان پێ بەنەوە. جادوگەر چەند ساتێك زەق زەق لە من و یوری ڕووانی و دواتر بێ ئەوەی

شتێك بڵێت لە ژوورەکە رۆشتەدەر. دڵم بێ ئیرادە تەپە تەپ لێی دەدا و خۆیشم نەمدەزانی بۆ و لەبەرچی. هەستێکی سەیر لە ناخمدا پەیدابوو و چوونکە هیچ کات نەمتوانی و ناتوانم قسە لە دڵدا رابگرم ڕووم کردە یوری ووتم:

یوری... دەڵێی ئەم جادوگەرە، جادوگەری پێشتر نەبوو... لەگەڵ ئەوەی لەوکاتەدا بێ حاڵ و بێ هۆش بووم جوان جووڵەکانی دەست و پێ و ڕووخساریم لەبیرە... ئەم کەسە ئێستا لای ئێمە وەستابوو، ئەو نییە.

یوری بە قووڵی لە ڕووخسار و چاوەکانی منی ڕووانی و دوای چەند ساتێك بێدەنگی ووتی:

ئەمە بابەتێکە نابێت بیهێنینە سەر زمان. منیش هەستم پێکرد. بەرژەوەندی ئێمە لەوەدایە بێدەنگ بین. ئیتر قسەم نەکرد و بێدەنگ بووم. دووبارە بێدەنگی لە ژوورەکەدا بوو بە فەرمانڕەوا بەڵام ئەمجارە بێدەنگی ژوورەکە زوو شکا چوونکە یەك دوو خولەك دواتر پەردەی ژوورەکە هەڵدرایەوە و چەند کەسێکی قوول برێك گۆشتی کوڵاو و مەرکانەیەکی گەورە پڕ لە ئاوی فێنکیان بۆ هێنایین و دوای ئەوەی لەبەردەم من و یوریدا دایان نا، رۆشتنەدەر هیچ کام لە ئێمە حەزمان لە خواردن نەبوو بۆیە گوێمان بە گۆشتە کوڵاوەکە نەداو دەستمان بۆ نەبرد تەنیا ئاومان خواردەوە و مەرکانەکەمان لەوێ بەجێ هێشت. کاتژمێرێك زیاتر یان کەمتر تێ نەپەری. کەم کەم بێدەنگی قورستر دەبوو چاوەکانم خەو دایدەگرت و پێڵوەکانم قورس ببوون. نزیك بوو خەو بمباتەوە لەدەنگی پێی یوری کە لە شوێنەکەی هەستا، وشیار بوومەوە و سەیرم کرد. یوری وەك پشیلەیەك کە هێواش هێواش بەرەو گۆشتەکە بڕوات و یان خۆی بگەیەنێتە قەفەسی باڵندەیەك، لە شوێنەکەی هەستاو دوای چەند هەنگاوی خێرا، هێواش هێواش لەسەر نوکی پێی خۆی گەیاندە گۆشتەکە و بەخێرایی هەڵیگرت و چەند پلێکی گۆشتی لە ئێسقان جیاکردەوە و فرێیدا. من لەماناى ئەم جووڵەیەی یوری کە بێ ئەندازە لام سەیر بوو، تێنەگەشتم و گوومانم کرد یوری شێت بووە، بەڵام یوری شێت نەببوو.

یوری بەم شێوەیە چەند ساتێك گۆشتی ڕانی تیکە تیکە کردو سەرئەنجام شتێکی سپی لێ دەرهێناو بەخێرایی خستیە باخەڵیەوە، دواتر گۆشتەکەی بەجێ هێشت و لەشوێنی خۆیدا دانیشت. لەژێر چاو سەیرم دەکرد. یوری وەك هەڵۆیەکی تیژبین سەرنجی بەدەروبەری داو لە ڕووناکی کەم ڕەنگ و لەرزۆکی مەشخەڵە ڕۆنییەکان کە بە دیوارە دارییەکەوە هەڵیان واسیبوو، بەجوانی شوێنێکی پشکنی و کە دڵنیابوو کەس لە

دەرەوە یان ناوەوە سەرنجی لای ئەونییە، لە شوێنەکەی هەستاو خۆی گەیاندە من.

من کە هەموو کارەکانی ئەوم بینیبوو بەهێواشی بەڵام بەخێرایی لێم پرسی:

چی بوو یوری...؟ چیت دۆزییەوە.....؟

نامەیەك سەرۆك... نامە.

لەناکاو لە شوێنەکەم هەستام و لەسەر تەختەکەم دانیشتم. ئێستا لە دوو لاوە شادمان بووم. یەك ئەوەی ئازارم نەبوو و ئێستا کە بەم خێراییە لە شوێنەکەی خۆم هەستام هەستم بە ئازار نەکرد و ئەویتر ئەوەی لەناو جلەکانی خۆی شتێکی سپی کە لەناو گۆشتی کولاوی ڕان دەرهێنابوو، دەریکرد و من بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بینیم شتە سپییەکە، نامەیەکە بە خەتی خۆش و ئینگلیزی لەسەری نوسراوە، دیار نەبوو کێ ئەو نامەی بۆ نوسیوین و لەناو گوشتە کولاوەکەدا دایناوە. بەهەرحاڵ یوری سووچی کاغەزەکەی لەوێدا بینیبوو و نامە گرمۆڵەکراوەکەی دەرهێنابوو و لەو نامەدا کەسێکی نەناسراو نوسیبووی:

(( بەهیچ جۆرێك مەترسن. لەناو مەرکانەکە کە وەك گۆزەی ئاو بۆ ئێوە هاتووە، دوو خەنجەر هەیە. خەنجەرەکان هەڵگرن و کاتێك دەنگی فیکەیەکتان لە دەرەوە بیست ئامادەبن. بەشێوەیەك بجوڵێنەوە پاسەوانەکان گومانتان لێ نەکەن. دوای بیستنی فیکە تا سەد بژمێرن و ئەوسا لەدواوە هێرش بکەنە سەر پاسەوانەکانی خۆتان و دوای ئەوەی ئەوانتان کوشت هێواش لەلای چەپ بە دەرگای ئەو ژوورەی تیایدان، بسوڕێن و بڕۆنە ناو جەنگەڵ. لەپشت دیواری ڕۆژئاوا کەسێك چاوەڕێتانەو تا دوو کیلۆمەتری ڕێنوێنیتان دەکات و لەوێوە دەگەڕێتەوە.

خوا یارو یاوەری ئێوە بێت ))

من و یوری بە وەرگرتنی ئەم پەیامە سەرمان سوڕما و لەبەرئەوەی باوەڕمان بە ئاوا بەختەوەرییەك نەبوو، توشی گومان بووین. ڕاوێژمان کرد. ووتم:

ڕەنگە ئەم فێڵە کالوویی ڕێکی خستبێت تا بمان کوژێت.

بەڵام یوری دژایەتی باوەڕەکەی کردم و ووتی:

هەرگیز وانییە، چوونکە ئەگەر کالوویی بیەوێت بمانکوژێت ئەم کارانە ناکات، ئەو سەبر دەکات و بەیانی هەردووکمانی بەدەستەوە دەدەن بەوپەڕی ئاسوودەیی تیربارانمان دەکات.

یوری دووخەنجەری ناو مەرکانە ئاوەکەی دەرهێناو لەژێر جلەکانمانەوە دامانشارد.

لەم کاتەدا دەنگی فیکە کە بیستراو یوری لە دڵدا دەستی بە ژماردن کرد.

بۆ ئەوەی باشتر بتوانین ڕابکەین، من یەکێك لە مەشخەڵەکانم کوژاندەوە تا ژوورەکە تاریکتر بێت بارودۆخێکی مەترسیدار هاتبووە پێش، مرۆڤ تا خۆی ڕووبەڕووی ئەم بارودۆخە نەبێتەوە ناتوانێت هەست بکات گرنگی ئەم کارە چەندە.

ئێمە دوو نەفەر کە لەم خاڵە مەترسیدارەی دونیا کەسمان جگە لە خوا و بەزەییەکانی ئەو نەبوو، دەمانتوانی چی بکەین مەگەر ئەوەی بە پەیامی جادوگەر ڕازی بین، ئێوەی خوێنەر کە ئێستا سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم دێڕانەن، خۆتان بخەنە جێگای ئێمە و گوومان بکەن لەبەردەم قاپی مەرگدا، ئاوا پەیامێکی پڕ هیواتان پێ گەشتووە... چی بکەین؟ ئەگەری ئەوە هەیە لەبەرچاوی نەگرن و چاوەڕوانی مەرگبین... هەرگیز...

لە چاوە ڕەش و وردەکانی یوری کە لە چاوی هەڵۆ دەچوو، نەبوونی باوەڕم دەخوێندەوە و ئەویش کە کەمێکی وشیارو زیرەك بوو لە جووڵەکانی هەستی بەمە کرد. دەرفەتی وتوێژ و قسەی زۆرمان نەبوو بەڵام لە سەیرکردنی یەکتر تێگەشتین چی دەڵێین و چی دەبیستین.

وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا هەردووکمان، من و یوری کەوتینە ئەو بیرەی ڕەنگە ئەم نامەیە دروستکراو بێت و لەلایەن کالووییەوە بۆ ئێمە نێردرابێت کە بەبێ زەحمەت و بێ منەتی سەرۆکی هۆز بمان باتە ناوەڕاستی جەنگەڵ و لەوێ بمانکوژێت و یان ئەگەر زۆری پەلەبێت لەکاتی شەڕ لەگەڵ پاسەوانەکان بمانکوژێت. بەڵام لەهەمان کاتدا بیرێکی ترم بۆ دروست بوو کە ئێستا بڕیارە بمرین باشترە پیاوانە بمرین و وەك سەگ بە دەست کالوویی نەکوژرێین.

ئەمە بیرکردنەوەی من و یوری بوو. سەرئەنجام بەدوای ئەم بیرانە لەگەڕان بەدوای کەمترین شانسی ڕزگاری کە لەم کردەوە مەترسیدارە دابوو، دەست بەکاربووین.

کاتێك یەکێك لە مەشخەڵەکانم کوژاندەوە ژوورە دار و گیایەکەی وەحشیەکان کەمێك تاریك بوو. سێبەری دوو پیاوەکەی کالوویيم بینی کە لەبەردەم دەرگای ژوورەکە وەستاون، یوری ئیشارەیەکی لێکردم و وتی: ماتڵی چین..؟ دەبێت بڕۆین..

ئەمەی وت و هێواش خۆی گەیاندە پشت پەردەکە و وتی:

کەسێك یارمەتیم بدات، دەمەوێت برینداره‌کەم دابگرم.

دەست بەجێ تێگەشتم یوری چ پلانێکی دارشتووە، بۆیە بەخێرایی خۆم کێشایە دواوە و لەپشت دەرگاکە خۆم حەشاردا، یوری لەولا بوو من لەم لا.

یەک لە پاسەوانەکان تفەنگەکەی ئامادەکرد و پەردەکەی لابرد و هاتەژوور تا یارمەتی یوری بدات بەڵام هێشتا بە جوانی سەیری هەمووی ژوورەکەی نەکردبوو، دەستی یوری بەخێرایی بروسکە رۆشتە سەرو بەتوندی بەوپەڕی هێز هاتەخوار وخەنجەری لە کەلەکەی چەپی پاسەوانەکە ڕۆکرد ئەم لێدانە ئەوەندە خیرابوو دەتوانم بڵێم زیاتر لە دوو سێ چرکەی نەخایاند و پاسەوان نەیتوانی بەرگری بکات تەنیا دەمی کردەوە بقیژێنێت بەڵام دەستی چەپی یوری بەهێزێکی زۆرتر دەمی گرت و لە قیژاندنی ڕێگری کرد.

تفەنگەکە لە دەست پاسەوانەکە کەوتە خوار. لەو قڵشەی کە لە کەلەکەی چەپی دروست ببوو خوێن فیچقەی دەکرد بەڵام یوری هێشتا دەمی بەرنەدابوو تا کاتێک بە جوانی و ئارامی لەسەر زەوی درێژی کرد وتا ئەو کاتەی لەمردنی دڵنیا نەبوو، دەستی لە دەمی نەکردەوە.

لەگەڵ ئەوەی لەم ماوەدا بینەری کارەساتی زۆر و ڕووداوی خوێناوی بووم و دەبووایە وەک چۆن دەڵێن چاو و گوێم کرابێتەوە، هەستم دەکرد بە بینینی مەرگی ئەو پاسەوانە، گۆڕاوم و دڵم بۆی دەسوتێت. خوا لەعنەت کات ئەو دایک و باوکانەی منداڵەکانیان ترسنۆک و دەست و پێ سپی پەروەردە دەکەن.

مافی ئەوەم نییە لەعنەت لە دایک و باوکی خۆم بکەم. ئەوان زەحمەتی زۆریان بۆ پەروەردەکردنم کێشا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نایانبەخشم چوونکە منیان بێ ئەندازە ترسنۆک گەورەکردبوو.

لە منداڵی لەسەربڕینی مریشك و کەڵەشێر دەترسام و ئێستا کە ببوومە پیاوێکی شەڕکەر و ڕووداو خواز بەبینینی ئەم ڕووداوانە موچڕکە بە جەستەمدا دەهات. بینینی گیان دانی پاسەوانەکە کاریگەری زۆری لەسەر دانام و ئەگەر تەکانێکی توندی یوری نەبووایە، بەهەمان شێوە لە شوێنەکەمدا دەمامەوە.

یوری منی بە ڕەنگ پەڕاوی و ماتی بینی، بەشێوەیەك بازوی گرتم و ڕایچڵەکاندم نزیك بوو بکەوم. کاتێك هاتمە خۆم و هەستم بە بارودۆخە مەترسیدارەکەی خۆمان کرد کە پاسەوانی دووەم لە درەنگ کردنی هاوڕێکەی نیگەران و بۆ ئاگاداربوون سەری هێنایە ژوورەوە، بەڵام لەبەر ئەوە مەشخەڵەکەی تریشمان کوژاندبوویەوە، چاوی بە جوانی هیچی نەدەدی. ساتێك وەستا تا چاوی عادەت بە تاریکی بکات و لەم کاتەدا بە تووڕەییەوە وتوندی ووتی:

ئەی ئەحمەقینە، بۆ مەشخەڵەکانتان کوژاندۆتەوە.

ڕستەیەك کە دەیویست هاوڕێکەی بانگ بکات لە دەمی دەرنەچوو چوونکە یوری وەك هەڵۆیەك کە خۆی بخاتە سەر نێچیرەکەی لە حەشارگەکە هەستاو لە کاتێکا خەنجەرە خوێناویەکەی بە دەم گرتبوو بە دوو دەست گەردنی پاسەوانی گرت و بەخێرایی و هێزێکی سەیر کێشایە ناو ژوورەکە.

پاسەوان کەمێك پەلەقاژێی کردو سەرئەنجام چوونکە یوری پیاوێکی بەهێزبوو نەیتوانی خۆڕاگری بکات و بەهەمان خێرایی کە ڕادەکێشرا هاتە ناوژوورەکە و بەدەمەوە درا بەزەویدا.

لەوانەیە بپرسن بۆ پاسەوان نەیقیژاند ئەمە شانسی ئێمە نەبوو چوونکە پاسەوان دوای ئەوەی گەردنی لەناو دەستی بەهێزی یوریدا بینی نەیتوانی لە تفەنگەکەی کەڵك وەربگرێت، دەمی بۆ هاوارکردن کردەوە بەڵام بێجگە لە ناڵەیەکی کەم هیچ دەنگێکی لێوە نەهات ! یوری کە شەڕکەر و زیرەك بوو، لەهەمان چرکەی سەرەتا کە پاسەوان کۆنترۆڵی بیری لە دەست دابوو بەشێوەیەك ملی بادا دەنگ لە قورگی دا خنکاو هەرچەندە هەوڵیدا نەیتوانی بقیژێنێت.

کاتێك کەوتە سەر زەوی و تفەنگەکەی لە دەست بەربوو، تفەنگەکەم هەڵگرت و یوری بەهەمان زیرەکی نیشتە سەری و بە لەقە لە سەرو ملی دا. پاسەوان دوو سێ جار سەری بەرز کردەوە بقیژێنێت بەڵام هەرجار بە لەقەیەك ڕوخساری دەدرا بە زەویدا و لەجیاتی هاوار دەنگێکی بچووکی لێوە هات و سەرئەنجام جاری سێیەم و چوارەم لەهۆش چو و بێ جووڵە لە شوێنەکەیدا مایەوە، ئێمە گومانمان دەکرد مردووە یان بێهۆش بووە بەڵام پاسەوان کە گیانی خۆی لەمەترسیدا دەبینی، بەرژەوەندی خۆی لەوەدا بینبوو بۆ چەند ساتێك خۆی بێهۆش کات تا ترسی لە مردن نەمێنێت و ئەو کات بەچەند هاوارێك هەمووان لە ڕاکردنی ئێمە ئاگادار بکاتەوە. ئێمە بێ ئاگا لەم ڕووداوە و لەم فێڵە، فیشەکی پاسەوانی یەکمان کردەوە و بەو دوو تفەنگەی بە دەستمان هێنابوو، لە دەرگای ژوورەکە ڕۆشتینەدەر و لەهەمان ڕێگا کە نیشان درابوو و لە نامەکەدا ئاماژەی پێدرابوو، بەڕێکەوتین. هەموو شتێك تاریك بوو و کاتێك ئێمە لەپشت دیواری داری ژوورەکە تێ دەپەڕین هیچ ڕووناکیەك لە ڕێگاکەمان کە بەجەنگەڵ گەشتبوو، نەدەبینرا. تەنیا ٥٠ مەتر ئەولاتر کە بنکەی هۆزی وەحشیەکان بوو، ئاگرێك هەڵایسابوو و تاقمێك لە دانیشتوانی هۆز بە ڕمی درێژ و تیرو کەوانەوە لەدەوری ئاگرەکە کۆ ببوونەوە و

سەرقاڵی ئاواز خوێندن بوون. ئەم ئاگرە لە ٥٠٠ هەنگاوی لەپشت سەرمان بوو، لەوێ دوور دەکەوتینەوە، بەڵام ئەو رووناکییە رێگەی جەنگەڵی روناك نەدەکردەوە. لەگەڵ تاریکی زۆر و چڕی جەنگەڵ، چوونکە ژیان و مردن لە ئارادابوو بە باشی دەڕۆشتینە پێش و بێ گوێدانە ئەو مەترسیانەی لە پێش و دواوەی ئێمە بوو، هەنگاومان لەناو چقڵ و گیای وشك و تەڕ و هەندێ کات لیتاوی زەوی هەڵدەگرت و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی لە تاریکیدا یەکتر ون نەکەین، من و یوری دەستی یەکمان گرتبوو.

بڕیارمان دابوو چەند دە مەترێك ئەولاتر بە کەسێك لە دانیشتوانی ناوچەکە کە چاوەڕێی دەکردین پەیوەست ببین و بە ڕێنمایی ئەو لەوێ دوور بکەوینەوە. لەوخاڵە کە هێشتا لە شوێنی ڕێ نیشاندەرە ئاماژە پێدراوەکە دوور بووین یوری دەستی منی راکێشا. وەستام، ووتی:

سەرۆك..... دەزانن...؟ ئێستا رزگارمان بووە، بۆ بڕۆینە لای ئەو کەسە و لەگەڵ ئەودا رابکەین... کێ دەڵێت ڕسوامان ناکات ! لەگەڵ ئەوەشدا مەگەر من خۆم ڕێ نیشاندەر و دانیشتوی ناوچەکەنیم...؟

لە مەبەستی یوری گەشتم و پێشنیارەکەیم پەسەند کرد بەڵام نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات چوونکە لەم کاتەدا لەناکاو دەنگی هاوارێك بیسترا و دەنگی ئەو پاسەوانەی خۆی دابوو لە بێهۆشی دەگەشتە گوێ کە بەدەم هاوارەوە دەیوت:

ئاخ..... رایان کرد. کالوویی فریامان کەوە. ئەوان رۆشتن و ئێمەیان کوشت.

دەنگی هاواری ئەو بێدەنگی نیوەشەوی جەنگەڵ و هۆزەکەی شێواند و من و یوری کە هێشتا لە سنوری هۆزەکە زۆر دوور نەکەوتبووینەوە، دەنگی هەلهەلە و هاواری وەحشیەکانمان بیست و سێبەری ئەوانمان بینی کەوەحشیانە لە ژوورەکانی خۆیان دەهاتنە دەر و بەملاولادا ڕایان دەکرد بە بیستنی ئەم هاوارانە ئەژنۆم کەوتە لەرزین. لاوازییەکی سەیر سەراپای داگرتم بە شێوەیەك توانایی ڕاکردنم نەبوو. وەك چۆلەکەیەك ڕووبەڕووی ماربوبێتەوە و لەژێر کاریگەری نیگای مار کەوتبێتە ژێر کاریگەری خەوی موگناتیسی و نەتوانێت بجووڵێت، منیش دەمویست ڕابکەم بەڵام بە شێوەیەك ترسابووم تەنانەت نەمدەتوانی دەست و پێم بجووڵێنم چ بگات بەوەی بەخێرایی لەوێ دوور کەومەوە.

یوری وەك ئاژەڵێك کە هەستی بە مەترسی کردبێت، گوێی هەڵخست، چەند ساتێك بە جوانی گوێی لە دەنگەکان گرت و لەدەوروبەری ڕووانی. ئەو کات بەجووڵەیەکی خێرا

دەستی ڕاکێشام و ووتی: با ڕاکەین، بۆ وەستاون؟ ئێستا دێن...

بێ ئیرادە لە ترسی گیان قاچەکانم وەك ئامێرێك دەجووڵانەوە و هەنگاوم هەڵدەگرت. لەگەڵ ئەوەی یوری بەخێرایی منی ڕادەکێشا و دەیبردم، لەشوێنەکەی خۆمدا دەمامەوە و هەندێ کات لەبەر سستی ئەژنۆکانم دەستی یوریم ڕادەکێشا و یان دەستی لە دەستم بەردەبوو و ئەو لە من دوور دەکەوتەوە. کاتێك دەیبینی وەستاوم دەگەڕایەوە و دەستی دەگرتم و دەیبردمەوە.

لەم کاتەدا ئێمە بەخێرایی دەڕۆشتینە پێش و لە دڵی تاریکی و بێدەنگی جەنگەڵ خۆمان دادەشارد. دەنگی تەپڵەکانی هۆز بەرزبوویەوە... گام... گام... گام... گامب و گامب و گامب... گرگر... گرگر... گرگر، ئەمە دەنگی سێ جۆر تەپڵ بوو لەدوورەوە دەبیسترا بەڵام ئێمە لە هۆز دوردەکەوتینەوە. جەنگەڵ سات لەدوای سات چڕ و مەترسیدارتر دەبوو. هەرسات ئەگەری ئەوە هەبوو مارە مەترسیدارەکانی ((بووئا)) کە گامێشێك بە هێزی خۆیان ورد دەکەن، هێرشمان بکەنە سەر و یان دوور نەبوو دڕەندەکان بێنە سەرمان و جەستەمان تیکە تیکە بکەن بەڵام ئێمە کە لە دواوە لەلایەن وەحشیەکانەوە مەترسیمان لەسەر بوو، هەرگیز بیرمان لەم مەترسیانە نەدەکردەوە، پێشتر لە فیلمە سینەماییەکاندا بینیبووم کاتێك وەحشیە مرۆڤ خۆرەکانی جەنگەڵە ڕەشەکانی ئەفریقا دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر سپی پێستەکان و یان هۆزێکی تر، تەپڵ لێدەدەن و هەلهەلە دەکێشن و هێرش دەبەن. ئێستا بەگوێی خۆم دەنگی تەپڵەکەیانم دەبیست و بانگی هەلهەلەی ئەوان بە باشی بەگوێم دەگەشت. ئاشکرابوو ئێستا هێرش دەبەن و گەمارۆمان دەدەن. یوری هەمیشە چەند هەنگاو لەپێشتر بوو، ڕێگای دەکردەوە و لە پێچ و پەنای دارە چڕەکانی جەنگەڵ تێدەپەڕی و ڕێنوێنی منی دەکرد. ئێستا بیر دەکەمەوە ئەگەر یوری نەبووایە لە جیاتی یوری ڕێ نیشاندەرێکی ترسنۆکی وەك خۆم تەمەڵ و دەست و پێ سپیم لەگەڵدا بووایە چی ڕوویدەدا؟ چۆن دەمتوانی لە جەنگەڵ تێپەڕم؟

هەرچەندە ئەو بە ئازایەتی خۆی نەیتوانی ڕێگە لە ڕووداوە ناخۆشەکانی دواتر بگرێت بەڵام هەرچی بوو هێزی ڕۆحی ئەو لەبەرگەگرتنی دژواریەکان بووە هۆی ڕزگار بوونی من لە مردنێکی ئاشکراو من دەبێت زیاد لەڕادە سوپاسگوزاری بم.

دووریەکی زۆر بەم شێوەیە لە تاریکیدا ڕۆشتینەپێش بێ ئەوەی بزانین بۆ کوێ دەڕۆین و چیمان بەسەردێت. دەنگی هەلهەلەی وەحشیەکان و تەپڵەکەیان بە جوانی

دەگەشتە گوێ و ئێمە هێواش هێواش هیلاك بووین و هەناسەبڕکێمان پێکەوت.

کاتێك مرۆڤ هیلاك دەبێت، هەر هەنگاوێك بە کیلۆمەترێك دەزانێت و ئەو هەنگاوە بە ئەندازەی یەك کیلۆمەتر لەکاتی ئاساییدا هیلاکی دەکات. لەگەڵ ئەو هەموو هیلاکیەدا، تینوێەتی تەنگی پێ هەڵچنین. دەستی یوریم گرت و لە کاتێکا هەناسەبڕکێم بوو ووتم:

بووەستە..... ئەوان لە ئێمە دوورن..... مەگەر نابیسیت؟ دەنگی ئەوان لە دوورییەکی زۆرەوە دەبیسترێت بووەستە با تۆزێك بحەسێینەوە و دواتر درێژە بە ڕاکردن بدەین.

یوری وەك ئەوەی ڕووبەڕووی شتێك بووبێتەوە دەستی گرتم بەتوندی بۆ پێشەوەی کێشام و ووتی:

سەرۆك مەگەر شێت بوویت: دەنگی تەپڵەکەیان نابیستیت؟

بەڵێ، شێوەی ئەوان لەهێرشدا ئەوەیە هەمیشە ئاخرین دەستە کە لە دواوەی هەموویانن دەقیژێنن و هاوار دەکەن و دەستەکانی پێشەوە کە ڕاسپێردراوی هێرشن بێ دەنگ، بەڵام خێرا دەڕۆنە پێش. ئەگەری هەیە ئەوان ئێستا لە چەند مەتری پشت سەرماندا بن. لەلایەکیتر دەنگی تەپڵەکەیان دەبیستن؟ ئەوان بە تەپڵ هۆزەکانی دەوروبەر ئاگادار دەکەنەوە کە دوو نەفەری سپی پێست ڕایان کردوە و دەستور دەدەن بمانگرن. من بە تەپڵ هەرچی دەڵێن باش تێدەگەم.

بە زانینی ئەم بابەتە تەسلیمی یوری بووم و خێرایی هەنگاوەکانم زیاد کرد بەڵام چوونکە هەناسەم دەیگرت و جلەکانم بە جەستەمەوە لکابوون، ووتم:

بەڵام نزیکە لەپێ بکەوم. لە ئارەقدا خوساوم.

یوری وەستا. ووتی: ڕاست دەکەیت دەبووایە چەند ڕۆژ پێشتر ئەم کارەمان ئەنجام بدایە..... هەوای ئێرە زۆر گەرمە.

جلەکانتان دەربێنن. منیش ڕووت دەبمەوە.

و دەست بەجێ هەردوکمان سەرقاڵی خۆ ڕووت کردنەوە بووین... خولەکێك دواتر ڕووت بووین و تەنیا بۆ داپۆشینی شەڕمی خۆمان، شۆرتێکمان لەبەرخۆماندا هێشتەوە و لەجلەکان تەنیا پێڵاوەکانمان فڕێ نەدا و هەڵمان گرت.

ئێستا لەتەرەزان دەچووین... لە قیافەی خۆم بەو بازووە لاواز و جەستە ڕووتە، پێکەنین دەیگرتم بەڵام بە خۆشحاڵیەوە لەو جەنگەڵەدا مرۆڤێکی پێش کەوتوو و شارنشین نەدەبینرا پێم پێ بکەنێت و گاڵتەم پێ بکات. هەرکەس بوو وەك خۆم ڕووت

بوو بەم جیاوازییە ئەوان ڕەش و من سپی.

ڕووت بوونەوەمان لە توندی گەرمای کەم کردەوە. ئارەقم وشك بوویەوە و تینوو بوونی زیاد لەڕادەشم نەما. تفەنگەکەم خستە سەرشان و فیشەك بەندەکەم لەسەر سینەی رووتی خۆم بەست و بەڕێکەوتین.

یوری جل و بەرگەکانی بە هەموو هێزی فرێدایە سەر دارێك. کاتێك هۆکاری ئەم کارەم پرسی ووتی:

لەوانەیە ئەوان ونمان کەن بەڵام ئەگەر جل و بەرگی خۆمان لەجەنگەڵدا بەجێ بێڵین، ڕێگەی رۆشتنمان دەدۆزنەوە کاتژمێرێك یان دوانی تر بەو خێراییە دەڕۆشتین تا سەرئەنجام لە هیلاکی و تینویەتی لەپێ کەوتم. هەوا کەم کەم روون و بەیانی نزیك دەبوویەوە بەڵام دەنگی تەپڵی وەحشیەکان هێشتا دەبیسترا. نەسیمێکی فێنك هەڵیکردبوو..... ویوری دوای هەست کردن بەم نەسیمە فێنکە ووتی:

سەرۆك... نزیك ئاوی ڕووبار بووینەتەوە... ئەم نەسیمە لەسەر ئاوەوە هەڵیکردوە خێراکەن، هەستن با بڕۆین، گەشتینە ئاو.

ئەوەندە هیلاك بووم ئارەزومەند نەبووم گوێ لە قسەکانی یوری بگرم. دەمویست پاسەوانیم بکات و بخەوم. جوان بیرمە چەندە هیلاك بووم تا چەندە لاوازی و ویستی خەو و هیلاکی لە ناخمدا ڕەگی داکوتابوو و هێزو تواناییمی لەناو برد بوو! چەندە دڵم دەیویست بخەوم. هێشتا ئارەزوومەندی ئەو حەزە بێ کۆتاییەم لە بیرە. ئەگەر هەر شوێنێکی تر جگە لەوێ بوو دەخەوتم گوێم لە قسەکانی یوری نەدەگرت بەڵام ئەوێ شوێنی خەو نەبوو.

دەنگی تەپڵی وەحشیەکان لەدوورەوە دەبیسترا و دیاربوو هێشتا بەدواماندا دەگەڕێن. یوری لە وەڵامی داواکەی من کەوتم ڕێگەبدە کەمێکی تر بحەسێمەوە ووتی:

وەحشیەکان بەم ساناییە دەستمان لێ هەڵناگرن..... ئێستا ئیتر تەنیا کالوویی نیە، ئێمە لەبەردەم ددانی ئەوان ڕامانکردوە و ئەم ڕاکردنە بۆ ئەوان گەورەترین جنێوە و هەر بۆیە ئەگەر تا کۆتایی جەنگەڵی بارانیش بێت بە دواماندا دێن... ئێرە شوێنی خەو نیە، کاتێك لە ڕووبار تێپەڕیین لە شوێنێکی ئەمندا دەخەوین. پرسیارم کرد:

ئەمە کام رووبارەیە؟

نازانم..... چوونکە دیارنیە ئێستا لەکوێداین تا بتوانم بارودۆخی ئێستامان دەست نیشان بکەم بەڵام دڵنیام لە یەکێك لە ڕووبارەکان نزیك بووینەتەوە.

تینوێتی زمان و دەمی ووشك كردبووم و زیاتر لە هیلاكی ئازاری دەدام، دەمویست چەن گەڵای دارێك لە دەم بنێم و بیجووم بەڵام یوری ڕێگری كرد و وتی:

هەستن... ڕووبار نزیكە... چ نەسیمێكی فێنكە.... ئەم نەسیمە لە ڕووی ئاوەوە تێ دەپەڕێت نازانم هیچ كات تینوتان بووە؟ تەنیا ئەوانەی یەك ڕۆژ تینویەتیان كێشاوە دەزانن من چیم كێشاوە هەڵبەت یوریش وەك من تینوو و هیلاك بوو بەڵام خەڵكی ئەو ناوچەیە بەگشتی بەرگەی كێشە و دژوارییەكان دەگرن و یوریش لەبەر ئەمە بە ڕووی خۆیدا نەدەهێنا.

بەیارمەتی یوری لە شوێنەكەم هەستام و لەبەرئەوەی دەنگی تەپڵەكان نزیك ببوویەوە بەخێرایی لەوێ دوور كەوتینەوە. بەرەبەیانێكی زۆر جوان بوو. هەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش لە وشكی و گەرمی هەوا كەم دەبوویەوە. دەتوت نزیك دەریا بووینەتەوە. هەوا تەڕییەكی دڵگیری پەیاكردبوو. ئاسمان لە لابەلای گەڵا و بەرگی چنارەكان بە جوانی دەبینرا و لە ڕۆحی گیراو و پەرێشانی من كرانەوەیەكی تایبەتی دروست دەكرد.

ڕێگەڕۆشتنی ئێمە لەوێ بەدواوە بەخێرایەكی زیاتر ئەنجامی گرت و سەرئەنجام یەك دوو كاتژمێر دواتر دەنگی تاڤگەیەكی گەورە لە دوورەوە دەبیسترا. دەنگی ئاو لەو دەورووبەرەدا بڵاوببوویەوە. وا دەهاتە بەرچاو كە دارە گەورە و چەند سەد ساڵەكانی ئەو ناوچەیان شۆردووە.

لە لابەلای بەردە ورد و گەورەكانی سەر ڕێگامان و لەشوێنێكی تری جەنگەڵ كە بەرد نەدەبینرا، گیاكان ڕوابوون و جوانی دیمەنی جەنگەڵی زیاد كردبوو.

سەرئەنجام بە ڕووبار گەشتین. یوری نزیكەی ١٠٠ هەنگاو لەپێش منەوە دەڕۆشت بۆیە زووتر لە من گەشتە ڕووبار. لای تاڤگەیەكی مەزن كە لە بەرزایی ٣٠ مەتری دەڕژایە خوار، وەستاو بە وردی لەدەورووبەری خۆی ڕووانی.

گەشتمە لای و لە ڕووخساری هیلاك و چاوە زەق بووەكانیم ڕووانی. یوری دوای ئەوەی جوان بیری كردەوە و سەیری سەرو خواری جەنگەڵی كرد ووتی:

دەزانن ئێرە كوێیە؟

و دواتر بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی پرسیارەكەی خۆی بێت ووتی:

ئێرە جەنگەڵی بارانە، دیارە ڕێگاكە بە هەڵە نەهاتووین.

ئەمەش ڕووباری ناودار و مەزنی ناپۆیە و ئەمەش سەرچاوەكەیەتی. ئێمە ئێستا لە

شوێنێکداین ئەگەر بمانویستایە بە گوێدرێژو یان هەرشتێکی تر بهاتینایەتە ئێرە، دەبووایە یەك مانگ رێگەمان ببڕیایە بەڵام خۆشبەختانە رێکەوت و ڕووداوەکان ئێمەی بۆ شوێنێك رێنوێنی کردوە و تا گەشتن بە مەبەستەکەی ئێوە ئەوەندەی نەماوە.

سەیرێکی ڕووبار و پانتایی و مەزنیم کرد. ووتم:

دەبێت لەم ڕووبارە تێپەڕین.

بە دڵنیاییەوە دەبێت تێ پەڕین چوونکە ئەگەر بمانەوێت لەمبەری ڕووباری ناپۆ بمێنینەوە دەبینە دیلی جەنگەڵی هۆزە وەحشیەکان، ئەوبەری ڕووباری ناپۆ تا رووبەرێکی زۆر، شوێنەوارێك لە هۆزە وەحشیەکان نیە و رەنگە پاشماوەی رێگا بەبێ مەترسی ببڕین.

بەخێرایی و پەرێشانی پرسیم:

بەڵام پەڕینەوە لەم ڕووبارە کاری هەر کەسێك نیە، بۆ گەشتن بەو بەستێنە چ پلانێکت هەیە. پانتایی ڕووبار زیاتر لە ٥٠ مەتر و قووڵایی لەوە زیاتر بوو. لەهەمووی خراپتر خێرایی ئاو سەرسورهێنەر بوو. بەیەك نیگا هەموو ئەم کێشە و لەمپەڕانەم هێنایە بەرچاو، بەڵام یوری شارەزا، دەستی گرتم و وتی:

بڕۆین، ئێرە سەروخواری ڕووبار زۆر زۆرە و دەمانفلیقێنێت. چەند میلێك خوارتر لێرە ڕووبار دەرژێتە شوێنە ساف و تەختەکانی جەنگەڵ و لەخێرایی ئاو کەم دەبێتەوە. لەوێوە دەبێت تێپەڕین. یوری ئەمەی ووت و کێشان کێشان منی بەدوای خۆیدا برد و ئێمە پاشماوەی رێگامان لە بەستێنی ڕووبار بڕی. کاتێك گەشتینە شوێنێکی ئەمن و کەمێك حەساینەوە، یوری رێگەی ئاو خواردنەوەی دا. دوای ئەو هەموو رێگەبڕینە، لەگەڵ ئەو هەموو هیلاکییە کوشندە و بێزارکەرە، بەو تینویەتیە، بیهێنە بەرچاو خواردنەوەی ئاوی فێنکی ڕووبار چ تامێکی هەیە. بڕێك ئاوم خواردەوە و کاتێك خۆم بۆ خواردنەوەی زۆرتر ئامادەکرد، دەستی یوری بە بازومەوە لکا و منی لای ڕووبارەکە هەستاند. بە سەرسوڕمانەوە پرسیم:

بۆ.....؟ بۆ نایەڵێت ئاسوودەبم... لەوانەیە ئاویش بۆ سینەم زەرەری هەبێت؟

یوری پێکەنی و ووتی:

سەرۆك، ئاوی ڕووباری ناپۆ هی باوکم نیە بەڵام ئێستا کە زۆر تینوتانە ئەگەر ئاو زۆر بخۆن سکتان پڕ دەبێت و کاتژمێرێك دواتر توشی ئازاری گەدە دەبن و بەبێ خواردن و برسیەتی لە هەڵگرتنی یەك هەنگاو ناتەوان دەبن چ بگات بەوەی بتوانن

ڕابکەن و لە مەترسی هەڵبێن.

بە قسەکانی ڕازی بووم بە پێکەنینێك سوپاسگوزاریم لێکرد.

یوری خۆشی ئاوی خوارد بەڵام بەشێوەیەکی تایبەت کە لای من سەرنج ڕاکێش بوو، سەرەتا دەم و سەرو روخساری بە ئاو شۆرد و دوای نیوکاتژمێر تەنیا قومێك ئاوی خواردەوە. هەستم کرد بێجگە لەو وانانەی لە قوتابخانە و زانکۆکاندا فێرمان دەکەن، ژیان پێویستی بە زانستی تریش هەیە و هەندێ کات ڕوودەدات بۆ ژیان تەنانەت یەك ووشە لەوانەکانی خوێندنگا و زانکۆ، کەڵکی لێ وەرناگیرێت.

کاتێك تینویەتیمان شکا، ڕۆشتینە سەر دارێکی بەرز و لەسەر لقێکی گەورە لای یەکتر دانیشتین و دەستمان بەقسەکردن کرد. ئەو دارە نزیکەی دوو مەتر پانی و ۳۰ مەتر بەرزایی بوو.

ئەم دارانە بە ((لیانا)) ناو دەبرێن و لە جەنگەڵی باران زیاتر لە هەرشتێك لەم دارانە دەبینی.

ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار ئەو دارەم ناسی لە کاتێکدا نەمدەزانی هەمان دار کە زۆر سادە و بێ بەها دەهاتە بەرچاوم دواتر چەندە بە کەڵکی ژیان دێت و چۆن چەندین جار گیانمی لە مردن ڕزگار کرد.

یوری ووتی:

دەزانیت چیە.. ئێمە بۆ دروست کردنی بەلەمێك لانی کەم دەبێت نزیکەی دە ڕۆژ لێرەدا دانیشین. بۆ ژیان کردن شوێنێکی ئەمنتر لێرەمان دەست ناکەوێت. شەوان لەسەر ئەم دارە دەخەوین و ڕۆژانە سەرقاڵی دروست کردنی بەلەمەکە دەبین چوونکە تێ پەڕین لەم ڕووبارە بەبێ بەلەم ئەگەری نیە.

سەرەتا بە پێشنیازەکەی یوری ڕازی نەدەبووم بەڵام دواتر زانیم چارەیەکمان جگە لەمە نیە بۆیە لەو ڕۆژەوە دەستمان بە دروست کردنی بەلەم کرد. ئێوە هەر ئەوەندە دەخوێنندەوە و کە من دەنووسم بەلەممان دروست کرد بەڵام نازانن چۆن دروست کراو بۆ دروست کردنی چەند ئازار و دژواریمان کێشا.

بەهەمان شێوە کە یوری ووتبووی شەوانە لەسەر دار دەخەوتین و ڕۆژانە کارمان دەکرد. ئێستا لە ژیانی وەحشیەکان تاڕادەیەك لە ئەماندا بووین بەڵام زیاتر لەهەر مەترسیەکی گەورە، ئاژەڵە وەحشی و مارە مەترسیدارەکان کە بۆ خواردنەوەی ئاو دەهاتنە بەستێنی ڕووبار، هەڕەشەیان لە ژیانی ئێمە دەکرد. چەندین جار لەلایەن

مارەکانەوە هێرشمان کرایە سەر بەڵام من تەنیا یەکجاریتان بۆ دەگێڕمەوە بۆ ئەوە گێڕانەوەی ئەو پێشهاتانە بێزارتان نەکات.

خواردنی ئێمە لە گۆشتی کولاو و نیوە کولاوی نێچیر داین دەکرا و کارمان ئەوەبوو لقی ئەستووری دارەکان ببڕین و بە پێستی داری لیانا کە لە هەرتەنافێك قایمتر و توندتر بوو، بە یەکیانەوە ببەستین و لای یەك دایان بنێین. یوری بۆ ئامادەکردنی خواردن دەڕۆشتە ڕاوی ماسی و یان بۆ ڕاوکردنی باڵندە و کەروێشك و شتی تر دەڕۆشتە جەنگەڵ و لەبەرئەوەی بۆ ڕاو بێجگە لە خەنجەر هیچمان نەبوو، یوری کە لەم کارەدا لێهاتوو بوو بە خەیزەران ڕمی دروست کرد و ڕاوی پێ دەکرد.

ئەو ڕۆژە من سەرقاڵی دروست کردنی بەلەم بووم یوری ڕۆشت بۆ جەنگەڵ بەڵام زۆر دورنەکەوتبوو کە لەناکاو دەنگی هاواریم بیست. یوری ئەو پیاوە ئازایەی لە تەمەنیدا ناتەوانی دەرنەبڕیوە و لە هیچ مەترسیەك نەترساوە، هاواری دەکردو داوای یارمەتی دەکرد بەخێرایی خۆم پێگەیاند و لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم هیچ کارێکم لە دەست نایەت و دەبێت بینەری مەرگی دڵتەزێنی یوری بم.

مارێکی گەورە شوێن یوری کەوتبوو. یوری داماو لە دارێکی خوار و درێژ خۆی دەکێشایە سەرەوە، مارێك کە لە ترس ئەنگێزترین و مەترسیدارترین مارەکانی جیهانە، بەدوایدا لەو دارە دەڕۆشتە سەر و کاتێك گەشتم بینیم زیاتر لەیەك هەنگاو لە یوری دوور نیە.

ئەگەر ماری بووئا کەمێك خێراتر دەبوو بە ئاسانی یوری دەگەست و دواتر ئەوی قووت دەدا. بووئا لەدەوری دارەکان دەئاڵێت و لەناکاو خۆی دەخاتە سەر گامێشە گەورەکانی جەنگەڵ و بەهێزی خۆی وردیان دەکات و ئەوسا بەئاسوودەیی دەست بەخواردنی گامێش دەکات، لە چنگی مارێك کە گامێشێك بە زەحمەتی خۆی ورد دەکات، یوری داماو چۆن دەیتوانی گیان دەربازکات. هۆی ئەوەی بووئا کتوپڕ هێرشی کردبووە سەر یوری ئەوەبوو یوری نێچیری مارەکەی لێ ڕفاندبوو و مارەکەی تووڕە کردبو.و لەسەر نوکی ڕمە حەیزەرانیەکەی یوری کەروێشکێکی گەورەی جەنگەڵی دەبینرا. تێگەشتم کەمارەکە بۆ خواردنی کەروێشك خۆی حەشار دابوو. یوری بێ ئەوەی ئاگای لەو مارەبێت کەروێشکەکەی ڕاوکردبوو. بەهەر حاڵ لەسەر من بوو یارمەتی یوری بدەم. بەڵام چ کارێکم لە دەست دەهات مەگەر ئەوەی ڕووی خۆم بسوڕێنم تا مەرگی هاوڕێ خۆشەویستەکەم نەبینم.

لەم کاتەدا بیرێك بە مێشکمدا هات و دەست بەجێ خستمە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە. یوری حەقی ژیانی لە ئەستۆمدابوو و دەبووا لە مردن رزگاری بکەم بۆیە بێ گوێدان بە گیانی خۆم ڕۆشتمە پێش و خۆم نیشانی ماری بووئا دا. کاتێك چاوی بە من کەوت، من دەست و سەری خۆم دەجووڵاند تا تووڕەی کەم و لە بەدوادا چوونی یوری دەست هەڵگرێت و بەدوای مندابێت. سەرقاڵی کاری خۆم بووم کە هاواری یوری بەرزبوویەوە کە دەیووت:

راکە... سەرۆك راکە... ئاناگنە !. ئاناگنە !

لە مەبەستەکەی یوری نەدەگەشتم بەڵام هەستم کرد لە ترسی ماری بووئا دوورم دەکاتەوە و سەرم سورما بۆ یوری دەقیژێنێت لە کاتێکدا مارەکە کاری بە من نیە و مەترسیەك هەڕەشەم لێناکات. هاوارەکانی یوری زیاتر بوو و من بە گوومانی ئەوەی خزمەتی دەکەم سەرقاڵی کاری خۆم بووم کە کتوپڕ یوری خەنجەرەکەی خۆی دەرهێنا و ووتی:

سەرۆك ڕاکە ئەگینا خۆم دەکوژم... ئاناگنەیەك لای راستی ئێوەیە.

ئەم ڕستە منی هێنایەوە هۆش خۆم و چەند هەنگاو رۆشتمە دواوە و تازە زانیم مارێکی رەش و گەورەی (ئاناگندا) لە داری (لیانای) لای راستی من خۆی شۆڕکردۆتەوە. کاتێك بووئا چاوی بە ئاناگند کەوت هێواش لە دارەکە شۆڕ بوویەوە و لە یوری چاوی پۆشی. ئێستا ترسێکی گەورە هەرەشەی لێدەکرد بەرژەوەندی ماری بووئا لەوەدابوو چاو لە نێچیرەکەی بپۆشێت. ماری ئاناگندا کە دەستە کەمێکی لە بووئا نیە هێواش لە دارەکە هاتە خوار و بەرە و بووئا بەڕێکەوت. بووئاش بەرەو ئاناگندە هات تا ئەو دوو مارە گەورە کە هەرکام ١٠ مەتر درێژیان بوو گەشتنەیەك وەك قامچی لەیەك ئاڵان.

یوری لەم دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و لەدارەکە هاتە خوار وخۆی گەیاندە من و لە کاتێکا لە ترسا دەلەرزی ووتی:

با ڕابکەین بەڵام من سەیری شەڕی ئەو دوو مارەم دەکرد و تا ئەو کاتەی ئاناگند بووئای کوشت و قووتی دا لەوێ وەستام و سەیرم کرد. ئاناگند دوای ئەوەی بووئای قووت دا و سکی ئاوسابوو و شوێنەوارێك لە بووئا بەجێ نەما، هێواش هێواش لەوێ دوور کەوتەوە و لەناو گژوگیاکاندا ون بوو. من و یوری کەروێشکەکەمان هەڵگرت و بەرەو بەلەمەکە هاتین و دوای خواردن دەست بەکاربووین. هەفتەیەك دواتر کاری بەلەم

تەواو بوو و یەك رۆژ بەیانی کەهەوا نمدارو خۆڵەمێشی رەنگ و پەڵەیەك هەوری رەش لە سوچی ئاسماندا دەبینرا، بەلەمەکەمان خستە ناو ئاو. لەگەڵ ڕەوتی ڕووبار بەیارمەتی ئەو حەیزەرانە بەرزانەی لە دەستماندا بوو بەڕێکەوتین بەڵام جل وبەرگ هیچمان لەبەردا نەبوو، چوونکە هەمووی درابوو.

بایەکی نەرم لای باکوورەوە هەڵی کردبوو، لەسەر ئاوی ڕووبار شەپۆلی ووردو بچووکی دروست دەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا یارمەتی بەلەمە سەیرەکەی ئێمەی دەدا. ئێمە بە یارمەتی قامیشی حەیزەران دەڕۆشتینە پێش و بەلەمەکەمان بەرەو پێش دەبرد. ئەم لاولای ڕووبار بە داری کۆن و ئەستوور و سەربەئاسمان کێشراوەکان داپۆشرابوو و ڕێگەی بینینی بەشێوەیەك گرتبوو کە چاو بێجگە لە ڕیزێك دار و شاخ و گەڵای چڕ هیچی تری نەدەبینی بەشێوەیەك ئەگەر کەسێك یان کەسانێك لای ڕووبار بەدواماندا بهاتنایە و ئێمەیان بکردایە بە نیشانە، نەمان دەدین.

هەرچەندە لە تاڤگە دوور کەوتینایەتەوە، قووڵایی ئاو کەمتر دەبوو و حەیزەران کەمتر لەئاودا جێگەی دەگرت ئەمە بووە هۆی خێرایی زیاتری ئێمە و لەبەرئەوەی ئەرزی ڕووبار بەهێزتر بوو بەیارمەتی قامیشەکان باشتر دەمانتوانی بەلەمەکەمان بەرەوپێش بەرین.

وردە وردە دیمەنی جوان دەردەکەوت. ئاو ئارام و بێدەنگ بوو و تەنیا هەندێ کات بەرەوپێش چوون و جووڵەی بەلەم شەپۆلی وردی لەم لاولای ئێمە دروست دەکرد و دەنگی بەرکەوتنی دەهات و بێدەنگی دەشکاند و بێجگە لەو دەنگەو دەنگی باڵندەکان هیچ دەنگێکی تر نەدەبیسترا.

دیمەنی تێپەڕینی ڕووبار لە پێچ و پەنای جەنگەڵی چڕی دەست لێ نەدراو زۆر سەرنج ڕاکێش بوو و لەهەر دوولای ڕووبار جەنگەڵ ئەوەندە جوان بوو نەمدەتوانی چاوی لێ هەڵگرم و لە سەیرکردنی تێر ببم. ئاژەڵە وەحشیەکان کە ئێمەیان لەسەر ئاو دەبینی تا دووریەکی زۆر لە بەستێنی ڕووبار بەدواماندا ڕایان دەکرد و هەڵبەزو دابەزیان دەکرد بەڵام چوونکە دڵنیابووین بە بوونی ئاوی ڕووبار دەستی ئەو ئاژەڵانە بە ئێمە ناگات خەیاڵمان ئاسوودە بوو لەجیاتی ئەوەی بترسین سەیرمان دەکردن و هەندێ کات بەهۆی جووڵاندن و تەکان دانی قامیشەکانی دەستمان دەبووینە هۆی توورەیی ئەو ئاژەڵانە.

جارێك پڵنگێك زۆر زل بەڵام جوان لەسەر دارێك خۆی فڕێدایە خوار و دوورییەکی

زۆر لە بەستێن ڕایکرد و هەرجار دەوەستا ئێمە بگرێت بەڵام لە ئاوەکە دەترسا و دەستی بە ڕاکردن دەکردەوە. ئێمە بەوپەڕی ئاسوودەییەوە سەیری ئەو ئاژەڵەمان دەکرد و بەتەکان دانی حەیزەرانی دەستی خۆمان هەوڵمان دەدا زیاتر ئەو پڵنگە جوانە بەو چاوە کاریگەر وسەرنج ڕاکێشانەی تووڕەبکەین تا زیاتر هەڵبەزو دابەزبکات پڵنگ کە دەتوت زۆر برسیە، نەیتوانی چاو لە ئێمە بپۆشێت و لەبەرزایی دارێکی کۆنەوە خۆی فرێدایە ناو ئاوەکە و بە مەلەکردن بەرەو لامان هات.

پڵنگ دەینەڕاند و بەیارمەتی مەلە و ڕەوتی ئاو دەهاتە پێش تا شوێنێك بە نەڕەنەڕ گەشتە پێنج مەتری بەلەمەکەی ئێمە. کەم کەم ترسام چوونکە گوومانم دەکرد بەهەمان شێوە کە پڵنگ تا ئێرە هاتووە خۆی دەگەیەنێتە بەلەمەکەمان و هەڵمان دەدڕێت بەڵام یوری هەرگیز نەدەترسا و حەیزەرانەکەی خۆی دەکردە دەمی ئەو ئاژەڵەو دەیترساند.

کاتێك لەبەشی مرۆڤ ناسی دەمخوێند زمانی ((کوانچا)) کە تایبەت بە هۆزەکانی ناوچەی ((ئوریانت)) و جەنگەڵەکانی دەوروبەرە بەبێ ئارەزومەندی دەمخوێندەوە نەمدەزانی زانینی ئەم زمانە ڕۆژێك بەکارم دێت، بۆیە ئەو ڕۆژە بەشادمانی بە یوریم ووت:

من زمانی کوانچا دەزانم نەزۆر باش..... بەڵام بەسندە دەکات

لەم کاتەدا لەقەدی دارێك کەکەسێکی ئەو ناوچە لەوێ دانیشتبوو، نزیك دەبووینەوە. ئەو گەڕایەوە. ئێمەی بینی و سەریشی سوڕنەما بەڵکو درێژەی بە سەوڵ لێدانی خۆی داو ڕۆشتە پێش. یوری پێی ووتم:

بانگی کە و سەرنجی ڕاکێشە.

یەك خولەك بیرم کردەوە تا وشەی پێویست بۆ ووتنی مەبەستەکەم دۆزیەوە و ووتم:

هەی... هاوڕێی من، بووەستە، کارم پێتە، من هاوڕێی سەرۆك هۆزەکەتم.

ئەو بەخێرایی گەڕایەوە و قووڵتر لە منی ڕووانی و بێ ئەوەی قسەبکات تەنیا بە پەنجە ئاسمانی نیشان داو دەستی بە سەوڵ لێدان کرد و ڕۆشت:

من و یوری سەیری ئاسمانمان کرد، هۆی ترسەکەیمان نەزانی.

ئەو لەچی دەترسا؟ لە ئاسماندا شتێك نیە بیترسێنێت؟ بەڵام یوری کە زیاتر ئاشنای ئەو ناوچە بوو پەڵە هەورێکی ڕەش کە لە ئاسماندا دەبینرا نیشانی داو بەترس و لەرزەوە ووتی:

ئاه...... تۆفان ! تۆفان.

لەبەرئەوەی تۆفانی ئەو ناوچانەم نەبینیبوو و نەبیستبوو، نەدەترسام بۆیە گوێم پێ نەداو بەڵام چەند خولەك دواتر یەکەم نیشانەکانی تۆفان دەرکەوت، تێگەشتم کەوتوینەتە چ قەیرانێکی مەترسیدار دەست بەجێ بۆ بردنی بەلەم بۆ قەراغ ڕووبار هەوڵمان دا بەڵام بەداخەوە ئەم کارە نەکرا و ئاوەکە کەوتبووە هەڵبەزو دابەز بووە ڕێگر لەوەی بتوانین بەلەمە دارییەکەی خۆمان ببەینە بەستێن.

ورده ورده بەندە گیاییەکانی دارەکان پچران و بەلەم بەرەو لەناوچوون رۆشت. ئاسمان دەینەراند و بارانێکی توند دەباری. دەتوت دەریایەکیان لە ئاسمانەوە بۆ زەوی بەرداوەتەوە. ئاو لە هەموو شوێنێك بوو. سات بە سات ئاوی ڕووبار زیادی دەکرد و بارودۆخ مەترسیدار تردەبوو. من و یوری سەخت هەوڵمان دەدا. چەن خولەك دواتر لەیەکتر جیابووینەوە کاتێك سەری خۆم سوڕاند کە بەداخەوە لە یوری کەمترین هەواڵ و شوێنەوارێك نەبوو. تەنافەگیایەکانی بەلەم پچرا بوون و لەئەنجامدا یوری کەوتە ناو ئاو و لەوانە بوو بخنکێت. لە ژێر بارانی توندی ناوچەی گەرمەسێر کە وەك کلکی ئەسپ لە ئاسمان دێتەخوار و لەسەر شەپۆلە خرۆشاوەکانی ڕووبار لەبەردەم ئەو لافاوە مەترسیدارەی هەستابوو، منی پەرێشان و داماو لە سەر دارێك وەستابووم و بەردەوام بانگی یوریم دەکرد.

یوری ! یوری ! یوری !

بەڵام بەدبەختانە دەنگی هەورە بروسکە و تۆفان ئەوەندە زۆر بوو تەنانەت دەنگی خۆیشم نەدەبیست چ بگات بەوەی دەنگی یوری ببیستم و یان یوری دەنگی من، لە خەمی زۆری لە دەست دانی هاوڕێیەکی خۆشەویست و تەنیا مانەوە لەم جەنگەڵە مەترسیدارە نزیك بوو لەترسا جەڵتە بکەم. دڵم دەیویست خۆم فڕێدەمە ناو ئاوەکە تا بخنکێم بەڵام دواتر پەشیمان دەبوومەوە و بەهۆی لاوازی و ناتەوانی و بەبوونی تەکانە توندو تیژەکانی شەپۆلەکان کەوتمە سەر دارەکە و ئیتر نەمزانی چی بوو.

لە دوایین خولەکەکان بیرم هێنایەوە تەکانێکی توندم بەرکەوت و سەرم لە سەرسوڕمان بەر شتێکی قورس کەوت. کاتێك چاوەکانم کردەوە لەباو تۆفان و ڕووبار هەواڵێك نەبوو. لەسەر تەختەی پاناکانی بەلەم لای دارێکی کۆن بووم و لەگەڵ ڕووبارەکەوە زیاتر لە دوو سەد مەتر دوور بوو. هەموو شوێنێکی سروشت ئارام ببوویەوە ئەی یوری کوا؟

نەبوونی یوری بۆ من لە هەر کارەساتێك گرنگتر بوو. لەم ماوەدا کە لەگەڵ یوریدا

گەشتم دەکرد، بێجگە لە هەموو ئەو کەڵکانەی لێم برد لەگەڵ هەموو ئەو یارمەتیانەی ڕاستەوخۆ و ناراستەخۆ بە منی کرد و چەندین جار لە مردن ڕزگاری کردم ئەوەندە عادەتم پێ گرتبوو بەرادەیەك ئارەزوو مەندی ببووم کە ناتوانم وەسفی بکەم و دەترسم شتی وا لە حەزی زۆری خۆم بۆ یوری بنوسم ئێوە باوەڕ ناکەن.

مرۆڤ بە درێژایی تەمەنی خۆی لەگەڵ چەندین جۆر سۆزدا ئاشنا دەبێت. دەربرینی هەندێك لەم سۆزانە مرۆڤ ئازار دەدات و دەربرینی هەندێکیتر دەیباتە ناو چێژو خۆشیەکی بێ کۆتایی. هاوڕێیەتی و خۆشەویستی یەکێك لەم سۆزانە کە مرۆڤ لە دەربڕینی دەلەرزێت. لەمن دا ئەم سۆزە بەم شێوەیە کاریگەری دادەنێت و لەبەر ئەوەی دەروون ناس نیم و لێکۆڵینەوەم لەمبارەوە نەکردووە، کاریگەری لەسەر خەڵکانیتر نازانم.

هەرچەندە ئێرە شوێنی ئەم خواست و باسانە نیە و دەبێتە هۆی درێژی قسە، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانم پەیوندی خۆم لەگەڵ یوریدا نیشان بدەم و ڕشتەیەك کە ڕۆحی ئێمەی دوو کەسی بەیەکەوە پەیوەند دەدا ئاشکرابێت، لەباس کردنی ئەم بابەتانە ناچارم.

من یوریم خۆش دەویست. ئەم خۆشەویستیە لە دەرەوەی سنووری ئەو نیازە بوو کە بەیوریم بوو. بۆیە کاتێك چاوم کردەوە و خۆم لەبن دارێکی کۆنە ساڵ لەسەر تەختەیەکی شکاوی بەلەمەکە بە تەنیاو بەبێ یوری بینی، نزیك بوو شێت ببم. یوری لە کوێیە؟ ڕەنگە ئێستا لەولاتر کەوتبێت؟ بەم بیرەوە لە شوێنەکەم هەستام تا بەدوایدا بگەڕێم بەڵام ئازارێکی توند لە بەشی قاچ و پەڕاسو و سنگ و شوێنەکانی تری جەستەم پەیابوو و ڕێگر بوو لەوە ببتوانم ئەم مەبەستە بە جوانی ئەنجام بدەم.

دەرکەوت زۆرم ئازار پێگەشتوە چوونکە هەموو گیانم ئازاری هەبوو و لە هەمووی گرنگتر سەرم گێژی دەخوارد. ئازار زۆر گرنگ نیە..... یوری لە کوێیە؟ بە دژواری توزێك ڕاست بوومەوە  بە هەموو توانامەوە هاوارم کرد و وتم:

هۆ........ یوری.... هۆ.....لەکوێیت؟ وەڵام بدەرەوە

هیچ دەنگێك مەگەر دەنگی خۆم نەبیسترا. باوباران و تۆفانیش تەواوببوو. سروشت و ئاسمان هەموو شوێنێکی دنیا ئارامی گرتبوو و ڕەوتی سروشتی خۆی بەسەردەبرد. قوڵپی گریان قورگمی دەگوشی و بەخۆمم ووت:

((خوایە، ئەم هەموو تۆفان و ئازارە سروشتیانەت بۆیە ساز کرد کە یوریم لێ بستێنیت و بەبێ هاوڕێ بەتەنیا بمهێڵیتەوە. ئای لە خۆشەویستی خوایی تۆ.....))

حەزم دەکرد بگریم. قوڵپی گریان قورگمی دەگوشی و ئازاری دەدا. نزیك بوو لەخەم و خەفەتدا دڵم بتەقێت ! خوایە یوری لەکوێیە؟ سەرم نا بەدارەکەوە و ڕوخسارم لەناو دەستم گرت و بیرم کردەوە ئەم کارەم بۆ ئەوە کرد ئەگەر ویستم و حەزم لێ بوو بە ئازادی بگریم، دارەکانی جەنگەڵ و سروشت نەمبینن و هەست بەلاوازی وسستی من نەکەن.

نەمزانی چەند خولەك لەو حاڵەدا مامەوە. هەروەها بیرم نیە کە گریام یان نە. کتوپڕ بەدەنگێکی سەیر هاتمەوە خۆم و ڕشتەی بیرەکانم لێك پچڕا. ئەو دەنگە لەسەر سەری من دەبیسترا دەنگێکی تایبەت بوو ئەگەر بمەوێت بە پیتەکان نیشانی بدەم دەبێت ووشەی ((غژ)) هەڵبژێرم بەم جیاوازیە کە ئەم ((خ و ژ )) چەند چرکەیەکی خایاند و کتوپڕ بە دەنگێکی وشك وەك بەرکەوتنی نووکی دار کوونکەرەیەك بە دارەکە کۆتایی پێ هات.

بەوردی لەم لاولای خۆم ڕووانی بەڵام هیچ ئاژەڵێك لە دەوروبەری من نەدەبینرا. چەند ساتێکی کورت تێپەڕی، نزیك بوو ئارام بگرم و دوبارە بڕۆمە ناو فکرو خەیاڵ. دوبارە هەمان دەنگی ((غژ)) بیسترایەوە ئەم جارە دەنگەکە زۆر نزیکتر گەشتە گوێم.

یەك چرکە چاوەکانم بەست تا شوێنی دەنگەکە لەبیری خۆمدا بەدوایدا بگەڕێم و دیاری بکەم. هەستم کرد دەنگەکە لەسەر سەرم دەبیسترێت. بەهێواشی سەرم بەرەو قەدی دارەکە کە لەژێریدا دانشتبووم و پاڵم پێوە دا بەرزکردەوە و بە سەرسوڕمانەوە بینیم دوو تیر هەرکام بە دووری چەند سانتیم مەتر لەسەر سەری من لە قەدی دارەکە ڕۆچوون و هێشتا دەجووڵێنەوە.

هەناسەیەکی کورت بێ ئیرادە لە سینەم هاتەدەر. بینینی ئەو دوو تیرە ژەهراویە بە تەواوی ترساندمی ئەگەر یەك لەوان بەر سەرم دەکەوت کار تەواو بوو و ئێستا جەستەی بێ گیان و سوور لە خوێنی خۆم لێرەدا کەتبوو.

هێشتا لە سەیرکردنی تیرەکان ئاسوودە نەبووم کە تیری سێیەم بەویزەویز لە بەرانبەری سینەمەوە تێپەڕی و لە قەدی دارەکە ڕۆچوو. ئەم تیرەش بە دووری دوو تا سێ سانتی مەتر لای دڵی منەوە تێپەڕی و خوا ڕەحمی کرد لە دڵم نەچەقی.

ئەم تیرانە لە کوێوە دەهاتن؟ چاوە ترساوەکانی خۆم بەم لاولادا تەرکیزی پێ کردو سەرئەنجام لە دووری پەنجا هەنگاوی بەرانبەری خۆم منداڵێکی دە یانزە ساڵەم بینی کە تیروکەوان بەدەست تیرم بۆ دەهاوێت و بێ ئەوەی لە شتێك بترسێت سەرقاڵی کاری خۆیەتی. دەوت ئامانجی لەشتێکی بێ گیان گرتووە. بە بینینی ئەو قیژاندم و لە

شوێنەکەمدا هەستام. بەڵام مناڵەکە بێ گوێدان بە من سەرقاڵی کاری خۆی بوو و بۆ هەر شوێنێك کە من جەستەی خۆم خواردەکردەوە ئەویش تیروکەوانەکەی لە دەستدا جێ بەجێ دەکرد و هەوڵی دەدا بە تیری چوارەم لە پێم بخات.

لەم کاتەدا کە لەترس و سەرسوڕمان گێژ و مات ببووم و نەمدەزانی چی بکەم، پیاوێکم بینی لە چەند هەنگاوی ئەو مناڵەدا وەستاوە و لە کاتێکدا پێ دەکەنێت و ددانە سپی و تیژەکانی خۆی نیشانی من دەدات، سەرنجی لای هونەری ئەو کوڕەیە.

ئەو پیاوە ڕووت بوو. مناڵەکەش وەك ئەو بە قوماشێکی دەست چنراو قەدی کە زیاتر لە پێشی دار دەچوو تا قووماش بەشێك لە جەستەی خۆی داپۆشیبوو. سەیرێکی ئەو پیاوە زلەو مناڵەم کرد. قیافەیەکی سووتاوی رەنگ قاوەییان بوو، چاوەکانیان دەبریسکایەوە و وەحشی گەری لە ڕوانینەکانیان ئاشکرابوو.

خوێندنی من لەبەشی مرۆڤ ناسی جگە لە بەدبەختی و چارە ڕەشی و سەرگەردانی سوودی تری بۆم نەبوو. بەڵام لەم کاتەدا کەڵکی باشی پێ گەیاندم. کاتی خوێندن لەبەشی خەڵك ناسی کاتێك نەتەوە و هۆزە پێش کەوتوەکانمان دەخوێند ئارەزوم بۆ خوێندن کەم دەبووەیەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەی دەگەشتینە هۆزو نەتەوە وەحشیەکانی ناو جەنگەڵ بە ئارەزوویەکی زیاد لە ڕادە لەناو پۆلدا ئامادە دەبووم و چاوم لە دەمی مامۆستا هەڵنەدەگرت و بە خۆشحاڵیەوە هەموو شتێکم سەبارەت بەم بەشە، بە جوانی فێر دەبووم

ئەو ڕۆژە لەبیرنەکراوە کاتێك بەترسەوە سەیری ئەو پیاوە و مناڵەکەم کرد و دەستم تەکان دا کە لە کوشتنی منی بێ سیلاح خۆ بەدوور بگرن و گوێ لە قسەکانی من بگرن لەناکاو چاوم بە قژو ناوچاوی بەرزی رەنگاورەنگی ئەوان کەوت.

لە زانکۆ کاتی خوێندن، خوێندبووم لە هۆزی کواچا دانیشتووی جەنگەڵی باران، بە تەسریحەیەك بەڕەنگی تایبەت ناوچاوی خۆیان دەبەستن و بەزمانی کوانچوا قسە دەکەن. بە خۆشحاڵیەوە تا ڕادەیەك ئەم زمانەم دەزانی بۆیە بە خۆشحاڵیەوە بە زمانی خۆیان ووتم:

هاوڕێیانم......... مەمکوژن... منیش لەکوانچام.

بەڵام مناڵەکە بێ گوێدان سەرقاڵی کاری خۆی بوو وچوونکە من بەردەوام شوێنم دەگۆڕی چەند تیرێکی بە فیڕۆ ڕۆشت، بۆیە تووڕەبوو وبەتووڕەییەوە منی نیشانەگرت.

ئەو پیاوە کە دەنگی منی بیست سەیرێکی جەستەی ڕووت و پێستی سپی و مووی

بۆری منی کرد، لەناکاو برۆکانی هێنایەوە یەك و بەدەست ئیشارەیەکی لە منالەکە کرد و هاتەپێش. منالْ تیروکەوانەکەی داگرت. وام دەزانی ئەو وەحشیە بۆ دەربرینی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی بەرەو لای من دێت بۆیە خۆشحالْ بووم و دەستەکانم لەیەك سوو بەلاّم کتوپڕ خەنجەرەکەی لەکەمەر دەرکێشا و بە نیگایەکی خوێناوی و ڕوخسارێکی ترس ئەنگێز بەرەو لام ڕایکرد.

بەدبەختانە هەموو شتێکم لە ئاودا نوقم ببوو بەلاّم خەنجەرەکەم لە شوێنی تایبەتی خۆیدا بەکەمەرمەوە بوو. پیاوی وەحشی دوو سێ هەنگاوی تر هاتە پێش تا گەشتە یەك هەنگاوی من. نەجوولاّم و وەك کێو وەستام تا شەڕی دەستەویەخەی لەگەلْ بکەم. ئەو زۆر بەهێزتر لە من دەهاتە بەرچاو و بۆ کوشتنی من وەك هەلْۆ لە شوێنەکەی بەرزبوویەوە و خۆی بەرەو لای من درێژکرد.

لەیەك چاو تروکاندا لێك ئالاّین و لێك جیابووینەوە بێ ئەوەی بتوانین ئازار بەیەکتر بگەیەنین. لەم تاقی کردنەوەدا ئەنجامێکی خراپم گرت چوونکە تێگەشتم ئەو زۆر بەهێزە. شەڕ و پێکدادانی من و ئەو وەك شەڕ و پێکدادانی فیل و ڕێوی بوو.

ئەو جەستەیەکی زلی نەبوو بەلاّم ماسوولکەکانی وەك پۆلاّ بەهێزبوو بەشێوەیەك بەشەقەزلەیەك دەیتوانی لەپێم بخات. ئەم تاقی کردنەوە هەرچەندە بووە هۆی ترسی من لانی کەم ئەم باشیەی بوو هەوڵم دا ئاگاداری خۆم بم. بڕیارم دا هەمیشە خۆی لێ بە دووربگرم و تا ئەو شوێنەی دەکرێت ڕێگە نەدەم دەستی بە من بگات ڕەنگە لەم ناوەدا دەرفەتێکم دەست بکەوێت و بتوانم لەپێی بخەم. هێرشەکانی ئەوم بە ڕاکردن بەرپەرچ دەدایەوە و هەوڵم دا تا ئەو شوێنەی دەکرێت هیلاکی بکەم تا تواناای خۆی لە دەست بدات. منالەکە بە حەزێکی سەیرەوە لەم دیمەنەی دەڕووانی و بزە لەسەر لێوە ناسکەکانی بزر نەدەبوو. ئاشکرابوو لەم دیمەنە مەرگ هێنەرە چێژ دەبات.

پیاوی وەحشی چەند جارێك هێرشی کردە سەرم و تا دوای دارەکە ڕاوی نام. گەشتمە شوێنێك کە بە جووڵەیەك دەمتوانی خۆم لەپشت دارەکە بشارمەوە بەلاّم لەوێدا وەستام و نەجوولاّم تا ئەوەی هێرشی کرد هێرشەکەی زۆر توند بوو بە شێوەیەك خەنجەرەکەی بۆ داهێنامەوە کە ئەگەر نووکەکەی لەجەستەم گیر بوایە تا دەسکەکەی بەئاسانی لە گۆشتم دەچەقی و دەیناردم بۆ ئەو دنیا. ئەم جارەشیان زۆر بەخێرایی خۆم کێشایە دواوە و توند مەچەکی دەستیم گرت.

ئەو مەچەکی دەستی منی گرتبوو و منیش مەچەکی دەستی ئەو. زەختمان لەیەك

دەکرد رەنگە یەکمان بتوانێت ئەویتر لە پێ بخات. ئەم زۆر تاقی کردنەوە رەنگە خولەکێك یان زیاتری خایاند، کەم کەم هەستم کرد نزیکە دەستم لە جووڵە بکەوێت. زەختی پەنجەکانم لەسەر مەچەکی دەستم ئەوەندە زۆربوو دەتوت دەستمیان لەناو گیرەیەکی ئەلکتریکی و یان لەسەر سندانی کارخانەی پۆڵا سازی داناوە و بە چەکوشێکی ١ تەنی پیای دەکێشن.

زۆرم زەخت لەخۆم کرد و تا ئەو شوێنەی ئەگەری بوو هەوڵم دا خۆگری بکەم. کتوپڕ بیرێك لە مێشکمدا هات و دەست بەجێ خستمە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە. قاچی راستی خۆم بەهەمان شێوە کە لە دواوە بوو جووڵاندم و بەهەموو هێزی خۆم لەقەیەکم لە سکی دا.

بە رزگاری خۆم هیوادارنەبووم بەڵام بەخۆشحاڵیەوە ئەو لەقەیە ئەوەندە بەهێزبوو کە قیژاندی و مەچەکی دەستی بەردام. بەخێرایی دەستی ماندووی خۆم بەرەو سینەی بردو خەنجەرەکەم لەیەکەم دەرفەتدا تا دەسکەکەی لەسکی، لە ژێر قەفەسەی سینەی رۆکرد.

ئەو هاوارێکی تری کردو بە دواوە رۆشت تا سەرئەنجام لە چوار هەنگاوی من لەبەردەم قاچی ئەومناڵە کە هێشتا پێ دەکەنی و شادمان بوو کەوت و گیانی دا. خەنجەرە خوێناویەکەم لە دەستمدا بوو بەڵام نەمدەویست ئەو مناڵە بکوژم و زیاتر لەمە سەرم سورمابوو بۆ پێدەکەنێت و لە مردنی باوکی شادمانە. مناڵ لەهەمان کاتدا بێ ئەوەی لە خەنجەرەکەی من بترسێت هاتە پێش و بە زمانی کوانچۆ هەندێ شتی وت کە بە دژواری لەچەند وشەی تێگەشتم و خۆشحاڵ بووم چوونکە پێی ووتم:

ئێوە شەڕکەرێکی باشن، زۆرباش ڕاو دەکەن.

و دواتر سەیرێکی جەستەی ئەو پیاوەی کرد و بە ڕوخسارێکی نارازی ووتی:

ئەمە ڕاوچیەکی باش نەبوو.

ئەمە مامۆستام بوو... زۆر باش بوو کە کوشتت، زۆر تەمەڵ بوو و لەگەڵ مندا نەدەهاتە راو... ئەمەی وت و چەند لەقەیەکی بەهێز لەسەرو روخساری خوێناوی ئەو پیاوە دا و دواتر بە ڕوخسارێکی کراوە بەرەولای من هات.... سێ هێڵی سوور رەنگم لەنێوان برۆکانی و بەینی برۆ و سەری بینی و تێگەشتم نەجیب زادەیە. پێش ئەوەی لەمبارەوە پرسیاری لێبکەم ووتی:

باوکم سەرۆك هۆزی کوانچۆیە. تۆ مامۆستای منیت و پێکەوە دەچینە ڕاو. وەرە با

بڕۆینە هۆزەکە بۆلای باوکم تا تۆی پێ بناسێنم... خێراکە.

ساتێك بیرم کردەوە و دەست بەجێ ووتم:

ئامادەم.... لەگەڵتا بێمەلای باوکت... من مامۆستای تۆ دەبم.

و بەخێرایی لەگەڵ ئەودا بەرەوخاڵێکی نادیارو مەترسیدار لەجەنگەڵی باران بەڕێکەوتین. لێرە بەدواوە چارەنوسێکی سەیر چاوەڕوانی دەکردم چوونکە گەشتبوومە یەك میلی هۆزی ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن و خۆم لەمە بێ ئاگابووم. وام دەزانی کەس منی نەبینیوە بەڵام دواتر تێگەشتم لەسەرەتای کەوتنی من لە قەراغ ڕووبار تا کاتێك لەگەڵ ئەو کوڕەدا بەڕێکەوتم پاسەوانانی ژنی هۆزی ژنانی وەحشی چاودێری جووڵە و کردەوەکانی منن و بەردەوام بەسەرۆکی هۆزەکەی خۆیان کە ژنێکی زۆر جوان بوو ڕاپۆرت دەدەن.

منال لەرێگا دا زیاتر خۆی ناساند و شانازیە ڕەگەزەیەکانی خۆی باس کرد.

بۆ نمونە دەیووت ناوم سمی یە. باوکم بە تالکا ناو دەبرێت و سەرۆکی هۆزی ((پی چی)) یەکانە من کوڕە گەورەی ماڵم و ئەگەر باوکم بەم زوانە بمرێت و یان یەکێك لە سەرۆکەکانی هۆزەکانیتر بیکوژن من دەبم بە سەرۆك.

بە هەمان شێوە کە لەناو دارە چڕەکانی جەنگەڵدا دەڕۆشتمە پێش و لەگەڵ سمی کە منالێکی چاونەترس و ئازا دەهاتە بەرچاو، قسەم دەکرد، باشتر و جوانتر لەگەڵ زمانەکەیان ئاشنا دەبووم. زمانی پی چییەکان زمانی زۆربەی خەڵکی جەنگەڵی بارانە. یەکێك بوو لەو دوانزە زمانە وەحشیە و جیاوازە کە ئێمە لە زانکۆدا یاساکانیمان دەخوێند بەڵام چوونکە بەو زمانە قسەم نەکردبوو، ئێستا هەستم دەکرد زووتر دەتوانم فێربیم، بەهەرحاڵ پێویستی خۆم بە کۆکردنەوەی ئەو وشانەی لەبیرمدا مابووم، لەناو دەبرد.

بۆ ئەوەی زیاتر قسەی لەگەڵدا بکەم و لەگەڵ دەستەواژەکانی زمانی پی چیەکان زیاتر ئاشنابیم لێم پرسی:

مەگەر هۆزەکەی ئێوە دوژمنی هەیە؟

بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم و ووتی:

مەگەر لە هۆزەکەی ئێوەدا شەڕکەران شەڕناکەن؟ دوژمنیان نیە ! باوکم گەورەترین شەڕکەری جەنگەڵی بارانە و تا ئێستا دەیان کەسی کوشتووە و هەربۆیە دەیانەوێت بیکوژن. بەڵام گەورەترین دوژمنی ئێمە ژنە وەحشیەکانن.

بە بیستنی ڕستەی ئاخر، تەکانێکم خواردو بەخێرایی قسەکانیم پچڕاند و پرسیم:

مەگەر ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن لێتان نزیکن !

دووبارە سەیری کردم ووتی:

بەڵێ ئەوان لە دراوسێیەتی ئێمەدان. هەندێ کات هێرشمان دەکەنە سەرو تاقمێك لە پیاوەکانمان لەگەڵ خۆیان دەبەن و دواتر دەیانکوژن و سەرەکانیانمان بۆ دەنێرن. ئێمە ناتوانین شەڕیان لەگەڵدا بکەین چوونکە لەگەڵ ئەوەی ژنن زۆر ئازان.

شتی سەیرم دەبیست. ئاگاداربووم لەم بابەتە چوونکە پەیوەندی بەڕەگەزی ژنەوە بوو، هەم بۆم شیرین و سەرنج ڕاکێش بوو هەم دەیترساندم و پشتمی دەلەرزاند.

دەمویست لەمبارە پرسیاری تری لێبکەم بەڵام لەناکاو بەخۆشحاڵی قیژاندی و دەست بەجێ تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و لە کەوان دا دایناو بێ ئەوەی کاتی خۆی بۆ نیشانە گرتن بەفیڕۆبدات، تیرەکەی رەهاکرد و ساتێك دواتر مەیمونێکی بچووك لەلای دارەکان کەوت، مەیموونەکەقیژاندی و گیانی دا.

بەسەرسوڕمانەوە لە جووڵەکانیم دەڕوانی. سەرم سورما بۆ مەیمونەکەی بەتیر پێکا دەمویست سەرکۆنەی بکەم بۆ ئەو مەیمونە بێ تاوانەی کوشت بەڵام بینیم بەخۆشحاڵی و بەتەماحێکی نەشیاو بۆ وەسف چەقۆیەکی لە تیردانەکەی دەرهێناو سەری مەیمونەکەی بڕی. لە کاتێکدا لە سەرسوڕمان دەمم کرابوویەوە، لەم دیمەنە سەیرەو کەم وێنەم دەڕوانی و نەمدەوێرا قسەبکەم. ئەو بەحەزێکی زیاد لەڕادە سەرقاڵی کاری خۆی بوو، سەرنجی لای سەرسوڕمانی من نەبوو. سەرەتا سەری مەیمونەکەی بڕی و فڕێیدا و دواتر سکی هەڵدڕی و ئەوسا ریخۆڵەکانی هێنایە دەرو بەخێرایی وبەلێهاتووییەکی سەرسورهێنەر پێستەکەی داماڵی و لە کاتێکا دەستە خوێناوی و سپیەکانی خۆی دەلستەوە ووتی:

چیلکە و دارکۆکەرەوە تا کەبابت بۆ دروست کەم.

دەمویست بەلەقەیەك فڕێدەمە ئەلاوە و دواتر بە خەنجەر سینەی هەڵدڕم و درێژە بەرێگەی خۆم بدەم بەڵام چوونکە هێشتا مناڵ بوو ئەم کارەم بە قێزەون دەزانی کە مناڵێك بکوژم. ئەگەر لە جیاتی ئەو کەسێکی گەورە دەیویست مەیمون بکاتە کەباب و بیخوات، بە دڵنیاییەوە دەمکوشت. بەم شێوەی کە خوێندتان و زانیتان مرۆڤ کوشتن بۆ من ئاسان ببوو. لەهەموو شوێنێك بۆ رزگارکردنی خۆم کەڵکم لێوەردەگرت. خەریك بوو دەڕشامەوە. مەیمونی پێست داماڵراو وەك مناڵێکی دوساڵە دەهاتە بەرچاو کەسەریان

بڕیبێت. بە باوەڕی من خواردنی گۆشتی مەیمون لەگەڵ خواردنی گۆشتی مرۆڤ جیاوازی نیە بۆیە لەم کردەوەی ئەو زۆر تووڕە بووم، بەڵام رێگە چارەیەك جگەلەوەی لەگەڵیدا بسازێم و سەرنجی راکێشم، لەبەردەمما نەبوو. ئەو ((سمی)) کوری سەرۆك هۆزی ((پی چیە)) کان بوو. لەم حاڵە لەجەنگەڵ، بێ یارمەتی و رێ نیشاندەر، دوای نەمانی یوری باشترین دۆست و پارێزەری منە ! دەمتوانی چی بکەم گریمان ئەویشم دەکوشت و بەدوای کاری خۆمدا دەڕۆشتم، دەگەشتمە کوێ؟ چۆن لە زیانی ژنانی وەحشی ئامازۆن و هۆزی پی چیەکان لە ئەماندا دەبووم؟ دەچوومە کوێ کە ئەوان دەستیان بە من نەگات؟ لەبەرئەمە دەستم بە کۆکردنەوەی چیلکەکرد و دوای چەند خولەك سمی سەری تیرێکی وەك دریل لەسەر بەردێك سوڕاند و ئاگری خۆش کرد، بە لقە ناسکەکانی دار کەبابی دروستکرد.

بۆنێکی ناخۆش لەم کەبابە بێزارکەرە هەڵدەستا کە لووتی ئازار دەدام بەڵام سمی بە حەزێکی تایبەتەوە کەبابەکەی لەسەر ئاگر دەسوڕاند و هەندێ کات ددانەکانی خۆی لە گۆشتی نیوەکولاوی مەیمون رۆدەکرد و پارویەکی لێ دەخوارد.

دوای ئەوەی کەباب دروست کرا سمی قاچەکانی کردەوە و دەستی بەخواردن کرد بێ ئەوەی سەرنج بە من بدات وەك مانگا دەیخوارد و من لە سەیرکردنی ئەو کە بەتام و چێژەوە گۆشتی مەیمونی وەك گۆشتی کەو دەخوارد، خەریك بوو دەرشامەوە و هێڵنجم دەدا.

بۆ ئەوەی زیاتر نارەحەت نەبم پشتم تێ کرد بەڵام بانگی کردم و ووتی:

وەرە بخۆ، بۆ وەستاویت، لای ئێمە بەئاسانی گۆشتی مەیمون دەست ناکەوێت.

ئەوەندە حاڵم خراپ بوو کە ئەگەر بۆ قسەکردن دەمم بکردایەتەوە دەرشامەوە. بۆیە بە ئیشارەی سەر تێم گەیاند حەزم لە خواردن نیە.

سمی کە دەتوت لە نەخواردنی من شادمان بووە بەئاسوودەیی دەستی بەخواردن کرد و نیوکاتژمێر دواتر لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم لە مەیمونە مناڵە کە لانی کەم چوار پێنج کیلۆ گۆشتی پێوە بوو، شتێك بیجگە لە ئێسقان نەماوبوویەوە.

دوای خواردنی مەیمون سمی هەستاو لە کاتێکدا قامکەکانی دەلستەوە، بەرێکەوت و بە ئیشارەیەك منی بەدوای خۆیدا بانگ کرد بەڵام ئێستا سمی لەگەڵ کاتژمێرێك پێشوتر زۆر جیاوازبوو کاتژمێرێك پێش وەك بە چکەی بنیادەم بوو، ئەندامی رێك و بەئاسانی بەرێگادا دەڕۆشت بەڵام ئێستا سکی ئاوسابوو، بە دژواری هەنگاو هەڵدەگرت

و نەیدەتوانی بچەمێتەوە.

لە زۆر خۆری و سك برسیەتی ئەو سەرم سوڕما. هەستم دەکرد ئەگەر مرۆڤە پێش کەوتووەکان بزانن نەتەوەیەك لە نەتەوەکان گۆشتی مەیمون دەخۆن باوەڕدەکەن یا نا....؟

بەڵام دواتر تێگەشتم مەیمون باشترین خواردنی هۆزی پی چیە و تەنیا لە میوانی و جەژنەکان بە دژواری چەند مەیمون بۆ سەرۆك هۆز ڕاو دەکەن. سەرۆکیش دوای خواردنی یەکێکیان ئەوانیتریان لەناودا دابەش دەکات.

سەرم سوڕما ئەم منالە چۆن چەند کیلۆ گۆشتی خوارد بەڵام دواتر زانیم هەموو پی چیەکان زۆر خۆرن و کەم خۆرترینیان لانی کەم چوار تا پێنج بەرانبەری شارنشینەکان دەخوات و تازە لە کەم ئیشتیایی خۆیان نارەزایی دەردەبرن و بۆ چارەسەر دەڕۆنە لای جادوگەری هۆز.

سمی ڕێگەی جەنگەڵی باش دەناسی و منی بەدوای خۆیدا دەبرد. دوای بڕینی ماوەیەکی درێژ گەشتینە جادەیەك کە بەرزاییەکەی زیاتری بوو. لەسەر تەپۆڵکەیەك کێشرابوو کە ئەو تەپۆڵکەیەش دریژەی جەنگەڵ و ڕەنگە چڕتر لە زەوییە تەختەکان بوو. لەسەر تەپۆڵکەکە هۆزی پی چیەکان دیاربوو کە لەسەر تەختاییەکی سافدا بوو و خانوەکانیان لە چەندین ریزدا کێشرابوون.

لەوێوە هات و چۆی خەڵك دەبینرا بەڵام لەجیاتی ئەوەی کە دوای بڕینی ماوەیەکی دوور و درێژ و ئەو هەموو هیلاکیە دەگەشتینە ناوچەیەکی ئاوەدان، خۆشحاڵ و شاد بم تووشی ترس و پەرێشانی ناخ بووم. ترسم لەوە بوو لای خۆم بیرم دەکردەوە و دەموت:

ئەم منالە زۆر شەیتانە..... بۆ ئەوەندە سادەم توانی هەڵم خەڵەتێنێت. من ڕاهێنەر و مامۆستای ڕاوەکەیم کوشت لە کوێوە بزانم ئەو منی هەڵنەخەڵەتاندبێت؟ ئەگەر بیانەوێت بمکوژن کێ بە فریام دەکەوێت..؟ چی دەبێت....؟

حەز دەکەم هەموو ئەو کەسانەی ئەم دێرانە دەخوێننەوە بۆ یەك ساتیش بێت خۆیان لە جێگەی من دابنێن تا بزانن چ حاڵێکم هەبووە و بزانن ئایا مافی خۆم بوو بترسم یان نە.

چی بکەم...؟ لێرەوە بگەڕێمەوە...؟ ئەگەر ڕابکەم سمی و پی چیەکان بەدوامدا نایەن؟ بەدڵنیاییەوە دێن... کەواتە ڕاکردنم بێ سوودە... چەند ساتێك ئەم پێ و ئەو پێ کرد و لەسەر تەپۆڵکەکە دوودڵ مامەوە بەڵام سەرئەنجام خۆم بەدەست قەزاوقەدەر

سپارد و بەڕێکەوتم.

سمی لەپێش منەوە ڕێگەی دەبڕی بەڵام کاتێك لە هۆزەکە نزیك بووینەوە وەستا تا پێی گەشتم و پێکەوە ڕۆشتین. لێرەوە سەیرکردنی دیمەنە کەم وێنەکان دەستی پێکرد، هەموو شتێك بۆم سەرنج ڕاکێش بوو. خەڵکی هۆزەکە، ژنان، پیاوان، منداڵەکان و شتەکانیتر کە لە سەر ڕێگەم دا دەمبینین هەموویان سەرنج ڕاکێش بوون.

پیاوەکان بەخڕی سەری خۆیان تاشیبوو. ئەوان بەزۆری ڕووت بوون بەڵام هەندێکیان شتێکی بۆ داپۆشینی شەرمی خۆی دروست کردبوو کە دیار نەبوو لە پێستی ئاژەڵە یان قوماش.

هەرکام ڕمێکی درێژ بەڵام باریکیان لە دەستدا بوو کە دیاربوو لە بەکاربردنی بەتوانان. قوولاپەی قاچیان تا ژێر نەرمەی ڕان بە ڕشتەیەکی سپی ڕەنگ کە هاوشێوەی تەناف بەستبوو. ژنەکانیش وەك پیاوەکان ڕووت بوون. ئەگەر هەندێ لە پیاوەکان شتێکیان بۆ داپۆشینی شەرمی خۆیان هەبوو، لەبەرانبەر ژنەکان بە تەواوی ڕووت بوون و تەنیا پارچەیان پێستێکی باریکیان لەبەینی قاچەکانی خۆیان تێ پەڕاندبوو و لەپشتەوە بەرشتەیەك کە لە کەمەریاندابوو بەستبوویان.

پیاوان بەزۆری بالآیان نێوەنج بوو بەڵام ژنان بالآ بەرز و ئەندامێکی ڕێك و قژێکی ڕەشیان هەبوو کە لە ڕادەبەدەر جوان و سەرنج ڕاکێش بوو. پێستی ژنەکان کەمێك لە پیاوەکان ڕوونتر دەهاتە بەرچاو بەڵام لەبەرامبەردا مووی پیاوەکان، بۆری نزیك بە سپی بوو کە سەرەتا وام زانی شتێکی سروشتیە بەڵام دواتر زانیم بەرەنگێکی تایبەت ڕەنگی دەکەن و بە باوەڕی خۆیان خۆیان دەیرازێننەوە.

دانیشتوانی هۆز و بەتایبەت ژنەکان بۆ سەیرکردنی من کۆببوونەوە بەڵام سمی بە کەوانەکەی خۆی پاڵی پێوەنان و ڕێگەی کردەوە تا گەشتینە ماڵی باوکی تالکا کە سەرۆکی هۆزبوو و ڕۆشتینە ناو.

لەناو ژوورەکە کە زۆر گەورە بوو بە دەستی ڕاستیدا سووڕام و دوای تێپەڕین لە ڕێگەیەکی باریك کە لە قامیش دروست کرابوو گەشتینە شوێنی تالکا. تالکا پیاوێك بوو چل و چەند ساڵ کە ئەندامێکی ڕێك و بەهێزی بوو سکی لەبەر زۆر خۆری و حەوانەوەی زۆر قەڵەو و ناوکی بەشێوەیەکی سەیر قووڵ ببوو.

تالکا چاوی ڕەش و سەرنج ڕاکێشی بوو کە هۆش و زیرەکی زیاد لە ڕادەی لێ ئاشکرابوو. لەیەکەم نیگادا بە زووی سەرنج ڕاکێشی بووم بەڵام بەسەر خۆمدا زاڵ بووم

سمی ڕووداوەکەی باس کرد و بەشادمانیەوە ووتی:

ئەم کەسە کەوەك سەگ مووی زەردە ((ئانگۆ)) پاسەوانەکەی منی کوشت. ئەوەندە جوان کوشتی کە پەسەندم کرد. ئەو شەڕکەرێکی باشە و بەئاسانی دەتوانێت دوان بکوژێت.

تالکا بەچاوە تیژەکانی خۆی سەیری کردم وتی: باشە..... بەڵام ڕۆحی گلاّوی نیە.

لەم وتوێژە ئەنجامم گرت و ئەنجامەکەش ئەوەبوو ئەوان وایان زانی سپی پێستەکان ڕۆحی شەیتانیان هەیە تالکا ڕشتەی هزرەکانمی پچڕاند و ووتی:

ئەو کاتێك ئانگۆی کوشت دەیتوانی تۆش بکوژێت و لەبەرئەوەی تۆی نەکوشتووە ئێمەش نایکوژین.

و ئەوسا بەدەست ئیشارەیەکی کرد. بەو ئیشارەیە سمی دەستی گرتم و لەژووری تالکا بردمیە دەر. سمی لەوەی باوکی بە من ڕازی ببوو شادمان دەهاتە بەرچاو بۆیە بەهەڵبەزودابەز منی لەناو دوو ڕیز لەماڵەکان تێپەڕاند و بردمیە ناوماڵێکی بچووك ووتی:

ئێرە ماڵی ئێوەیە، داری خواردنتان بۆ دێنێت.

نەمدەزانی داری کێیە و چیە ! ویستم پرسیاری لیّ بکەم بەڵام سمی دەرفەتی نەدا و لەژوورەکە ڕۆشتەدەر و ڕۆشت. تەنیا مامەوە و دەستم بەبیرکردنەوە کرد. چارەنوسی من چیە؟

ئەم پرسیارە بەردەوام زەحتی بۆ مێشکم دەهێنا.

لەم کاتەدا دەرگاکە کرایەوە و ژنێکی زۆر جوانی نیوە ڕووت کە بزەیەکی شیرینی لەسەر لێوبوو هاتە ژوورو لەبەرامبەرمدا وەستا. بەهەمان نیگای یەکەم ئەسیری جوانیەکەی بووم بەڵام چوونکە نەمدەزانی کێیە بە بزەیەك وەڵامی بزەکەییم دایەوە.

ئەو پەنجەی لەسەر سینەی خۆی داناو ووتی:

من داریم. ئەمە ئێوەن لە بەر عەشقی من ئانگۆتان کوشت کە ببنە خاوەنی من و ماڵی ئانگۆ.

لە مەبەستەکەی تێنەگەشتم بۆیە وەڵامم نەدایەوە. ئەو دووبارە پرسیارەکەی دووبارەکردەوە کە وەڵامی نەبیست ناوچاوی دا بەیەکدا ووتی:

مەگەر من جوان نیم؟ من منداڵت بۆ دەهێنم، شیر دەدەم.

ئەم جارەیان هاتمە قسەو بە زاراوە تایبەتەکەی خۆم کە بە دژواری لە مەبەستەکەم

دەگەشتن ووتم:

بۆ نا تۆ جوانیت بەڵام من ئانگۆم لەبەر تۆ نەکوشت.

هەندێ کات مرۆڤ ناچار دەبێت پشت بە درۆ ببەستێت. درۆ چەکێکی باشە بۆ کەسانێك کە هەست بە ناتەوانی دەکەن و بەردەوام لەسەرەتای دنیاوە تا ئێستا لەو کاتەوەی هابیل و قابیل کەوتنە گیانی یەك و یەکیان ئەویتری کوشت هەمیشە لە چەکی درۆ کەڵك وەرگیراوە.

دەبێت لەبەرچاوماندا بێت لەو سەرزەوینە مەترسیدارە منیش لاوازبووم. نەسیلاحم پێ بوو نەکەسێك منی دەناسی و نە بە جوانی ئەوانم دەناسی و لەئاوا بارودۆخێکدا ژنێکی جوان عەشقی خۆیم بۆ دەردەبڕێت و داوام لێدەکات شتێك بڵێم کە لە ڕاستییەوە زۆر دوورە.

کار لەکار ترازابوو، پێشتر وتبووم ئانگۆم لەبەر تۆ نەکوشت بەڵام بۆ قەرەبوو کردنەوەی رستەی پێشو دەستم گرت و بەرەو لای خۆم رام کێشا و ووتم:

تۆ زۆر جوانیت. من باسی تۆم کاتێك لە ڕووبار تێ دەپەڕیم لە ڕاوچییەك بیست دەیوت ژنی ئانگۆ زۆر جوانە و منیش دەمویست تۆ ببینم.

بەم شێوەیە درۆم کردو درۆکەم ئەوەندە لە ناخی ئەو ژنە نیوە ڕووتە کاریگەر بوو کە دەتوت گریان تێ بەرداوە و گەرماو سوتێنەری ئەو گڕە روخساری رەنگ بەڕەنگ دەکات.

سەرەتا لە شادمانیدا رەنگی پەڕی. دواتر سووربوو، لێوەکانی دەلەرزین و چاوەکانی دەبریسکانەوە کە کاریگەری لەسەر چاوەکانی منیش دانا ئەوسات دەستی لە ملم ئاڵاندو بۆنی بە ڕوخسارمەوە کرد.

لە دنیادا هۆزو نەتەوەی جیاواز دەژین و هەرکام لەم هۆزانە عادەت و تایبەتمەندی ئەخلاقی تایبەت بە خۆیان هەیە کە تەنیا بە پەیوەندی زۆر و گوزەری زەمان دەتوانین ئاشنایان بین. حەز دەکەم ئەوەی لەبارەی داب و نەریت و ئەخلاق و تایبەتمەندی ژیانی هۆزو نەتەوەکانی جەنگەڵی باران و بەتایبەت هۆزی ئامازۆن فێری بووم و دۆزیومەتەوە، لەم کتێبەدا لەگەڵ باس کردنی سەر بووردەی خۆم باسی بکەم بەڵام بەداخەوە لەم کتێبەدا شوێنێك بۆ ئەم حەقایەتانە نیە. ناچارم بەشێوەیەکی کورت ئەوەی بینیومە بینووسم و چاو لە هەندێکی بپۆشم.

نەتەوەیەك کە ئێستا لەناویاندا دەژیم و سمی جێگریان بوو، عاداتی تایبەتیان

هەبوو. ژنێك کاتێك لای ژنانی تر سەربڵندو سەر فراز بوو کە ژمارەیەکی زۆرتر لەبەر ئەو بکوژرێن. من ئانگۆ پاسەوانی سمی کوری سەرۆك هۆزم بەرێکەوت و بۆ پاراستنی گیانی خۆم کوشتبوو، بەڵام بەپێی یاساو رێساکانی ئەو هۆزە هەر کەسێك پیاوێك بکوژێت دەبێت ژنەکەی بباتە ماڵی خۆی و ماڵێکی تازە بەدەستی خۆی بۆ ئەو ژنە دروست بکات و ئاگاداری بکات. بەم شێوەیە منیش ببوومە ئانگۆو بۆیە یەك راست منیان بۆماڵەکەی ئەو برد.

لەلایەکیتر داری شادمان بوو کە من ئانگۆم کوشتووە چوونکە لای ژنانی تر شانازی دەکرد یەکێك لەبەر ئەو کوژراوە. من هیلاك و ناتەوان بووم. دەمویست بحەسێمەوە و چەند کاتژمێرێك بخەوم بەڵام داری بەپێچەوانەوە. ئەو پیاوێکی تازەی لەجیاتی ئانگۆی توورە و مۆن دەست کەوتبوو و لەم رووداوە خۆشحاڵ بوو. بۆیە دەستی کردە ملی من و بۆنی بە روخسامەوەکرد.

ئەو وەك کەسانیتری ئەو هۆزە ماچ کردنی نەدەزانی و من ئەمەم کاتێك ئەو لووتی لەسەر کوڵمم دانا و بۆنی کرد زانیم. لەگەڵ ئەوەی دەم و چاوم زبرو ریشم هەبوو ماچم کرد.

ئەو سەرەتا ئەم کارەی منی بە سەرسوڕمان و نارەحەتیەوە وەرگرت و برۆکانی هێنایەوە یەك و نارەزایی دەربڕی. بەڵام دوای چەند ساتێك روخساری کرایەوە و دووبارە دەستی لەملم ئاڵاندەوە و روخساری هێنایە پێش و چاوەکانی بەست.

زانیم ماچ کردنی پێ خۆشە و بۆیە دووبارەم کردەوە. سەرئەنجام لە کاتێکدا لەم دۆزینەوە تازەی خۆی رازی بوو دەستەکانی لەیەك دا و بەخێرایی لە ژوورەکە رۆشتەدەر.

تازە دەرفەتم دەست کەوت و لە دەوروبەری خۆم روانی، شتێکی ئەو تۆ لە ژوورەکەدا نەبوو. دیوارەکانی لە حەسیر دروست کرابوو و شتێك وەك لانکە لە ژوورەکەدا هەڵواسرابوو کە بە زیرەکی خۆم تێگەشتم شوێنی خەوی ئانگۆیە.

دواتر زانیم لەم هۆزەو هۆزەکانی دراوسێ پیاوان گرنگی تایبەتیان هەیە. پیاو لەماڵەوە لە ئارامیدایە کاتی حەوانەوە لەولانەکەدا دەخەوێت و ژن رایدەوەشێنێت و وەك ژنانی ئێمە کە مناڵ بەلایەلایە دەخەوێنێت ئەوەندە ئاوازی بۆ دەخوێنن و دەست بە قژیدا دێنن تا خەو بیباتەوە.

کاتێك چاوم بەو لانکە کەوت بێ ئیرادە خۆم تێ فرێدا و هەناسەیەکم بە ئارامی

کێشا. بەڵام دەرفەتی خەوم پەیانەکرد چوونکە لەم کاتەدا دەنگی داریم بیست کە لە دەرەوە پێدەکەنێت و لەگەڵ کەسێکیتردا قسەدەکات. ساتێك دواتر داری دەم بە پێکەنین هاتە ناو و دەست بەجێ بەدوایدا کچێکی زیاد لە ڕادە جوان هاتەژوور.

داری دەستی کێشاو لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا بەڵام کچەکە زیاتر لە ١٨ تا ١٩ ساڵی تەمەن بوو، بە بێزاریەوە هەنگاوی هەڵدەگرت. دەتوت ڕازی نیە. بەهەرحاڵ داری ئەوی تا نزیك من بە کێشان کێشان هێنا منی بە پەنجە نیشان دا و بەهەمان زەوقی منداڵانە ووتی:

بینیت کە ووتم ئەو ئانگۆی لەبەر من کوشتەوە، ئەم لە ئانگۆ باشترە.

من ئەم قسانەم کە ئەوان بە زمانی خۆیان دەیانوت تێ دەگەشتم بەڵام بە دژواری هەندێ کات بە وشیاری لە وشەکان تێدەگەشتم. کچەکە سەیرێکی کردم و سەری خۆی داخست. ئەو زۆر جوان بوو. ئەوەندە جوان کەناتوانم بە وشە و ڕستە وەسفی جوانیەکەی بکەم.

ئەویش وەك داری و هەموو ژنانی تر نیوە ڕووت بوو. تیکە قوماشێکی گیایی بە پێشی جەستەیەوە هەڵواسیبوو کە تەنیا بەشێکی بچووکی لە جەستەی دادەپۆشی.

بۆ ئەوەی خۆم لەدەست ئەوان ڕزگار کردبێت ووتم:

زۆر برسیمە، سەرەتا شتێکم پێ بدەن تا سکم تێربێت.

داری دەست بەجێ لە ژوورەکە ڕۆشتەدەر و چەند خولەك دواتر بە دەفرێکی پڕ خواردن گەڕایەوە. من کە دیمەنی گۆشتی مەیمون خواردنی (سمی) کوری سەرۆك هۆزم بینیبوو بە بینینی ئەو خواردنە حاڵم تێکچوو و پشتم تێ کردن.

داری بڕێك لە خواردنەکەی خوارد تا باوەڕی من بەدەست بێنێت بەڵام تامەزرۆی نەبووم بیخۆم تاکو ئەوەی بە دژواری ڕستەی پێویستم لە مێشکی خۆمدا دروست کرد لێم پرسی:

ئەم خواردنەتان بەچی دروست کردوە...؟

داری کەرەستە سەرەتاییەکانی خواردن کە لەماڵەکەیدا بوو هێنایە پێش و نیشانی داو تازە تێگەشتم خواردنی ئەو ڕۆژەی من کە لەناو ڕۆن و شیلەی شیرینی لە جۆرێك میوەی جەنگەڵی کوڵێنرابوو.

دوای بە دەست هێنانی دڵنیایی لەوەی کە گۆشتی مەیمون نیە، دەستم بە خواردن کرد، داری و هانا هەردووکیان لەبەرانبەرمدا دانیشتبوون و بە چاوە تیژ و لێوانلێو لە

وشیاری خۆیان. سەیریان دەکردم و لە چۆنیەتی خواردنی من سەریان سورما.

ژوورەکە لە بێدەنگی و ئارامیدا ڕۆچوبوو. ئەوان سەیری منیان دەکرد و منیش سەرقاڵی خواردن بووم و نەمدەزانی دوای خواردن چ پلانێکیان بۆ من هەیە و دەبێت چی بکەم. بۆ ئەوەی بێدەنگی بشکێنم و لەهەمان کاتدا زانیاری سەبارەت بە هانا بەدەست بێنم لە داریم پرسی:

هانا خوشکی تۆیە...؟

داری پێکەنی، چ پێکەنینێك...! و دواتر شانەکانی بەرزکردەوە بە نازێکی ژنانە ووتی:

من خوشکم نیە. ئەو کچی سەرۆکی هۆزو خوشکی سمی یە. مەگەر ئێوە سمی ناناسن.

لێرەدا بوو مێشکم گڕی گرت و ڕەنگ بە ڕوخسارمەوە نەما... من کچی سەرۆك هۆزم ماچ کردبوو....

و چ بەدبەختیەکی گەورە... ئەگەر تالکا بزانێت من کچەکەیم ماچ کردوە چی دەبێت و چ فەرمانێك دەردەکات بە دڵنیاییەوە بە زیندوویی لە ئاگردا دەمسوتێنێت...

هەردووکیان هەستیان بە شڵەژانی من کرد بەڵام هیچیان نەوت. منیش دەرفەتی زیاترم بۆ قسەکردن یان بیرکردنەوە نەبوو چوونکە لەم کاتەدا دەنگە دەنگ لەدەرەوە دەبیسترا و دەست بەجێ چەند پیاوی چەکدار کە تووڕەبوون و جنێویان دەدا، هاتنە ژوور.

یەك لەوان منی بە پەنجە نیشان دا ووتی:

بیگرن..... ئەم سەگە موو زەردە بگرن...

لەناکاو ئەو چەند پیاوە چەکدارە خۆیان دا بەسەرما و بە ڕاکێشان منیان لە ژوورەکە بردە دەر. پەلەقاژەم دەکرد و هەوڵم دەدا بەڵام بێ ئەنجام بوو. هەرچی پرسیم بۆچی منتان گرتووە و بۆ کوێم دەبەن؟ کەس گوێی لە قسەکانم نەگرت و سەرنجی پێ نەدا. ناچار تەسلیم بووم و خۆم بەدەست چارەنوس سپارد.

ئەوان منیان دەبرد و هەندێ کات کە قاچم دەلەرزی و سست دەبووم چەند مشت و لەقەیەکیان لە سەرو سکم و کەلەکەم دەدا و بەم شێوەیە خێرایی هەنگاوەکانی منیان زیاتر دەکرد. چەند خولەك دواتر گەشتینە ڕووبەڕووی ماڵی جادوگەری هۆز کە لای ماڵی تالکا بوو و پێشتر لەبەرانبەریدا تێپەڕیبووم. ئەوان منیان بۆ ژووری جادوگەر برد.

بە ڕاستی ژوورێکی سەیر بوو.

بێ خۆراگری ڕۆشتمە ژوور. لەبەردەم دەرگا چەند تیکە تەختەیەك لە چەپ و ڕاستی سەروخوار دەبینرا کە لە سەر ئەو تەختانە وێنە و شکڵی سەیریان هەڵکەندبوو. دواتر چەن سەری مرۆڤ لە ژوورەکەدا هەڵواسرابوو، لە ژووری جادوگەر چەند ڕووبەندێك و چەند ئێسکە پەیکەرێك سەرنجی هەرتازە هاتوویەکیان ڕادەکێشا.

لەیەکەم ساتدا چاوم بە چاوی جادوگەر کەوت کە بەچاوی خوێناوییەوە سەیری دەکرد. لای ئەو تالکا سەرۆکی هۆز وەستابوو و کەمێك ئەولاتر سمی بە سکی ئاوساوو ڕەنگی شین لە سەرزەوی کەوتبوو لەخۆی دەئالاو دەیناڵاند.

لەگەڵ ئەوەی چاوی تالکا بە من کەوت لە شوێنەکەی هەستاو بەرەو لای من هات ووتی:

بەدبەخت کوڕەکەی منت کوشت... یان چارەی دەکەیت یان دەتسوتێنم.

نەمدەزانی چ بەڵایەك بەسەر سمی دا هاتووە. لەلایەکیتر ئەوانیش دەرفەتیان نەدەدا. دوای تالکا جادوگەر هاتە پێش و ئەویش هەندی شتی ووت و سەرئەنجام هەرکەس لەوێ بوو هاتە پێش و دنیایەك جنێوی پێشکەش کردم.

لەم کاتەدا سمی تلێکی خواردو کەوتە سەر پشت. کتوپڕ چاوم بەسکە ئاوساوەکەی کەوت و بەخۆشحاڵیەوە ڕووم کردە تالکا ووتم:

ئەو لە منەوە زیانی پێ نەگەشتوە بەڵکو خواردنی زۆری خواردوە و وای لێهاتووە و بۆم باس کرد چۆن مەیمونێکی ڕاوکردو بە تەنیا کەبابی کردو خواردی. ئەوان باوەڕیان بە قسەکانی من نەکردو جادوگەر کە زیاتر لەهەمووان دوژمنایەتی لەگەڵدا دەکردم، پێشنیازی کرد ئەشکەنجەم بدەن تا چۆنیەتی سام و ژەهرێك کە دەرخواردم داوە بدرکێنم. ئەگەر بزانین چ ژەهرێکی دەرخوارد داوە، بەدژە ژەهر چارەسەری دەکەین.

دوبارە ڕوداوەکەم بۆ باس کردنەوە و کە بینیم باوەڕ بە قسەکانم ناکەن ووتم:

بۆ چەن کاتژمێرێك بیدەنە دەست من و دواتر وەرن بەسەلامەت وەریبگرنەوە ئەم پێشنیازەی منیان پەسەند کرد و بڕیاریان دا لەگەڵ سمی دا بەتەنیا بەجێم بێڵن و لەگەڵ ئەوەشدا پیاوەکانیان لە دەوراندەوریماڵەکەدا پاسەوانی بدەن تا نەتوانم ڕابکەم. ئەگەر دوای چەن کاتژمێر سمی مرد یان چاك نەبووەیەوە بە زیندویی لە ئاگردا بمسوتێنن. بەم بڕیارە ئەوان ڕۆشتن و منیان لە ماڵی جادووگەر لەگەڵ سمی کە سکی ئاوسابوو و ڕوخساری ڕەش ببوو و دەیناڵاند، بە تەنیا جێ هێشت.

کاتێك لەگەڵ سمی دا بەتەنیا مامەوە ترس سەراپای داگرتم. ئەو وەك کەسێك ئاژەڵی خواردبێت و سکی ئاوسابێت، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا کەوتبوو دەتلایەوە و دەیناڵاند. ڕوخساری ڕەش ببوو چاوەکانی خەریك بوو دەردەتۆقێن.

سەیرێکی خۆم، سەیرێکی ژووری جادوگەر و سەیرێکی سمیم کرد و دەلەرزیم. بیری ئەوەی ئەگەر چارەسەر نەکرێت و دەمخەنە ناو ئاگرەوە و بە زیندوویی دەمسوتێنن، دەیلەرزاندم. سەرم بۆلای ئاسمان بەرزکردەوە و داوای یارمەتیم لە خوا کرد.

نازانم هیچ کات لە تەنگانە و ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوەکاندا گرفتار بوون یان نە. لەم کاتانەدا کە هەموو دەرگاکانی هیوا بە ڕووی مرۆڤدا دەبەسترێت، هەرکەس بەهەر ئەندازەیەك ئیمانی هەبێت بەهێزی بێ کۆتایی خوا پشت دەبەستێت و داوای یارمەتی لە خوا دەکات. هەرچەندە دین و ئیمانێکی تەواو بەهێزم نەبوو بەڵام لەو کاتەکە خۆم لەیەك هەنگاوی مەرگدا دەبینی، سەرم بۆ لای ئاسمان بەرزکردەوە و لە قووڵایی دڵەوە داوای یارمەتیم لێکرد. ئەوێ ماڵی جادوگەربوو، هەندێ شتی سەیرو سەمەرە و ترس ئەنگێز لەدەورو دیواری ماڵەکە هەڵواسرابوو. لە سەرتەختەی پان وێنەی جۆراوجۆریان کێشابوو و بەچوار دەوری ژوورەکەدا هەڵیان واسیبوو. لەلایەکیتری ژوورەکە لە چوارچێوەیەك لە دار چەندین کولەکەی وشك دەبینرا و برێك نارگیل لەوێ رژابوو. سەرنجم بۆ لای کولەکەکان راکێشرا. نەمدەزانی چیم دەوێت و بەدوای چیدا دەگەرێم. سمیم بە هەموو ئازارو نارەحەتیەکانی خۆیەوە بە تەنیا بەجێ هێشتبوو سەرقاڵی چوارچێوە دارەکە و کولەکە وشکەکان بووم. یەکێك لە کولەکەکان کە کونێکی گەورەی تیابوو هەڵمگرت و تەکانم دا، شلەمەنیەکی تێدابوو کە بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێوە دەهات.

زانیم جادوگەر لەم کولەکانە وەك گۆزەی دەرمان کەڵك وەردەگرێت. لەناو کولەکەکانی تریشدا شلەمەنی تری تیابوو کە سەرنجم پێ نەدان چوونکە دەمزانی ناتوانم لە تایبەتیەکانی ئەوان کەڵك وەرگرم.

نارگیلەکانیش بەهەمان شێوە، یانی لە سەروی هەرکام کونێکیان تێ کردبوو و ناوەکەیان لەو کونەوە دەرهێنابوو و ئەویتریان وشك کردبوو و لەجیاتی شوشەی دەرمان کەڵکی لێوەردەگیرا، ئەمانە هی جادوگەر بوون و دڵنیابووم و دڵم ڕوون بوو کە سەرئەنجام لەناو ئەوانەدا دەرمانی پێویست دەدۆزمەوە.

سمی زۆری خواردبوو و دڵ ئێشەی تووش ببوو و ئێستا ئەگەر بەشتێك دەمتوانی خواردنەكان لە سكی دەربكەم ئازارو ناڕەحەتیەكەی نەدەما. باشترین شت كە دەیتوانی ئەم مەبەستەم جێ بەجێ بكات، كەمێك ڕۆن وەك ڕۆن گەرچەك بوو.

لەوكاتەی سمی دەیناڵاند و منیش سەرقاڵی ژێروژوكردنی دەرمانەكانی جادوگەر بووم دەنگێكم لە دەرەوەی ژوورەكە بیست و هەستم كرد ژن و پیاوێك بە توندی لەگەڵ یەكدا قسە دەكەن.

سەرنجم پێ نەدا و سەرقاڵی كاری خۆم بووم بەڵام دەخولەك دواتر دەرگای ژوورەكە كرایەوە و هانا كچی سەرۆك هۆز و خوشكی سمی هاتە ژوور و تازەتێگەشتم ئەو بۆ هاتنەژوور لەگەڵ پاسەوانەكەدا شەڕی دەكرد و مۆڵەتی هاتنە ناوەی دەویست.

هانا هاتە ژوور. بزەیەكەی شیرین لەسەر لێوە قاوەیی ڕەنگ و جوانەكانی دەبینرا كە مرۆڤی رادەچڵەكاند.

وەك سمی سێ هێڵی ڕەنگاو ڕەنگ بەشێوەی ستونی لەسەر ناوچاوی دەبینرا، ئەم سێ هێڵەی هانا كە سمی جیاواز لەوەی لەسەر ناوچاوی بوو، نیشانەی گەورە زادەیی و گەورەیی بنەماڵە بوو.

كاتێك هانا هاتە ژوور، دەرگاكەی بەتوندی لەپشت سەری خۆیەوە داخست و كیلونی دا. نیگایەكی لە ڕووی بێزاریەوە لە سمی كرد و دووبارە دەم بە بزە بەرەو لای من هات. دەستەكانی لە گەردنم ئاڵاند كە لە هاتنی شادمان و لە سەیركردنی حەیران و لەرزان بووم. هانا لێوەكانی هێنایە پێش تا ماچی بكەم. ئێوە خۆتان لە جێگەی من دانێن.... ئایا لەو كاتەدا تواناو حەزی ماچ كردنتان هەیە؟

لەو هۆزەدا كەس ماچ كردنی نەدەزانی و لووتیان لەیەك دەخست. جاری پێشتر هانا لە ماچی من خۆشی هاتبوو ئێستا دەیویست بە تەواوی فێری ببێت بەڵام من پاڵم پێوەنا ووتم:

ئێستا برۆ.... برۆ بە تەنیا جێم بێڵە، مەگەر نازانی باوكت دەیەوێت لە ئاگردا بمسوتێنێت.

ئەو سەرەتا ناوچاوی مۆن كرد و بەڵام كاتێك زیاتر بۆم ڕوون كردەوە ووتی:

دەمی من بلێسەرەوە و بیمژە تا یارمەتیت بدەم.

دەمزانی یارمەتی هانا كچی سەرۆك هوز بۆ من كاریگەرە و بۆیە لەوپەری بێزاریدا ماچم كردو بە خێرایی ووتم:

دەتوانی کەمێك ڕۆن گەرچەکم بۆ بێنی.....

نەمدەزانی بە گەرچەك چی دەڵێن. بەڵام بۆم ڕوون کردەوە و ئەوەندەم بۆ شی کردەوە تا تێکەشت. بیری کردەوە ووتی:

نە..... ئێمە ڕۆن گەرچەکمان نیە. بەڵام ڕۆنی ترمان هەیە... وەك ڕۆنی نارگیل... من دەستیم گرت و بردمە لای دەرمانەکانی جادوگەر و ووتم:

ئایا تایبەتمەندی ئەم دەرمانانە دەزانی.

و دواتر کولەکەیەك و نارگیلێك کە بەهاراتی تیابوو لە بەرانبەر لووتی ئەو داگرتم و ئەو بۆنی کرد.

سێیەم کولەکەی لە دەستم وەرگرت و دووبارە بۆنی کرد ووتی:

ئەمە گوشراوەی جۆرە گیایەکی جەنگەڵە کە لەماڵەکان بۆ کەسانی کەم ئیشتیا بەکاری دەبەن.

لە ئەو سەبارەت بە شێوە و تایبەتمەندیەکانی ئەو گیایە ڕوون کردنەوەم ویست. هانا جوان بەو پەڕی حەزەوە بۆی ڕوون کردمەوە. تێگەشتم ئەو گیایە هەرچی بێت مەترسیدارنیە و لەبەرئەوەی بۆ ئیشتیا بەکاردەبرێت ئەگەر کەمێکی دەرخواردی سمی بدەم دەبێتە هۆی ورووژاندنی ڕژێنەکانی ناو گەدە و دوانزە گرێ. ئەوم داناو داوام لە هانا کرد بڕێك ڕۆنم بۆ بێنێت و جگە لە ڕۆنی نارگیل هەر ڕۆنێکی تر دەزانێت بڕێکی زۆرم بۆ بێنێت.

هانا بەخێرایی هەستاو ڕۆشت و من لەنەمانی ئەو ١٠٠ گرام لە گوشراوی گیایی ئامازە پیدراوم لە قورگی سمیدا خاڵی کردەوە بە خۆمم ووت:

ئاو لەسەرم تێپەڕیوە.... ئەگەر سمی چارەسەر نەکرێت دەمکوژن.. کەواتە ئیرادی نیە هەرجۆرە دەرمانێك لێرەدابێت دەرخواردی دەدەم. ڕەنگە یەکیان کاریگەری بێت و ئەو ڕزگاری بێت.

ئەمەم وت و سەد گرامی تر لەو گوشراوەم کردە قورگی. سمی کە لە حاڵەتی بێهۆشیدا بە سەری دەبرد و بێ ئیرادە دەتلایەوە و دەینالاند بە خواردنی دەرمانەکە ئارام بوویەوە... چەند خولەکێك تێپەڕی... نەدەجوولا دەنگ لە قوورگی نەدەهاتە دەر.

ڕەنگی پەڕیبوووەك شیر سپی بوو، ترسم زیادی کرد و بەخۆمم ووت:

خوایە ئەو مرد و کاری منیش بەمەرگ کۆتایی هات.

بەڵام کۆڵم نەداو گوێم بە دڵیەوە نا، دڵی سمی بەهێواشی کاری دەکرد و دانە دانە

هەناسەی دەکێشا. سینەی ئەوەندە هێواش بەرزو نزم دەبوویەوە نەهەستی پێدەکراو نەدەبینرا. چەند خولەکێکی تر بەم شێوەیە تێپەڕی بەڵام لەناکاو سمی لە شوێنەکەیدا راپەڕی.... بینیوتانە لە خەودا کەسێك مار بیگەزێت.... بیهێنە بەرچاوی خۆتان کەسێك ئارام خەوتووە و لەناکاو مار ددانی قاچی دەگەزێت. چۆن ئەو کەسە لە شوێنەکەیدا بەرز دەبێتەوە......؟ سمیش بەهەمان شێوە و دوو سێ جار بە سکە ئاوساوەکەی خۆی بەم لاولاداخست و قیژاندی. لەم کاتەشدا دەرگای ژوورەکە کرایەوە و هانا هاتەژوور.

ئەگەر هانا لەو کاتەدا نەهاتایە، لەترسا دەمقیژاندو سەری خۆم دەکێشا بە دیواردا چوونکە ئەم جارەیان دڵنیابووم سمی خەریکی گیاندانە....

هانا بەخێرایی رۆشت و بەهەمان خێرایی گەڕایەوە و چەندین کولەکە ڕۆنی جیاوازی بۆ هێنابووم. لە ئارەقدا خوسابوو دیاربوو ماوەی ڕێگا چ زۆر چ کەم بە ڕاکردن هاتووە و زۆر هیلاك بووە. لەگەڵ هاتنی بزەیەکم گرت و تێگەشتم هەمان بزەی رەزامەندی کە لێوەکانی منی کردەوە، هەموو هیلاکی لە جەستەی ئەودا دەرکرد چوونکە بە خۆشحاڵیەوە لای من دانیشت و کولەکەکانی لەبەردەستم دا دانا. بەخێرایی دەست بەکار بووم. سەرەتا گوێم لە لێدانی دڵی سمی گرت و هەستم کرد لە جاری پێشتر توندتر بووە. دواتر دەستم بە بۆن کردن و ناسینەوەی ڕۆنەکان کرد، لەم کاتەدا بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە یەکێك لە کولەکەکانم هەڵگرت و زانیم ڕۆنی گەرچەکە. لە خۆشیدا قیژەیەکی کورتم کرد ووتم:

هانا ڕۆنێك کە من دەمەوێت ئەمەیە... چۆن دەتوت ئێمە لەمەمان نیە.

هانا کە زۆر لەم ڕووداوە شادمان ببوو ووتی:

ئێمە ئەم ڕۆنە ناخۆین و بە مەترسیداری دەزانین بەڵام ئەو کەسانەی لە شەڕدا بریندار دەبن ئەم ڕۆنە لە جەستەیان دەسووین. بەتایبەت ئەم ڕۆنە بۆ پێست لە بەرامبەر تیشکی هەتاو دا زۆرباشە. دەست بەجێ بڕێك لەو ڕۆنەم کردە ناو قورگی سمی و لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئەنجامەکەی دانیشتم.

هانا زۆر لەوەی ڕۆنی پێویستم دەست کەوتبوو شادمان بوو و بەردەوام دەیوت:

ئێستا سمی باش دەبێت......؟

ئێستا دڵی بچووك دەبێت.

بەڵێنم پێدا بەخێرایی براکەی باش دەبێت بەڵام دەمزانی زۆر ئارەزوومەندی

باشبوونەوەی براکەی نیە بەڵکو شادمانی لەوەیە بە باشبوونەوەی ئەو من رزگارم دەبێت و مەترسی مردن لەسەرم نامێنێت. ئێمە دوو نەفەر قسەمان دەکرد کە لەناکاو سمی سەری بەرزکردەوە و دەستی بە ڕشانەوە کرد. لەگەڵ ئەوەی ڕشایەوە بۆنێکی ناحەز و ناخۆش ژوورەکەی پڕ کرد و ئێمەش هێڵنجمان دەدا، هانا ڕووی کرد بەولاوە بەڵام من بە حەزەوە لە سمی نزیك بوومەوە و دەستم بە سکیدا هێنا.

ڕشانەوە کاریگەری ڕۆن گەرچەك نەبوو بەڵکو کاریگەری دەرمانی یەکەم بوو. بەهۆی بزواندی رژێنەکانی ناو گەدە سمی حاڵەتی ڕشانەوەی گرت و سەرئەنجام ئەوەی لە سکی دا بوو هێنایە دەر و چەند خوولەك دواتر چاوە بە قوڵاچوەکانی خۆی کردەوە.

من و هانا لەپیساییەکە دوورمان کردەوە و لە سوچێکی ژوورەکەدا ڕامانکێشا. سمی چاوەکانی کردەوە بەڵام هێشتا سکی بچووك نەببوویەوە و کەمێك ئازاری بوو. دڵنیابووم ئازاری سینە و ناڕەحەتی ئەو تا یەك دوو کاتژمێری تر نامێنێت بۆیە کەمێکی تر ڕۆن گەرچەکم دەرخواردا و بە هانام وت:

ئەم ڕۆنانە ببەدەر تا جادوگەر نەیانبینێت و نەزانێت چۆن چارەسەرم کردووە.....

دەرمانەکانی جادوگەریش لەشوێنی خۆیاندا دانێرەوە.

هانا ئەم کارەی کرد و بەخێرایی ڕۆشتەدەر. سمیم دانیشاند و حاڵیم پرسی. بزەیەکی گرت و ووتی:

باشم. بەڵام دڵم کەمێك ئازاری هەیە. دەڵێی مەیمونەکە مێچکە بوو. خواردنی مەیمونی مێچکە باش نیە. زۆر خەوتم وانیە؟ زانیم لە ڕووداوەکە ئاگادار نیە بۆیە ڕووداوەکەم بۆ باس کردو بە پاسەوانەکانم ووت بە تالکا بڵێن سمی باش بووەتەوە بابێن. جادوگەر و باوکی سمی هاتن. تاقمێکی تریش لەگەڵیاندا بوون بەڵام کاتێك سمیان دەم بە پێکەنین بینی بەسەرسوڕمانەوە سەیریان کردم و دواتر دەستخۆشیان لێ کردم. هەمووان شادمان بوون بەتایبەت تالکا شادمانی زۆری دەربڕی و بە منی ووت:

ئێوە جادوگەرێکی باشن و دەبێت لەناو هۆزەکەدا بمێننەوە و نەخۆشەکان چارەسەر بکەن.

زانیم بەم شێوە دەبمە دوژمنی جادوگەری هۆز و ئەگەری ئەوە هەیە ژەهراویم بکات و یان بەشتێك لەناوم ببات ووتم:

نا..... من جادوگەرنیم و ئەگەر سمیم چارەسەرکرد بەیارمەتی دەرمانەکانی جادوگەر بوو و من هیچ شتێك نازانم. بە ووتنی ئەم رستەیە دەرمانەکانی جادوگەرم

نیشان داو کولەکەی گوشراوەی گیا ئامازە پێدراوەکەم دەرهێنا. جادوگەر لەوەی من ڕێزو گرنگی ئەوم پاراستبوو زۆر شادمان بوو، لەژێر چاوەوە سەیری کردم و بەوپەڕی ڕێزو سوپاسەوە لێمی ڕووانی.

سمی دوای ئاگادار بوون لە ڕووداوەکە سوپاسی کردم و بەم شێوەیە من بەوپەڕی ڕێزەوە لەوێ هاتمەدەر، لە دەرەوەی ماڵی جادوگەر داری بەناوچاوێکی مۆن لە کاتێکدا خەنجەرێکی لە دەستدا بوو وەستابوو و لەگەڵ ئەوەی منی بینی هاتە پێش و ڕێگەی لێ گرتم و دواتر خەنجەرەکەی لەسەر سکی خۆی داناو ووتی:

دەمەوێت خۆم بکوژم تا بتوانێت بە ئاسانی لەگەڵ هانا زەماوەند بکەیت.

گازم لە لێوی خۆم گرت و ووتم: من هانام خۆش ناوێت و تەنیا تۆم خۆش دەوێت..... بۆ نەت بینی ئانگۆم لەبەرتۆ کوشت....

داری خێرا باوەڕی کرد ووتی:

ئەگەر وایە ئیتر لێوی هانا مەمژە... چوونکە ئەو مژینی فێری هەموو هۆزەکە کردوە بەڵێنم دا ئیتر ئەم کارە نەکەم و لە دڵدا توشی دڵەراوکێ بووم چوونکە پەیوەندی من لەگەڵ کچی سەرۆك هۆز بابەتێکی نا گرنگ نەبوو.

بەم شێوە بەشێوەیەکی کاتی هانا لە ژیانی من و داری ڕۆشتەدەر و ئێمە دوانە پێکەوە ڕۆشتینە ماڵی ئانگۆ. ئەو شەوە تێپەڕی. بەیانی ڕۆژی دواتر هێشتا لە خەودا بووم کە دەنگە دەنگ لەدەرەوەی ماڵەکە دەبیسترا. بەپەلە لە شوێنەکەمدا هەستام وامزانی دوبارە بۆ گرتنی من هاتوون بەڵام داری کە لەسەر سەرم دانیشتبوو دەستی بە قژمدا دەهێنا ووتی:

شتێکی گرنگ نیە. بێگانەیەکیان گرتووە و بۆ کوشتن دەیبەن.

کوشتنی بێگانەیەك کە وامزانی یەکێك لە دانیشتوانی هۆزەکانی دراوسێ یە لای من گرنگ نەبوو. شتێك نەبوو پەیوەندی بە منەوە هەبێت بۆیە گوێم پێ نەداو سەرم لەسەر ئەژنۆکانی داری دانا. داری بەپێی دەستورێك کە شەوی پێشتر پێم دابوو باڵندەیەکی حەڵاڵ گۆشتی گرتبوو، کوشتبووی و سوری کردبوویەوە تا بیخۆم. ئاشتایی من بە خواردنی ئەو باڵندە کە دەتوت جۆرێك کۆترە، کۆتایی پێ هات و دواتر کەوتمە بیری دەست خستنی کراسێك.

لە داری پرسیارم کرد چۆن جل و بەرگ دەدورن. لەراستیدا ئەوان جل وبەرگیان نەبوو و ئەوەی هەندێ کات لەبەریان دەکرد یەك دو درزی بوو کە دەبووا بدورایێەتەوە.

داری چۆنیەتی درومانی بەو کەرەستانەی لەبەردەستی دابوو، فێرکردم و دواتر هەردوکمان دەست بەکاربووین و لە پارچەیەکی کۆنە، کۆنە کراسێکمان دوری و لەسەر شەرواڵەکە لەبەرم کرد.

ئەو کراسە زۆر باش نەبوو بەڵام چوونکە قوماشەکەی ئەستووربوو، جوان لەبەرمدا وەستا. ئەو رۆژە بڕیارمدا بوو لە ماڵی داری نەڕۆمەدەر چوونکە سمی نەخۆش بوو کارم نەبوو و لەلایەکیتر ئارەزومەند بووم ئەو رۆژە بەقسەکردن لەگەڵ داریدا ببەمەسەر بۆیە دەستم بەدروست کردنی پیپ کرد. لە جۆرێك تەختەی نەرم پیپێکم دروست کرد و ڕۆنم لێدا و لە جۆرێك گیایی وشك کە شێوەی توتن و بگرە توتنیش بوو و دوکەڵێکی سازگاری بوو دەستم بە دوکەڵ کردنی پیپ کرد. داری لەوەی دەیبینی لە دەستمەوە دوکەڵ دێتەدەر سەری سورمابوو، زەق زەق لێی دەروانیم.

یەك دو کاتژمێریش بەم شێوەیە تێپەڕی و من لە دەرەوەی ماڵ هیچ هەواڵێکم نەبوو....

نزیك نیوەرۆ لە کاتێکدا پاڵم بە دیوارە حەسیرەیەکەدابوویەوە و پیپم دەکێشا، داری خواردنی بۆ هێنام. کاتێك خواردنەکەی دانا، ئەو دەنگە دەنگە و قەرەباڵغیەی بەیانی بیستبووم دەستی پێکردەوە و لە داریم پرسی :چی بووە؟

داری شانەکانی بەرزکردەوە.

من لە سەیرکردنی کوشتنی سپی پێستەکان لەوکاتەوەی تۆ هاتویت چێژ نابەم.

زانیم قەرەباڵغیەکە پەیوەندی بەو بێگانەی بەیانیەوە هەیە. بۆیە ترساو مەچەکی دەستیم گرت و ووتم: چی دەڵێیت.... سپی پێست....؟

ووتی: بەڵێ سپی پێستێکیان گرتووە و ئێستا دەیبەن بکوژن...

من بەپەلەو ترسەوە لە شوێنەکەم هەستام و لەماڵ ڕۆشتمەدەر. دانیشتوانی هۆز بەدەم شادیەوە لەبەرامبەر ماڵەکەی ئێمە تێپەڕین و دیاربوو هێشتا سپی پێستەکەیان نەهێناوە چوونکە هەمووی دەگەڕان و سەیری دواوەیان کرد.

یەك دوو خولەك تێپەڕی و کتوپڕ لە دوورەوە دوو لە پیاوە چەکدارەکانی هۆز دەرکەوتن کە سپی پێستێکیان بەدەست بەستراوی رادەکێشا. رزگارکردنی سپی پێستێك کاری من بوو بۆیە ڕۆشتمە پێش تا جوانتر ببینم بەڵام هێشتا دوو سێ هەنگاو نەڕۆشتبووم کە لە شوێنەکەمدا وشك بووم چوونکە بینیم ئەو سپی پێستە یوری ئازیزو خۆشەویست و هاوڕێی ئازیزی منە کە وامزانی لە ڕووبار خنکاوە.

ئاه یوری........

ئەم دەنگە بێ ئیرادە لە قورگم هاتەدەر.... یوری سەری بەرزکردەوە و تا چاوی بە من کەوت لە خۆشیدا قیژاندی و خۆی بەرەو لای من فرێدا. بەڵام لەم کاتەدا ئەو دوو پیاوە پاسەوانە لێیان داو کێشایانە دواوە. ئێوە خۆتان لە جیاتی من دانێن و دوای ئەو هەموو روداو وکارەساتانەی بووە هۆی نوقم بوونی یوری لەناو شەپۆلە هەڵشەکانی ڕووبار، لەگەڵ ئاوا دیمەنێکدا روبەڕووببنەوە، بەویژدان بڵێن ئایا شیاوی باوەڕ کردنە یوری زیندو بێت؟

تازە کاتێك ئەویان برد چاوەکانم هەڵگلۆفی...... گوومانم کرد رەنگە خەوببینم.

من یوریم خۆش دەویست. ئەوەندەی بەرامبەر بە من چاکەو خۆشەویستی دەربڕیبوو مافی ئەوەم بوو بە یەکێك لە باشترین هاوڕێ کانی دنیا ناوی ببەم.

دوبارە چاوە سەرسوڕماوەکانی خۆم لەدواوە تێ بڕی. هەرچەند هەنگاوێك یوری دەوەستا سەیری دەکردم و دواتر سەری خۆی دادەخست و دەڕۆشت و دوبارە چەند هەنگاو ئەولاتر ئەم کارەی دوبارە دەکردەوە.

دەتوت لە دڵ و رۆحمدا ئاگریان داگیرساندوە. سینەم لە چێژو ئازارێکی تایبەت لێوان لێو بوو، رۆحم گوشرابوو وکرانەوەیەکی دڵگیری پەیاکردبوو کە شیاوی باوەڕپێکردن نیە. یوریم دۆزییەوە.... ئەوەندەم بەسە ئیتر لە دنیا هیچ شتێکم ناوێت...... بەڵام دەیبەن بۆ کوشتن،.... دەیانەوێت بیکوژن.

لەبیر هێنانەوەی ئەم خاڵە نزیك بوو بقیژێنم و یەخەی خۆم بدڕم. نەمدەزانی چی بکەم و بۆ رزگارکردنی ئەو پشت بە چ کەسێك ببەستم و چ کارێك ئەنجام بدەم زووتر بگەمە ئەنجام؟ دەترسام لەوێ دووربکەومەوە و برۆمەلای سمی و لەم کاتەدا سەری بپەڕێنن، دەرفەت بەفیڕۆدەچوو، کات تێدەپەڕی و یوری بە خێرایی لە مردن نزیك دەبوویەوە و من هێشتا پەرێشان و گێژ و وڕ لەوێدا وەستابووم کە لەناکاو هەستم کرد دەستێکی نەرم و ناسك بەرشانم کەوت. بەتووڕەییەوە بە گوومانی ئەوەی داری هەوەسی ڕابواردنی کردوە سوڕام تا لە خۆمی دوور بکەمەوە بەڵام چاوم بە ڕوخساری جوان و شیرین و دەم بەبزەو لێوی ئاڵی هانا کچی سەرۆك هۆز کەوت و جنێوێك کە لەناو دەممدا کۆببوونەوە مردو لە جیاتی ئەوە بزەیەك لێوەکانمی کردەوە.

هانا کە لە سەرەتاوە ئاگاداری جووڵە و کردەوەکان و ناڕەحەتی من بوو بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

بۆ لەبینینی ئەم بێگانە ئاوا شێواویت. لە دانیشتوانی هۆزەكەی ئێوەیە؟ پێش ئەوەی وەڵامی هانا بدەمەوە بیرم هێنایەوە هەرچی بێت ئەو كچی سەرۆك هۆزە و زۆر كاری لەدەست دێت بۆیە دەست بەجێ دەستەكانم كردەوە لە خۆشحاڵیدا باوەشم گرت و بردمە ژوورەكەی داری و پێش ئەوەی شتێك بڵێم بۆ ڕازی كردنی چەند جارێك لێوەكانیم ماچ كرد و بە ووتەی خۆیان دەمیم لستەوە.

هانا كە بۆ جارێك ماچ كردن دوو كاتژمێر دەپاڕایەوە و بەرتیلی دەدا سەری سورما و بە شادمانیەوە ووتی: تۆ بەردەوام ئاوا دەمم دەلێسیتەوە !

ووتم:

بەومەرجەی كارێكم بۆ ئەنجام بدەیت بەڵێن دەدەم هەمیشە تۆم خۆش بووێت.

هانا كە لە شادمانیدا پێدەكەنی سەری خۆی تەكان دا و ڕازی بوونی خۆی بە پێشنیازەكەی من ڕاگەیاند. ئەوم بردە سوچێك ووتم:

تۆ دەبێت ئەم پیاوەی بۆ كوشتنی دەبەن لە مردن ڕزگار كەیت. ئەو دانیشتوی هۆزو هاوشاری منە. ناوچاوانی مۆن كرد و بە تووڕەییەوە ووتی:

كەواتە تۆ منت خۆش ناوێت و ناتەوێت من هۆی تۆبم.

لە ترسی ئەوەی نەكا كات بەفیڕۆ بڕوات بەخێرایی ووتم:

ڕزگاركردنی ئەو بەخۆش ویستنی من یا خۆش ویستنی تۆ چ پەیوەندیەكی هەیە من بەڵێنت پێ دەدەم. ئەو هەستی بەوە كرد كە من ئەم خاڵە نازانم ووتی:

ئەگەر من لە مردن ڕزگاری كەم وەك ئەوە وایە خوازبێنیم كردبێت. لێرەدا واباوە هەرپیاوێك پیاوێك بكوژێت عاشقی ژنەكەیەتی و دەبێت ژنەكەی بە ژنی خۆی قبووڵ بكات و هەر ژنێك پیاوێك لە مردن ڕزگار بكات یانی ئەو پیاوەی خۆش دەوێت و دەبێت بیكاتە مێردی خۆی.

وتووێژی ئێمە لەمبارەوە خەریك بوو درێژە بكێشێت. پەلەم بوو، ناڕەحەت بووم و هانا هەوڵی دەدا لەئەنجام دانی ئەم كارە خۆی بدزێتەوە. سەرئەنجام بەهەزاران فێڵ و بەڵێن ڕازیم كرد بۆ ڕزگار كردنی یوری كارێك بكات.

هانا ڕازی بوو بەخێرایی ڕۆشت. منیش بە دوای ئەودا و هەردووكمان بەڕاكردن لە گۆڕەپانی هۆز دوركەوتینەوە. ڕۆشتینە شوێنێك كە تایبەت بوو بە تاوانباركردنی تاوانباران. كاتێك گەشتینە ئەوێ كۆمەڵێكی زۆر بۆ سەیركردن كۆ ببوونەوە و بۆ كوشتنی یوری بێ تاوان شادمانیان دەكرد.

هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ژنان لەوێ کۆببوونەوە ئەوەبوو کە بەپێی یەکێك لە نەریتەکان هەمیشە ژنان خوازبێنی لە پیاوان دەکەن.

لە ڕۆژی ئیعدامدا ژنان کۆدەبنەوە و جادوگەرانی هۆز ئەو پیاوە نیشانی ژنان دەدەن و لەگەڵ سەمایەکی تایبەت سێ جار دەڵێت ژنێك خوازبێنی لێ بکات و گیانی بکڕێتەوە.

ئەم یاسایە یوریشی دەگرتەوە بەڵام یوری ناشیرین کێ پێی ڕازی دەبوو. ئێمە کاتێك گەشتین جادوگەر خەریکی سەما کردن بوو.

لەم کاتەدا هانا ڕۆشتە پێش و دەستی بەسەماکردن کرد. هەموو ئەوانەی لەوێ کۆببوونەوە سەریان سوڕما لەوەی هانا کچی سەرۆك هۆز ئامادەی خوازبێنی لە بێگانەیەك بووە. بەڵام دوای چەند خولەك گەڕانەوە بارودۆخی ئاسایی خۆیان و دەستیان بە چەپڵە لێدان و شادی کردن کرد. کەمێك دواتر سەرۆکی هۆز خەنجەرەکەی دەرهێناو دای بە هانا. هاناش بەدەم سەماکردنەوە خۆی گەیاندە یوری و بەندەکانی دەست و پێی کردەوە و لووتی خۆی لە لووتی سوو. کاتێك یوریمان هێنایە ماڵ بەسەرهاتی خنکاندنی خۆی بەم شێوەیە بۆ باس کردم:

لەسەر بەلەمەکە سەرنجم لای ئێوە بوو نەکا بکەونە ناو ئاوەکە، لەناکاو شەپۆلێك منی دزی و فڕێیدامە ناو ئاوەکە. لەگەڵ شەپۆلەکاندا شەڕم دەکرد و کاتژمێرێك دواتر کە نزیك بوو ماسولکەکانم لە هیلاکیدا وشك بێ خۆم گەیاندە بەستێن.

شەوانە لەسەر دارەکان دەخەوتم و بە ڕۆژ دەڕۆشتم. ڕۆژێك بەیانی زوو خۆم لە گەمارۆی کۆمەڵێك وەحشی زل و چوارشانە چەکدار بەڕمی ئاسنینی مەترسیدار بینی. ناچار لەگەڵیاندا ڕێ کەوتم و لە پێچ و پەنایەکی زۆر لە جەنگەڵ تێ پەڕین و سەرئەنجام یەك دوو کاتژمێر دواتر گەشتینە شوێنی مەبەستی ئەوان. لەو هۆزەدا بەو ژیانەو ئەو دانیشتوانە تەنیا دە پیاوی لێ بوو. ئەوانەی کە هەموویان ژن بوون کاتێك گەشتمە بەردەم سەرۆکی هۆزەکە ژنێکی زیاد لە ڕادە جوان و هەوەس ئەنگێزبوو، تێگەشتم لەناو هۆزی ژنانی ئامازۆندام.

ئەو پیاوە ڕەش پێستانە دەستیان کردمەوە و بە مشت و لەقە ناچاریان کردم لەبەردەمیدا کوڕنوش ببەم. ژنی گەنجی جوان کە بینی ناوچاوم نابەمە سەرخاك لە پلیکانەکانی تەختەکەی دابەزی و قاچی ڕاستی خستە سەر سەرم و ئەوەندەی زەخت لێکرد ناوچاوم لە خاك درا.

من بەخێرایی قسەکانی یوریم پچڕاند و ووتم:

ئایا ئەوەی دەیڵێیت راستە........ چی بوو..؟ تەواوی ڕوداوەکە بگێڕەرەوە..؟ چۆن تۆیان ئازاد کرد !

یوری سەری تەکان داو وتی: ئەوان بەدوای ئێوەدا دەگەڕێن دەزانن ئێوە ئێستا لەناو ئەم هۆزەدا دەژین و تەنانەت دەزانن لەماڵەوە ژنێکی گەنج و جوانتان بەناوی داری هەیە.

بەسەرسوڕمانەوە ووتم: شیاوی باوەڕ پێکردن نیە. چۆن شتی وا ئەگەری هەیە.......؟

یوری پێکەنی و وتی: سەرتان سوڕنەمێنێت. هەنگاو بە هەنگاو لە دواتانا هاتوون. هەڵبەت مەبەستم ژنەکانە. چوونکە ئەگەر پیاوەکان بەدوای ئێوەدا بهاتنایە دەستگیرکردنی ئێوە ئیرادی نەبوو. سەرۆکی هۆز منی راسپاردوە بێمە ئێرە و ئێوە بەرم بۆلای و بەتایبەت لەدوایین خولەکدا پێی ووتم:

ئەگەر جگە لەمە کارێك بکەیت لەهەرکوێ بیت بەدەست سیخورەکانی ئێمە دەکوژرێیت و من دڵنیام ئەو هەرچی بڵێت ئەنجامی ئەدات مەگەر ئەوەی ئێوە ببەمە لای.

نەمدەزانی مانای ئەم قسانە چیە ! سەرم گێژی دەخوارد و سەرسوڕمانێکی تایبەت کە وەسف کردنی ئەگەر نیە. نەمدەزانی لە وەڵامی یوری و پێشنیارەکەی ئەو کە بۆ من ئەفسانەیی و باوەڕ نەکراوبوو چی بڵێم.

کاتێك یوری بێدەنگ بوو و چاوەڕەش و خڕەکانی خۆی کە لێوان لێوە لە پاڕانەوە سەیری کردم کەوتمە دەریای بیرکردنەوە. بیرم دەکردەوە ئەو ژنە جوانە وەحشیانە بەتایبەت ئەو ژنەی یوری بۆی باس دەکردم دەبێت کاری بە من چی بێت. لەکوێوە من دەناسن و چۆن لە تایبەتمەندیەکانی ژیان و شوێنی مانەوەی من ئاگادارن.

بێ ئاگا لە هەموو شتێك و هەموو شوێنێك بووم. لەگەڵ روداوێکدا خۆم روبەڕو دەبینی و لە دەمی یوریەوە شتی وام دەبیست ئەگەر بەراستگۆیی و راستی ئەو باوەڕی تەواوم نەبووایە، گوومانم لە راستیەکەی دەکرد و بێژەرەکەیم بە پیاوێکی درۆزن لە قەڵەم دەدا بەڵام یوری کەسێك نەبوو درۆ بکات بەتایبەت لە بارەی من لەگەڵ من.

دەبێت چی بکەین؟ خولەکێك بیرم کردەوە. لایەنە جیاوازەکانی بابەتەکەم هێنایە بەرچاو و لەبەردەم زەین و هۆش و زیرەکی خۆم لێکدانەوە و شی کردنەوەم بۆ کرد بەڵام شتێکی گرنگم بەدەست نەهێنا و بۆئەوەی رەنگە لە نێوان قسەکانی یوری هەست بەشتێك بکەم داوام لێکرد بابەتەکەم دوبارە بۆ بگێڕێتەوە.

یوری درێژەی بەقسەکردن دا و ئەوەی پێشتر وتبووی و من کورتەییەکم گێرایەوە باسی کرد. لە یوری بە دەنگێکی تایبەت کە بۆی سەرنج راکێش و پێکەنیناوی بوو پرسیم:

یوری........ دەزانی ئەوان منیان لەکوێ بینیوە و چۆن لە بوونی من لەماڵی داریدا ئاگاداربوون؟

یوری پێکەنی و دوای ئەوەی لە پێکەنین بە دەنگی بەرز ئارام بوویەوە بە گاڵتەوە ووتی:

نا سەرۆك، ئاگادار نیم بەڵام رێگە بدەن برۆم و ئەم پرسیارانە بکەم و بگەڕێمەوە. من بە خۆشحاڵی تەواو ووتم:

یوری، کاتی گاڵتە کردن نیە، بۆ پێدەکەنی؟ زۆر نیگەرانم بەو شێوەی تۆ دەڵێی ئەم ژنانە بەو هەموو جوانیەوە خەڵکێکی مەترسیدار و لەهەمان کاتدا خوێنخۆرن. دەبێت فکرێکی بنچینەیی بکەینەوە چوونکە بە هیچ نرخێك ناتوانم خۆم رازی بکەم بەم ئاسانیە برۆمە لای ئەوان و بەقاچی خۆم، خۆم بخەمە ناو تەڵەی مەترسیداری مەرگەوە.

لەم شێوەدا گیانم بەفیڕۆ بڕوات.

بەسەرسوڕمانەوە ووتم:

تۆ ئەوەندە دڵنیایت کە ئەوان لە ئەگەری شکاندنی بەڵێن دەتکوژن؟

دڵنیام چوونکە لەم یەك دوو رۆژەدا هەندێك لە راستیەکانم بۆ دەرکەوتووە.

ئەوان لەگەڵ ئەوەی ژن و جوان و ناسکن بەرادەیەك ئازاو چاونەترسن دەبنە هۆی سەرسوڕمان و واق ورمانی بینەر. لە تیر هاویشتن و ڕاوە مەترسیدارەکان لە پێش پیاوانەوەن و لەگەڵ بەهێزترین ڕاوچیانی جەنگەڵی باران بەرانبەری دەکەن. بەو وەسفەش یەکێك لەوان خۆی بگەیەنێتە دەوروبەری ئەم ناوچەیە و بەیەکێك لەتیرە ژەهراویەکان دڵم کون کات. بۆیە هاوڕێیانە داواتان لێدەکەم لەگەڵمدا بێن و گیانم بکڕنەوە.

بارودۆخێکی سەیر بوو. لە تەنگانەیەکدا گرفتار بووم رزگاربوون لێی دژوار بوو. ئەگەر رازی دەبووم و لەگەڵ یوری دەڕۆشتمە ناو ژنانی وەحشی ئامازۆن، چیم بەسەر دەهات و چی دەبووە کەفیلی گیانم؟ و ئەگەر رازی نەدەبووم و وەڵامی نام بە یوری دەدا، ئەگەر بەڕێکەوت دەکوژرا چۆن دەمتوانی لە ئازاری ویژدان و پەشیمانی خۆم رزگار بکەم؟ دەبێت چی بکەم؟

ئەم پرسیارە ئازاری دەدام. بە یوریم ووت:

ڕێگەم بە شەو ڕۆژێك بیربکەمەوە. و بەیانی لەم کاتەدا وەڵامەکەت دەدەمەوە و بەبوون و نەبوون چارەسەری ئەم کێشە دەکەم.

یوری زۆر زیرەك و وشیاربوو لەگەڵ ئەوەشدا زۆری من خۆش دەویست سەری خۆی تەکان داو بزەیەکی هێنایە سەر لێو و ووتی:

دڵنیام ئێوە ڕازی دەبن چوونکە ئامادەنین من لە دەست بدەن و ناتانەوێت بینەری مەرگی یەکێك لە باشترین هاوڕێکانی خۆتان بن.

من لەوکاتەدا وەڵامم نەدایەوە و بەخێرایی لە ژوورەکە ڕۆشتمەدەر و بۆ ئەوەی خۆم سەرقاڵ بکەم لە قەراغ دارەکانی جەنگەڵ دەستم بە پیاسە کردن کرد. کاتێك ٥٠ مەتر لەدوایین ماڵ دوور کەوتمەوە دەنگێکم لە پشت سەری خۆمەوە بیست. کاتێك ڕووم وەرگەڕاند هانام بینی بە نازو عیشوەیەکی تایبەت بەرەو لای من دێت.

هانا تا ئەو کاتەی گەشتە بەردەمم پێدەکەنی. پێکەنینێك شیاوی وەسف کردن نیە و ناتوانم بەیارمەتی وشە و ڕستە بۆ ئێوەی بنەخشێنم تا بزانن پێکەنینەکەی چەندە جوان و دڵنیشین بوو. خۆزگە نیگار کێش دەبووم و یان کامێرای وێنەگرتنەکەم ون نەدەکرد تا وێنەیەکم لێ بگرتایە و ئێوە بتاندیایە ئەوسا مافتان بە من دەدا.

هانا بە پێکەنینەوە لێم نزیك بوویەوە کاتێك گەشتە یەك هەنگاوی من دەستی ڕاستی خۆی وەك نیشانەی ڕێزو دەربڕینی خۆشەویستی لە سەر سینەی من داناو دواتر لەسەر سینەی خۆی.

ئەو ڕۆژە هانا جل و بەرگی تایبەتی لەبەرکردبوو کە زیاتر لە هەرکاتێکی تر ئەوی جوانتر و دڵگیرتر دەکرد. لەو شێوە جل و بەرگەم لە هۆزەکانی ئەواندا نەبینیبوو. گەردنبەندێکی لە دەنووی جۆرە خورمایەکی تاڵ کە بۆ دەرمان بەکاردەهێنرا، لە ملی دابوو. دوو ئەڵقەی ئاڵتوونی گەورەی وەك نیشانەی گەورەزادەیی خۆی لەگوێیدابوو. تەنورەیەکی لە ساقی خورما لە پێدابوو کە دەوربەری سمتی دادەپۆشی و لە کەمەریدا بە کەمەربەندێك لە حەسیر هەڵواسرابوو.

جل وبەرگی ئەو پێکهاتبوو لەم تەنوورەیە. بەڵام ئەم ساکاریە ئەوەندەی جوان کردبوو دەمویست لە ئامێزی بگرم و ئەگەر ئەو هەواڵە دڵتەزێنەی یوری نەبووایە ئەم کارەم دەکرد چوونکە هانا ترس و بێزاری نەبوو.

هانا کاتێك گەشتە بەردەم من وتی:

شادمان بە کە ئەمڕۆ کارێکی گرنگم بۆ ئەنجام دایت.

بەگوومانی خۆم کە دەیەوێت سەبارەت بە رزگارکردنی یوری قسە بکات وتم:

راست دەکەیت و کارێکی گرنگە و من سوپاست دەکەم.

هانا وتی:

نامەبەستم رزگارکردنی هاورێکەت نیە بەڵکو رزگار کردنی خۆتە. ئەمڕۆ چاوم بە باوکم کەوت و پارێم کرد ئەرکی پاسەوانی کردنی سمی بە کەسێکی تر بسپێرێت و هەر کەس ئەم کارە بکات ناچارە ببێتە هاوسەری داری و من لەم بابەتە کە تۆ نابیتە هاوسەری داری، دڵنیا دەبم.

ئەمەش هەواڵێکی خۆش بوو چوونکە بەهەمان ئەندازە کە لە سمی بێزاربووم لە تێکەڵ بوونیشی دەترسام بەڵام بەو هەموو خەمەی هەمبوو گۆڕانێك بەبیستنی ئەم هەواڵانە لە ڕوخساری مندا دروست نەبوو.

هانا سەیرێکی کردم وتی:

بۆ ئەوەندە مۆنیت..... مەگەر منت خۆش ناوێت. رەنگە لەوەی داری لە دەست دەدەیت ناڕازیت. بە هیچ جۆرێك باش نەبوو سەبارەت بە بابەتەکەی خۆم و یوری قسەی لەگەڵدا بکەم چوونکە ئەو منی خۆش دەویست و ئەگەر ئەم هەواڵەی ببیستایە حەسوودی دەکرد و ئەگەری ئەوە هەبوو کارەکە بشێوێنێت بۆیە وەڵامێکی بێ سەروبەرم پێدا کە بەشێوەیەکی کاتی جێم بێڵێت. بەڵام هانا بەم ئاسانیە وازی لێ نەدەهێنام. ساتێك بیری کردەوە و دواتر وتی:

ئا.... گوێ بگرە.... دەتەوێت داردەستێکی بریقەدار و چەترێکی جوانت پێ بدەم بەو مەرجەی شادمان بیت و بەم شێوە ناوچاو مۆن نەکەیت.

دەمویست شتێك بڵێم تا بڕوات و وازم لێ بێنێت و چەند خولەکێك تەنیابم و بیربکەمەوە. بەڵام هانا دەرفەتی نەداو دەست بەجێ دەستمی گرت و بەدوای خۆیدا رایکێشام. هەرچەندە ویستم خۆراگری بکەم و لەگەڵیدا نەڕۆم، نەکرا سەرئەنجام بە کێشان کێشان منی بە دوای خۆیدا راکێشاو و بردمیە ناوەڕاستی جەنگەڵ.

جەنگەڵ تا دووری چەند میلی دەوروبەری هۆزی پی چیەکان بارودۆخێکی رێکی بوو. چەندین رێگای لێوە تێ دەپەڕی کە لەبەر زۆری هات و چۆ رێك و ساف ببوون. هانا لەم رێگایانەوە منی نەدەبرد بەڵکو لەناو گەڵا و لقی دارەکان تێپەڕاندم و دەگەشتینە ئەو شوێنانەی مەترسی هێرشی ئاژەڵە وەحشیەکان و مارەکان زۆر بوو.

هانا بە هەڵبەزو دابەز و سەماکردنەوە دەڕۆشت و منی لەگەڵ خۆیدا دەبرد تا ئەوەی بە دووریەکی زۆر لە هۆز دوور کەوتینەوە. ئەویٚ شوێنێکی زۆر دڵگیرو و دیمەنێکی جوان بوو. ڕووبارێکی بچووك لەناو جەنگەڵەوە تیٚ دەپەڕی کە هانا دەیوت لە کوێستانەکانی ئەولا هۆزی ((باشیە)) کان سەرچاوە دەگرێت.

ئاوی ڕووبار لەو شوێنەدا بەدەوری خۆی دەسوڕاو حەوزێکی گەورەی دروست دەکرد و دواتر ڕێگەی لەناو دارەکانی جەنگەڵ دەکردەوە و دەڕۆشت. لەدەوروبەری حەوزەکە کە دیاربوو شوێنی ئاو خواردنەوەی ئاژەڵە وەحشی و ناوەحشیەکانیشە دارەکان تەڕی و دڵگیرییەکی تایبەتیان بوو. ئەویٚ بەهەشتێك بوو رەنگە هاوشێوەی لە هیچ شوێنێکی دنیادا دەست نەکەوێت. دەوروبەری حەوزەکە گیایی کورت ڕوابوون کە وەك چیمەن هەموو شوێنێکی زەوییەکەی داپۆشیبوو و سەوزی کردبوو.

چەند تاشە بەردێکی بچووك و گەورەش لای حەوزەکە بوو کە دیاربوو ئاو لە کوێستانەوە ئەو بەردانەی هێناوە. کە گەشتینە ئەم شوێنە هانا دەستی بەرەلاٚ کردم و دەست بەجیٚ پەڕییە ناو ئاو.

لەڕۆشتنی ناو حەوزەکە بێزاربووم چوونکە وامزانی رەنگە مەلەکردنی من لەگەڵ کچی سەرۆك هۆز شێوەیەکی جوانی نەبێت و ببێتە هۆی شەڕ و خوێنرێژی.

هانا تێنەدەگەشت و سوور بوو چوونکە من خۆم بەدوور دەگرت بەهەمان شێوە هاتە دەر و منی بردە ناو ئاوەکە. مەلەکردنی ئێمە زیاتر لە یەك کاتژمێری خایاند و من چوونکە ناڕەحەت بووم، دوای هاتنەدەر لە ئاوەکە هەستم کردکرانەوەیەکی تایبەت لە مندا دروست بووە.

کیٚ یە لە مەلەکردن لەگەڵ ئاوا کچێکی جوان و ناسك چێژ نابات و لەخۆی بیٚ خۆی نابێت. کاتێك لە ئاوەکە هاتینەدەر و هانا جل و بەرگە گیایەکەی خۆی لەبەر کردەوە و قژەکانی وشك کردەوە، دوبارە دەستی منی گرت و بردمیە ناو جەنگەڵ. ٥٠ مەتر لە ئەستێرەکە دوور کەوتبووینەوە..... هانا وەستا... و ووردبوویەوە و جوان لەدەوروبەری ڕووانی و کە دەوربەری بە چۆڵ بینی بەڕاکردن ڕۆشتە ناو گیاکانی قامیشەڵان و بە تفەنگێکی بەلژیکی و کلاٚوێکی حەسیری گەڕایەوە.

کە چاوم بە تفەنگەکە کەوت نزیك بوو لە خۆشیدا بقیژێنم بەڵام خۆم گرت.

هانا تفەنگەکەی دایە دەستم و ووتی:

ئەم داردەستە ئاسنینە بۆ تۆ بەومەرجەی منت خۆش بوویٚت.

تفەنگەکەم وەرگرت و کڵاوەکەم لەسەرنا. تفەنگەکەم پشکنی و بە خۆشحاڵیەوە بینیم تفەنگەکە کێشەی نیە و ٥ فیشەکی تیایە لە هانام پرسی:

ئەم شتانەت لەکوێوە هێناوە..؟

هانا پێکەنی و ووتی:

ساڵی پار چەند سپی پێستێك هاتنە ئێرە بەڵام هۆزی باشیەکان ئەوانیان گرت و کوشتنیان. کاتێك پیاوانی باش گەمارۆیان دان من لەناو ئەم ئەستێرەدا بووم خۆم شاردەوە تا نەم بینن. کاتێك ئەوان ڕۆشتن شتەکانم کۆکردەوە و دام شاردن.

لە هانام پرسی: بێجگە لەم کڵاو تفەنگە شتی تریشی لێیە؟

هانا ووتی: زۆر شتی ترە کە نایان ناسم.

بە دوای هانادا ڕۆشتمە ناو قامیشەڵان و بینیم بڕێکی زۆر کەرەستەی سەفەر لەوێدا ڕژاوە کە گرنگترینیان، خەنجەر، فیشەك، دووربینی ڕاو و سەعاتێکی دەست بوو، ئەم شتانەم کۆکردەوەو لەگەڵ هانا بەرەو هۆز بەڕێکەوتین.

لەڕێگادا من بە تفەنگ، فیشەکێکم تەقاندو بەرازێکی بچووکم ڕاوکرد، هانا بە سەرسوڕمانەوە لە شوێنی گوولەکەی ڕوانی ووتی:

ئەم داردەستە پڕە لە ڕۆحە گلاوەکان. فڕێیدە.

سەرقاڵی ڕوونکردنەوە لەبارەی سوودەکانی تفەنگ بووم لەناکاو هانا قیژاندی و خۆی لەپشت مندا شاردەوە. تفەنگەکەم ئامادەکرد ئاژەڵە دڕەندەکە لەپێ بخەم بەڵام بەو پەری سەرسوڕمانەوە بینیم لە جیاتی ئاژەڵی دڕندە لەناو دارەکان دوو پیاوی هۆزی پی چی کە یەکیان بە نێزەو ئەویتریان بە خەنجەر چەکدار بوون هاتنەدەر یەك لەوان ڕێگەی لێ گرتم و لە کاتێکدا خەنجەرەکەی بەرەو ڕووم گرت ووتی:

بۆ لەماڵی خۆشەویستەکەی من شوێنت خۆش کردوە. من داریم خۆش دەوێت و ئەو دەبێت شوو بکات بە من. دەبێت تۆ بکوژم تا بە خەیاڵی ئاسوودە و بەپێی یاسا ببمە مێردی داری کە ئێستا ژنی تۆیە.

ئەویتریان هاتە پێش و دەستی هانای گرت و لە پشت منەوە نەری هێنا. هانا لە ترسا قیژاندی و بێهۆش بوو. دەست بەجێ لای خۆم گەشتمە ئەو ئەنجامەی ئەگەر بە نەرمی لەگەڵیاندا بجووڵێمەوە دەمکوژن و دوای کوشتنی منیش ئەگەری ئەوە هەیە دەست درێژی بکەنە سەر هانا. بۆیە بڕیاری بەرگریم دا. لەم کاتەدا تیمساحێکی گەورە لای حەوزەکە تێدەپەڕی. ئاشکرابوو بۆ ئاو خواردن دەڕوات. و تیمساحەکەم نیشان دان

ووتم: سەیری کەن.

دواتر بەفیشەکێك ئاژەڵەکەم لەپێ خست و خستمە ناو حەوزەکە. ئەوسا ڕووم کردە ئەو دوانە کە لەترسا چاویان زەق بوو، ووتم: ئەگەر تایەك خولەکی تر لێرەدا بووەستن بەم داردەستە جادویە هەردووکتان دەکوژم.

ئەوان ترسان و بەلەرزە لەرز ڕۆشتنە دواو لەپشت دارەکانەوە ون بوون. منیش بەخێرایی هانای بێهۆشم خستە سەر دەست و لەوان دوورکەوتمەوە. تا دووریەکی زۆر ئەوان بە دوامان‌دا هاتن بەڵام نەیاندەوێرا نزیك ببنەوە.

لەماوەی ڕێگادا لەگەڵ ئەوەی مەترسی بە دوامانەوە بوو، لە شادمانیدا دڵم بێ هێز دەبوو. نازانم ئایا هەرگیز لەماوەی تەمەندا لەگەڵ ڕووداوێکی دڵخۆشکەر ڕووبەڕوو بوونەتەوە یان نە؟ بیربکەنەوە لەو کاتەدا مرۆڤ چەندە شادمانە، چۆن دڵی بەیەکدادێت و هەست بە شادمانی دەکات...؟ لەم کاتەدا کە هانام لە سەردەست گرتبوو و لەوێوە دووردەکەوتمەوە، ئاوا حاڵێکم بوو بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێم شادمانیم لەبەرئەوە نەبوو کە هانام بەدەست هێنایەوە یان لەگەڵ ئەودا لە جەنگەڵ دا بەتەنیا بووم بەڵکو لەبەرئەوە بوو لەو جەنگەڵە مەترسیدارە و لەو شوێنە پڕ ترسە کە مرۆڤ لەیەك کاتژمێری داهاتووی خۆی دەڵنیانەبوو، ببوومە خاوەنی تفەنگ و فیشەك لەوەش گرنگتر کراسێکی باش و کڵاوێکی حەسیری.

هەتاو چاوی کز کردبوو، چەند جار بڕیارمدا بە لقی وشکی دارەکان بە یارمەتی داری کڵاوێك بۆ خۆم دروست بکەم بەڵام چوونکە خۆم چنینی کڵاوم نەدەزانی و لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیاندی شێوەکەی لە داری ئاسان نەبوو، لە بوونی کڵاو چاوم پۆشی تا ئەوەی هانای خۆشەویست بە ووتەی خۆی منی کردە خاوەنی داردەستێکی ئاسن و چەترێکی پێدام. ئەو وایدەزانی تفەنگ داردەست و کڵاو چەترە.

ئێستا خاوەنی زۆر شت بووم. تفەنگ، کڵاو و لە هەمووی گرنگتر ئەوەی هانا منی خۆش دەویست و ئەوەی کەسێك هەیە لەناو هۆزدا هانای خۆش دەوێت و ئەویتر کەسێکە عاشقی داری هاوسەرە سەپێنراوەکەی منە.

سەرئەنجام بەهەر ترسێك بوو گەشتینە هۆزو من هانام ڕاستەوخۆ بردەماڵی داری و شێلام تا هاتەوە هۆش خۆی! کاتێك چاوە جوانەکانی کردەوە پرسیم ئەمانە کێن.... و لە من و تۆ چیان دەویست.

هانا بێ دوودڵی و بێ ڕیا ڕاستی ووت ووتی:

ئەو لاوەی نێزەی بە دەستەوە بوو منی خۆش دەویست..... ماوەیەکە هەرکات بە تەنیا دەڕۆمە جەنگەڵ ڕێگام لێ دەگرێت تا ئەوەی ئەمڕۆکە ئەو سپی پێستەم ڕزگار کرد و ڕۆدی برد و لەگەڵ عاشقی داری هاتنە جەنگەڵ کە ئێوە و من بکوژن.. نازانم چۆن بوو زیندوومایەوە. من نامەوێت بمرم. پێشتر لە مردن نەدەترسام بەڵام ئێستا دەترسم نازانم بۆ..؟

ئەو بەم شێوە دەیویست عەشق و خۆشەویستی بۆ من دەرببڕێت بەڵام نەیدەزانی چی بڵێت و نەیشیدەزانی دڵداری منە و مانای ئەمە چیە؟

لەم کاتەدا یوری هاتە ژوور و کاتێك منی بینی شادمان بوو. نازانم شادمانی من لەوساتەدا بۆچی بوو. ڕەنگە وایدەزانی ڕادەکەم و لەم گێژاوەدا بە تەنیا جێی دێڵم. بەهەرحاڵ کاتێك چاوی بە من کەوت بزەیەك بەوپەڕی ڕەزامەندی چاوەکانی کردەوە.

بە بینینی ئەو کەوتمە بیری وادەی مۆڵەتەکەی خۆم. بیست و چوار کاتژمێر لە یوری کاتم ویستبوو وەڵامی بدەمەوە. بۆ ئەم مەبەستە بە هانام ووت:

تۆ و داری بە تەنیا جێم بێڵن.

هانا بزەیەکی گرت ووتی:

ئەگەر بیانوتایە تۆ لەگەڵ داریدا بەتەنیا جێ بێڵم دەگریام بەڵام لەگەڵ ئەم پیاوەدا کێشە نیە.

هێواش هێواش کاری من و هانا دەگەشتە شوێنە ناسکەکان و ئەو بێ ترس نێهێنیەکانی دڵی خۆی بە زمان و چاو و نیگا و ئیشارە و ووتە و ووشە لە من دەگەیاند و دەری دەبڕی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا منیش ئەوم خۆش دەویست و بەرژەوندی خۆم لەوەدا دەبینی ڕووی خۆشی پێ نیشان نەدەم وخۆم بەم لە گێلی و نەزانی. کاتێك داری و هانا ڕۆشتنەدەر، چاوی یوری بە سووچی ژوورەکە کەوت و تفەنگەکەی لەوێدا بینی و لە شادمانیدا قیژاندی کە هانا ترسا و پەرێشان گەڕایەوە تا ببینێت چی بووە.

یوری تفەنگەکەی لە ئامێزگرتبوو و وەك دایکێك منالەکەی خۆی دۆزیبێتەوە، ماچی دەکرد، بۆنی دەکرد و بە سینگیەوە دەگوشی، چاوەکانی لە فرمێسکی شادیدا تەڕبوو و ئەوەندە سەرقاڵی تفەنگەکە بوو منی لەبیرکردبوو. بەردەوام لەخۆم دەپرسی چی بکەم؟ دەبێت چی وەڵامی یوری بدەمەوە؟ کاتێك لە زانکۆ دەمخوێند، زانیاری کەمم سەبارەت بە ژنانی وەحشی ئامازۆن بەدەست هێنابوو و دەمزانی ئەوان پیاوانیان تا کاتێك خۆش دەوێت کە لێیان تێرنەبوون و کاتێك لە پیاوێك تێربوون دەیکوژن.

کەواتە عاقڵانە نیە بەپێی خۆم لە مردن نزیك ببمەوە، بەخۆم دەوت:

من سپی پێستم هەرچەندە لای کچانی ئامازۆن خۆشەویست بم درەنگ یان زوو لێم تێردەبن و ئەوسا بە دەستی جەلادم دەسپێرن.

لەم کاتەدا دووبارە لە یوریم پرسی چی دەزانێت و چییان لێ تێگەشتووە.

یوری وتی:

لە زینداندابووم و شتێکی ئەوتۆیان لەبارەوە نازانم. تەنیا شتێك دەزانم ئەوەیە ئەگەر بەڵێنەکەی خۆم نەبەمەسەر و ئێوە نەبەمە لای سەرۆکی ژنان بە دەست شەڕکەرانی ئەوان دەکوژرێم و ئەمەیش گاڵتە نیە. دڵم بۆ یوری دەسوتا هەرچەندە دەمزانی پیاوێکی ترسنۆك نیە. یوری لەم ماوەدا بۆی سەلماندبووم پیاوێکی ئازاو بەجەرگە. بەڵام ئێستا کە ئەوەندە لە ژنانی ئامازۆن دەترسێت، گرنگە و هەڕەشەکەی درەنگ یان زوو دەبێتە ڕاستی و یوری دەکوژرێت.

حەیف بوو هاوڕێیەك بەو ڕادەیە خۆشەویست بکوژرێت. لە جوامێری بەدوور بوو لەبەر گیانی خۆم بیخەمە ناو داوی مردنەوە. ئەو چەند جار منی لە مردن رزگار کردبوو.

کەواتە ئەرکی منە ئەمجارەیان گیانی ئەو بکڕمەوە ئەگەر بە نرخی گیانی خۆم تەواوببێت. ئەوە دوایین فکرو دوایین قۆناغی دوودڵی و گومانی من بوو. چوونکە دەست بەجێ پێم وت. یوری گوێ بگرە من لەگەڵ تۆ دێم بەڵام مەرجەکەی ئەوەیە کوێرانە فەرمانەکانم جێ بەجێ بکەیت.

تێدەگەیت.

مۆنی کرد وتی: لەم ماوەدا کە ساڵێکە کەی سەرپێچی فەرمانەکانتم کردووە؟

تێنەگەشت. سەبارەت بە ڕابردوو قسەناکەم.... لە داهاتوودا ڕەنگە ڕووداوی وا بێتە پێش باوەڕی تۆ بەرامبەر بە من بگۆڕێت و یان لە خۆشەویستی تۆ کەم بکاتەوە. مەبەستم ئەوەیە لە داهاتوودا کوێرانە فەرمانەکانم جێ بەجێ بکەیت و لەوپەڕی بەزەییدا دەستوورەکانم ئەنجام بدەیت. ئەگەر ڕازی دەبی لەگەڵتا دێم.

ئەو بێ درەنگ وتی: ڕازیم.

دواتر دەستی بۆ لای من درێژکرد و جارێکیتر وەك ئەو شەوەی کە لە قاوەخانەکەدا ڕووبەڕووی یەك بووینەوە، دەستی یەکمان گووشی و دەست بەجێ وتم:

کەواتە ئامادەی بەڕێکەوتن بە.

یوری هەستاو بەخێرایی جلی لەبەرکرد، قەیتانی پێڵاوەکانی توندکرد. دوو

خەنجەری لە چەپ و ڕاستی کەمەری خۆی دانا و دواتر تفەنگەکەی منی بەدەستەوە گرت و ووتی: سەرۆك من ئامادەم... بەرەو پێش بەرە و چارەنووسێکی تازە.

من داوایەکی سەیرم لە یوری کرد کە خۆیشم ماناکەیم نەدەزانی. بیرم کردەوە ئەگەر بکەوینە قەیرانەوە، فێڵ بەکاربەرین و دوژمنانی خۆمان بکوژین بەڵام........

بەڵام من توانای کوشتنی کەسم نەبوو ئەم پێشنیارەم کرد بەدەستی یوری مەبەستەکانی خۆم ئەنجام بدەم و گیانی خۆم رزگار کەم.

منیش پێڵاوەکانی خۆم هەڵکێشاو ئامادەبووم بەڵام پێش ئەوەی لە ماڵی داری بڕۆینەدەر،هانا شڵەژا و هاتە ژوور ووتی:

ئاخ...... بۆ کوێ دەڕۆن........ مەڕۆن....

بەپەلە پرسیم :چی بوو........ بۆ کوێ نەڕۆین؟

هانا لەکاتێکدا دەستەکانی لە ملم ئاڵاند گریا و ووتی:

بۆ کوێ دەڕۆیت.... دەڵێی دەتەوێت بۆ ڕێگایەکی دوور بڕۆیت،چاوەڕوان بە بارودۆخ مەترسیدارە و جەنگەڵ ئەمن نیە.

پرسیم: بۆ........ مەگەر چی بووە.

ژنانی وەحشی ئامازۆن وەك ساڵی پێش هاتوونە ئەم دەوروبەرە. هەرکات ئەوان بە شەڕکەرانی خۆیان لێمان نزیك دەبنەوە: کۆمەڵێك لە پیاوە جوان و لاوەکانی هۆزەکان دەبەن و دواتر دەیکوژن.

ووتم: ئەوان کاریان بە پیاوانی هۆزی ئێوە نیە. مەبەستیان منم کاتێك من ڕۆشتم. ئەوان دەڕۆن و ڕووداوەکە کۆتایی پێدێت.

هانا وەك شێت دەگریا و بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوو دەست بەردارم بێت. دەستەکانی توند لە ملم ئاڵاندبوو قاچی لە زەوی بەرزکردەوە بەڵکو ناچارم کات دانیشم و لە ڕۆشتن پەشیمان ببمەوە:

سەیرێکی یوریم دەکرد و سەیرێکی هانا. چاوە جوانەکانی هانا فەرمانیان پێ دەکردم لە ڕۆشتن لەگەڵ یوری چاو بپۆشم بەڵام لەولاوە نیگا پڕ داواکارییەکانی یوری هانی دەدام هانا بەجێ بێڵم و بڕۆم.

ماوەیەك لە ترس و گوماندا بەسەرم برد. چەند خولەکێك بە دژواری لێم گوزەرا. خولەکە پەرێشانیەکان کە تیایدا نەمدەزانی چی بکەم و دەبێت چ بڕیارێك بگرم. سەرئەنجام دەستەکانی هانام بەزۆر لە ملم کردەوە ووتم:

هانا، گوێ بگرە. من تۆم خۆش دەوێت. بەڵام ئێستا ناتوانم ببمە هاوسەرت. سەبركە با برۆم و بێمەوە ئەوسا ماڵێكی جوان لای تاڤگە بۆخۆمان دروست دەكەین. تێدەگەیت.

هانا بە گریانێك بە دەنگێك كە دنیایەك نائومێدی لێ دیاربوو ووتی:

تۆ دەڕۆیت. بەڵام دڵنیام بە دەست ژنە جوانەكانی ئامازۆن دەكوژرێیت. هەرگیز پیاوێك بە سەلامەتی لە دەستیان دەرباز نەبووە.

من تفەنگەكەم نیشان دا ووتم: بەم داردەستە كەس ناتوانێت بم كوژێت.

بەهەزار قسەو پاڕانەوە رازیم كرد بەشێوەیەكی كاتی وازمان لێ بێنێت.

بەهەرحاڵ ئەو بەخۆشحاڵی و ڕاكردن ڕۆشت و من و یوری لە دەرگا ڕۆشتینەدەر و بۆ ئەوەی كەس نەمان بینێت ڕێگەی خۆمان خواركردەوە. لە پشت ڕیزی ماڵەكان ڕێگەی جەنگەڵمان گرتەبەر.

من و یوری بە نەرمی دەڕۆشتینە پێش. یوری ڕێگاكانی جەنگەڵی باشتر لە هەركەسێكی تر دەناسی، لەپێچ و پەنا، بەرزو نزمی و سەرئەنجام هەموو شوێنێكی ئەو سنووورە شارەزابوو.

زۆنگاوە مەترسیدارەكانی لەوێ بە پەنجە دیاری كرد و بەشێوەیەك منی لە زۆنگاوەكانەوە تێپەڕاند كە بە راستی سەیربوو. توشی سەرسوڕمان بووم. خوێنەرانی بەڕێز كاتێك لە ڕاستی ڕووداوەكە و ناسنامەی ڕاستەقینەی یوری ئاگاداربن ڕەنگە زیاتر لە من سەریان سوڕبمێنێت، ئێستا چوونكە نامانەوێت ڕێرەوی داستانەكە بگۆڕین ڕووداوەكان یەك یەك بەو شێوەی ڕوویانداوە، دەگێڕینەوە و دەگوزەرین بەبێ ئەوەی ئامارژە بەم بابەتە بدرێت.

ئەو رۆژە یوری لەپێش منەوە دەڕۆشت و ڕێگاكانی جەنگەڵی نیشاندام زۆر سەرم سوڕما بەڵام چوونكە ئەوم بە كەسێكی وشیار دەزانی بە خۆمم ووت:

ئەو جارێك لەم رێگاوە تێپەڕیوە و ئەم سنوورانەی ناسیوە بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نیە بەڵام راستی شتێكی تربوو.

رۆشتنی ئێمە درێژەی بوو. لە خاڵێك لە جەنگەڵ كە سەرچاوەیەكی ئاوی پاك لە ژێر زەوی هەڵدەقوڵا، وەستاین و بڕیارماندا دوای كاتژمێرێك حەوانەوە دەست بە ڕێگا ڕۆشتن بكەینەوە.

٤

ئاوابوونی هەتاو نزیك بوو و هەوا هێواش هێواش تاریك دەبوو، منیش تووشی ترس دەبووم.

لە لایەکیتر برسیەتی تەنگی پێ هەڵدەچنین. لەو کاتژمێرەوەی لە هۆزەکەی هانا هاتبووینەدەر تا ئێستا برسی بووین. لەلایەکیتر بە هاتنی شەو درێژەدان بەڕێگەو ڕۆشتن دژوار دەبوو. بە یوریم ووت: سەرەتا بۆ تێرکردنی سکی خۆت و من کارێك بکە و دواتر پێم بڵێ لێرەوە تا هۆزی ژنانی وەحشی ئامازۆن چەندە ڕێگایە.؟

یوری بیری کردەوە ووتی:

ئەگەر بەخێرایی بڕۆینە پێش نزیك بەیانی دەگەینە هۆزەکەیان. ئەگەر وانەبێت ناچارین ئەم شەو لەناو جەنگەڵدا بمێنینەوە.

کاتێك دڵنیابووم هێشتا ڕێگەیەکی زۆرمان تا گەشتن بە هۆزی ژنانی ئامازۆن ماوە بە یوریم وت هەستە، هەستە تا بەدوای ڕاودا بگەڕێین. تا هەوا تاریك نەبووە دەبێت شتێك بۆ خواردن پەیابکەین وەگەرنە گیرۆدەی برسیەتی دەبین.

و دەست بەجێ تفەنگەکەم هەڵگرت و بەڕێکەوتم. یوریش بەسەرسوڕمانی من لە شوێنەکەی هەستاو بەدوامدا بەڕێکەوت. کەمێکی تر لەو ڕێگادا ڕۆشتین نەمدەزانی چ چارەنوسێکی شووم چاوەڕێمان دەکات. لە هەرشتێك بێ ئاگا هەنگاومان هەڵدەگرت و چاومان لەسەر شاخ و گەڵای دارکان بەدوای باڵندەدا دەگەڕا تا بە فیشەك بکوژرێت و ببێتە خواردن بۆمان.

لەم کاتەدا گەشتینە پانتاییەکی بەربڵاو کە داری تیانەبوو. دەنگی چۆڕەی ئاوێکی کەم لەسەرەوە دەبیسترا و ڕۆشناییەکی سوور ڕەنگ لەسەر زەوی ڕەنگی دەدایەوە. سەرم سورما بۆچی خۆڵ و گیا تیشکی هەتاوی زەرد ڕەنگ پێ دەداتەوە.

و جگە لەوە لە یوریم پرسی:

بۆ ئەم بەشە لە جەنگەڵ چۆڵە دارەکانی ئێرە کێ بڕیویەتی؟

یوری بە وردی و ترسەوە لەدەوروبەری خۆی دەڕووانی و کاتێك من لە چاوەکانی زەق بووم ترسام. ئایا لە هەموو شوێنێکی ڕوخسار و چاوی ئەو وابووە بە

سەرسوڕمانەوە پرسیم: یوری تۆ چیت لێ دێت؟ بۆ وا ڕەنگت پەڕاوە.

ئاوی دەمی خۆی قوت دا ووتی: سەرۆك. لەسەر قەراغەکانی مردن جێگیربووین. ئێرە مەترسیدارترین زۆنگاوەکانی بەستێنی ئامازۆنە. لقەکانی ڕووباری ناپۆ کە لە جەنگەڵدایە، دێتە ئێرە و ئەگەر بەردێکی بچووك بکەوێتە ناوی تا قووڵایی دوو سەد مەتر دەڕواتە خوار و هیچ هێزێك نیە رزگاری بکات.

شانەکانی خۆم بەرزکردەوە و بە خوێنساردی ووتم:

ئەم زۆنگاوانە ئەوەندەش مەترسیدارنین چوونکە ئێمە هێشتا پێیان نەگەشتووین و لەم رێگەوە کە هاتووین دەتوانین بگەڕێینەوە. لێرەدا بوو منیش ترسام و هەموو گیانم لەرز دایگرت چوونکە یوری ووتی:

سەرۆك بەهەڵەداچوون، رێگەی گەڕانەوە گیراوە. من و ئێوە لە ناوەڕاستی زۆنگاوداین و بەخۆشحاڵیەوە تا ئێستا لە تەنیا ڕێگەی زۆنکاو و کە ڕەق و بەهێزە هاتووین و بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین. بەڵام گەڕانەوە کارێکی ئاسان نیە.

زانیم چارەنوس مەرگێکی مەترسیداری بۆ پێش بینی کردووین.

رەنگ بە ڕوخسارمەوە نەمابوو. دەلەرزیم. هەرچەندە هەوا تاریکتر دەبوو زیاتر دەترسام.

زمانم لە ترسا گیرابوو لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی خۆمم دەداو بەرەو دواوە یانی ئەو رێگەی لێوەی هاتبووین رۆشتم بەڵام هێشتا دوو هەنگاو نەدەڕۆشتبووم کە قاچی ڕاستم تا ئەژنۆ لەناو زۆنگاوەکەدا ڕۆچوو ئەگەر یوری دەستی نەدەگرتم لەقوڵایی زۆنگاو ڕۆدەچووم.

لەم کاتەدا دەنگی چڵپ چڵپ لەم لاو لامان بەرزبوویەوە، لەدەروبەرم دەڕوانی بەڵام چوونکە هەوا تاریك بوو چاو هیچ شوێنێکی نەدەبینی و هیچم بۆ جیانەدەکرایەوە.

لە ترسا بازوی یوریم گرت و ووتم: یوری....... ئەم دەنگانە چین؟

یوری بازووی لە دەستم دەرهێنا ووتی:

سەرۆك مەجووڵێن منیش مەجووڵێنن، ئێرە کە لێی وەستاوین ڕەقە بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە شوێنی قاچمان بگۆڕێت و بڕۆینە ناو قووڵایی زۆنگاو.

بەپەلە ووتم: وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە ئەم دەنگانە هی چیە؟

ئەو دوبارە شتێکی تری ووت و من تێگەشتم کە نایەوێت وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە و بۆیە جاری سێیەم بە تووڕەیی یەخەیم گرت ووتم:

ئەحمەق...... بڵێ ئەم دەنگانە چیە؟ گوێ بگرە. دەنگی چڵپ چڵپ دەبیستی؟

ناچار یوری هاتە قسە و بەپێچەوانەی حەزی خۆی ووتی:

ئەمە دەنگی ئانیکاتۆرەکانە. تیمساحەکان هاتوون جەستەمان بخۆن. ئەم ئاژەڵانە لە دوورەوە بۆنی مرۆڤ دەکات و بەخێرایی خۆی پێدەگەیەنێت. تیمساحی زۆر لەناو زۆلکاوە شلەکانی ئەم زۆنگاوانەدا هەیە کە مەترسیدارترین ئاژەڵەکانی جەنگەڵ دەژمێردرێن. ئەوان ئێستا ئێمەیان گەمارۆداوە تا لەکاتی گونجاو دا هێرشمان بۆ بکەن.

تازە تێگەشتم بۆ یوری لەوەڵامدانەوەدا مینگە مینگی دەکرد. ئێمە لەوخاڵە یانی لە شوێنێك بە پانی یەك مەتر بە یەك مەترونیو مابووینەوە. رێگەی گەڕانەوەمان وون کردبوو و رێگەی پێش کەوتنیشمان نەبوو. دەوروبەرمان تیمساحە خوێنخۆرەکان بوون و هەرسات ئەگەری بوو پەلامارمان بدەن.

لەراستیدا مەرگ لە چەند هەنگاویماندا بوو و هێدی هێدی لێمان نزیك دەبوویەوە.

زیاد لەڕادە ترسابووم و لە ترسی ئەوەی نەوەك تمساحەکان گاز لە قاچم بگرن و بمکێشنە ناو زۆنگاوەکە، دانیشتم و جوامیلکەم دا. یوری کە ئەمەی بینی ووتی:

سەرۆك ئاسوودەبن تا کاتێك ئێمە زیندووین ئەم تیمساحانە هێرش ناکەن.

دەترسام نەمدەویست ناوی مردن ببیستم. بەڵام لەم زۆنگاوەدا بێجگە مردن رێگایەکی ترنەبوو. چ مەرگێکی مەترسیدار و پڕ ئازار.

شەو تێ دەپەری، تاریکی چڕتر دەبوو، برسیەتی فشاری دەهێنا و کەم کەم من و یوری لە لاوازی و ناتەوانی و بێ خەوی لەپێ دەکەوتین.

سەرئەنجام ئەو شەوە بە هەموو دژوارییەکانی تێ پەری و بەیانی بوویەوە.

کاتێك هەوا هێواش هێواش ڕوون بوویەوە سەیری دارەکانی جەنگەڵم کرد کە بەشێوەی بازنەیی لەدەواندەورماندا بوو و دواتر سەیرێکی ئاسمانم کردو بە خۆمم ووت:

خوا، چارەنوسی منی وا دیارکردبوو لێرەدا بمرم.... لێرە و بەم هەمووئازارە؟

یوری کە زیاتر لە من بەبارودۆخ و مەترسی زۆنگاوەکە ئاشنابوو زیاتر لە من ترسابوو و زووتر لە من لەپێ کەوت. هەتاو هەڵات، هەتاو تیشکی دەپرژاندەسەر ئاوی پیسی زۆنکاو، هەڵمێکی پیس و بێزارکەری دروست دەکرد، هەواگەرم بوو... گەرم گەرمتر تا ئەوەی من و یوری ناچار ڕووت بووینەوە.

گەرما لە زۆنکاوەکە بوو. ئاوەکە لەژێر تیشکی تیژو راستەوخۆی هەتاو دەبوو بە

هەڵم و هەڵمی ئاو شوێنەکەی نەشیاو بۆ خۆراگرتن و هەوای نەشیاو بۆ هەڵمژین کردبوو. لەگەڵ ئەوەی هەردوکمان بەتەواوی خۆمان رووت کردبوویەوە لەگەرمای زۆر ئارەقمان دەڕشت. دەتوت ئەندام و ئێسقانەکانم دەبنە ئاو و لەجەستەم دەردەچن. مردنیش نزیك دەبوویەوە تا شوێنێك چنگاڵی خوێناوی خۆی لەسەر قورگی یوری دانا. رەنگ بە ڕوخساری یوریەوە نەمابوو و من لە رووی حسابێکەوە کە دەمزانی مرۆڤ هەرچەندە لاوازیش بێت تا دوو شەو و رۆژ بە برسیەتی دەتوانێت زیندو بمێنێت گوومانم برد ئێمە بە هۆی هەڵمەکانی زۆنگاو ژەهراوی بووین. بە راستیش هەروا بوو. یوری ڕەنگ پەڕاو بە لێوە شین و وشك هەڵگەراوەکانی چەمایەوە تا ئەوەی کەوتە سەر زەوی. بە دژواری و ترس و لەرزی زۆر خۆم پێگەیاند و گوێم لە دڵی گرت.

هێشتا دڵی هێواش لێی دەدا و نیشانی دەدا هێشتا زیندووە. بە بینینی ئەمە نزیك بوو شێت بم. زۆر خۆم ڕاگرت تا شێت نەبم.

سەیرێکی دەوروبەرم کرد و دواتر هەرچوار لام خستە ژێر سەرنجەوە.... لە چەپ و راست..... سەروخوار.... کەنارەکانی زۆنکاو دوور بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەیەکم هەڵبژارد و ڕۆشتمە پێش.

چەند هەنگاوێك کە رۆشتمە پێش زەوی ڕەق بوو. شادمان بووم و بە دڵنیاییەکی زۆرترەوە درێژەم بە ڕۆشتن دا بەڵام لەناکاو ژێر قاچم ڕۆچوو تا هاتم بکەومە خۆ، تا کەمەرم رۆشتە ناو زۆنکاو. لە سینەمادا بینیبووم و لەناو رۆژنامەو گۆڤارەکاندا خوێندبووم کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە ناو زۆنکاو نابێت زۆر هەوڵ بدات چوونکە هەرچی زیاتر تەکان بە خۆی بدات و وزە بەکاربەرێت زیاتر ڕۆدەچێت. بۆیە کاتێك بینیم تا کەمەرم لە زۆنکاوەکەدایە هەوڵمدا خوێنساردبم و بە خوێنساردی ڕێگەیەك بۆ رزگاربوون بدۆزمەوە.

بەڵام چ شتێك ئەگەری بوو من لە مردن رزگار کات.

لەگەڵ ئەوەی هەوڵم نەدەدا سات لەدوای سات زیاتر لە زۆنکاوەکەدا ڕۆدەچووم. ئاوی زۆنکاو لە کەمەرم هاتە سەر تا لە ناوك تێپەڕی و گەشتە ژێر پەڕاسوەکان و لەوێوە وردەوردە بەرزبوویەوە.

چی بکەم؟.... ژیان تەواوبوو. ماڵ ئاوا هەموو شتێك و هەموو شوێنێك و هەموو کەسێك ماڵئاوا. دایە، براکەم... ماڵئاوا ئەی هاوڕێ ئازیزەکانم...، ماڵئاوا ئەی هانای خۆشەویست، من لەم زۆنکاوەدا مردم و بووم بە پاروی تیمساحەکان.

بێ ئیرادە ئەم رستانەم هێنایە سەر زمان و وەك شێت لە چەپ و راستی خۆم ڕووانی.
دووبارە دەنگی چڵپ چڵپ دەبیسترا و زانیم تیمساحەکان نزیك دەبنەوە. چاویانم دەبینی، دەم کراوە و ددانە تیژەکانیان مووی لەسەر جەستەم بەرز دەکردەوە.

زۆنکاو فشاری بۆ جەستەم دەهێنا. دەتوت بەشێکی جەستەمیان خستۆتە گەچەوە. نزیك بوو چاوەکانم دەرپەڕن. دەستەکانم درێژ کرد و کاتێك زیاتر دەڕۆشتمە خوار بە هەموو هێزی خۆم قیژاندم و لەهۆش چووم.

روخساری مەترسیداری مەرگ پێش ئەوەی بمرم و رۆح لە جەستەم دەرچێت ئەوەندە ترسی تیا دروست کردم کە بێهۆش بووم بەڵام لە دوایین ساتدا داخی دڵی خۆم بە قیژەیەك خاڵی کردەوە.

جۆرێکی تایبەت بێ هۆش بووم. کەم کەم..... سات بەسات بە هەمان ئەندازە کە لەهۆش دەچووم رۆشتنە خوارەوەی خۆم لە زۆنکاو و نزیك بوونەوەی تمساحەکانم هەست پێ دەکرد.... و لەهەمان کاتدا شادمان بووم بە بێهۆشی دەمرم و ئازار ناکێشم. بیستبووم گیان دان سەختە. کەوا ئێستا کە بێهۆش بووم هەستم بە گیان کێشان نەدەکرد.

ئەوە دوایین شت بوو بە بیرمدا هات و ئیتر نەمزانی چی بوو....

وا هەست دەکەم مردن زۆر شیرین و ئاسان بێت. ئەو رۆژەی من و یوری کەوتینە زۆنکاوەکە، مردین، مەگەر مردن شتێکی زیاترە، یوری لە هەڵمە ژەهراویەکانی زۆنکاو حاڵەتی گۆڕا. لێدانی دڵی کەم بوویەوە و لای چەند تاشەبەردێك کەوت و لە مردن نزیك بوویەوە. منیش کەوتمە ناو زۆنکاو و لەگەڵ ئەوەی لێی دەترسام روبەڕو بوومەوە.

کەم کەم لەزۆنکاودا ڕۆدەچووم کە وەك شێت قیژاندم و لەهۆش خۆم چووم.

مردن ئەمەیە. زۆر ئاسان و شیرین وەك خەوێکی قورس، خۆش. کاتێك مەرگ هات جەستەی مرۆڤ بە هەموو ئازارەکانیەوە هەست بە ڕاحەتی دەکات. دەمی مرۆڤ لە هەنگوینێکی شیرین چێژدەر و ئارام کەرەوە پڕ دەبێت. رۆح لە کۆتی جەستە ئازادی دەبێت و کار تەواو دەبێت.

وا هەست دەکەم مردن زیاتر لەمە شتێك نیەو من ئەو رۆژە ئەم حاڵەم هەبوو تا دوایین سات. دوای ئەو قیژە بە ئازارەی کێشام هەستم دەکرد دەڕۆم بمرم و لەم مردنە کە وەك خەوێکی قورس بەدوامدا هات چێژم دەبرد.

گوومانم دەبرد مردوم، ئێستا لە تابووتدام. ئێرە کە ئارام پاڵ کەوتین تابووتێکە

جوان ومنیان تیا پاڵخستوە و دەیانەوێت بمخەنە ژێر خاك. لەوەی مردوم گوومانم نەبوو بەڵام بیرم لەوە دەکردەوە چ هێزێك منی لە زۆنکاوەکەدا هێناوەتەدەر و لەناو تابووتدا دایناوم.

بیستبووم قەشەکان دەیانوت ((کاتێك مرۆڤ مرد، رۆح ئازاد دەبێت و دوای ماوەیەك رۆح بە دوای جەستەی خۆیدا دەگەڕێت و سەردانی جەستەی خۆی دەکات )).

وام زانی چەند مانگ یان چەند رۆژ تێپەڕیوە و ئەمە رۆحی منە گەڕاوەتەوە و هەست بەم شتانە دەکات. بەڵام لەوە سەرگەردان بووم چۆن دەتوانم هەناسە بکێشم. هێواش دەستی ڕاستی خۆم بەرەو لای خۆم تەکان دەدا. دەمویست تابووتەکە بدۆزمەوە بەڵام هەرچەندە دەستم گێرا دەستم بەر تابووت نەکەوت. دواتر دەستی چەپی خۆم بە هەمان شێوە جووڵاند. ئەم جارە دەستی چەپم بەر شتێکی گەرم کەوت. وەك جەستەی مرۆڤ گەرم بوو. بە سەرسوڕمانەوە سەری خۆم سوڕاند تا مردویەکی تر کە لای من دایان نابوو ببینم. چەندە سەرم سورما کاتێك یوریم لای خۆم بینی.

بە بینینی یوری کرانەوەیەکی سەیر دڵ و گیانمی گرتەوە و تازە هەستم بەوە کرد کە سەر و کەلە و گەردن و نیوەی جەستەی خۆشم بەرزکردۆتەوە، بە خۆمم ووت:

ئەگەر مردووم چۆن و بۆ دەجووڵێم.

هەناسەشم دەکێشا، سینەم بەرزونزم دەبوویەوە. دەستم لەسەر دڵی خۆم دانا لێدانی نەرم و ئاسایی دڵم هەست پێ کرد. یوریش زیندو بوو. تەنیا کەمێك رەنگ پەڕاو دەهاتە بەرچاو دەستم لەسەر دڵی دانا و هەستم کرد حاڵی ئەویش باش و ئاساییە. کەواتە هەردووکمان زیندووین.

دەمویست لە شادمانیدا بقیژێنم. دەمویست لە شوێنەکەمدا هەستم و سەما بکەم. بەخۆمم دەوت خوایە، چ هێزێك جگە لە دەسەڵاتی تۆ توانای رزگارکردنی ئێمەی لەو زۆنکاوە مەترسیدارە دابوو.

چ کەسێك ئێمەی لە قورگی مردن هێنایەدەر و گەڕاینەوە بۆ ژیان.

کەس نەبوو وەڵامم بداتەوە. هەموو شتێك لام نامۆ بوو بەڵام دەمتوانی بە ئازادی لە دەوروبەری خۆم بڕوانم. یوری لەسەر زەوی پاڵکەوتبوو تەنیا سەرینێکی بچووکی لەژێر سەردابوو بەڵام ژێر من نەرم بوو. پارچەیەکی گەورەی پێستی گایان لەژێردا ڕاخستبووم و سەرینێك گەورەتر لە سەرینەکەی یوریم لە ژێر سەردا بوو.

پارچە.... سەرین....... لێرە؟ ئێرە کوێیە؟

کەس وەڵامی ئەم پرسیارەشی نەدایەوە. بەچاوسەیری ئەم لاولام کرد. دەورمان دیوارێك بوو. ئەویٚ ژوورێکی گەورە و پاك بوو، هەرچەندە وەك زۆربەی ژوورەکانی جەنگەڵی باران لەبەرگ و گەڵای درێژ و تایبەت دروست کرابوون بەڵام جیاوازی لەگەڵ ماڵ و ژوورەکانی تر لەوەدا بوو کە زیاد لە ڕادە پاك و خاوێن بوو. بە سەلیقەییەکی تایبەت رازێنرابوویەوە و چەند دەلاقەیەك بۆ روون کردنەوە و رووناکی لەناو ژوورەکەدا دروست کرابوو.

ئێرە کوێیە؟ یانی چی...؟ کەوتمە دەریای بیرو سەرم لەناو دەستم گرت و دەنگێك سەرنجی منی بۆلای خۆی راکێشا و کە سەرم بەرز کردەوە یوریم بینی چاوی خۆی کردەوە و دەینالآند.

زۆر شادمان بووم. خۆم گەیاندە سەر سەری و دەستم بە شێلانی شانەکانی کرد.

یوری ناڵەیەکی کرد و بەڵام کاتێك چاوی بە من کەوت بزەیەکی گرت و ووتی:

سەرۆك رزگارمان بوو.

بە هێواشی ووتم:

بەڵی رزگارمان بوو بەڵام هێشتا دیارنیە کێ رزگاری کردوین و ئێرە کوێیە.

یوری هەستاو دانیشت. زۆر بەخێرایی ئەم کارەی ئەنجام دا چوونکە هێشتا شوێنەواری ژەهرەکە لە جەستەیدا مابوو، هەستی بەسەر گێژە کرد و چەند ساتێك چاوەکانی بەست و سەری لەسەر دەست گرت تا باشتر بوو.

پێش ئەوەی دەست بە گێرانەوەی ڕووداوەکان بکەم، باشترە خوێنەران لە ڕووداوی چۆنیەتی رزگارکردنی خۆم و یوری و چۆنیەتی دەرکەوتنی ئەم موعجیزە باس بکەم و دواتر بڕۆم بە دوای ڕووداوەکان لەو کاتەی من کەم کەم لەناو زۆنکاوەکەدا ڕۆدەچووم بە هیچ شوێنێك هیوادار نەبووم، لە قەراغ زۆنکاوەکە کۆمەڵێك بەرەو لای هۆزی پی چیەکان دەڕۆشتنە پێش. ئەم تاقمە لە دوو پیاوی زل و چوارشانە و رەش پێستی چەکدار و چوار ژنی جوان پێك دەهاتن.

ئەمانە لە هۆزی ژنانی ئامازۆن بوون. ژنانی دانیشتوانی هۆز و رەش پێستەکان لەو پیاوانە بوون کە ببوونە دیلیان و دوای ئەوەی ئەرکی خۆیان ئەنجام دەدا، چارەنووسی وەك کەسانیتریان پیٚ دەبرا. وەك لە بەشەکانی پێشووتردا ئاماژەی پێدرا، کاتێك من و سمی بەرەو لای پی چیەکان دەڕۆشتین چەند ژنی چەکداری هۆزی ژنانی ئامازۆن ئێمەیان بینیبوو. لەوەی سپی پێستیان لەگەڵ سمیدا بینیبوو، سەریان سوڕما بوو،

خێرا سەرۆکەکەی خۆیان کە ژنێکی زۆر جوان و دڵرفێن بوو، ئاگادار کردبوویەوە.

سەرۆکی هۆز دەستوری دابوو بەهەر شێوەیەك دەکرێت دەستگیرم کەن و بمبەنە لای و بۆ ئەم مەبەستە ئەو تاقمە بەرەو هۆزی پی چیەکان بەڕێکەوتبوون و لەهەمان کاتدا من و یوری لە زۆنکاوەکەدا گیر کەوتبووین لە قەراغ زۆنکاوەکەدا بەرەو هۆزی ئامازەپێدراو دەڕۆشتن کە لەناکاو دەنگی قیژەی منیان بیست. من لەو کاتەی خۆم قیژاندم سەرم سورما چوونکە تەنیا مرۆڤێکی ئەحمەق داوای هاریکاری لە هیچ دەکات منیش دەبووایە زۆر ئەحمەق بم کە لەو کاتەدا قیژاندم و داوای یارمەتیم کرد. لەو جەنگەڵەدا کەسم نەدەناسی بێتە یارمەتیمان و یارمەتی من و یوری بدات.

بەهەرحاڵ قیژاندم و ئەم دەنگە بەگوێی ئەوان گەشت و بەخێرایی وەستان. سەرەتا دوو پیاوەکە بەرەو زۆنکاوەکە هاتن و بەدوای ئەواندا چوار ژنەکە کە بە تیروکەوان چەکداربوون هاتنەپێش. کاتێك لە چڕی دارەکان تێ دەپەڕین، لە ڕووناکی کەم ڕەنگی ئێواریْ سەری منیان بینی.

هەموو ئەم شتانەم دواتر زانی. ڕەش پێستەکان ئارەزومەندی ڕزگارکردنی ئێمە نەبوون و دەیانویست درێژە بەرێگای خۆیان بدەن. تەنانەت ژنەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هاوڕاکرد و بەڕێکەوتن بەڵام لەناکاو چاوی یەکێك لە ژنەکان بە من و پێستی من کە ڕووت بوو دەکەوێت و کە دەزانێت سپی پێستم بەوانی تر دەڵێت ئەمە ئەو کەسەیە کە سەرۆکی هۆز داوای لێکردوین و ئێستا بۆ دەستگیرکردنی ئەو دەڕۆین. بگەڕێنەوە بۆ کویْ دەڕۆن.

بەخێرایی دێنە پێش و کە دڵنیادەبن من سپی پێستم فەرمان بەو دوو ڕەش پێستە دەکەن بۆ ڕزگارکردنی ئێمە خۆیان بدەن لە زۆنکاوەکە. بیر خستنەوەی ئەم خاڵەش پێویستە کە ژنانی ئامازۆن زیاتر سەرنجیان بە من دەدا و بە یوری کە پێستی جەستەی تا ڕادەیەك قاوەیی ڕەنگ و سووتاو بوو، سەرنجیان نەدەدا. چوونکە ئەویان بە سپی پێست نەدەزانی.

بەهەرحاڵ یەکێك لە دوو ڕەش پێستە لەسەر وشکە دارێك دادەنیشێت و ئەویتریان بە قاچ دارەکەیان پاڵ پێوە دەنێت تیمساحەکان وەك دیاربوو زۆرلێمان نزیك ببوونەوە ئەگەر ئەوان چارەکێك درەنگتر بگەشتنایە، ئەو ئاژەڵە دڕندانە تیکە تیکەیان کردبووین.

بەم شێوەیە دوو ڕەش پێستەکە دێنە پێش و بەیارمەتی ڕمە درێژەکانی خۆیان وشکە دارەکە دەجووڵێنن. کاتێك من بێهۆش بووم، ڕۆچونم لەناو زۆنکاوەکەدا وەستاوە

چوونکە پەلەقاژەم نەدەکرد و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە شوێنەکەی خۆمدا بمێنمەوە. دەرکێشانی من لەناو زۆنکاوەکەدا دژواربوو بەڵام ئەو دوو ڕەش پێستە هەر جۆرێك بوو ئەم کارەیان ئەنجام دابوو و من دەکێشنە دەر و دەمخەنە سەر دارەکە و دەڕۆنە لای یوری و ئەویش دەخەنە سەر دارەکە و هەر لەو ڕێگاوەی کە هاتبوون دەگەڕێنەوە.

هەرچی بوو قیژەیەك لەدوایین ساتدا لەوپەری بێ هیوایی لە قورگی من هاتەدەر و بووە هۆی ڕزگاری ئێمە. هەڵبەت ئەو کاتەی یوری هاتە هۆش و ئێمە لە ژوورەکەدا دانیشتبووین لەم بابەتە ئاگادار نەبووین. کاتێك یوری هاتە هۆش و سەرگێژەی نەما وەك ئەوەی بیەوێت پشتی لە من داشارێت و ڕووی تێکردم و بەدوای کراسەکەی خۆیدا گەڕا. بە خۆشحاڵیەوە ئەوان کە ئێمەیان ڕزگارکردبوو، هەموو شتێك تەنانەت پێڵاوەکانی ئێمەیان هێنابوو و لە ژوورەکە هەڵیان ڕشتبوو. یوری کاتێك چاوی بە جلەکان کەوت زۆر شادمان بوو و بەهەمان شێوە کە پشتی لە من دائەشارد بەرەو کراسەکەی ڕۆشت و لەبەری کرد.

سەرم سوڕما یانی چی...! بۆ پشتی لە من دائەشارێت؟ ئایا لە پشتی ئەودا برینێك هەیە؟

ئەم سەرسوڕمانەم زۆری نەخایاند و کاتێك یوری کراسەکەی لەبەردەکرد توانیم پشتی ببینم.

لە پشتی ئەودا وێنەیەکی سەیر دەبینرا، هەموو پشتی ئەو بەشێك لە شانیان خاڵ کوتابوو. خاڵی وێنەکان ڕەنگی جۆراوجۆریان بوو. بەشێك ڕەش، بەشێك سەوز و بەشێك سوور زیاتر لەیەك نیگا نەمتوانی پشتی ببینم بەڵام لەهەمان سات و بەهەمان نیگا هەستم بەوەکرد خاڵەکەی هاوشێوەی خاڵی وەحشیەکانی باشووری ئەمریکایە و وێنەی یەکێك لە بتەکان نیشان دەدات.

ئەم بابەتەم بە هەموو گرنگیەك دواتر بەدەست هێنا، زۆر زوو لەبیرم چوویەوە و دەرفەتی ئەوم دەست نەکەوت زۆر بیری لێ بکەمەوە چوونکە لەهەمان کات کە یوری کراسەکەی خۆی لەبەرکرد و سەرقاڵی لە پێ کردنی شەرواڵەکەی بوو دەرگای ژوورەکە کرایەوە و ڕەشێکی چوارشانەی زل و بەهێزهاتە ناو و زەق زەق لە من و یوری ڕوانی.

یووریش سەرسوڕماوانە لێی دەڕوانی و دواتر بزەیەکی گرت و شتێکی وت کە من لە ماناو ناوەڕۆکەکەی حاڵی نەبووم. یوری زمانە ناوچەییەکانی زۆر دەزانی کە یەك لەوان زمانی هۆزی ژنانی وەحشی ئامازۆن بوو. ئەو بە ڕەش پێستەکە شتێکی وت و ڕەش

دەستەکانی بەرزکردەوە و داینایەوە و بەهەمان شێوە کە هاتبووە ژوور ڕۆشتەدەر و دەرگاکەی لەسەر داخستین.

لە یوریم پرسی: چی تێگەشتیت؟ ئەم ڕەشە کێ بوو لەگەڵیدا پێکەنیت؟ ئێستا لە کوێین.

یوری بە پێکەنینەوە ووتی: لەماڵی خۆماندانین. دڵنیابە تا یەك ساڵی تریش زیندووین و دوای ئەوە خوا دەزانێت چی دەبێت.

لە شتەکان تێنەدەگەشتم و لەبەرئەوەی لەمەتەڵیش بێزاربووم ووتم:

جوان قسەبکە، وەڵامی من بدەرەوە.

گەورەم ئێمە لەناو هۆزی ژنە وەحشیەکانی ئامازۆنداین. ئەوان ئێمەیان لە زۆنکاوەکە رزگارکرد. ئەوەی بینیتان من و ئەو قسەمان ئەکرد شتێکی گرنگ نەبوو. من سلاوم کرد ئەو وەڵامی دایەوە و دەستی بە نیشاندانی پیرۆزبایی بەرزکردەوە. من و یوری سەرقاڵی قسەکردن لەم بارەوە بووین کە بۆ جاری دووەم دەرگاکە بە توندیەکی زیاتر کرایەوە. وەك بڵێی لەقەیان لێدابێت قاپی دەرگاکە ڕۆشتەدواوە و بەر دیواری ئاڵفی ژوورەکە کەوت. کاتێك دەرگاکە کرایەوە، کۆمەڵێك ژنم بینی کە لە پشت دەرگا وەستابوون. دوو نەفەر ڕەش پێست کە بە ڕم و خەنجەر چەکداربوون هاتنەژوور و لەم لاولای ژوورەکە وەستان و ئەوسات ژنێکی باڵابەرز، خۆش ئەندام و جوان هاتە ژوور و بە چاوە شەهلاکانی لە چەپ و راستی ڕووانی و سەیرێکی من و یوری کرد.

کاتێك نیگام بەر نیگای کەوت دەتوت دەستیان لە کارەبا داوم و کارەبا بە لەشمدا تێدەپەڕێت. لەرزینێکی کەم بەڵام بەردەوام هەموو گیانمی داگرت. چاوە جوانەکانی نیگایەکی جوانتری بوو کە هەر پیاوێکی دەلەرزاند چ بگات بە من کە توانای ڕۆحی خۆم بەکەمتر لە پیاوانی تر دەزانی و بەردەوام لەبەرانبەر ژنە جوانەکان لاوازبووم.

زۆر زوو تێگەشتم ئەو سەرۆکی هۆزە. نەمدەتوانی چاوی لێ هەڵبگرم.

هێشتا سەیری یەکمان دەکرد کە کتوپڕ ڕووی خۆی سوڕاند و بە یەکێك لە ڕەشەکان شتێکی ووت و ڕۆشتەدەر. ژنانی تریش بەدوایاندا ڕۆشتن تەنیا ئەو دوو ڕەش پێستە مانەوە کە یوری ووتی بۆ بردنی ئێمە وەستاوون. منیش جلەکانم پۆشی و هاوڕێ لەگەڵ یوری تفەنگم بەدەستەوە گرت و ڕۆشتم. ڕەشەکان بە نەرمی و میهرەبانیەوە ڕێنوێنیان کردین تا گۆڕەپانێکی گەورە کە لەپشت ڕیزێك لە ماڵەکانەوە بوو. لەوێ ئەو ژنە لەسەر تەختێکی گەورە لەسەر دار دانیشتبوو.

ئێمەیان لەوێ دانیشاند و وتووێژی ئەوان دەستی پێکرد. یوری بە هێواشی بە منی ووت.

ئەمانە بەپێی نەریتێکی کۆن لەبارەی دیلەکانی خۆیان کۆبوونەوە ئەنجام دەدەن. ئێستا سەبارەت بە ئێوە قسە دەکەن.

و دوای چەند خولەك کە دەنگی ژنان بەرزبوویەوە و هەرایەك دەستی پێکرد یوری ووتی: هەمووان دەنگیان دا ئێوە ببنە غولامی سەرۆك و پەیوەستی ئەو بن.

چەند خولەکێکی تر ڕا و بۆچونیان گۆڕیەوە ئەم جارەیان سەبارەت بە یوری قسەیان دەکرد و کاتێك دەنگیان داو هەڵبژاردنیان کرد یوری بەر کچێکی جوان کەوت. کچەکە بە ڕاکردن خۆی بە یوری گەیاند و خۆی فڕێدایە باوەشی.

یوری لە دوایین سات کە لەگەڵ هاوسەرەکەی دەڕۆشتە پشت ماڵەکان قیژاندی و ووتی: سەرۆك لەباوەشی بگرن، نەریتیان وایە.

بەخێرایی لەسەر دەست بەرزم کردەوە، بە پەنجە ماڵێکی گەورەی نیشاندام و تێگەشتم کە دەبێ بۆ ئەوێ بڕۆم. بەهەمان شێوە کە لەسەر دەستم بوو بەڕێکەوتم و ڕۆشتمە ژوور. کاتێك ڕۆشتمە ژوور، پیاوێکی ڕەش پێست کە ڕوخسارێکی پەرێشان و بەیەکدا دراوی بوو هاتە دەر.

ئەو کاتە نەمناسی، بەڵام دواتر تێگەشتم کە ئەو کاری منی ئەنجامداوە و کاتێك من هەڵبژێردرام کارەکەی لە دەست داوە و بەپێی یاسا دەبێت لە ماڵی ژنەکە بڕواتەدەر. ئەگەر کەس ئەوی نەویستایە، زەمانی مەرگی هاتبوو و بەیانی ئیعدام دەکرا.

ڕەشی ئاماژەپێدراو بە ڕق و تووڕەییەوە سەیری کردم و زانیم نەخشەیەکی مەترسیداری بۆ کێشاوم. لەگەڵ ئەوەشدا گوێم پێ نەدا و هاوسەرە جوانەکەم لەسەر دۆشەکێکی ئەتڵەس دانا و خۆشم لەبەردەمیدا کەوتمە سەرچۆك.

سەرەتا لە چارەنووسی خۆم نوقمی چێژبووم. دواتر ترسی ئەوەی خوازراو و نەخوازراو یەکیتر جێگەم دەگرێتەوە و منیش وەك ئەم ڕەش پێستە لەم ژوورە دەکرێمە دەر، پشتی لەرزاندم.

ئێستا دەمبینی ئەوەی لەبارەی ژنانی وەحشی ئامازۆن بیستبووم و خوێندبووم ببووە ڕاستی... موو بە موو یەك بەیەك دێتە دی، کەوانی مەرگی من و یوریش ڕۆژێك دێتەدی.

بیستبووم ژنانی ئامازۆن کاتێك لە پیاوێك تێر دەبن دەیکوژن، ئایا منیش

دەکوژن؟.....

ئەم هزرانە دەیترساندم و بیری پێ دەکردمەوە، یەك خولەك کەلە روخسارە جوانەکەیم دەڕوانی، نوقمی ئەم فکرانەبووم بەڵام بە شادمانیەوە ئەو نەیهێشت زیاتر لەمە بیربکەمەوە و بزەیەکی گرت.

نزیکەی ٢٤ کاتژمێر من و ئەو لەو ژوورە کە لە هەموو ژوورەکانیتر گەورەترو جوانتربوو ماینەوە و نەهاتینەدەر. ئەوەندە چێژم بردبوو دەمویست هەر لەوێدا بمێنم بەڵام ڕەسم و نەریتەکانی هۆز زیاتر لەمە ڕێگای نەدەدا. دوای ٢٤ کاتژمێر وەرزێکی تر دەستی پێکرد.

بەپێی نەریتێکی کۆن کاتێك سەرۆکی هۆز پیاوی دڵخوازی دەست دەکەوت و دەبووە هاوسەری جم و جوڵێك لەناو دانیشتوانی هۆز دەردەکەوت و کاتێك من و ئەو لە ژوورەوە بووین دانیشتوان سەرقاڵی ڕابواردن و خۆشی بوون بەڵام من خەبەرم نەبوو.

کتوپڕ بە دەنگە دەنگی زۆر هاتمە خۆم و لە خەوی چێژ بەخشی ٢٤ کاتژمێری خۆم بەئاگاهاتمەوە. ڕاستی بیرم چوو باسی بکەم.. ئەو پێش هەر شتێك ناوی ڕاستەقینەی خۆی بە من ووت. ئەم بابەتەی زۆر بەدژواری تێگەیاندم و من بەو خوێندنەوانەی لەسەر هۆزە جیاوازەکان بووم و رستەی زمانە وەحشیەکانم دەزانی، لە مەبەستەگەی گەشتم. ناوی ئەو ( موناك ) بوو و دواتر زانیم موناك لە زمانی ئەوان بە مانای داری گوڵی یاسە. بەڕاستی ئەو گوڵی یاس بەڵکو جوانترو خۆش بۆنتر لە گوڵی یاس بوو.

بە بیستنی دەنگی تەپڵ و قەرەباڵغی دانیشتوان، بەپەلە لای ئەو هاتمەخوارو سەری موناك کە لەسەر سینەمدابوو، لەسەر زەوی دامنا، ئەو ترسی لە چاوەکانی من خوێندەوە و چوونکە هەر چەند سات جارێك ئەم دیمەنە بۆ ئەو دووبارە دەبوویەوە، قاقایەکی بەرزی کێشا. لە تەختەکەی دابەزی و سەری لەسەر سینەم داناو بە جووڵەکانی خۆی منی دڵنیاکرد شتێکی گرنگ نیەو لەگەڵ ئەوەشدا تێیگەیاندم کە منی خۆش دەوێت و دەتوانم بە عەشق و خۆشەویستی ئەو دڵگەرم بم. کاتێك من و ئەو لەناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابووین و من دەستم بە پرچەکانیدا دەهێنا، دەرگاکە بەتوندی کرایەوە و ژنێك کە دەتوت پیرترین ژنی هۆزەکەیە هاتە ژوور و دەرگاکەی لە پشت سەری خۆی بەست. موناك بە بینینی ئەو منی بەردا و ڕاست و ڕێك وەستا. منیش وەك ئەو. پیرێژن کە قاپێکی تەختەیی لەدەستدا بوو هاتە پێش و دەستە چرچەکانی خۆی کردە ناو شلەمەنیەکی سەوز ڕەنگی خۆش بۆن و چەند هێڵێکی

ڕاستی لە ڕوخساری موناکدا کێشا و دواتر هەمان کردەوەی لەسەر ڕوخساری من ئەنجامدا.

پیرێژن وێردی دەخوێند لەگەڵ ئەوەشدا لەتەواوی ئەو ماوەدا بزە لەسەر لێوە ژاکاوەکانی دوور نەدەکەوتەوە و دەم و ڕوخساری پێدەکەنی.

دوای ئەنجامدانی کارەکەی لە ژوورەکە ڕۆشتەدەر، بەڵام دەرگاکەی دانەخست. لە بەینی دەرگاکەوە بینیم هەموو دانیشتوانی هۆز لەگەڵ ئەو چەند پیاوەی لەناویاندا بوون، هەرکام شتێکیان لە دەستدایەو شادمانی خۆیان دەردەبرن. پیرێژن قاپە تەختەییەکەی دایە دەست یەکێك لە پیاوە ڕەش پێستە چەکدارەکان و لە یەکێتر لە پیاوەکان تیرو کەوانێکی وەرگرت و هاتەژوور. بەدوای ئەودا چەند کەس لە ژنەکان هاتنەژوور و هەرکام شتێکیان لە دەستدابوو بە ڕێزەوە دایاننا و ڕۆشتنەدەر.

پیرێژن تیروکەوانەکەی ڕوبەڕوی من گرت و هەندێ شتی ووت کە من تێنەگەشتم. دواتر لە دەرگای ژوورەکە تیروکەوانێکی تر کە دیاربوو هی مووناك و تایبەتە بەخۆی هەڵیگرت و دایە دەستی. خەنجەرێك و ڕمێك سیلاحەکانی تری من و ئەو بوو.

ناڕەحەت بووم بۆ زمانیان نازانم و لە مەبەستەکانیان ناگەم.... ئەگەری هەبوو بەهۆی نەزانین و بێ ئاگایی کردەوەیەکی پێچەوانە لە من سەربدات و کارەکەم خراپ بکات. دڵم دەکولاً و پەرێشان بووم کە کتوپڕ یوری لەبەردەم دەرگاکە دەرکەوت و دوای ئەوەی بەڕەسمی خۆیان سڵاوی کرد و دەستی تا سەر زەوی هێنایە خوار بەوپەڕی ڕێزەوە لەوێدا وەستا.

بە ئیشارە مەبەستەکەی خۆم لە یوری گەیاند و یوریش هاتە پێش و شتێکی بە مووناك وت کە من تێنەگەشتم. مووناك بەسەر ئیشارەیەکی کرد و دواتر یوری هاتە لای من و بە هێواشی ووتی:

هیوادارم خراپتان لێ نەگوزەرابێت... ئێستا لەگەڵ هاوسەرەکەتان کە سەرۆکی ژنانی ئامازۆنە دەڕۆنە ڕاوی پڵنگ... ئەم سیلاحانە بۆ ئەو مەبەستەیە. کەسێك کە دەبێتە هاوسەری سەرۆکی هۆز دەبێت بووێرو ئازا بێت و لانی کەم بتوانێت بە تەنیایی پڵنگێك ڕاو بکات. بۆیە لە ئێستاوە ئێوە و خاتوون دەڕۆنە جەنگەڵ و شەو و ڕۆژ لەوێ دەبن و دوای هەفتەیەك بە پڵنگێك دەگەڕێنەوە.

بە بیستنی ناوی پڵنگ و ڕاوی پڵنگ ڕەنگ بە ڕوخسارمەوە نەما و وەك بڵێی هەر ئێستا ڕوبەڕوی پڵنگێك بوویێتمەوە ئەژنۆکانم کەوتە لەرزین و پشتم لە ئارەقدا خوسا.

لەگەڵ ئەوەشدا بەرووی خۆم نەهێنا و ووتم:

ئەگەر نەمتوانی پڵنگ ڕاوبکەم چی دەبێت...؟

هیچ... یەکێك لە تیرەکانی خاتوون لەدڵی ئێوەدا جێگە دەگرێت و مووناك تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ناو هۆز و بە هەمووان دەڵێت کە ئەو شیاو نەبوو بۆ ژیان لەگەڵ من. بۆیە ئەوم کوشت.

لە کاتێکدا دەنگم دەلەرزی بە هێواشی بە یوریم ووت:

ئەمە چ ڕەسمێکی شێتانەیە ! نامەوێت مێردی سەرۆکی هۆز بم... ئەمە چ بارودۆخێکە....

یوری دەستی لە گاڵتە هەڵنەدەگرت، سەری لە گوێچکەم نزیك کردەوەو ووتی:

ئەمە بەحەزی ئێوە نیە بتانەوێت یان نا..... مووناك ئێوەی پەسەند کردوە.... ئەمە بەسە...

ئەوەش بزانن بەهاکەتان لەوەدایە کە سپی پێستن و گەرنا لەگەڵ پیاوانی تردا جیاوازنین.

لەم کاتەدا ڕەنگم پەڕا و دەمم لەترس و تووڕەییدا وشك ببوو، ڕێوڕەسمی مەزهەبی کۆتایی هات و پیرێژن دەرگاکەی کردەوەو بەجوولاندنی دەست و سەر لە ئێمەی گەیاند کاتی ڕۆشتنە.

نەمدەتوانی هەنگاو هەڵبگرم بەڵام یوری کە لای من وەستابوو دەستی لەسەر پشتم دانابوو و بۆ پێشەوە پاڵی پێوەنام و ووتی:

مەترسن..... خوا یارمەتیتان دەدات...

بەهەر دژواریەك بوو بەڕێکەوتم و بە دوای مووناك و لەناو چەپڵەو قاوەقیژی دانیشتوان لە گۆڕەپانی هۆز تێپەڕین. گێژبووم و وەك ئەوەبوو گوێچکەکانم هیچ نەبیستن. دەنگی قیژەی ژنانم نەدەبیست و شادی و خۆشی ئەوانم نەدەبینی تەنیا سەرقاڵی خۆم بووم و بەس.

لەولای گۆڕەپان کە لە قەراغ جەنگەڵەوە نزیك بوو یوری بۆ ساتێك ون بوو و دواتر لە کاتێکدا تفەنگەکەمی لە دەستدابوو گەڕایەوە. لە شادمانیدا دەمویست بقیژێنم و سەما بکەم. لای خۆم ووتم:

بیری تفەنگەکەم نەبوو... ئەحمەق بووم کە دەترسام... تا تفەنگ هەیە خەمم نیە.. لە دێویش ناترسم. یوری تفەنگەکەی دایەدەستم و دەستمی گوشی وماڵئاوایی کرد.

دواتر مووناك دەستمی گرت و منی بەدوای خۆیدا بردە جەنگەڵ و یەك خولەك دواتر لەناو چڕی دارەکاندا ون بووین و دەڕۆشتین.

هەندێك لە دیمەنەکانی ژیان مرۆڤ ناتوانێت بیریان بکات.

ئەم دیمەنانە جوانن و هەندێ کات قێزەون. هەندێ جار لەبەر شیرین بوونی بیرەوەریەکانی لەبیرناکرێت و هەندێ جار لەبەرئەوەی زۆر تاڵ و ناسازگارە.

کاتێك من و مووناك دەست لەناو دەست رۆشتینە ناو جەنگەڵ، هەستم کرد یەکێك لەم دیمەنە لەبیرنەکراوانەی ژیانم دەست پێ دەکات جەنگەڵ سەر سەوز و رۆح پەروەر بوو. شاخ و گەڵای سەوزی دارەکان لەیەك ئاڵابوون و لەسەر رێگەیەکی باریك کە لە ناودارەکانەوە تێدەپەڕی سێبەری خستبوو.

دەستی مووناك لە دەستی مندا بوو رێگەمان دەبڕی. نزیکەی کاتژمێرێك بەم شێوە رۆشتینە پێش، دووریەکی زۆر لە هۆز دوورکەوتبووینەوە، گەشتینە رووبارێکی پان، ئاوێکی خرۆشاوی بوو. دەوروبەری رووبار بەگیا بەرزەکان داپۆشرابوو. گیای وەحشی، پێچ پێچ و لەناویەك. مووناك وەك نەزانێکی وەحشی هەڵبەزودابەزی دەکرد، پێدەکەنی و رایدەکرد، لێرەدا وەستاو خۆی فرێدایە سەر گیا نمدارەکانی قەراغ رووبار و منیشی لەپاڵ خۆیدا راکێشا.

لەوکاتەدا خۆم بە بەختەوەرترین پیاوی دنیا دەزانی. مووناك سەری خۆی خستە سەر ئەژنۆم و دەستی بە فێرکردنی زمانەکەی خۆیان بە من کرد.

بە دژواری ووشە و رستەکانی تێدەگەیاندم و ماناکانی بە ئیشارە دەووت و من بە پێشینەیەك کە لە ریشەی زمانەکەی ئەواندا هەمبوو، بەیارمەتی سروشتی خۆم لە مەبەستەکانی تێدەگەشتم و ماناکەیانم لەبەرکرد.

ئەو شتانەی فێری کردم، عەشق، ژن، مێرد، شەو، رۆژ، منداڵ و راو بوو. ئەو پێی ووتم دەبێت منالی باشم پێ بدەیت و تێی گەیاندم منالەکانمان دەبێت کچ بن..... دەبێت سپی پێست بن تا زیندوو بمێنن.

بەم شێوەیە کەم کەم قسەکردن لەگەڵ ئەودا فێربووم و هەرچەندە زیاتر تێکەڵاوی دەبووم زیاتر ئارەزومەندی دەبووم. زمان فێرکردنی من لەناو گیاکان زیاتر لە دوو کاتژمێری خایاند تا ئەوەی هەردووکمان هەستمان بە برسیەتی کرد.

مووناك لە شوێنەکەی من هەستاو تیروکەوان و رمەکەی بە مندا و ووتی:

راوبکە، نان بخۆین.

بۆیەکەم جار لەمانای قسەکانی بەبێ دژواری گەشتم و دەست بەجێ ڕۆشتمە ناودارەکان. دەستم بە ڕاوکرد مووناك لە ئامادەنەبوونی بۆ ئامادەکردنی شوێنی گونجاو و کۆکردنەوەی چیلکە بۆ برژاندن سەرقاڵ بوو. لێرەو لەوێ، سەروخواری دارەکان بەدوای باڵندەو گیاخۆری شیاوی خواردن گەڕام و بەم شێوەیە مەودایەکی زۆر لە مووناك دوورکەوتبوومەوە کە کتوپڕ لەبەردەم من چەند قرقاوڵی گەورە هەستان و هەڵفڕین. ئەگەر دەمویست بە تیروکەوان ڕاوبکەم چەند چرکەیەکی پێدەچوو قرقاوڵەکان دەڕۆشتن، بۆیە بێ دەرنگ ڕمەکەم لە دەستمدا بە نەرمی بەڵام بە بەهێزی بۆ دەستەی قرقاوڵەکان هاویشت. ڕم هەوای بڕی وڕۆشتە پێش، کەوانێکی بەرزبوونەوەی پێواو لەکاتی دابەزین لە پشتی قرقاوڵێك ڕۆچوو، لە سینەی هاتەدەر و کەوتە سەرزەوی. قرقاوڵەکان پەرێشان و بڵاوەیان لێکرد بەڵام چوونکە شاخ و گەڵای دارەکان زۆر چڕبوو نەیاتوانی زۆر دوورکەونەوە، بۆیە من تیروکەوانەکەم ئامادەکرد و یەکێکیتر لە قرقاوڵەکان کە لەسەر دارێك هەڵنیشتبوو نیشانەم گرت.

قرقاوڵەکان بۆ تێرکردنی سکی پێنج شەش کەس بەس بوو، هەڵم گرتن، ڕم و تیرەکەم پاك کردەوە و بەسەرکەوتوویی بۆ لای مووناك گەڕامەوە. هێشتا بۆ بەستێنی ڕووبار زیاتر لەسەد مەترم مابوو کە تیرێك لەپەنا گوێمەوە ڕۆشت و بەرداری لای چەپی جەستەم کەوت. سەری خۆم کێشایە دواوە و قرقاوڵەکانم فڕێدا. بە ڕەنگێکی پەڕاو لە کاتێکدا ڕمەکەم لە دەستمدا فشاردەدا بەم لاولادا گەڕام بەڵام چوونکە ڕکەبەرم نەبینی ترسام نەکا دووبارە بمکاتەوە بەنیشانە. بێدەنگی چواردەوری گرتبووم. تەنیا لە دوورەوە دەنگی خرۆشانی ئاو و شەپۆلەکان بەگوێ دەگەشت. دەورووبەرم جیاواز لە دارەکۆنەکان بەگیا بەرزەکان دەورەدرا بوو. بەرزی گیا وەحشیەکان ئەوەندە بوو مرۆڤێك دەیتوانی بەناویاندا ڕێبکات. دڵنیابووم دوژمنەکەم لەناو گیاکاندایە چوونکە تیرەکە جۆرێك لە دارەکە ڕۆچبوو نیشانی دەدا لە خوارەوە هاوێژراوە.

چاوی خۆم بڕییە گیاکان کە لەناکاو هەستم کرد بەشێکی دەجووڵێتەوە. هەنگاوێك ڕۆشتمەپێش خشەخش بەرزبوویەوەو جوڵەی گیاکان زۆرتربوو. ئێستا دڵنیابووم ئەو لەوێدایە. ڕمەکەم ئامادەکرد لەسەر دەست ڕام گرت بەڵام نەمهاویشت چوونکە لەم کاتەدا ڕەشێکی چوارشانە، ئەو ڕەشە کەوتم پێشتر مێردی مووناك بوو زەق زەق لێی دەڕوانیم، لەناو گیاکان هاتەدەر و هێرشی کردەسەرم لێدان و شەڕێکی توند دەستی پێکرد ئەو چەکداربوو بەڵام ڕمەکەی فڕێدا. منیش ڕمەکەم فڕێدا خەنجەری کێشا،

منیش خەنجەرەکەم لە کەمەرم دەرهێنا و بەربووینە گیانی یەك.

بە ڕواڵەت وا دەردەکەوت من دەبەزێم و دەکوژرێم بەڵام لەیەك ئالاین. زۆر شادمان بووم چوونکە هەستم کرد بە هەموو بەهێزی خۆی و ئەو قیافە زلە، لاوازە و تەکنیکەکانی شەڕی دەستەو یەخە نازانێت و من بە پێچەوانەوە تەکنیکی زۆرانبازی لە زانکۆ فێرببووم.

زۆر بەخێرایی خەنجەرەکەم لە دەستی دەرهێناو فڕێمدا، خۆیشم خەنجەرەکەم فڕێدا چوونکە لە جوامێریەوە دووربوو لەگەڵ ڕکەبەرێکی بێ چەك، بە چەکەوە شەڕبکەم. لەم کاتەدا کە من و ئەو دەتلاینەوە و هەندێ کات ئەو لەسەر سکی من و هەندێ کات من لەسەر سکی ئەو جێگەم دەگرت، مووناك نزیك بوویەوە.

چاوەکانی دەبریسکایەوە، لەوەی دەیبینی دوو کەس لەسەر ئەو شەڕدەکەن چێژی دەبرد. هەستی لە خۆڕازی بوونی ژنانەی بزواو نوقمی چێژبوو. بە چێژێکی زۆرەوە لەم دیمەنەی دەڕووانی و دەیویست لە ئاستی هێزی بازووی من ئاگادار بێتەوە.

کاتێك چاوم پێی کەوت هێزێکی تازەم لە بازوانی خۆمدا هەست پێکرد و بەهێرشێکی تازە ڕەشەکەم لەپێ خست قورگیم لە چنگ گرت و ئەوەندەم گووشی تا خنکاو قاچی سست بوو، دواتر مرد.

سەرکەوتوانە بەڵام ماندوو و خوساو لە ئارەق لەسەر جەستەکەی هەستام و هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی کێشا بەڵام مووناك کە لە سەرکەوتنی من زۆر شادمان بوو هاتە پێش و دەستی لە ملم ئاڵقەکرد.

قرقاوڵەکانمان هەڵگرت و بەرەو شوێنێك کە مووناك ئامادەی کردبوو گەڕاینەوە و بە چاك کردن و برژاندنی قرقاوڵەکان سەرقاڵ بووین.

مووناك بە لێزانینێکی سەیر قرقاوڵەکانی لە شیش دا، کەبابی کرد و خواردمان. چ خواردنێك بەتام و سازگار هیچ کات خواردنێکی بەوخۆشیەم نەخواردوە و نایخۆم.

دوای خواردن مووناك جارێکیتر سەری لەسەر سینەم داناو خەوت. منیش چاوەکانم قورس ببوو خەوم لێکەوت کاتێك کە لە خەو هەستام بینیم مووناك لای من نیە. لە چەپ و ڕاست و سەرو خوارم ڕووانی بەڵام موناك دیار نەبوو. هەستام سەرپێ و زیاتر گەڕام و لەوکاتەدا لەوپەری خۆشحاڵیدا خەڵخاڵ و بازوبەندەکەی مووناکم لە چەند هەنگاوی خۆمدا بینی و زانیم بۆ مەلەکردن ڕۆشتۆتە ڕووبار.

لەناو شاخ و گەڵای دارەکان ئەوم بینی لەسەر تاشەبەردێك کە دەڕوانێتە سەر ڕووبار

وەستاوە و ئامادەیە خۆی فڕێداتە ناو ئا.و مووناك بە جوانترین شێوە خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە. لە دەوروبەری چەند شەپۆلێکی بچووك دروست بوون و لەبەرچاو ون بوون.

بەڕاستی لە خۆفڕێدانی بۆ ناو ئاوەکە سەرم سوڕما، هەرکەس لە جیاتی من بووایە سەری سوڕدەما چوونکە مووناك بەوردی و بە لەبەرچاو گرتنی یاساکانی مەلە و پەڕین، دوو قاچی کێشا بە تاشەبەردەکەدا و وەك باڵندەیەکی باڵ سووك بەرزبوویەوە و بەجووڵەیەکی خێرا خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکە. بەشێوەیەك رۆشتنە ناو ئاوەکە کە لە دەوروبەریدا تەنیا چەند شەپۆلێکی بچووك و گەورە دروست بوو و هیچ دەنگێك بەرز نەبوویەوە.

لەم بیرانەدابووم. لەوەی مووناك لە چ کەسێك یاسای مەلەکردن فێربووە، بیرم دەکردەوە کە لەناکاو هەستم کرد مووناك هێشتا لە ئاو نەهاتۆتەدەر. چرکەکان بەدوای یەکدا تێ دەپەڕین و دەتوت لەسەر دڵی من بەردی قورسیان کەڵەکە دەکرد. هەرچرکەیەك کە تێدەپەڕی نیگەرانی و پەرێشانی من زیاتر دەبوو.

یەك دوو، سێ، پێنج، دە، یانزە رەنگە بیست چرکە تێپەڕی و مووناك لە ژێر ئاو نەهاتەدەر. زۆر ترسام و ئەم بیرەم لا دروست بوو رەنگە ڕۆشتنە خواری مووناك لەناو ئاوەکەدا زۆر بووە و سەری لە ژێر ئاوەکە بە گیا و قوڕاو گیری کردوە و یان تووشی قرشە مرۆڤ خۆرەکان بووە... چ بەدبەختیەکی گەورە... دڵم بەخێرایی لێیدەدا ڕەنگم پەڕا، هەموو گیانم کەوتە لەرزین و بێ ئیرادە وەك ئەوەی کارەبایان لێمدابێت لە شوێنەکەم بەرزبوومەوە بەرەو ڕووبارەکە ڕام کرد..... بەڵام دەمتوانی چی بکەم.

جل و بەرگم لەبەردابوو ئەگەر دەمویست کاتی خۆم بۆ دانانیان بەفیڕۆبدەم کات لەدەست دەڕۆشت و مووناك دەخنکا و دەمرد.

کاتێك گەشتمە لای ئاوەکە دەلەرزیم و ئارەق لەسەر روخسارم دەباری... گوومان و دوودڵیم زیاتر لە دوو سێ چرکەی نەخایاند و بەخێرایی بەجل و بەرگەوە خۆم فڕێدایە ناو ئاوەکە.

جلەکانم تەڕبوو و بەجەستەمەوە لکا. لکان و قورسی جلەکانم ئەوەندە زۆر بوو کە لە سێ چوار مەتریدا بازووەکانم هیلاك بوون نزیك بوو وەگەڕێم بەڵام زەختم لەخۆم کرد و کاتێك بە تەواوی گەشتمە ژێرئاو و دەستم بەڕیشەی دارێکی ئاویەوە گرت چەند ساتێ حەوامەوە. ئاو ڕوون بوو بە ئاسانی چاوی خۆم کردەوە و دەوروبەری خۆمم بینی. تا چەند مەتر ئەولاتر هیچ هەواڵێك لە مووناك نەبوو. بۆیە بڕیارمدا بە مەلەکردن لە ژێرئاو

خۆم بگەیەنمە ئەو خاڵەی ئەو تیایدا ڕۆچبوو بەداخەوە هەناسەم سواربوو و ناچار بەخێرایی خۆم گەیاندە سەرئاوەکە، سیەکانم پڕکرد و دووبارە ڕۆشتمە ژێرئاو.

چەن جارێك ئەم کارە دوبارەبوویەوە لە موونات هەواڵێك نەبوو. لەخەم و پەژارەدا دەمویست بقیژێنم و کاتێك دوایین جار هەموو شوێنێکی ڕووبار گەڕام نەمدۆزیەوە بە خۆمم ووت:

من خۆشم دەویست...... لەلایەکیتر بە مردنی ئەو گەڕانەوەم بۆناو هۆزەکە ئەگەری نیە، خۆم دەکوژم. بەم حاڵە پەرێشانە هاتمە سەرئاو و بەم بڕیارە کە خۆم بکوژم بەڵام... لەم کاتەدا هەستم کرد لە چەند مەتری لای ڕاستی من ئاو دەجووڵێتەوە و شتێك بەخێرایی هاتە سەر ئاو و دەڕۆشتەخوار نەمزانی چی بوو گوومانم برد قرش بێت.

بەخێرایی سیەکانم پڕکرد لە هەواو لەولایەدا ڕۆشتمە پێش جوان بەردەمی خۆم سەیرکرد. لەناکاو هەستم کرد شتێکی گەرم و لوس بەر ڕوخسارم کەوت و بەخێرایی لەسەر سەرمەوە تێپەڕی سوڕان لەناو ئاودا بە دژواری ئەنجام دەدرێت لەگەڵ ئەوەشدا قاچم تەکاندا و سوڕام. لەم کاتەدا موووناکم بینی وەك ماسیەکی زرنگ بەدەوری مندا دەسوڕێت و هەندێ کات لە من نزیك دەبێتەوە و دەستی بە ڕوخسارمدا دێنێت.

لە تووڕەیی و لەوەی تا ئەم ئەندازە منی نیگەران کردبوو بە مەلەکردن بەدوایدا ڕۆشتم بەڵام چوونکە ئەو ڕووت بوو من جل و بەرگم لەبەردابوو، پێشم کەوت و خۆی گەیاندە سەرئاوەکە. منیش بەدوایدا هاتمە سەر ئاو. کاتێك سەرم لە ئاوەکە دەرهێنا دنیایەك ڕق و تووڕەیی لە چاوەکانم دەباری بەڵام موونات لەگەڵ ئەوەی چاوی بە من کەوت پێکەنی و ئەوەندە قاقای کێشا نزیك بوو ببوورێتەوە. بە ئاسوودەیی لە ئاوەکە هاتمەدەر و سەرقاڵی وشك کردنەوەی جلەکانم بووم. موونات هێشتا مەلەی دەکرد و هەرکات لە قەراغ نزیك دەبوویەوە دەستەکانی پڕ دەکرد لە ئاو و دیپرژاند بە سەرو چاومدا و دەگەڕایەوە ژێر ئاوەکە.

کاتژمێرێك دواتر هیلاك و ماندوو کەلە مەلە ئاسوودەبوو، هاتەدەر ئەوەندە هیلاك بوو نەیدەتوانی بە ڕێگادا بڕوات و چەند مەترێك ئەولاتر لەسەر گیا نەرمەکاندا ڕاکشا. کاتێك سەبارەت بەوەی بۆچی منی نیگەران کردوە بەدژواری و ئیشارە پرسیارم لێکرد لە وەڵامدا پێکەنی و ووتی:

بۆ ئەوەی بزانم منت خۆش دەوێت یان نە ! کاتێك خۆت فڕێدایە ناو ئاوەکە من لەناو گیاکاندا خۆم داشاردبوو. بە باوەڕی من ژن هەمیشە و لەهەموو شوێنێکدا ژن و هەموو

ژنانی دنیا، چ وەحشی و چ نیوە وەحشی و چ پێشکەوتو تایبەتمەندی وەك یەکیان هەیە و لەلایەکیتر فێڵ و کەڵەکەی ئەوان هاوشێوەیە فێڵی ئەو بۆ دۆزینەوەی خۆشەویستی من بەرامبەر بەخۆی رەنگە لە ژنێکی شارنشین سەیر نەبێت.

سەرم سوڕما بەڵام دواتر کە خوێندنەوەم بۆ زۆربەی دانیشتوانی هۆزی ژنە وەحشیەکان کرد زانیم لە بابەتە سەرەکیەکانی ژیان لە نێوان وەحشی و شارنشین جیاوازی نیە.

بەهەرحاڵ، رێکەوتی ئەو رۆژە و ترسێك کە من بەشێوەیەکی سروشتی لە نەهاتنە سەری ئەو لەژێر ئاو لە خۆم دەربڕی، خۆشەویستی ئەوی بۆ من گەیاندە ترۆپك و جێگەیەکی گونجاوی بۆ من لە دڵی ئەودا کردەوە.

ئەو رۆژە من و مووناك لە سەرگیا نمدارەکانی قەراغ رووبار خەوتین و کاتێك هەتاو ئاوا بوو و جەنگەڵ لە تاریکیدا رۆچوو، لە خەو هەستاین.

بەم شێوە هەرچەندە ئاشنایەتی من و ئەو زیاتردەبوو باشتر تێدەگەشتم کە ئارەزوومەندی منە و رەنگە تا ئەوسات ئەم حەزەی بەرامبەر بە هیچ پیاوێك نەبوو بێت و دەری نەبڕیبێت.

ئاوابوونی خۆر تفەنگەکەم هەڵگرت تا بۆ ئامادەکردنی خواردن بڕۆمە جەنگەڵ بەڵام ئەو نەیهێشت و سوور بوو کە خۆی ئەم کارە ئەنجام بدات. ئەو سووربوو خۆی بۆ راو بڕوات و من لەو شوێنەدا بمێنمەوە و لەشوێنی خۆم نەجوڵێم. هەڵبەت ئەوسات زۆر گرنگیم بەم بابەتە نەدا بەڵام دواتر کە زانیم چەندین پیاو بوونە قوربانی هەوەسەکانی ئەو، گرنگی سووربوونەکەی ئەوم بۆ دەرکەوت و زانیم بە ڕاستی عاشقم بووە.

ئەو شەوە تێپەڕی، شەوەکانی تریش بەسەرچوون و سەرئەنجام هەفتەیەك من و مووناك سەرکەوتوانە رێگەی هۆزمان گرتەبەر بەڵام هێشتا پڵنگمان راو نەکردبوو، لەرێگادا بە مووناکم ووت: بۆ پڵنگ چی بکەین.

ئەو سەری تەکاندا و ووتی: بەیانی دەتبەم بۆ شوێنی ژیانی پڵنگەکان، شێری زۆریشی لێیەو تۆ دەتوانی بە سانایی پڵنگێك راو بکەیت.

بیر هێنانەوەی ئەم خاڵە پێویستە کە لەو چەند رۆژەدا کەم کەم زمانی ئەوان فێربووم و لەکۆتاییدا کەم تا زۆر دەمتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم. ئەمەیش ببووە هۆی سەرسوڕمانی ئەو و دەیوت بەم خێراییە ناتوانێت زمانی ئێمە فێرببێت.

ڕۆژی ئاخر، بەیانی زۆر زوو مووناك منی لەناو جەنگەڵێکی تاریك تێپەڕاند و بردمیە

شوێنێك کە زیاتر لە کوێستان دەچوو تا جەنگەڵ. زەوی ناڕێك و بەرزو نزم بوو، هەندێ شوێنی لە ئاوی ڕووبار نزیك زیاتر لە سەد مەتر بەرزایی بوو هەندێ شوێنی ئەوەندە قووڵ بوو ئەگەر بکەوتینایە تیکە تیکە دەبووین. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شوێنێك نمدار و هەموو شوێنێك بە داری کۆن و ئەستوور و گەورە داپۆشرابوو.

ئاو و هەواکەی جۆرێك بوو لە درزی بەردەکانی کوێستانیش گیا سەوز ببوو.

لێرەدا بوو مووناك پێی ووتم ئێرە پڵنگی زۆرە. بە پێی یاسا تۆ دەبێت من لای ڕووبار بەجێ بێڵیت و بێیتە ئێرە و پڵنگێك ڕاو بکەیت و بگەڕێیتەوە.... بەڵام من لەگەڵ تۆدا دێم.

بە خێرایی پرسیم: بۆ...

سەری خۆی داخست و ووتی: حەز دەکەم لەگەڵت بێم، تۆ لەپێشەوە بڕۆ و منیش لە دواوە ئاگام لێتە و دواتر تیروکەوانەکەی دایە دەستم و ڕمەکەی خۆی هەڵگرت. بەڵام من تیروکەوانەکەم پێدایەوە ووتم: ئەم داردەستەم بەسە.

مەبەستم تفەنگ بوو ئەو چوونکە لە شێوەی کاری تفەنگەکە ئاگادار نەبوو، سەری سوڕما و بە دڵنیاییەوە دەستخۆشی لە چاو نەترسی من کرد. گەڕان زۆری نەخایاند کاتژمێرێك دواتر کاتێك من لە کەلێنی کێوەکە دەڕۆشتمە پێش لەناکاو دەنگی پڵنگێك کوێستان و جەنگەڵی هێنایە لەرزە، کە ڕووی خۆم وەرگەڕاند پڵنگێکم لەیەك هەنگاوی خۆمدا بینی. بەخێرایی ڕۆشتمە دواوە و تا ئەو شوێنەی کرا خۆم لێی دوورخستەوە مووناکم نەبینی دەتوت منی ون کردوە. دەبووا پڵنگەکەم بکوشتایە... پڵنگ بە چاوە وەحشی و ترس ئەنگێزەکانی خۆی سەیری دەکردم. تفەنگەکەم لەسەر دەست ئامادەکردبوو. کاتێك دەیویست بپەڕێتە سەر من تەقەم لێکرد گوولەیەکم لە دەستی چەپی پڵنگ داو وردم کرد بەڵام ئەوی لە پێ نەخست و بەڵکو تووڕەیی و وەحشی گەری ئەو ئاژەڵەی زیاتر کرد.

بۆ گوولەی دووەم میلم هێنایەوە بەڵام پڵنگ دەرفەتی پێنەدام لە شوێنەکەی هەستاو وەك کێوێك خۆی دا بەسەرمندا. بە پشتا کەوتم و هەستم کرد ددانەکانی شانمیان هەڵدڕی.

ئازارەکە ئەوەندە زۆر بوو قیژاندم و بێهۆش کەوتم و ئیتر نەمزانی چی بوو.

کاتێك چاوەکانم کردەوە لاشەی خوێناوی پڵنگ لای من کەوتبوو و سەری من لەسەر ئەژنۆی مووناك بوو. ڕمەکەی دەستی مووناك هێشتا لە سکی پڵنگەکە دەبینرا و

دیاربوو ئەو ڕمە ئاژەڵەکەی کوشتووە.

بەشەرمەزاریەوە سەرم بەرز کردەوە و ووتم:

بمکوژە، زووتر بمکوژە تا بەنەریتەکانی هۆزەکەت ئەمەکداربیت.

بزەیەکی گرت ووتی: بەڵێ دەبووا بتکوژم چوونکە نەتتوانی پڵنگەکە بکوژیت و شیاوی مردنیت بەڵام نازانم دەستم بۆ کوشتنت ناڕواتە پێش... کاتێك بێ هۆش بوویت دوو سێ جار خەنجەرەکەم تا سەردڵت هێنایە خوار بەڵام نەمتوانی... تا نەتکوژم. هەرچی دەبێت با ببێت، خیانەت لە هۆزەکەم دەکەم کێشە نیە.

هەندێ کات بۆتان دەرکەوتوە نیگا زمانی هەیە و لەگەڵ مرۆڤدا قسە دەکات و کەسەکە هەرچەندە کەم هۆش هێزی تێگەشتنی نەبێت دەتوانێت تێبگات هەندێ نیگا بە درێژایی ژیانی قسەیان لەگەڵدا کردوە.

من، تۆ، ئێوە، ئەوان و هەمووان بە نیگا لە مەبەستی بەرامبەر گەشتووین. ئەو رۆژە لەبیرنەکراوە نیگای موموناك قسەی لەگەڵ کردم.

لەوکاتەدا ئەم بیرە بەزەینم گەشت لە عەشقی ئەو دەتوانم چ کەڵکێك وەربگرم؟ کەمترین قازانجێك کە لەم عەشقە کراوەیە بەدەست دەهات دواخستنی بڕیاری کوشتنم بوو.

کاتێك پیاوێك بەڕادەی پێویست بۆ دروست کردنی نەوە و مانەوەی بوونی هۆزی ژنان کاریگەر ببوو ئیتر کارێکی لەدەست نەدەهات و دەیانکوشت و لە جیاتی ئەو پیاوێکی تر جێگای دەگرتەوە و هیچ کات ساڵێك زیاتری نەدەخایاند کە پیاوێك دەکوژرا و پیاوێکی تر جێگای دەگرتەوە بەڵام من کە ئەو خۆشی دەویستم ئایا وەك کەسانیتر دەکوژرام؟

لەم بیرانەدا رۆچووم کە موموناك ژێرباڵی گرتم تا لە هەستان لە زەوی یارمەتی دابێتم. خەنجەر تیژو بریسکەدارەکەی لەسەر زەوی کەوتبوو... بە بینینی خەنجەر پشتم لەرزی و بەخۆمم ووت:

خوایە ! سوپاست دەکەم.... تۆ نەت ویست ئەم خەنجەرە تا دەسکەکەی لە دڵی من رۆچێت.

بەهەرحاڵ لە شوێنەکەم هەستام بەڵام هەستم بە شەرمەزاری دەکرد. لاشەی پڵنگەکە لەوێدا کەوتبوو تفەنگەکەی من ئەولاتر. کاتێك بۆ هەڵگرتنی تفەنگەکە نوشتامەوە، ئازارێکی زۆر دایگرتم. شان، بازوو سنگ، سك، گەردن، هەموو شوێنێکی من بەو هێرشە

ناتەواوەی بریندار ببوو و خوێنی لێ دەچۆرا. مووناکیش دەتوت تا ئەوسات گوێی بە برینەکانی من نەداوە و یان ئەگەر گوێیداوە هەستی نەدەکرد تا ئەوەندە قووڵ بێت، هەرچەندە خۆیشم بیرم نەدەکردەوە بریندار بووبێتم، سەرم گێژی دەخوارد نەمتوانی بچەمێمەوە و تفەنگەکەم هەڵبگرم، وەستام، دڵۆپەکانی خوێن لە ژێر جلەکانمەوە دەهاتە خوار و لە دەرلنگی شەرواڵەکەمەوە دەردەچوو، دەتکایە سەر زەوی.

لەگەڵ ئەوەی چاوی مووناک بەخوێنی جەستەم کەوت ڕەنگی گۆڕی. بەئاشکرا حاڵەتی تێك چوو. پەرێشان بوو ئەم پەرێشانیە دەرونیە لە چاوەکانی ڕەنگی دایەوە و زیاتر بووە هۆی هیواداری من. دووبارە بە خۆمم ووت:

ئەگەر شێتانە منی خۆش نەوێت لە بریندار بوونی من تا ئەم رادە نیگەران نابێت.

ژێر بازووی گرتم و تا لای بەردێك بردمی و دایانم و خۆی بە لێهاتووی دەستی بە پێست داماڵینی پڵنگەکە کرد. چەند خولەك دواتر پێستی پڵنگەکەی داماڵی و ڕمەکەی خۆی هەڵگرت و بە منی ووت: بەرێکەوین.....

من ووتم: تفەنگەکەی منیش بەدەست هەڵگرە.

برۆکانی هێنایە یەك وەك ئەوەی لە شتێکی مەترسیدار ترسابێت ووتی:

نا نا، ئەم دار دەستە جادووییە مەهێنەرەوە بۆماڵ، ئەمە هی شەیتانەکانە و دەبێتە هۆی بەدبەختی ئێمە، هەرچی بۆم ڕوونکردەوە و پێمداگرت، رازی نەبوو. دژایەتی کردو ناچار تەسلیم بووم. بەدژواری و کێشە کێش خۆم گەیاندە تفەنگەکە و لەشوێنێکدا شاردمەوە و بەیارمەتی مووناك بەرەو هۆزەکە رێکەوتین. رێگام بەدژواری بڕی، خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆشت. سات بەسات لاوازتر دەبووم. تا کاتێك ماڵەکانی هۆز لەناو دارەکانەوە دەرکەوتن بێهۆش بووم و جارێکیتر کەوتمە سەر زەوی نەمزانی چی بوو و چی ڕوویدا، کاتێك چاوم کردەوە لە ماڵەکەی خۆمان لەسەر ڕاخەرێك لە ئەتڵەس خەوتبووم و سەرم لەسەر ئەژنۆی مووناك بوو.

مووناك پیاوێکی ڕەشی بۆ دەرمان کردنی برینەکانی من دیاری کردبوو و لە بەستنی برینەکانی من یارمەتی دا.

ئازاری رۆحیم هەبوو و ئەم ئازارە رۆحیە کاتێك زیاتر بوو کە بینینم ڕەشەکە لە ژێر چاوەوە سەیری مووناك دەکات لێرەدا ئیتر خۆم نەگرت و ڕەشەکەم لە ژوورەکە کردە دەرەوە.

مووناك بەسەرسوڕمانەوە لە هۆکاری ئەم کارەی پرسی و منیش بە ڕاشکاوی ووتم:

زۆر سەیری تۆی دەکرد.

مووناك سەرەتا وەك ئەوەی سەیرترین شتەکانی بیستبێت، زەق زەق لێمی ڕووانی، ئەوکات دوای یەك خولەك بێدەنگی و بیرکردنەوە قاقای کێشاو ووتی:

ئاه..... تۆ حەسوودی دەکەیت..؟

نەمدەتوانی درۆ بکەم بۆیە ووتم:

بەڵێ حەسوودی دەکەم. جگە لە من کەس مافی ئەوەی نیە تۆ ببینێت و تەنیا کاتێك من مردم و لەناوتانا نەبووم مافی ئەوەت هەیە پیاوێکی تر هەڵبژێریت.

دواتر کە ئەم بابەتەم بۆ یوری باس کرد ڕەنگ بە ڕوخساریەوە نەما ووتی:

خوا ڕەحمی پێ کردویت. سەرم سوڕدەمێنێت چۆن مووناك لەوێدا نەیکوشتویت. تا ئێستا پیاوی زۆری بە بیانووی جیاواز کوشتووە. کەس مافی ئەوەی نیە لە کارەکانی مووناك خۆی هەڵقورتێنێت و ئێوە ئەم مافەتان بەخۆتان داوە.

ئەمە بۆ چوونی یوری بوو بەڵام مووناك ئەو ڕۆژە توورە نەبوو وەك بڵێی لە دەربڕینی حەسوودیم ڕازیە قاقایەکی بەرزی کێشاو ووتی:

لە جووڵەو سەیرکردنت هەست دەکەم منت خۆش دەوێت. حەسوودی نیشانەی عەشقە. ئەگەر کارێك بکەیت من لێت تێرنەبم و بمکەیتە خاوەنی دوو کچ، بە دەسەڵاتی خۆم کارێك دەکەم، هەمیشە لەناو ئێمەدا بیت و ڕێگە نادەم بە جەلادت بسپێرن.

ئەرکی من کە مێرد و نۆکەری تایبەتی سەرۆکی هۆزبووم ئەنجامدانی کارە تایبەتی و گشتیەکانی مووناك بوو. هەندێ کات تەنیا و هەندێ کات لەگەڵ خۆیدا لە دابەش کردنی کارەکان بەشداریم دەکرد و جارێکیتر بە تەنیا بەسەردان و بینینی کارگەکانی گۆزە سازی و چنین سەرقاڵ دەبووم.

لەم کارگانەدا ژنان بەلێهاتوویی تایبەت پارچە و بەتایبەت ئەتڵەسی جوانیان دەچنی. ڕۆژێك کاتێك لە یەکێك لە کارگەکان دەڕۆشتمەدەر، یەکێك لە کچانی کارگە کە تەنیا کەمێك گیای لە دەوری کەمەری ئاڵاندبوو بەردەمی گرتم و وەك پاڕانەوە ووتی:

ئەی پیاوی سپی پێست کارێکم لە تۆ دەوێت و لەبەرامبەریدا شتێکی سەیرت پێ دەدەم.

لە ڕوخساری ئەو کچە کە زیاد لەڕادە هاوشێوەی هانا بوو، ووردبوومەوە، ڕوخسارێکی جوان و دڵگیری بوو قژە خورمایی ڕەنگەکانی خۆی بە ڕەفتەیەکی ئەتڵەسی زەرد بەستبوو. شەیدای بووم.

بە هێواشی ووتی: لەگەڵمدا وەرە

ئەو لەپێش و من بەدوایدا ڕۆشتم. لە چەند ماڵ کە دەرگاکانیان بەناو یەکدا دەکرانەوە تێپەڕین و لە شوێنێك کە وەك هەنبارەکانی قوماشی دنیای پێش کەوتوو، تۆپە ئەتڵەسەکان لە سەریەك چنرابوون ڕۆشتینە ژوور، منی بردە پشت دەرگا و بەهێواشی ووتی: ئەگەر ماچم کەیت..... و ڕێگەبدەیت سەرت بە سینەمەوە بگوشم ئەو شتە سەیرەت پێ دەدەم. من ماچ کردنی ئەوم بە کارێکی گرنگ نەدەزانی بەلام ئەو بۆی ڕوون کردمەوە ووتی: ئەگەر سەرۆکی هۆز بزانێت دەمکوژێت و تۆش دەکات بە خواردنی مێرووله سورە برسیەکان... نابێت کەس بزانێت.

سەرمی خستە سەر سینەی و فشاریدا و یەك خولەك گوێم لە لێدانی دڵە پەرێشانەکەی گرت.

پرسیم: ئەو شتە سەیرە چیە؟

ئەو بە ڕاکردن بەرەو ژوورەکە ڕۆشت و گەڕایەوە و شتێکی لە دەستم دانا. لە سەرسوڕماندا بە ڕاستی دەمم کرایەوە... سەعاتێکی باخەڵی زێڕ... سەعات؟... لەوم پرسی: تۆ ئەمەت لەکوێوە هێناوە؟

وەڵامی دایەوە: چەند ساڵ پێش کە هۆزی باش هێرشیان کردە سەرمان، ئەمەم لەملی یەکێك لە کوژراوەکان کردەوە و دامشارد. شتێکی باشە؟...

بە خێرایی سەعاتەکەم قورمیش کرد و نام بە گوێی کچەکەوە دەنگی سەعات و زەنگەکانی نزیك بوو بێ هۆشی بکات... لە ترس و لە سەرسوڕمان....

بەهەرحاڵ تێگەشتم کە چەند سپی پێستێك بەدەست هۆزی باشیەکان کە وەحشی بوون کوژراون و شتەکانی گیرفانیان لەدەست و گەردنی وەحشیەکان بۆتە شتێکی ڕازاندنەوە.

لە بەدەست هێنانی سەعاتی باخەڵ لەو شوێنەدا زۆر شادمان بووم و بەڕاستیش جێگەی شادمانی بوو چوونکە لەوکاتەدا و لەو شوێنە هیچ شتێك لە سەعات یان ڕۆژ پێو لەوانیش باشتر تفەنگ نەیدەتوانی بۆم بەکەڵك بێت.

جارێکیتر سەعاتەکەم پشکنی. زۆر جوان کاری دەکرد و بۆ ئەوەی کچە جوانەکە شادمان بکەم سەعاتەکەم نا بە گوێچکەیەوە و ئەویش لە شادمانیدا دەستەکانی لەیەك دەدا.

قەسەکردنی من لەگەڵ ئەو لەو شوێنەدا شاراوە و دوورکەوتوەدا بە هیچ جۆرێك

گونجاو نەبوو و ئەگەر منیان لەگەڵ ئەودا بدیایەو ئەم هەواڵە بە گوێی مووناک بگەشتایە گومانی تیانەبوو تووڕە دەبوو و دەیسپاردم بە دەست جەلاد، بۆیە پێم ووت:

بڕۆ... بڕۆ سەرقاڵی کاری خۆت بە منیش لەم دەرگاوە دەڕۆمەدەر.

لەوێ دەرگایەك هەبوو کچەکە منی لەو دەرگاوە کردە دەر و خۆی گەڕایەوە بۆ کارگەی چنین. هەمان رۆژ من یەکێك لە نۆکەرەکانی مووناك کە هەمیشە لە بەردەستی مندابوون ناردم بە شوێن یوریدا و رامسپار هەرچی زووتر بێتە لای من.

نۆکەرەکە رۆشت و دوای چەند خولەك گەڕایەوە ووتی:

یوریم بینی و پێم ووت بەلاّم ئەو....

قسەکەی تەواو نەکرد و بەخێرایی لە ژوورەکە رۆشتەدەر. دەتوت لە وتنی ڕاستی دەترسێت. چەند جار بانگم کرد بەلاّم ڕایکرد و رۆشت و ئیتر نەگەڕایەوە. ناچار یەکێکیتر لە نۆکەرەکانم نارد بە شوێن یوریدا و بۆ ئەوەی ئەمجارە یوری بێنێتە لای من پێم ووت:

بەهەر جۆرێك بووە بیهێنە، کارێکی زۆر گرنگم پێیەتی.

ڕەشە چوارشانە ڕۆشت و زیاتر لە کاتژمێرێکی خایاند و نەگەڕایەوە. دڵم دەکولاّ. خۆیشم نەمدەزانی بۆ و لەبەرچی تووشی پەرێشانی و نیگەرانی بووم و لەسەر ئەم پەرێشانیی و نیگەرانیە بۆ بینینی یوری پەلەم بوو. کاتێك بینیم نۆکەری دووەمیش گەڕایەوە و یوری نەهێنا زیاد لەڕادە تووڕە بووم.

کاتێك نۆکەرەکە هاتە ژوور لە سەرسوڕماندا دەمم داچەقاند چوونکە سەروچاوی خوێناوی بوو بە دەستێك چاوی خۆی گرتبوو دەینالاّند. بە خێرایی ڕۆشتمە پێش و لێم پرسی:

چی بووە؟ کێ تۆی خوێناوی کردوە،...؟

ووتی:

یوری لێیدام... دەتوت شێتە. چاوەکانی وەك وەحشیەکان سوور ببوو دەرگای ماڵەکەی داخستبوو. لە دەرگام دا، ژنەکەی دەرگای کردەوە و رۆشتمە ژوور بەلاّم کاتێك یوری زانی بۆ بردنی ئەو چووم کتوپڕ پەڕیە سەرم و ئەوەندە بە مشت و لەقە پیای کێشام و دامی بە دیوارکەدا کە نزیك بوو ماڵەکە بروخێت.

بە ناڕەحەتیەکی تایبەت لە کاتێکدا لە تووڕەییدا دەلەرزیم لێم پرسی:

چی ووت؟ لەوەلاّمی تۆدا وتی چی؟

ڕەشەکە نالآندی ووتی:

تەنیا جنێوی دا.. و بەزمانی خۆی هەندێك قسەی کرد کە من تێنەگەشتم. هەندێ کاتیش بە زمانی خۆم کە نەمزانی لە کوێوە فێربووە جنێوی پێدام. لەسەر یەك بە دوو سێ زمان قسەی دەکرد و ئەمەش لە شتە سەیرەکانی ئەوە.

تێگەشتن لەم بابەتە زۆر بۆم دژوار بوو لەکاتێکدا بە خۆمم ووت (( لەوانەیە شێت بوو بێت )) بە خێرایی لە ماڵەکە رۆشتمە دەر و ڕەشەکەشم وەك ڕێ نیشاندەر لەگەڵ خۆمدا برد.

لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی دێ لەگەڵ مووناك کە هاوڕێ لەگەڵ چەند ژنێکی تری هۆزەکەی و مێردەکانیان ڕێی دەکرد و روبەڕوبوومەوە.

مووناك خەمبار بوو. دەمزانی لەناو کۆمەڵدا نابێت خۆشەویستانە قسەی لەگەڵدا بکەم. وەك دانیشتوانی هۆزەکە کوڕنوشێکم برد. مووناك دەستی ڕاستی خۆی بردە سەرو هێنایە خوار و بەم شێوەیە وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە بەڵام بزەی نەگرت وەك هەمیشە دەم بە بزە نەدەهاتە بەرچاو. لە هێڵەکانی روخساری تووڕەیی دەبینرا و لەچاوەکانی شەپۆلەکانی کینە و رق دەرژایە دەر. لەگەڵ ئەوەی چاوم پێی کەوت و هەستم بەم حاڵەتە کرد پەرێشان بووم و سەرنجم بۆ لای ئەوخاڵە راکێشرا نەکا لە ڕووداوەکەی ئەمڕۆ ئاگادار بوو بێتەوە.

ئەگەر دەیزانی من کچێکم ماچ کردوە هەم گیانی من و هەم گیانی ئەو کچە بێ تاوانە دەکەوتە مەترسیەوە و هەردووکمان دەسپێردراین بە جەلاد.

ئەم فکرە منی خستە ترسەوە دڵم لەرزی و ڕەنگم پەڕی. برۆکانم هێنایە یەك و پرسیار هاتە سەر لێوەکانم بەڵام هیچم نەوت. مووناك منی بردە سووچێك و بە هێواشی ووتی:

بۆ کوێ دەڕۆیت.....؟

من ڕووداوەکەی یوریم بە شێوەیەکی کورت بۆ باس کردو ووتم ئێستا خۆم دەڕۆمە لای.

کاتێك من و ئەو قسەمان دەکرد چاوم کەوتە سەر ئەو کۆمەڵە ژنەی لەگەڵ مووناك بوون و بینیم ژنان بە نیگای پڕ داخ و پڕ خۆشەویستیەوە سەیرم دەکەن. دەمزانی ژنان بە مووناك لە بوونی هاوسەرێکی وەك من حەسوودی دەبەن و ئێستا ئەم حەسوودیەم لە چاوی ئەوان دەبینی. بەڵام مووناك بەخێرایی بۆ منی رونکردەوە و وتی:

گوێ بگرە دەزانی ئەمڕۆ چی ڕوویداوە؟ یەکێك لە ژنان مێردی ژنێکی لەگەڵ خۆیدا بردۆتە جەنگەڵ و تەواوی ڕۆژ پێکەوە لە جەنگەڵ بوون. ئەو پیاوە مافی ئەوەی نەبوو تا ژنەکەی لێی تێر دەبێت ببێتە هاو ئامێزی ژنێکی تر و ئەو ژنەش لێپرسراوە. بۆیە ئەمڕۆ دادگای هۆز بۆ تاوانەکەی ئەوان ساز دەدرێت. ئێستا بڕۆ کارەکەت ئەنجام بدەو خێرا وەرە لای من.

لەگەڵ ئەو ڕەش پێستە کە یوری بریندارى کردبوو ڕۆشتین بەڵام ئێستا حاڵێکی ترم بوو. لە مۆتەکەیەکی مەترسیدار بەئاگا هاتبووم. دەترسام و سوپاسی خوام دەکرد کە لە پەیوەندی من و ئەو کچە ئاگادار نەبوون. لە ڕەشەکەی هاوڕێی خۆمم پرسی:

دادگا لە بارەی ئەم ژن و پیاوە چ بڕیارێك دەدات

ڕەش پێست بە بێ دەرەنگ ووتی:

بڕیاری ئیعدام دەدات ئەوان دەبێت بمرن.

بە بیستنی ئەم ڕستە لە ئارەقدا خوسام و تازە هەستم بەوەکرد نابێت بە قسەی ژنان هەڵخەڵەتێم و دەبێت ئاگارداری خۆم بم. لەهەمان کاتدا گەشتمە بەردەم ماڵەکەی یوری. ڕەشەکە لە دەرگای داو هەمان کچی جوان کە ڕۆژی یەکەم دەستی یوری گرتبوو بردبووی دەرگاکەی کردەوە. بە بینینی من بزەیەکی گرت و و خوڵقی کردین. کاتێك ڕۆشتمە ژوور و ڕەشەکەم ئیزن دا و ڕۆشتم هەستم کرد حاڵی کچەکە ئاسایی نیە و ڕەتەڵ دەبات. سەرم سورما بەڕاستیش سەرسوڕهێنەر بوو. چوونکە کچەکە پێدەکەنی و سەرحاڵ بوو. بە شادمانیەوە بەردەوام قسەی دەکرد بەڵام تلی دەداو ڕەتەڵی دەبرد و هەندێ کاتیش بە دەنگی بەرز پێدەکەنی.

کچەکە پێش کەوت و منی بردە ژوورێکی تر کە دەتوت تایبەت بە حەوانەوە و خەوی یوری بوو. ئەوێ تاریك و فێنك بوو، یوری بە پشتا لەسەر زەوی پاڵکەوتبوو دەستەکانی بەم لاولادا درێژ کردبوو چاوەکانی بەستبوو چەند ساتێك لە تاریکیدا وەستام تا چاوەکانم بە تاریکی عادەتیان گرت و جوان توانیم قیافەی یوری ببینم. هاوسەرکەی یوری لای منەوە تێپەڕی و ڕۆشتە ژوور، لای یوری دانیشت و دوای ئەوەی چەندین جار ختووکەی دا و پێکەنی ووتی:

یوری هەستە، خاوەنەکەت هاتووە.

یوری بە بیستنی ناوی من چاوەکانی خۆی کردەوە و بەزەحمەت دەستی لە سەرشانی هاوسەرکەی دانا تا لە شوێنەکەی هەستێت. دوو سێ جار بۆ پێش و دواوە

چەمایەوە و سەرئەنجام جاری چوارەم هەستا. بەڵام کاتێك هەستا نەیدەتوانی هاوسەنگی خۆی بپارێزێت. هەوڵی دەدا ڕێك بووەستێت بەڵام توانای ڕاگرتنی خۆی نەبوو.

بە بینینی ئەم بارودۆخە سەرم سوڕما و بە تووڕەییەوە ڕۆشتمە پێش و بۆنی دەمیم کرد لە بۆنی دەمی مێشکم جووڵاو خەریك بوو بڕشێمەوە... بۆنی ئیسپرتۆ لەدەمی دەهات یانی چی؟.. لێرە ئیسپرتۆ دەست دەکەوێت؟ یوری لەکوێ بەدەستی هێناوە؟

تازە زانیم یوری سەرخۆشە و دەرخواردی هاوسەرەکەشی داوە، هەردووکیان سەرخۆش بوون و ڕەتەڵیان دەبرد بەڵام لە کوێوە بەدەستیان هێنابوو؟

بەخێرایی ئەم فکرەم لا کەڵەکە بوو ڕەنگە خواردنی شەڕاب لەم هۆزەدا تاوان بێت و ئەگەر تێبگەن یوری و هاوسەرەکەی بەم تاوانە ئیعدام دەکەن. بۆیە زیاد لەڕادە تووڕە بووم و بە ئینگلیزی بە یوریم ووت:

ئەحمەق بۆ خواردوتەوە؟ لە کوێوە بەدەستت هێناوە؟

یوری بەتەواوی سەرخۆش بوو، پێکەنی، دەستی ماچ کردم ووتی:

سەرۆك من زۆر بەختەوەرم و ئەگەر لەگەڵ نێردراوانی ئێوە نەهاتم لەبەرئەوەبوو کە حاڵم بەیەکدا دەهات دەترسام مەستانە بەڕێگادا بڕۆم. لە سێ ڕۆژ پێش ئێستا جگە لە خواردن و خواردنەوە هیچ کارێکم نەکردوە..... ببینە سەرۆك... چ ژنێکی جوانم هەیە... ئەمە بەختەوەری نیە؟

دوبارە لێم پرسی چۆن ئیسپرتۆی بەدەست هێناوە. یوری ووتی:

شتێکی گرنگ نیە سەرۆك، لێرە هەنجیری شیرینی جەنگەڵەکان زۆرە، بە هەنجیر شەڕابم دروست کردوە. سێ ڕۆژ پێش شەڕابی هەنجیر ئامادەبوو لەو ڕۆژەوە تا ئێستا سەرخۆشم.

ئەمەی ووت و بەڕاکردن ڕۆشت و بە کولەکەیەك پڕ شەڕاب هاتەوەلای من. شەڕابەکەم ڕەت کردەوە و چوونکە دەمزانی بەو بارودۆخە وتوێژ لەگەڵ یوریدا ئەنجامی نیە. ڕامسپارد ئیتر شەڕاب نەخوات و ئەم نهێنیە لای خۆی بپارێزێت و بەخێرایی لەوێ ڕۆشتمە دەر تا لە دادگا ئامادە بم.

لە پانتاییەکی بەربڵاو ڕوبەڕویماڵەکەی من و مووناك دانیشتین. دادگا سازدرا. مووناك لە سەرتەختەیەکی گەورە دانیشتبوو و ئەوانیتر لە بەرانبەر ئەو لەسەر زەوی دانیشتبوون. لەنێوان ئەو و داوەران و دانیشتوان ژنێك و پیاوێکی ڕەش پێست دەست

بەستراو وەستابوون و سەریان داخستبوو.

ژنەکە نزیکەی چل و پێنج ساڵ تەمەنی بوو، ئەو گەنج نەبوو بەڵام هێشتا جوانی و رێکی ئەندامی لەدەست نەدابوو و دەیتوانی عەشقبازی بکات. زانیم تاوانبارەکان ئەوانن. مووناك لەگەڵ ئەوەی منی لە دوورەوە بینی بەسەر ئیشارەیەکی کرد و منی بانگ کردە لای خۆی.

چوونکە تا ئەو رۆژە لەم جۆرە دانیشتنانەدا دانەنیشتبووم، کاری خۆمم نەدەزانی بەڵام مووناك کارەکەمی بۆ روون کردمەوە و بەدەست ئیشارەیەکی کرد و تێگەشتم کە دەبێت لەسەر تەختەکە لای ئەو دانیشم. کاتێك دانیشتم مووناك دەستمی گرت و گووشی.......

دادگایی دەستی پێکرد، درێژەی بوو. دوای کورتەیەك وتوێژ کە من بەشداریم تیانەکرد دوو تاوانبارەکە بە ئیعدام مەحکوم کران. بەبینینی ئەم بارودۆخە زۆرترسام و لەرزیم. دەمویست لە جێ بەجێ کردنی ئەم حوکمە زاڵمانە رێگری بکەم بەڵام دوودڵ و سەرگەردان بووم چی بکەم کە رێکەوتن ئەنجام بدرێت.

گێژو مات لەو دوو کەسە بێ تاوانە کە سەریان داخستبوو، دەمروانی کە لێپرسراوانی جێ بەجێ کردنی حوکم دەوریان گرتن و ئەوانیان برد. سەرسوڕمانم لەوەدا بوو بێ کەمترین بە رێگریەك لەگەڵیاندا رۆشتن تا برۆنە ناو قورگی مەرگەوە.

کاتێك دەوروبەرمان چۆڵ بوو، دەستی مووناکم گرت ووتم:

دەکرێت داواکەم قبووڵ بکەیت...؟

برۆکانی هێنایە یەك وەك ئەوەی دەیزانی چ مەبەستێکم هەیە ووتی:

چ داوایەك... تۆ هەرچیت بووێ ئامادەی دەکەم... هەرشتێك لە دەسەڵاتی مندا بێت لە خزمەت تۆدایە. من لە ووتنی مەبەستەکەم دوودڵ بووم و لەگەڵ ئەوەی نیوەی بابەتەکەم وتبوو، نیوەکەی تریم لەناو دەمدا ڕاگرت و منجەمنجم دەکرد و ڕاستیتان بوویت دەترسام ئەوەی ئەندێشەم دەکرد بێتە سەرزمان. مووناك کە منی بینی جارێکیتر برۆ جوانەکانی هێنایە یەك ووتی:

دەتەوێت چی بڵێیت؟ پەشیمان بوویتەوە؟

خۆم کۆکردەوە و ووتم:

دەزانم لە جێ بەجێ کردنی حوکمی ئەم دوو کەسە درەنگ ناکەن بەڵام دەمویست داوابکەم لە کوشتنی ئەو ژنە داماوە دەست بپارێزن.

به بیستنی ئەم رستە رەنگ لە ڕوخساری مووناك پەڕی. ڕوخساری وەك گەچ سپی بوو دوای چەند سات كە زەق زەق لە چاوەكانم وردبوویەوە ووتی:

تۆ.....؟ تۆ عاشقی ئەم ژنەیت......؟

ئێستا نۆرەی من بوو ڕەنگم بپەڕێت. نەمزانی دركاندنی ئەم بابەتە كە لەوپەری پاكی و سافیدا ووترا هیچ مەبەستێكی لە پشتەوە نەبوو، ئەم فكرە سەیرە لای مووناك دروست دەكات

مافی خۆم بوو بترسم چوونكە ئەوان زۆر بێ بەزەییانە كەسەكان دەكوژن و ئەگەر ئەم فكرە لەبارەی منەوە بەهێز دەبوو، كاری منیش تەواوبوو و مووناك دەیتوانی بە ئاسانی چاو لە من بپۆشێت و دەستوری مردنم دەركات و دوای یەك دوو ڕۆژ لەگەڵ پیاوێكی تردا هاوئامێز بێت.

لە ترسا لچی خوارەم دەلەرزی و لێوەی سەرەوەم كورت بوویەوە و لووتم تیژببوو، لەیەك دوو سات كە بە دژواری لە من گوزەرا، دیمەنی ئیعدام بە تەناف، لە داردان و سەربڕین و سەرئەنجام خنكان لە ئاوی ڕووبار و خراپتر لە هەموو تیكە تیكە كران بە هۆی ئاژەڵە وەحشیەكانی جەنگەڵ هاتە بەرچاوم.

بەڵام لە سەرئەنجام لە چاو تروكانێكدا زیرەكی شارستانیەتی من گووڵی كرد و قاقایەكی بەرزم كێشا و بە خوێنساردی شانەكانم بەرز كردەوە ووتم:

نە.... من عاشقی ئەو نیم... كەسێك كە خاوەنی تۆ، یانی جوانترین ژنی دنیایە چۆن دەتوانێت عاشقی ئەو ژنە ناحەزە بێت؟ مەبەستم ئەوەیە ئەو ژنە مەكوژن چوونكە...

ئەو لە دەمی منی دەڕوانی، ڕوانینەكە حاڵەتێكی تایبەتی بوو، نازانم دەتوانم بۆ ئێوەی باس بكەم كە نیگای ئەو چ حاڵەتێكی بوو و چ شتێكی بە من دەوت... هیچ كاتێ كە دادگا حوكمی ئیعدامی تاوانبارێك دەردەكات ئامادە بوون؟ ئایا سەرنجتان داوە كە خەڵك، ئامادە بووان سەیركەران چۆن بەو مەحكومكراوە بە ئیعدام لە ڕووی سۆز و بەزەییەوە سەیر دەكەن و لە سەیركردنەكانیان چ شەپۆلێك دەدرێتە دەر.

ئەویش ڕوانینەكەی ئەم حاڵەتەی هەبوو، وەك ئەوە بوو كاری منی بەتەواوی دەزانی و ئێستا كە دەیبینی من لە دەست دەدات داخی دەخوارد و لەرێگەی دڵسۆزی و بەزەییەوە سەیرم دەكات.... هەموو ئەم شتانە لە نیگای ئەودا بینی و داهاتووی خۆم تاریك و تاریكتر هەست پێدەكرد بەڵام دەمتوانی چی بكەم... كارێك بوو كراو من چارەیەكم جگە لە خۆراگری لەبەرامبەر دواهاتەكانیدا نەبوو. شتێكی ترم هەست پێكرد

و ئەویش ئەوەبوو ئیتر گوێی لە وتەکانی من نەدەگرت و هەمان پستەی بۆ مەحکوم کردنی من بە بەس دەزانێت. باش بوو هەستم بەم خاڵە کرد، تەکانم داو هێنامە خۆی، کاتێك موناك هاتەوەخۆی سەری داخست و من بە پێچەوانەوە بەیەك جووڵەی خێرا ئەوم لەسەر دەست بەرز کردەوە و بردمە ژوورەکەی خۆمان.

ئەو بە پێچەوانەی هەمیشە دەستەکانی لە دولاوە شۆڕکردبوویەوە و هەوڵی دەدا خۆی لە من بەدوور بگرێت... وەك ئەوەی نەیەوێت زیاتر بەر من بکەوێت. بەهەرحاڵ من گوێم پێ نەداو بردمە ژوور، لە سەر جێگاکەم خەواندم و دوای ئەوەی دەستم بە قژیدا هێنا ووتم:

گوێبگرە موناك... لە شار و وڵاتی ئێمە ژنان ناکوژن... ژن هەرچەندە تاوانباربێت کوشتنەکەی بە کارێکی قێزەون دەزانن و منیش لەسەر ئەمە داوام لە تۆ کرد لە کوشتنەکەی چاو بپۆشی. دەتوت موناك لەم ڕونکردنەوە خۆشحاڵ بوو چوونکە بە دەنگێکی هێواشتر ووتی:

ئەم ژنە تاوانبارە دەبێت بمرێت و بەتایبەتی تۆ دەبێت حوکمی کوشتنی جێ بەجێ بکەیت و بەدەستی خۆت بیکوژی تا من دڵنیابم کە ئەوت خۆش ناوێت..... تێدەگەیت؟

ئەی هاوار، چۆن دەمتوانی بیکوژم..؟ من جەلادنیم....؟ ئەم فکرەم لادروست بوو بەڵام بەخێرایی ئەفکارم کۆنترۆڵ کردو بۆ ڕەزامەندی ئەو ووتم:

زۆرباشە لەبەرئەوەی تۆم خۆش دەوێت و ڕێز لەهەموو ڕێ و ڕەسمەکانی هۆزەکەت دەگرم و بۆ ئەوەی بزانیت من ئەوم خۆش ناوێت و تەنانەت لەو کە ژنێکی تاوانبارە بێزارم بە دەستی خۆم دەیکوژم.

موناك لە بیستنی ئەم قسانە دەستی لەدەوری ملم ئاڵقە کرد و بەهێواشی ووتی:

ئێستا تێگەشتم منت خۆش دەوێت مزگێنیەکی خۆشت پێ دەدەم...

بەسەرسوڕمانەوە ووتم:

مزگێنی خۆش؟ چ مزگێنیەك باشتر لەوەی منت خۆش دەوێت....؟

بەهێواشی بە گوێمدا چرپاندی:

بەم زوانە دەبینە خاوەنی منداڵێك.

نازانم چۆن وەسفی بکەم تا ئێوەش تێبگەن کە چ حاڵێکم پەیاکرد. خۆشحاڵ بووم، ترسام، لەرزام هەستم بە نیگەرانی کرد، بێزاربووم. هەموو ئەم حاڵەتانە بە یەکجاری لە مندا دەرکەوتن. مناڵ....؟

بەم زووانە دەبمە باوک. لەم ژنە جوانە وەحشیە؟ مناڵەکەم چ چارەنوسێکی دەبێت؟ کچە یان کوڕ؟ نەمزانی چەند خولەك لەم حاڵەدابووم و چی لە نیگام دەخوێندرایەوە و مووناك کە زەق زەق لە منی دەڕوانی هەستی بەچی کرد. بەڵام جێگەی خۆشحاڵی بوو کە مووناك ووتی:

زۆر شادمان بوویت؟ دیارە کە زۆر شادمانیت.؟

لەترسا ووتم:

بەڵێ..... بەڵێ.... چ بەختەوەریەك لەمە گەورەتر؟

بەڵام لەم کاتەدا کەوتمە بیری ئەوکاتەی ئەگەر مناڵەکە کوڕ بێت سەری دەبڕن و دەیخەنە چاڵێکی تایبەتەوە.... خوا بکات لانی کەم ئەو کچی ببێت و من لەم ئازارە گەورەیە ئاسودە بکات.

دەنگی قەرەباڵغی و هەرا و هوریای دانیشتوان لەدەرەوە دەبیسترا و مووناك بە بیستنی ئەم دەنگە وەك ئەوەی هاتبێتە خۆی لە شوێنەکەی ڕاپەری.

ئایا کاتێك زۆر خەمبارو نیگەرانن رۆشتوونەتە گوڵستان؟ ئەگەر تاقیتان کردبێتەوە، سەیری گووڵەکان، سەمای پەپوولەکان، جوڵەی شکۆفەکان بەدەست نەسیم، هەموو خەمێك کە لە دڵی مرۆڤدایە بە یەکجاری دەرەوێنێتەوە. لەم کاتەدا کە لە بەرخەم و پەژارە ببوومە کێوی زەهرەمار، ئەو لە شوێنەکەی هەستا تا جل و بەرگی ڕێوڕەسمەکە لەبەربکات.

بۆ ئامادەبوون لە ڕێوڕەسمی ئیعدامی ئەو ژنە و پیاوە مووناك کە سەرۆکی هۆز بوو، جل و بەرگی تایبەتی دەپۆشی. ئەم جل و بەرگە لەلایەنی دروومانەوە لەگەڵ جل و بەرگەکانی تری ئەو جیاوازی نەبوو، تەنیا جیاوازی لە رەنگەکەیدابوو، جل و بەرگی ڕێوڕەسمەکە سوور ڕەنگ بوو.

تەنیا ئەم قیافەی ژن جوانە... ژن تاجی ئافراندنە، ژن سەرچاوەی ژیانە، ئەوانەی بە ژن و جوانی ژن سەرنج نادەن، مرۆڤ نین. و گوێنەدان بە ژن کە تاجی ئافراندنە وەك ناشکوری بە سروشت دەژمێردرێت.

بووگزەرێن.... بە بینینی مووناك و ئەندامی ئەو خەمەکانی خۆمم بیرکرد و دانیشتم و سەیرم کرد تا جل و بەرگی پۆشی و بە منی ووت:

برۆین... بیرت نەچێت دەبێت بە دەستی خۆت بیکوژیت.

پێکەوە لە ژوورەکە رۆشتینە دەر و بەرەو گۆڕەپانی ئیعدام بەڕێکەوتین. دانیشتوان

بە بینینی مووناك شادمانیان دەکردو هورایان دەکێشا و چاوی من ئەوانی نەدەبینی و لەناو خەڵکدا بەدوای ئەو دوو بوونەوەرە بێ تاوانە بەدبەختە دەگەڕا.

لە خاڵێك لە ناوەڕاستی گۆڕەپان، خاچێك لە داریان هەڵواسیبوو و دوای ئەوەی خاچەکە دانراو ئامادەبوو، دوو سێ کەس رایان کرد و تاوانبارەکانیان هێنا کەدەست پێیان بەسترابوویەوە و لەولاوە بەخاچە داریەکە بەستیانەوە.

ئەوانیان بەجۆرێك بەستبوویەوە کە دەستەکانیان بە دوو شاخی خاچەکەوە بەسترابوویەوە، قاچەکانیشیان لەسەریەك دانرابوو و لەخوارەوە شەتەکدرابوو، پشتیان لەیەك بوو یەکیان نەدەدی کاتێك کاری بەستنی ئەوان تەواو بوو، مووناك ئیشارەیەکی کرد و دوو سێ کەسی تر چەندین قاپیان هێنا کە پڕبوو لە شلەمەنیەکی زەرد رەنگ بوو. سەرەتا نەمزانی لەناو قاپەکاندا چیە بەڵام دواتر زانیم شیری هەنجیرە. شیری خەست و بۆن خۆشی هەنجیر.

یەك لە ژنان رۆشتە پێش و دوای خوێندنەوەی وێرد، دەستەکانی خۆی کردە ناو شیرەکە و لە جەستەی ئەوانی سوو، بە شێوەیەك سینە و ڕان و قاچی ئەوانی تێوەدا. ئەم کارە ئەنجام دەدرا. بەڵام نەمدەزانی چۆن ئیعدامیان دەکەن و شیر چ کاریگەریەکی لەسەر جەستەی ئەوان هەیە.... کە لەناکاو دوو کەسیتر بە دوقاپی گڵین لە سوچێکی گۆڕەپانەکەوە دەرکەوتن. سەری ئەم قاپانەیان بە پێست بەستبوو. لە نیوە گۆێك دەچوو کە سەرەکەیان بە پێست بەستبێت.

یەکێك لەم قاپانە لەبەرامبەر ژنەکە و ئەویتر لەبەرامبەر پیاوەکەدا دانرا و پێستەکان لەسەر قاپەکان لابران.... و لەناکاو مێروولە سوور ڕەنگ وەحشی و خوێنخۆرەکانی جەنگەڵ لەناو قاپەکان هاتنەدەرو بە بۆنی شیرەکە هێرشیان کردە سەر ئەو ژن و پیاوە بەدبەختە...

یەك خولەکی نەخایاند جەستەی ئەوان بە مێروولە سوور رەنگەکان داپۆشرا. دەنگی قیژەی گیانبڕی ئەوان دەگەشتە ئاسمان... دەیانقیژاند و مێروولەکان سەرقاڵی خواردنی ئەوان بوون. کەس گوێی پێ نەدەدان، بەزەییان نەدەکرد دەتوت ئەم خەڵکەیان لەبەرد دروست کردوە، مرۆڤ نین و هیچ هەستێکیان نیە. یانی چی؟

ئەمە چ وەحشی گەریکە؟ بە بینینی ئەم دیمەنە دەڵتەزێنە لە ئارەقدا خووسام. بەڵام بەداخەوە هیچ کارێکم لە دەست نەدەهات. دیاربوو ئەم داماوانە دەبێت ئەوەندە بقیژێنن تا مێروولەکان پێستی سکیان کوون دەکەن و ئەندامەکانی ناوسکیان بخۆن و بمرن.

هەموو وەستابوون و سەیریان دەکرد. بەڵام توانای سەیرکردنی ئەم دیمەنە وەحشیگەرییەم نەبوو.

یەک دوو جار دەستم بەرەو خەنجەرەکەم رۆشت تا بڕۆمە پێش و ئازادیان کەم بەڵام عەقڵ ئاگاداری دەکردمەوە و لەسەر شوێنەکەمدا دەیچەقاندم بەڵام تاقەتم نەما و بیرێک بە مێشکمدا هات و بۆ ئەنجامدانی دەست بەکار بووم.

بڕیارەکەم ئەوە بوو دەست بەجێ خۆم بگەیەنمە جەنگەڵ و فیشەکەکانی خۆم هەڵگرم و بۆ ئەنجامدانی کاری ئەم ژن و پیاوە داماوە خۆم بگەیەنمە ئەو شوێنە بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو، یەکەم کێشە بزواندنی هەستی گوومانی مووناک بوو. بەم شێوە لەگەڵ ئەوەی تەکانم خوارد و ویستم هەنگاوێک بڕۆمە دواوە، مووناک کە لای من وەستابوو بینەری مەرگی ئەوان بوو، بە توندی مەچەکی دەستی گرتم ووتی:

بۆ کوێ دەڕۆیت..؟ ناتوانیت مەرگی ببینیت..؟

من کە لە تووڕەیی زۆر دەلەرزیم و کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دابوو، مەچەکی دەستی خۆم بەتووندی لە دەستی دەرهێناو بە زمانی ئینگلیزی یانی زمانی خۆم چەند جنێوێکم پێش کەش بەخۆی و هۆزەکەی کرد و بەخێراییەکی بێ وێنە بەرەو جەنگەڵ ڕۆشتم.

بەخۆشحاڵیەوە چوونکە مووناک زمانی ئینگلیزی نەدەزانی لە جنێوەکانی من حاڵی نەبوو بەڵام کردەوەیەکی ناشرین کە لەگەڵ ئەودا کردم و دەستی خۆم بەتووڕەیی لە دەستی ئەو دەرهێنا و رۆشتم، بۆ ئەو نەشیاو بۆ خۆ ڕاگری بوو.

کەس ئاگای لە ئێمە نەبوو، هەموو بەحەزێکی زیاد لەرادە هێرشی مێروولە سوورەکانیان سەیر دەکرد و دەیانویست بینەری مەرگی دڵتەزێنی ئەوان بن. ژنی داماو دەیقیژاند و پیاوەکەش لەخۆی دەناڵا بەڵام چوونکە دەست و پێی بەسترابوو نەیاندەتوانی هیچ کارێک بکەن و تەنیا قیژە و ناڵەو ئازارەکانی خۆیان کەم دەکردەوە. بەخێرایی لەو شوێنە ترس ئەنگێزە دوورکەوتمەوە، رام دەکرد، هەناسکە هەناسکم پێ کەوتبوو دەمویست هەرچی زوتر خۆم بگەیەنمە جەنگەڵ.

دەنگی قیژاندنی ئەو ژنە داماوەم دەبیست. ئەم دەنگە گوێ ئازاردەرە رۆحمی دەلەرزاند، لەهەموو تەمەنمدا قیژەیەکم بەو گیان ستێنە نەبیستبوو. ئەگەر بیستبێتیشم لەبیرم نیە.

مردن، روخساری ترس ئەنگێزی خۆی نیشان ئەدات بەڵام بەئاسانی رزگاری

نەدەکردن و گیانی نەدەکێشان کە لەرەنج و ئازارەو گازی مێرووله سوورەکان ئاسوودەبن.

لەم رێگادا بیرم لە شتێکی تریش دەکردەوە ئەویش تووڕەیی مووناك بوو دڵنیابووم مووناك ئەم کارە ناشرینە و ئەم ئیهانە کردنەی من بەبێ سزا ناهێڵێتەوە. من عاشقی ئەو بووم و ئەم عەشقە لەمپەر بوو لەوەی بڕیارێکی دژوار لەبارەی منەوە بگرێت.

بە هەرحاڵ کارێك بوو ئەنجام درابوو. چارەیەکم نەبوو نەمدەتوانی کارێکی تر بکەم. مرۆڤایەتی فەرمانی پێدەدام بڕۆم، تفەنگەکەم بێنم و بڕیارەکەم بخەمە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە، هەرچی دەبێت با ببێت....

لەم کاتەدا رۆشتمە ناو جەنگەڵ، لە پێچ و پەناکان کە بە جوانی شارەزای بووم بەئاسانی تێپەڕیم. بەخێراییەکی سەیر دەڕۆشتم.

ڕام دەکرد و چقڵ و لقە چقڵاویەکانی دارەکان کە بەراست و چەپ نوشتابوونەوە لە جەستەم و سەرو روخسارم رۆدەچو و برینداری دەکردم. بەڵام بێ گوێدان بە کزانەوە و ئازار دەڕۆشتمە پێش و ئەوەندە رۆشتمە پێش، تا گەشتمە ئەو خاڵە، ئەو شوێنەی مووناك تفەنگەکەی فڕێدابوو. ئەوێ شوێنێکی کوێستانی و تێپەڕین لێی بێ مەترسی نەبوو و لەگەڵ ئەوەشدا من هەموو لەمپەرەکانم بڕی و بەوێ، ئەو شوێنەی تفەنگەکەم لەسەر بەرد و گیاکاندا کەوتبوو گەشتم. تفەنگ و فیشەکەکانم هەڵگرت.

کاتێك تفەنگەکەم هەڵگرت و فیشەکدانەکەم بەست، بە ئاسوودەیی هەناسەیەکم کێشا. ئەم تفەنگە بۆ من هەموو شتێك بوو، هەموو شتێك و من بەهۆیەوە دەمتوانی زۆر شت بکەم.

جێگەی بیرکردنەوە و درەنگ کردن نەبوو. بەخێرایی لەهەمان رێگاوە بەرەو هۆز گەڕامەوە و هەناسکە هەناسك خۆم گەیاندە پشت مووناك کە لە تووڕەییدا ددانەکانی لەیەك گیر دەکرد، نینۆکی دەچەقاندە بەری دەستی خۆی.

مووناك کە دەنگی هەناسە برکێی منی بیست و هەستی بەگەڕانەوەی من کرد و بەشێوەیەك بە تووڕەییەوە سەیری کردم کە پشتم لەرزی و لەئەنجامی کارەکەم نیگەران بووم. بەڵام بەڕوی خۆمدا نەهێناو بەخێرایی میلم هێنایەوە و یەکەم فیشەکم کردە ناو تفەنگەکە مووناك ئەم جارە هەستی بە تفەنگەکە کرد بەڵام دەرفەتی نەبوو شتێك بڵێت یا تفەنگەکەم لەدەست بستێنێت چوونکە لەم کاتەدا تفەنگەکەم بردە سەرو و مێشکی ژنەجوانەکەم نیشانە گرت. بیرهێنانەوەی ئەم خاڵەش پێویستە کە لە کاتی رۆشتن و

هاتن مێروولەکان کاری خۆیان ئەنجامدابوو و زۆربەی ئەندام و ناوسکی ئەو ژن و پیاوەیان دەرهێنابوو و ژمارەیەك زیاتر لە دوو هەزار میروولە رۆشتبوو ناوسکیانەوە. بەڵام هێشتا زیندوو بوون و لەخۆیان دەئاڵاند و دەیانقیژاند.

مووناك لە شوێنەکەی خۆی هەستاو دەستی بەرزکردەوە تا تفەنگەکەم لەدەست بگرێت بەڵام ئەو دەرفەتەشی دەست نەکەوت. پەنجەم لەسەر پەلەپیتکەکە جووڵا و گوولەکە تەقێنرا و مێشکی ژنە جوانەکەم پرژاند.

دەنگی تەقەی گوولە هەموو دەنگەکانی تری خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە و چاوەکان بەرەو لای من کە لای مووناك وەستابووم سووڕا. هێشتا هەندێك نەیاندەزانی چی بووە و چی ڕویداوە، بەڵام دوای یەك دو خوولەك کە بینیان مێشکی ژنە جوانەکە پرژاوە زانیان داردەستە پڕ نهێنیەکەی من ئەم کارە تایبەتەی ئەنجام داوە و تازە ئەوکات بوو بۆڵە بۆڵ لەناو ژناندا دەستی پێکرد و چپەچپەکان دەستی پێکرد. چاوە سەرسوڕماوەکان و نیگا پڕ ترسەکان ڕویان لە من کرد کە دوبارە دەستم کەوتە جووڵە و گوولەی دوەمیش تەقێنرا و ئەم جارە پیاوەکە کوژرا.

کاتێك هەردوکیانم کوشت ئاسوودە بووم..... و یژدانم ئارامی گرت و هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی کێشا.

چەندە لە تفەنگەکەی هانا تفەنگێك کە هانای جوان بە منی بەخشیبوو، سوپاسگوزاریم کرد کە لەم شوێنە پڕ ترسەدا بە ئازارو ئەشکەنجەی دوو بوونەوەری بێ تاوان کۆتایی هێنا.

مووناك لە تووڕەییدا دەلەرزی، بەرەو لای من هات. تفەنگەکەی لە دەستم سەند، فیشەکدانەکەمی کردەوە و هەردوکیانی بەرەو یەکێك لە ڕەشەکان درێژکرد.

ڕەشەکە نەیدەوێرا تفەنگەکە بگرێت.... دەترسا، گوومانی نەدەکرد ئەم داردەستە سیحراویە کە لە مەودایەکی دوورەوە دوو کەسی کوشتووە، نەکا ئەویش بکوژێت.

بەڵام لە بەرامبەر مووناك چارەیەك بێجگە فەرمانبردنی نەبوو. بەترس و لەرزەوە دەستی هێنایە پێش، تفەنگەکەی گرت و بردی.

مووناك هاتە پێش، سینە بە سینەی من وەستا ووتی:

بۆ کوشتت....؟ نەتدەتوانی ئازارەکەی ببینی؟

بە خوێنساردیەوە وەڵامم دایەوە:

مەگەر خۆت نەت وت دەبێت بە دەستی خۆت بیکوژیت...

بۆنا، بەڵام نە ئێستا بڕیاروابوو لە کۆتاییدا بەدەستی خۆت سەری جیابکەیتەوە.

وەڵامم نەدایەوە وەستام بەڵام مووناك بڕیای خۆی دابوو و بەیەك دوو کەس لە ڕەشەکانی ووت:

بیگرن و بیبەنە جەنگەڵ و لە (( مایلا )) زیندانی کەن تاکاتی دادگایی کردنی دەگات.

لە روخساری مووناك حالاتی جۆراو جۆر دەبینرا، عەشق و غرور شەڕیان دەکرد، ئەرك و خۆشەویستی لە چاوەکانیەوە قسەیان دەکرد و سەرئەنجام پەردەیەك ئەشکی درەوشاوە کە چاوە جوانەکانی داپۆشی منی دڵنیا کرد کە هێشتا گیرۆدەی عەشقی منە و ناتوانێت حوکمی کوشتنی من دەرکات. بێ خۆراگری تەسلیم بووم و ڕەشەکان منیان بردە جەنگەڵ، لە یوری هەواڵم نەبوو نەمدەزانی چی بەسەر هاتووە، لەم کاتە هەستیارە کە چارەنوسێکی تاریك چاوەڕوانم بوو، پێویستم بەو بوو بەڵام نەو دیارنەبوو ئایا هێشتا سەرخۆشە.... شەرابی هەنجیر ئەوی شێت کردوە.

زیندانی من خاڵێك لە جەنگەڵ بوو کە سێ لای بە زۆنکاوی مەترسیدار کە پڕبوو لە تیمساح و لایەکی ڕووبارێکی قووڵ، گەمارۆ درابوو. لەم ڕووبارە کە تەنیا ڕێگەی هات و چۆ و گەشتن بە مایلا بوو هیچ شتێك ئەگەری تێپەڕینی نەبوو مەگەر ئەو بەلەمە تایبەتانەی کە تەنیا لە بەردەست پاسەوانانی مایلا دا بوون.

ڕەشەکان منیان لە بەستێنەکەدا دابەزاندو ڕۆشتن و یەك لەوان بە منی ووت:

بیر لە هەڵاتن نەکەیتەوە چوونکە یان لە ڕووباردا دەخنکێیت یان دەبیتە پاروی تمساحەکان. ئەوان ڕۆشتن و بەتەنیا جێیان هێشتم. لەو شوێنەدا داری میوەی جەنگەڵی زۆر بوو. من بەمۆز و نارگیل و هەنجیری وەحشی و هەرمێ سکی خۆم تێردەکرد.

بۆ سکم خەمم نەبوو، بەڵام بۆ خەو حەوانەوە هیچ شوێنێکی لێ نەبوو من لەمار و ئاژەڵەکانی جەنگەڵ دەترسام و نەمدەتوانی وەك وەحشیەکان لەسەر زەوی بخەوم.

سێ شەوی یەکەمم لەسەر دارێك بەسەر برد و ڕۆژی چوارەم ویستم شوێنێکی گونجاو بۆ خۆم دروست بکەم. نە چەقۆم پێ بوو نە تەور، بە دەستی هێزو بازو لقی دارەکانم شکاند و لەسەر یەك دامنان تا شوێنێکی گونجاو لە سەر دارەکە شوێنێکی گونجاو بۆ خەوی من دروست ببێت.

دارێك کە هەڵمبژاردبوو نزیك ڕووبارو و لەشوێنێکدا بوو لە دولاوە ڕووبارە

خرۆشاوەکەم دەبینی و هەرکەس بهاتایە بۆ ئەویّ، بەرچاوی من دەکەوت.

دەمەو ئێوارەی رۆژی پێنجەم بوو کە لەناکاو خاڵێکی رەش لە دوورەوە لەسەر رووبارەکە دەرکەوت. لە زەردی هەتاو ئەم خاڵە رەشە بە جوانی دەبینرا و هەرچی نزیکتر دەبوو گەورەتر دەهاتە بەرچاو، تا ئەوەی نزیك بوویەوە و من بەلەمێك کە تەنیا یەك کەسی تیابوو، بینیم.

بەلەم لەناوەکە بەخێرایی دەهاتە پێش تا گەشتە قەراغ مایلا وەستا و ژنێکی جوان بە قژی رەش لێی دابەزی. ژنە جوانەکە بەلەمەکەی هێنایە سەر چەوو لمی بەستێن و خۆی هاتە ناو مایلا و دەستی بەگەران کرد تا ژێردارەکە هات و منی نەبینی دەرفەتێکی باش بوو بۆ من کە بینیم و بیناسم. هەوا تا رادەیەك تاریك ببوو بەلام لەگەلّ ئەوەشدا کە گەشتە ژێر دارەکە ناسیمەوە. ئەو ئەو ژنە بوو لە هەنباری قوماشەکان کاتژمێرە زێرەکەی دا بە من، ئەو لێرە چی دەکات بۆ هاتووە بۆ ئێرە....؟

ئایا مووناك ئەوی ناردوە..؟

لەم بیرانەدا بووم کە لەناکاو لقی دارەکە شکاو من لەبەردەم قاچی ئەودا کەوتم بەلام ئازارم بەرنەکەوت هەر کە چاوی بە من کەوت، بزەیەکی شیرینی گرت و سەری داخست. بەخێرایی پرسیم.

تۆ بۆ ئێرە بۆ هاتوویت....؟

ئاخر تۆ تەنیا بوویت.

بەخێرایی بازووەکانیم گرت ووتم:

زوو برۆ..... برۆ..... ئەگەر مووناك تێبگات هەردووکمان دەکوژێت.

ئەو شانەکانی بەرز کردەوە ووتی:

قەیناکە... من لای تۆ دەمرم و ئەمە گەورەترین شانازی بۆ ژنێکی ئامازۆنیە لای خۆشەویستە سپی پێستەکەی بمرێت و پێش ئەوەی من قسەیەکی تر بکەم دەستەکانی لە ملم ئالآند و دەستی بە گریان کرد و پەردەی لە عەشقی خۆی هەڵمالی.

کاتێك ئارامم کردەوە و دڵمدایەوە ووتی:

لەهەمان رۆژی یەکەم کە تۆم لای مووناك بینی عاشقت بووم و بەدوای دەرفەتێکی گونجاو دەگەرام و ئێستا ئەم دەرفەتە بەدەست هاتووە. یان دەبێت بمکوژیت و بمخەیتە رووبار و یان تاماوەیەك کە لە مایلا زیندانیت لای خۆت رام گریت. دڵنیابە کەس لەم نهێنیە ئاگادار نابێتەوە.

ناوی ئەو لئونا دووەمین ژنی ئامازۆنی بوو کە بە من درا.

بەیانی زوو لئونا لە خەو هەستابوو دوای خواردنی بڕێك میوە سوار بەلەم بووین تا پێکەوە لەسەر ڕووبار پیاسە بکەین. بەڵام پێشتر لئونا دوو ئاڵقەی لە گوڵە جەنگەڵیەکان دروست کرد و یەکیانی کردە ملی من و ئەویتریان کردە ملی خۆی و ئەو کات سوار بووین و ڕۆشتین.

لئونا چوونکە ئەو شوێنەی باش دەناسی چەند خولەکێك بەلەمەکەی بردەپێش تا گەشتینە شوێنێك لەحەوز دەچوو. ئەوەندە جوان بوو ئەوەندە دیمەنی سەرسورهێنەری بوو کە پێنوس لەباس کردنی ناتوانایە.

لەو شوێنەدا بە پێچەوانەی شوێنەکانیتر ئاو ئارام بوو. وەك ئاماژەم پێدا زیاتر لە حەوز دەچوو بەڵام دەوروبەری ئەوەندە جوان و سەرنج ڕاکێش بوو نەمدەتوانی چاوی لێ هەڵگرم.

کاتێك گەشتینە سەر ئەستێرەکە لەوێش بۆ من شادی و شادمانیەکی تایبەت دروست بوو بەشێوەیەك دەیویست هەستێت و هەڵبەزو دابەز بکات.

بایەکی فێنك هەڵیکردبوو قژە ڕەشەکانی پەرێشان دەکرد، بەرچارۆکە دەکەوت و دەبووە هۆی ئەوەی بەلەمەکە خێراتر بڕوات. کاتێك با بەلەمەکەی دەبردە پێش سەوڵم لێ نەدەدا و لئونا لەوەی دەیبینی ماندوو نابم شادمان بوو.

گەڕانی ئێمە زۆری نەخایاند بەخێرایی گەڕاینەوە. لە گەڕانەوەدا لئونا پێشنیازی کرد بڕۆینە ناو ئاو مەلە بکەین، بەڵام دڵم لێی دەدا و دەتوت ڕووداوێکی ناخۆش پێش بینی دەکەم. بۆیە پێشنیازکەیم ڕەد کردەوە و بەڵێنم دا جارێکیتر کاتێك هاتینە ئێرە مەلە بکەین.

لئونا لە سەوڵ لێدان یارمەتی دام و لەگەڵ ئەوەی بەلەمەکە بە پێچەوانەی ڕەوتی ئاو دەڕۆشت، سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی سەوڵ لێدات نەکا من هیلاك بیم.

دەوری نێوان حەوز و مایلامان بڕی. کاتێك دارخورماکانی بەستێنی مایلا لەدوور دەرکەوت دڵە خورپەم گرت و بارودۆخێکی سەیر بەسەرمدا زاڵ بوو. ناتوانم باسی بکەم لەوکاتەدا چ حاڵێکم بوو و چۆن هەستم بە نیگەرانی دەکرد. دەتوت دنیام لێ بووەتە کوونە مشك و دەستێکی بەهێز دڵم دەگوشێت. لئونا لەکاتی گەڕانەوە کاتێك هەستی بە ڕەنگ پەڕاوی من کرد، سەوڵەکەی لابرد ووتی:

بۆ وات لێهاتووە......؟ بۆ ڕەنگت پەڕاوە........؟

پێم وت کە هەست بەنیگەرانی دەکەم. لئونا جوان گوێی لە قسەکانم گرت و دواتر بێ ئەوەی شتێك بڵێت یان پەچەکردارێك نیشان بدات سەوڵەکانی بەدەستەوە گرت و ئەم جارە لە جیاتی ئەوەی بەلەمەکە بەرەو پێشەوە ببات بەلای راستدا سوڕاو دوای چەند خولەك لە بەستێنی ڕووبار لەناو گیا بەرزەکان کە لەوێدا ڕوابوون و سێبەریان خستبووە، لەسەر ئاوەکە وەستا.

لئونا دابەزی و بە ئیشارەتی دەست منیشی دابەزاند. کاتێك لەو هۆکاری ئەم وەستانە بێ جێگەی پرسیارم کرد ووتی:

لێرەوە تا مایلا زۆر دوورنیە. ئێستا کە تۆ هەست بە نیگەرانی دەکەیت باشترە لەیەك جیاببینەوە و تۆ تەنیا بگەڕێیتەوە بۆ مایلا. هەرچی بێت مووناك هاوسەری تۆیە و درەنگ یان زوو لە تۆ منداڵی دەبێت و بە دڵنیاییەوە بەرگەی دووری تۆ ناگرێت. گوومان دەکەم بۆ بینینی تۆ بێتە مایلا و ئەوسا ئەگەر من لای تۆ ببینێت کاری هەردوکمان تەواوە.

لێم پرسی: تۆ چی دەکەیت؟

لەوەڵامدا ووتی: نیگەرانی من مەبە.

من بەلەمەکەی خۆم لەناو گیاکانی قەراغ ڕووباردا دادەشارم و لەدوورەوە بە دواتا دێم. ئەگەر گەشتیتە مایلا و هیچ ڕوینەدا پەیوەستت دەبم و شەو لای یەك دەبەینە سەر و جیاواز لەم شێوە خۆم دەزانم چی دەکەم. لئونا ئەمەی ووت و لەناودارەکان لەبەرچاو ون بوو. ڕێگەی مایلام گرتەبەر و ئارام ئارام بەڕێکەوتم. لەرێگا بیری سەیر و سەمەر فشاریان بۆ مێشکم دەهێنا. هەرچەندە هەوڵم دا خۆم لەم فکرانە رزگاربکەم نەمتوانی. وەك کەسێك لە زۆنکاودا گیری خواردبێت زیاتر ڕۆدەچووم.

لەم کاتەدا هەتاو گەشتبووە ناوەڕاستی ئاسمان و نیوەرۆ نزیك بوو. گەشتمە مایلاو بە ئاسانی دارێك کە لەسەری سەرقاڵی دروست کردنی شوێن خەوێك بووم بۆ خۆم، دۆزیمەوە، کاتێك گەشتمە بن دارەکە هەستم کرد دارەبڕاوەکان دەستیان لێدراوە و پرژوبڵاو بوونەتەوە.

شوێنێك کە شەوی پێشتر من و لئونای لەسەر خەوتبووین تێکدرابوو، دەتوت چەند کەسێك لەوێدا ڕۆشتوون و هەموو شتێکیان تێك و پێك داوە. بە سەرسوڕمانەوە لەدەروبەری خۆمم ڕووانی و لەم کاتەدا روبەڕوی چاوە گەورەکانی مووناك بوومەوە.

مووناك لە پەنجا هەنگاوی ئەویێ لەژێر دارێکی کوورتدا وەستابوو. دەستەکانی

لەسەر سینەی کۆکردبوویەوەو لە منی دەڕووانی. لە چاوەکانی دنیایەك نیگەرانی دەخوێنرایەوە.

لە نیگای ئەودا، حەسوودی، کینە، عەشق، سۆز، خۆشەویستی و هەمووی ئەم حاڵەتانەم پێکەوە بینی.

مووناك بە چاوانی پڕ تووڕەییەوە سەیری دەکردم. لەچاوەکانی ئاگر دەباری و منی دەسوتاند. چەند ساتێك چاومان لەسەریەك بوو: دواتر سەرم داخست و وام نیشاندا کە قسەم لەگەڵیدا نیەو ئیتر نامەوێت قسەی لەگەڵ بکەم. منی بەدبەخت نەمدەزانی ئەو چی بینیوە و چی بیستوە و هەستی بەچی کردووە. بە خوێنساردی دەستم بە کۆکردنەوەی دارەکان کرد کە شوێن خەوەکەی خۆم لەسەر دارەکە تەواوبکەم. بەڵام لێرەشدا بەتەنیا نیت.

من بەگوومانی ئەوەی لە بوونی لئونا لای من ئاگادار بۆتەوە، و ئەم بابەتانە لەسەر ئەو زانیاریانە دەڵێت سەرم سوڕماو لەچاوەکانی زەق بوومەوە و دوای چەند سات بۆ ئەوەی بەرگریم لەخۆم کردبێت و خۆم پەڕاندبێتەوە ووتم:

بەداخەوە بەو هەموو عەشقەی بەرامبەر بە تۆ هەمە ناتوانم لەبەرامبەر حەسوودی تۆدا خۆڕاگر بم. تۆ ژنێکی جوانیت و بەردەوام ژنە جوانەکان حەسوودن. بەرادەیەك زەختی لە بازووم کرد کە ئازارم لەناو ماسولکەکانم دا هەست پێکرد و ناچار ڕوم تێکرد. کاتێك ڕوبەڕوی یەك بووینەوە، دەستی بردە ژێر ئاڵقە گوڵەکە کە لەگەردنمدا بوو و بە توندوتیژی تێکەڵاو و بە نەرمی و شیرینی ووتی:

کەواتە کێ ئەم ئاڵقە گوڵەی بۆ دروست کردویت. بێهۆ بۆ هەڵخەڵەتاندنی من هەوڵ دەدەیت. بە فریشتەکانی دەریا و ڕووباری ئامازۆن کە بینەری کردەوەکانی ئێمەن سوێند ئەگەر خۆشم نەدەویستی و دڵم ڕێگەی دەدا هەمان ڕۆژ کە لە عەشقی تۆ بەرامبەر بەو ژنە داوێن پیسە ئاگاداربووم بە دەستی خۆم دەمکوشتی و دڵی تۆم کە لەبەرئەو ژنە لێیدەدا کون دەکرد. من ئەوم کوشت تابێ هیوابیت بەڵام دەبینم لێرەشدا بەتەنیا نیت و یەکێك لەژنان بۆ نەهێشتنی تەنیایی تۆ هاتووە.

بەهەمان ئەندازە کە مووناك قسەی دەکرد زیاتر تووڕە دەبوو تازە زانیم هۆی تووڕە بوونەکەی چیە. چ هەڵەیەکی گەورەم کردبوو. ئاڵقە گوڵەکەی لئونا هێشتا لەملمدا بوو نەمدەزانی مووناك مافی خۆی بوو گوومانی هەبێت هەر ژنێکی تر لە جیاتی ئەوبوایە بەبینینی ئاڵقە گوڵەکە تووڕە دەبوو حەسوودی دەکرد لەوکاتەدا خۆم بە ڕسوا دەبینی.

لەئەنجامی کارەکەم نیگەران بووم لەخۆم پرسی:

ئایا دەتوانم هەڵیخەڵەتێنم.......؟ چی بڵێم.....؟ بە چ درۆیەك قەناعەتی پێبکەم.

بەخێرایی بەسەرخۆمدا زاڵ بووم و پێکەنیم ووتم:

من مافی ئەوەم نیە بۆ خۆم لە گووڵە وەحشیەکان ئاڵقە گووڵێك دروست بکەم مەگەر من دڵم نیە...؟

لە تووڕەییدا گازی لە لچی ژێرەوەی گرت و ووتی:

ئەی سپی پێستی درۆزن........ ئەم گولاَنە بەدەستی ژنێکی عاشق کراوە بە ئاڵقە لەگەڵ ئەوەشدا بەخێرایی قسەکەی پچڕی و خۆی وەرگەڕاند و چەند کەسێکی بەناو بانگ کرد. بەخێرایی چەن ڕەشێکی چوار شانە لەناو دارەکانەوە هاتنەدەر و خۆیان گەیاندە مووناك.

تا ئەو ساتە لەبوونی ئەوان لەپشت دارەکان ئاگادار نەبووم و گووماننم دەبرد مووناك بەتەنیا هاتۆتە لای من و تازە زانیم ئەو بە تاقمێکی شەش کەسی لە ڕەشەکانی خۆی هاتۆتە ئێرە. مووناك لەیەك لەوانی پرسی ئەم گوولاَنە لەکوێی جەنگەڵدا دەڕوێن.

ڕەش پێستەکە ووتی:

لەم گوڵە لە مایلا هەیە بەلاَم جگە لە ژنانی هۆز، کەس ناتوانێت گوڵەکان بەم شێوەیە دەربهێنێت. ڕەشی ئاماژەپێدراو کە دیاربوو دڵێکی خۆشی لە من نیە زیاتر مووناکی هاندا و سەر ئەنجام کار گەشتە شوێنێك مووناك روویکردە ئەو شەش کەسە و ووتی:

لە مایلا و دەوروبەر بگەڕێن و هەر ژنێکتان دۆزیەوە بیهێنن بۆ لای من. پیاوەکان بەخێرایی دەستیان بە گەڕان کرد. دڵم دەلەرزی بەخۆمم ووت:

بە دڵنیاییەوە ئەوان لئونا دەدۆزنەوە و بەدەستگیری ئەو هەردووکمان ڕسوا دەبین و چارەنووسی ئەو ژن و پیاوە داماوەمان پێدەبڕێت و دەبینە خواردنی مێروولەکان.

ڕەنگ بە ڕوخسارمەوە نەمابوو و مووناك بە چاوەکانی خۆی چاودێری گۆڕانی حاڵەتەکانی منی دەکرد و هەموو گۆڕانکارییەکانی بە بەڵگەی گوناحکاربوونی من دەزانی و سەر ئەنجام ووتی:

هێشتا دڵنیا نەبووم لەوەی تۆ خیانەتم لێ دەکەیت..... ئەگەر بسەلمێت ! لەگەڵ ئەوەی تۆم خۆش دەوێت و منداڵەکەت لەسکمدایە دەستوور دەدەم زیندو زیندو لەئاگردا بتسوتێنن و جەستەی نیوە سووتاوی تۆ و خۆشەویستەکەت دەخەمە بەردەم تیمساحەکان.

کاتێك مووناك ئەم قسانەی دەکرد چاوەکانی پڕبوو لە فرمێسك و قوڵپی گریان لە قوڕگیدا کۆ بوویەوە لە وەڵامدا ووتم:

من پیاوێکی ئازادم و بەهەمان شێوە کە بە ئازادی و حەزی خۆم هاتمە ئێرە بە قاچی خۆم و پێش ئەوەی بمکەیتە خواردنی تیمساحەکان، بۆ شار و دیاری خۆم دەگەڕێمەوە.

مووناك دوبارە دەستی منی گرتەوە، بەڵام ئەم جارە لە تووڕەییدا دەلەرزی و بەشێوەیەك ڕەنگی ڕوخساری پەڕیبوو کە دڵم بۆی سووتا. ئەو نینۆکە تیژو بەرزەکانی لە گۆشتی بازووم چەقاند و ووتی:

تۆ ئازاد نیت.... تۆ دیلی منیت و هی منیت.... لەبەرئەوەی تۆم خۆش دەوێت بە هیچ نرخێك لە دەستت نادەم و ئەگەر ڕۆژێك بتوانیت هەڵبێیت بە دواتا دێم و لەهەر شوێنێکدا بێت دەتکوژم نەکا ژنێکی تر لە ئامێز بگریت.

لەوکاتەدا مووناك وێنەی هەموو ژنەکانی دنیا بوو. ڕوخساری ڕاستەقینەی ژنێکی حەسوود و ڕقاوی هەبوو. ژنان هەمیشە و لەهەموو شوێنێکدا یەکسانن و لە سۆز و هەستەکاندا هاوبەشن. هەموو ژنانی دنیا چ شارنشین، چ وەحشی، چ جوان چ ناشرین هەستی حەسوودیان زۆر بەهێزە. بەڵام لەناو چین و نەتەوەکاندا کەم و زۆری هەیە.

چ پیاوەکەی خۆی خۆش بووێت چ خۆشی نەوێت نایەوێت ژنێکی تر خۆشی بووێت و دڵ بدات بە ژنێکی تر.

کاتێك مووناك دەستی بەشێوەی خاچ لەسەر سینەی دانابوو و وەك مێچکە شێرێکی خوێنخۆر لەبەردەممدا وەستابوو و قسەی دەکرد، هەرگیز بیرم نەدەکردەوە لەگەڵ ژنێکی وەحشی ئامازۆنیدا ڕوبەڕوبووم. گوومانم دەکرد لە ماڵەکەی خۆم لە نیویۆرك و یەکێك لە ژنە جوانەکانی نیویۆرك لەبەرانبەرمدا وەستاوە و بەرگری لەخۆی دەکات.

جیاوازیەك کە نیویۆرك لەگەڵ جەنگەڵەکانی ئامازۆندا هەیبوو ئەمە بوو:

بۆ نمونە ئەگەر من لە نیویۆرك یان لەخاڵێکی ترلە دنیای شارستانیەت خیانەتم لە هاوسەرەکەم بکردایە ئەو بۆ بەرگری کردن و سەندنی مافەکانی خۆی شکایەتی دەبردە دادگا و بەیارمەتی یاسا سزای دەدام بەڵام لێرە لەم جەنگەڵە پڕ ترسە لەگەڵ ئەوەی من بەندە و ئەسیری مووناك بووم هیچ یاساو دادگایەکی دادپەروەر بوونی نەبوو و مووناك بەپێی دەسەڵاتێك کە هەیبوو فەرمانی بەخۆی دەدا کەس سزابات و ئەم سزادانە هیچ کات لەمەرگ و لەجێ بەجێ کردنی حوکمێکی ئامادی ئیعدام لاوازتر و بێ بەزەییتر نەبوو.

لەو خولەکە هەستیارانەدا بیرم کەوتەوە هەر ئێستا نێردراوانی مووناك لەگەڵ لئونا دەگەڕێنەوە و کاری من تەواو دەبێت. دڵنیابووم کە لئونا لە جەنەگەڵدا دەدۆزنەوە و من ڕسوادەکەن و لەم شێوەدا چاوڕێی بەزەیی و لێخۆش بوون لەلایەن مووناکەوە پێکەنیناوی بوو چوونکە دەمزانی ئەو هیچ کەس بەتایبەت من کە خیانەتم لێکردوە نابەخشێت.

سات و خولەکە پڕ ترسەکان بەسەر دەچوو. چەند کەس لە هاوڕێیانی مووناك بەدوای ژنێك، ژنێك کە ئاڵقەیەك گوڵی کردبووە ملی من دەگەڕان و تەنیا دوان لەوان لەوێ مانەوە.

چارەکە کاتژمێرێك دواتر مووناك لە کاتێکدا زەق زەق لە چاوەکانی منی دەڕوانی بەشێوەی دەستوور ڕوویکردە ئەو دوانە و ووتی:

ئێوەش بڕۆن بگەڕێن، هەموو مایلا بگەڕێن.

ئەو دوانەش ڕۆشتن. من قسەم نەدەکرد و سەرم داخستبوو و یەك یەك گوڵەکانی ئاڵقەی گەردنم لێ دەکردەوە، فڕەمدایە سەر زەوی و بەم بیانوە دەمویست بێدەنگی سەنگینی و توونودتیژی پیاوانە بپارێزم. هەرچی زیاتر قسەم دەکرد و ڕەنگە بۆ پەڕانەوەی خۆم هەوڵمدا بێ نرختر دەهاتمە بەرچاو و گرنگی خۆم لەدەست دەدا چوونکە مووناك بە فەرمانڕەوایی عادەتی بوو قسەکانی منی بە پاڕانەوە لە قەڵەم دەدا و وایدەزانی داوای لێبووردنی لێدەکەم بەڵام بێدەنگی چەکێك بوو گرنگی منی بە ڕادەیەکی هەست پێکراو زیاد دەکرد.

کاتێك دەوروبەر چۆڵ بوو هەر شەش پیاوەکە ڕۆشتن، مووناك بە هەنگاوی قورس بەرەو لای من هات و کاتێك گەشتە بەردەم من، سەیرێکی دەوروبەری کرد و چوونکە هەموو شوێنێکی بەچۆڵ بینی، دەستەکانی هێنایە پێش و بازووی منی گرت و بە نەرمی وەك پاڕانەوە ووتی: ڕاست بڵێ....

ناوچاوم مۆن کردو ووتم:

مووناك تۆ ئازارم دەدەیت و ئەم کارەی تۆ دەیکەیت بە پێچەوانەی عەقڵە چوونکە هەرچی زیاتر لە مایلا زیندانی بم لە خۆشەویستی تۆ کەم دەبێتەوە و سەرئەنجام ڕۆژێك دەگات جێگەی تۆ لە دڵمدا نەبێتەوە. مووناك بزەیەکی دەستکردی هێنایە سەر لێو و ووتی:

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە من خەنجەر بە دەستی خۆم تا دەسکەکەی لە دڵی تۆدا دەچەقێنم.

دەزانی ئەم کارەی کە تۆ نەتتوانی پڵنگەکە بکوژیت و دەبووایە ئەنجامت بدایە بەڵام...

بەڵام توانای ئەم کارەت نەبوو، دوای ئەمەش نابێت، تۆ نەخۆت دەتوانی من بکوژیت و نەتوانای ئەوەشت هەیە حوکمی ئیعدامی من دەرکەیت.

چاوەکانی مووناك پڕ بوو لە فرمێسك و بەسەرسوڕمان و غرورێکی تایبەت پرسی:

بۆ؟ ئەوەندە بە لاوازم دەزانیت؟

تۆ لاوازنیت بەڵام منت خۆش دەوێت و تاکاتێك خۆشەویستیم لە دڵی تۆدا هەبێت ناتوانیت بە مردنی من رازی بیت. بینیوتانە لەدەر، چۆن تۆفان دەبێت؟ کتوپڕ هەورە تریشقە دەگرمێنێت. بروسکەیەك دەدرەوشێتەوە و دواتر لافاوی باران لە ئاسمان دەبارێت و دەریا دەکەوێتە خرۆش.

مووناك تا ئەوسات وەك دەریایەکی ئارام بێدەنگ بوو بەڵام کە ئەم قسانەی لە زمانی منەوە بیست بازووی گرتم و بە توندی ڕایوەشاندم و ووتی:

درۆ دەکەیت... تێ ناگەیت.... من تۆم خۆش ناوێت... لەبەر ئەمە تۆم هەڵبژاردوە کە لە تۆ باشتر لەم جەنگەڵە دەست ناکەوێت... تێدەگەیت؟ من تۆم خۆش ناوێت بەو پەری خوێنساردی پێکەنیم و ووتم:

بۆ خۆت هەڵدەخەڵەتێنیت..؟ چاوەکانت پێم دەڵێت منت خۆش دەوێت و بۆ ئەوەی بۆت بسەلمێت کە منت خۆش دەوێت ئێستا تاقی دەکەمەوە.

بە خێرایی تفەنگەکەم ئامادەکردو لولەکەیم لەسەر دڵی خۆم دانا و ووتم:

ئێستا من خۆم دەکوژم تا دەرکەوێت منت خۆش دەوێت یان نە. ماڵئاوا مووناك.

مووناك وەك تیرێك کە لە کەوان دەرچێت هاتە پێش، قیژاندی و تفەنگەکەی لە دەست گرتم و فڕێیدا.

من نەمدەویست خۆم بکوژم تەنیا دەمویست ڕسوای بکەم و غروری ژنانەی بخەمە ژێر پێ بۆیە بە ئاسانی تفەنگەکەم دا بەدەستی، بەڵام ووتم:

مووناك ڕێگە بدە لێرەوە، لە ئێستاوە لەیەك جیابینەوە.... باشترە...

مووناك ووتی:

درۆم کرد.... من تۆم خۆش دەوێت... لای ئێمە بمێنەرەوە، بێ تۆ ناتوانم بژیم.

ووتم: بەمەرجێك لای تۆ دەمێنمەوە کە بەڵێن بدەیت. بەڵێن بەیت لەمە بەدوا تەنیا بۆ من ژن بیت نەك سەرۆك هۆز.

بەڵێن دەدەم....

لەم کاتەدا شەش نێردراوەکە گەڕانەوە و بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە هەواڵیان دا کە هیچ شوێن پێیەك لە مرۆڤ و بە تایبەتی لە ژنان لە مایلا بە دەست نەهێناوە.

هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی هەڵکێشاو هاوڕێ لەگەڵ مووناك و شەش نۆکەرەکەی سواری بەلەم بووین بەرەو هۆز و قەراغی چەپی ڕووبار بەڕێکەوتین.

هێشتا لە بەستێنی مایلا دورنەکەوتبووینەوە. کە دەنگی قەرەباڵغی بەگوێی گەشت و چەن خولەك دواتر بەلەمێك لە دوور دەرکەوت. بەلەمەکە چوونکە لەگەڵ رەوتی ئاودا دەڕۆشت بە زوویی لە ئێمە نزیك بوویەوە و من چەن ژن و پیاوێکم تیا بینی کە هەموویان ترساو دەهاتنە بەرچاو. بەلەمەکە لای بەلەمی ئێمە وەستا.

مووناك بەسەرسوڕمان و ناڕەحەتی پرسی:

چی بوو.......؟ بۆ دەقیژێنن؟ چی ڕوویداوە؟

یەکێك لە ژنەکان کە ڕوخساری خوێناوی بوو و دیار بوو لێدانی خواردوە و بریندار و بە ترس و لەرز دەنگێك پڕ لە ترسەوە ووتی:

یوری و ژنەکەی هاربوون و کۆمەڵێك لە ژنان و پیاوانی هۆزیان وەك خۆیان هار کردوە. ئاژاوەیەکی وا لەناو هۆزدا دروست بووە کە باوك رەحم بە کورەکەی خۆی ناکات و هەموو کەوتوونە گیانی یەك. من بە دژواری ڕام کرد و بەیارمەتی ئەم کەسانە خۆم گەیاندە ئێوە کە ئاگادارتان بکەمەوە.

مووناك لەسەرسوڕماندا دەمی داچەقاند بوو. نەیدەزانی چی بڵێت و چ بڕیارێك بگرێت. دەیزانی من یوریم خۆش دەوێت، بۆیە لەدەرکردنی حوکمی ئیعدامی ئەو گوومانی بوو، دوای ئەوەی سەیری منی کرد ووتی:

دەزانی هەرکەس لەناو هۆزی ئێمە دا هاربێت دەیکوژین.... ئەمە یاسایەکە لە هەزاران ساڵ پێش ئێستا جێ بەجێ دەکرێت.

خێرا پێکەنیم و ووتم:

ئەو هار نەبووە.

چۆن وادەڵێیت.....؟ مەگەر نابیستی کە دەڵێن کۆمەڵێکی تریشی هارکردوە.

لەگەڵ ئەمەشدا من دڵنیام یوری هار نەبووە...... ئەو بدەنە دەست من..... من ئەو و ئەوانیتریش چارەسەر دەکەم.

مووناك لە جیاتی ئەوەی وەڵامی من بداتەوە لەو ژنەی پرسی:

ئێستا لە کوێیە.....؟ دەستگیرتان کردوە....؟

ژن دەستەکانی لەیەك سوو بە ترس و نیگەرانیەوە ووتی:

کەس ناتوانێت دەستگیری بکات. هەرکەس لەماڵەکەی نزیك بێتەوە، بەشێوەیەکی وا لەلایەن یورییەوە هێرشی دەکرێتە سەر و بریندار دەبێت کە توانای هەرکارێکی لێ دەستێندرێتەوە.

من لەترسی ئەوەی نەکا تا گەشتنی من یوری بەگوومانی ئەوەی هاربووە بکەنە نیشانەی تیرە ژەهراویەکانیان و بیکوژن بەخێرایی ووتم:

زووتر بەرێکەوین، خێراکەن. من دەستگیری دەکەم.

دوو بەلەمەکە بەدوای یەکدا بەڕێکەوتین. هەمووان لە بیردا بوون و نەیاندەزانی ڕاستی چیە. تەنیا من دەمزانی یوری و ئەوانیتر بەخواردنی شەڕابی هەنجیر مەست بوون و مەستی دەکەن. بەڵام نەمدەوێرا لەمبارەوە لەگەڵ کەسدا قسە بکەم. چوونکە گوناحی خواردنی کەمتر لە هاربوون نەبوو.

بابەتەکە لای من و لای ئەوانیش گرنگ بوو بەڵام لای من بەشێوەیەك خۆی نیشان دەدا، لەلایەکیتر بۆ ئەوان گرنگ بوو، ئێوە کە ئەم دێرانە دەخوێنن دەتوانن لەم بیرەدا لەگەڵ من هاوڕابن کە یوری بۆ من گەوهەرێکی گرانبایی بوو کە لەگەڵ هیچ شتێکدا شیاوی بەراورد کردن نەبوو.

هیچ کەس و هیچ شتێك لە دنیا نەیدەتوانی بە ئەندازەی یوری بۆ من ئازیز و گرانبایی بێت. ئەو پارێزەری گیانی من بوو و تا ئەو ڕۆژە چەندین جار منی لە مردن ڕزگار کردبوو و لە قەیرانترین و مەترسیدارترین خولەکەکان گیانی منی وەك گیانی خۆی پاراستبوو.

ئێستا کاتی ئەوە بوو من لە مەترسی بیپارێزم.... ترس سەراپای گرتبوو.

وەك پێشتر ئامارەم پێدا لەوە دەترسام نەکا پێش گەشتنی من یوری بەتیرە ژەهراویەکان بکوژن و کاتێك من بگەم جەستەی بێ گیانی ببینم.

پاراستنی گیانی یوری لە دوو لاوە بۆمن گرنگ بوو، یەك ئەوەی لە گەڕانەوەدا بەکەڵکم دەهات و ئەویتر وەك پێزانینێك بەرامبەر بەو هەموو خزمەتەی بە منی کردبوو، لەمەترسی بیپارێزم مووناك و ئەوان هێشتا سەبارەت بە یوری و هاربوونەکەی قسەیان دەکرد. دوو سێ جار ووتم:

ئەو هار نیە، نەخۆشییەکی بێ ئازاری هەیە و من دەتوانم چارەسەری بکەم.

بەڵام ئەوان گرنگیان بەقسەکانی من نەدەدا و لەسەر باوەڕەکەی خۆیان سوور بوون

سەر ئەنجام گەشتینە بەستێنی چەپی رووبار. لەگەڵ ئەوەی دابەزین بەیەکێك لەو ڕەشانەی لەگەڵ مووناك هاتبوو ئێستاش لەگەڵیدا بوو ووتم:

خێرا خۆت بگەیەنە هۆز.... هەموو ڕێگا بەڕاکردن برۆ کە زۆر خێراتر لە ئێمە بگەیت و هەوڵ بدە لە یوری ئاگادار بکەیت تا من بگەم گیانی بپارێزە، تێگەشتیت.

ڕەشەکە سەری خۆی تەکاندا بەڵام نەدەڕۆشت.... سەیری مووناکی کرد... دەتوت دەیەوێت باوەڕی لەم بارەوە بزانێت مووناك وتی:

برۆ.... خێرا برۆ.

ڕەشەکە لە کاتێکدا بە ڕمە درێژەکەی خۆی لق و گەڵای دارەکانی لادەدا بەڕاکردن ڕۆشت تا لەبەرچاو ون بوو ئێمەش بەڕێکەوتین. من لە پێشەوە دەڕۆشتم مووناك بەدوامەوە بوو ئەوانیتریش بەدوای مووناك لەیەك ریزدا رێیان دەکرد.

ماوەیەك لە ڕێگامان بڕی: من وەستام و سەیری دواوەم کرد بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بینیم جگە لە من و مووناك کەسی تری لێ نیە... هەموویان ڕۆشتوون؟ ڕەنگە دواکەوتبێتن..؟ بەسەرسوڕمانەوە لە مووناکم پرسی... چییان لێهات...،؟

مووناك بزەیەکی گرت ووتی:

ئەوانم ناردە هۆزو دەستورمدا یوری ئارام بکەنەوە.

کتوپڕ نیگەرانیەکی تایبەت دڵ و ڕۆحی داگیرکردم و پرسیم:

بەڵام ئەگەر ئەوان زیانیان بە یوری گەیاندبێت...؟

ووتی: بێ هۆی خۆت ناڕەحەت مەکە... دەنگی ئاو دەبیستیت...؟

لەچەند هەنگاوی ئێمە تاڤگەیەکی جوانە... بڕۆین مەلە بکەین...

مووناك بەجووڵەیەکی خێرا خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکە... منیش بەدوایدا. گەمەی ئێمە دەستی پێکرد. ئەو لە مەلە کردندا بەتوانا بوو... زۆر زیاتر لە من دەیتوانی لە ژێر ئاودا بمێنێتەوە بۆیە من لە ژێر ئاودا نەمدۆزیەوە. لەکاتێکدا هەستم کرد هەردوو قاچمی لەژێرەوە گرتووە و لەژێر ئاو ڕامدەکێشێت.

کاتێك هەناسەم سوار بوو زۆر پەلەقاژەم کرد، ڕەهای کردم و لەچەند مەتریدا لەژێر ئاو هاتەدەر.

کاتژمێرێك یان ڕەنگە کەمێك زیاتر مەلەمان کرد. دواتر لەسەر گیاکانی قەراغ کانیەکە ڕاکشاین و حەواینەوە، لە جیاتی خواردن میوەمان خوارد و کاتێك هەتاو ئاوابوو بەرەو هۆز کە لەوێوە زۆر دوور نەبوو بەڕێکەوتین.

كاتێك نزیك هۆز بووینەوە لە دوورەوە ئاگر لەناوەڕاستی گۆڕەپانی هۆز دەبینرا. دووبارە كەوتمە بیری یوری و جۆرێك نیگەرانی و ناڕەحەتی دڵ و رۆحی داگیركردم. هەنگاوەكانی خۆم خێراتر كرد و كەمێك لە موناك دوور كەوتمەوە. بەڵام موناك بانگی كردم كە وەستام وتی:

بۆ وا بەپەلەیت دەڕۆیت....؟ لە هۆزەكەی ئێوەدا باوە شەوانە ژنان بە تەنیا لە جەنگەڵدا بەجێ بێڵن.

من كە زۆر نیگەران ببووم ووتم: بۆ یوری ناڕەحەت بووم.؟

موناك بازووی منی گرت و بە دەنگێكی كە یەك دنیا حەسوودی لێوە هەست پێ دەكرا ووتی: وام زانی تۆ تەنیا ژنانت خۆش دەوێت. بەڵام ئێستا دەبینم بەهەمان ئەندازە سەرنج بە پیاوانیش دەدەیت... تۆ هەموو كەسێكت زیاتر لە من خۆش دەوێت و من ناتوانم ئەم كارانەی تۆ تەقەبوول بكەم. موناك وردەوردە قیافەی خۆی نیشان دەدا لەپشت ئەو هەموو ڕوخسارە جوانە و ئەو ئەندامە دڵبزوێنە رۆحێكی ڕەش و ڕقاوی و دڵێكی ڕەش شاراوە بوو.

من ئەگەر سەرنجم بە سەگ و پشیلەش بدایە، موناك حەسوودی دەكرد و هەر ئەو ڕۆژەی موناك لە حەز و خۆشەویستیم بۆ یوری ئاگادار بوویەوە، دوژمنی دەستی پێكرد.

قسەكەیم پچڕاند و وتم: وانیە، تۆم زیاتر لە هەركەسێكیتر خۆش دەوێت. بەڵام یوری هاوڕێی منە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوە. تۆ نابێت حەسوودی بكەیت. من ئەوم بۆیە خۆش دەوێت چوونكە زۆری خزمەت كردوم.

موناك كە دەتوت قسەكانی منی نەبیستوە ووتی:

بەهەرحاڵ دەستورم داوە بەپێی یاسای هۆز لەگەڵیدا بجوڵێنەوە.

وەستام.... نەمزانی چیم بەسەر هات... دەستم بەلەرزین كرد. دڵم نزیك بوو لە لێدان بكەوێت. سەرم گەرم بوو و قیژاندم ووتم: چیت وت؟ بەپێی یاسای هۆز چییان لەگەڵدا كرد؟ كەواتە تۆ منت هەڵخەڵەتاند و لای كانیەكە ڕات گرتم..

وەك شێت وا بووم. تا ئەو ڕۆژە بە هەموو كارەكانی موناك ڕازی بووم. بەڵام ئەمەیان شیاوی لێ خۆش بوون نەبوو... دەستم بۆ تفەنگەكە برد و میلم هێنایەوە و بڕیارم گرت. جارێكیتر لێم پرسی چیت وت؟ چییان لەگەڵدا كرد؟ ئایا ئەویان كوشت؟

هێشتا ڕستەیەك كە دەستم پێكردبوو تەواو نەببوو كە دەنگی نەرەی چەند شێرێكی

برسی بیسترا. دەنگی شێرەکان لە نزیك ئێمە لە سەر تاشەبەردێکی گەورە کە لەلای راستی ئێمە و لەلای باشوری رۆژهەڵاتی هۆز بوو، دەبیسترا.

بەرزایی ئەو تاشەبەردە سەد مەتر هەڵبەتە ئەوەندە زۆر نەبوو، بەڵام چوونکە دارە وەحشیەکان دایانپۆشی بوو و کەلێن و بەرزو نزمی بوو، ئاژەڵەکان بە جوانی خۆیان تیادا دەشاردەوە بۆ پیاوانی هوز کە منیان دادەنا و ئەو شەوەش بەدڵنیایەوە ئێمە ئەوانمان نەدەبینی.

کاتێك دەنگی شێرەکان لە جەنگەڵدا بڵاو بوویەوە. ڕاچڵەکیم و قسەکەی خۆم پچراند بەڵام مووناك ووتی:

مەترسە... ئەم ئاژەڵانە کاریان بە ئێمە نیە... ئەوان ئەمشەو خواردنی خۆیان خواردوە و ئێستا گەمە دەکەن بە بیستنی ئەم قسانە دەتوت هەموو دنیایان کێشاوە بەسەرمدا. مەبەستی مووناك ئەوەبوو یوری خستۆتە بەردەم شێرە برسیەکان و شێرەکان ئەویان خواردوە. لە تووڕەییدا دەلەرزیم. تەنانەت نەمدەزانی بەجوانی تفەنگەکەم لەدەستمدا بگرم و ئەگەر قۆناغەکەیم لەسەر زەوی دانایە، لەدەستم دەکەوت ئارەقێکی سارد جەستەمی خوساند. قورگم گیرا و فرمێسك لە چاوەکانمدا کۆبوویەوە. ناتوانم جوان باسی بکەم چ حاڵێکم هەبوو چ هەستێك لە مندا دروست بوو... مووناك کە تا ئەوسات لەبەر چاوم فریشتەیەکی جوان بوو کە خۆی دەنواند ببووە دێوێکی خوێنخۆر و مەترسیدار و دەمویست بەخراپترین شێوە بیکوژم.

بەداخەوە ! نەمتوانی بەیەك گوولە بیکوژم... بیرم دەکردەوە (( داماو یوری... چ ئازارێکی کێشاوە چەند ترساوە تا سەرئەنجام لەژێر چنگی لەناو ددانی شێرە برسیەکان تیکە تیکە بووە مووناك هۆکاری ئەم بەدبەختیەیە.. کەواتە ئەویش دەبێت بەهەمان ئازار و زەبر بکوژرێت ))

ئەم بیرانە بە مێشکمدا تێدەپەڕی، لە هەمانکاتدا دەلەرزیم و لەئارەقدا خووسا بووم.

لەم کاتەدا نازانم چی بوو بیرم کەوتەوە کە ئەو منی خۆش دەوێت... بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی مەرگی یوری لە مندا جۆرە شتێکی کاتی کردبوو بە خۆمم ووت:

ئێستا کە ئەو منی خۆش دەوێت بە مردنی خۆم ئەشکەنجەی دەدەم. منیش خۆم دەکەمە خۆراکی شێرەکان کە ئەو ئازار بکێشێت و رەنج ببات و لەئەنجامدا تۆڵەم لێ سەندبێتەوە ئەمەم ووت و بێ ئیرادە بەرەو تاشەبەردەکە رام کرد. مووناك لە ژێر چاوەوە چاودێری منی دەکرد قیژاندی و چەند سەد مەترێك بەدەم قیژەوە بە دوامدا هات و

ووتی:

بۆ کوێ دەڕۆیت..... چی دەکەیت.... شێرەکان تیکە تیکەت دەکەن. مەڕۆ... بەڵام بێ گوێدان رامدەکرد و سەرئەنجام خۆم بەتاشە بەردێکی گەورە گەیاند و ڕۆشتمە سەری و کاتێك دڵنیابووم نە مووناك و نە کەسی تر دەستی بە من راناگات، رووم تێکردو ووتم: ئێستا کە تۆ ئازیزترین هاوڕێت لێ سەندمەوە منیش خۆم دەکەمە خۆراکی شێرەکان کە تا زیندویت ئازار ببەیت.

مووناك کە لەگەڵ تاریکی شەو لەژێر پێی خۆمدا دەمبینی و دەنگیم دەبیست بە گریان و پاڕانەوە و لالأنەوە دەیوت:

مەڕۆ... رەحمێك بکە... بەو منالەی لە تۆ لە سکمدایە رەحم کە... لای ژنانی هۆز شەرمەزار دەبم... بە نەشیاوم دەزانن.... مەڕۆ.... بە من ڕەحم کە.

کاتێك لە تاریکی شەودا لەبەردەکان دەڕۆشتمە سەر دەنگیم دەبیست.

دەتوت مووناك بە دوای مندا رادەکات، هەرچەندە لە تاشەبەردەکان سەردەکەوتم دەنگیم دەبیست بۆیە ئەم بیرەم لا دروست بوو کە ئەو بەدوامادا دێت. بەناچاری لە پشت تاشەبەردێك لە کوێستاندا خۆم شاردەوە بەم گوومانەی ئەگەر ئەو بەدوای مندا بێت بەڕێ بکات بەڵام دوای چەند خولەك کە بە ئارامی و لەهەمان کاتدا زۆر بەهێواشی تێپەڕی، هیچ دەنگێك لەو نەبیسترا. لەم چەند خولەکەشدا من حەوامەوە.

٥

ڕۆشتنە سەر لە تاشەبەردەکان بێ ئەندازە هیلاکی کردبووم. هەناسکە هەناسکم لێ دەداو ئارەق لەسەر ڕوخسارم دەباری، بەڵام ئەو چەند خولەکەی لەپشت تاشە بەردێك چاوەڕێی مووناکم دەکرد هیلاکیم ڕەواندەوە و بۆ درێژەدان بە ڕێگاکەم ئامادەبووم و لەبەرئەوەی ئیتر دەنگی مووناکم نەدەبیست بە ئاسوودەیی لە حەشارگە کەی خۆم هاتمەدەر و ڕێگەی کوێستانم گرتەبەر.

لە ڕاستیدا مەبەستی خۆکوشتنم نەبوو، ئەو بوێرییەشم نەبوو کە خۆم بخەمە بەردەم شێرە برسیەکان، بەڵکو ڕاکردنم بۆ کوێستان لەبەرئەوە بوو یەکەم لە مووناك کە هاوڕێی ئازیزەکەی کوشتبوو تۆڵە بستێنمەوە و دڵی بسوتێنم و دواتر خۆم لە مەترسیەکی گەورە ڕزگار بکەم.

ئەو ژنێکی حەسوود بوو، بە بچوکترین ڕووداو دەبزوێنرا و ئەگەری هەبوو بە هۆی سەر ڕێژ بوونی حەسوودی منیش بکوژێت و ژنێکی بێ تاوانی تر لەناوبەرێت بۆیە لەناکاو بڕیاری خۆم گرت و ڕام کرد.

نزیکەی نیو کاتژمێر لەناو تاشە بەردەکاندا ڕێم پێوا، هەوا ڕووناك بوو.

ئەستێرەکان ئەدرەوشانەوە و ئاسمان درەوشانەوە و شکۆیەکی تایبەتی بوو. مانگ تازە هاتبووە سەر و من لە ڕووناکی کەم ڕەنگی ئەو ڕێگەی خۆم دەدۆزیەوە و دەڕۆشتمە پێش.

نیوکاتژمێر دواتر گەشتمە شوێنێکی بەرز کە هەم جەنگەڵم لێوە دیار بوو هەم هۆز. لە دوورەوەماڵەکان دیمەنێکی تایبەتیان بوو. لەبەرامبەر هەرماڵێکدا ئاگرێك داگیرسابوو و ڕووناکی ئەم ئاگرانە دەستیان خستبووە دەستی یەك و دەروبەریان ڕووناك کردبوویەوە.

بەشێوەیەك من لە سەروی بەردەکان هەموو شوێنێکی هۆز، بە تایبەت گۆڕەپانی ناو ماڵەکان کە جەژن و ئیعدام و ڕێوڕەسمیەکانی تیا ئەنجام دەدرا، بە جوانی دەمبینی.

هەموو شوێنێك ئارام بوو، تەنیا هەندێ کات دەنگی نەڕەی شێرەکان لە دوورەوە دەبیسترا و ئەم دەنگە نیشانی دەدا ئەو ئاژەڵە وەحشیانە هێشتا لەناو تاشەبەردەکاندان

و لە سنووری هۆز دوور نەکەوتوونەوە. و من چوونکە لە شوێنێکی بەرز وەستابووم دڵنیابووم کە شێرەکان لە خوار من لەناو بەردەکانن و بە خۆشحاڵیەوە من لەسەرەوە ناکەومە بەر پەلاماریان.

دروست لەم کاتەدا کە سەرقاڵی سەیرکردنی دەوروبەری خۆم بووم و بارودۆخی خۆم لەبەرچاو دەگرت لەناکاو دەنگە دەنگێك بەگوێم گەشت. بێ ئیرادە و دوبارە سەرم بەرەو هۆز کە دەنگەکە لەوێوە بەگوێم گەشت سوڕا و بینیم لە گۆڕەپانی هۆز قەرباڵغییەك دروست بووە.

لە رووناکی ئاگرەکاندا بینیم کۆمەڵێك بەم لاولادا رادەکەن. دەنگی ژنێك دەبیسترا کە هاواری دەکرد. دەپاڕایەوە. کۆمەڵێك رایاندەکێشاو بەرەو دەرەوەی هۆز و بەرەو تاشەبەردەکانیان دەهێنا. لە دوورەوە بەهۆی تاریکی جوان نەمدەتوانی بزانم کێیە و تەنیا ئەوەندە تێگەشتم کە مەحکووم کراوە و رەنگە بۆ هەڵدڕین لەژێر چنگ و ددانە تیژەکانی شێرەکان بۆ ئەوێ دەبرێت.

بەسەرسوڕمانەوە لەسەر تاشەبەردەکە دانیشتم و سەیرم کرد و لەهەمان کاتدا تفەنگەکەی خۆم ئامادەکرد کە ئەگەر گوومانەکەم ببێتە راستی بە گوولەیەك ئەو ژنە داماوە بکوژم کە ئازار نەچێژێت و زوو بمرێت و ئاسوودە بێت. هیچ جۆرە مەرگێك لەوە قورستر نیە مرۆڤ بە زیندویی بخەنە بەردەم شێرە برسیەکان بە هەمان ئەندازە کە خەڵکەکە لە داوێنی کێوەکە نزیك دەبوونەوە، دەنگی شێرەکان و نەڕە ترس ئەنگێزەکانی ئەوان زیادی دەکرد. ژمارەی شێرەکانیش زۆر بوو، هەم برسی و هەم مەست و هەم دڕەندە. بە خۆمم ووت:

ئەم ئاژەڵانە ئەمشەو هاوڕێکەی من و هاوسەرەکەیان تیکە تیکە کردوە؟ ئێستا گۆشت و خوێن و پێستی یوری لە سکی ئەواندایە....؟ بەداخەوە چ هاوڕێیەکی ئازیز بوو... دوای ئەوەی من بەتەنیایی چۆن دەتوانم ژیان بکەم....؟

چۆن لەم جەنگەڵە گیان بەدەربەرم ! رێگەی گەڕانەوە نازانم... لەم کاتەدا ئەوان گەشتنە بەردەم تاشەبەرد یانی شوێنێك کە مەحکومەکەیان دادەناو خۆیان دەگەڕانەوە.

ئەوێ رێگەیەکی باریك بوو لەنێوان دوو تاشەبەردی بەرز، پانییەکەی ئەو رێگایە نزیکەی دە مەتر، کەمێك زیاتر یان کەمتر بەڵام درێژییەکەی زیاتر و لەیەك کیلۆمەتریدا بەرز و لقی لێ دەبوویەوە و بەرێگاکانی تر کە بە سەروی تاشەبەردەکە کۆتایی پێ دەهات پەیوەست دەبوو. تاوانبارانیان لە دەرگای ئەو رێگایە دادەناو بەرەلایان دەکرد و

ڕێگەی گەڕانەوەیان دەبەست. چوونکە ڕێگەیەك بۆ هەڵاتنی نەبوو. لە دوولای دیوارە بەرزی تاشەبەردەکان بوو، مەحکوم بەناچاری دەڕۆشتە پێش و سەرئەنجام دەبووە پارووی شێرە برسیەکان کە هەمیشە لەوێ لە کەمیندابوون و دەکوژرا.

من لەسەرەوە بە جوانی ئەوانم دەبینی و کاتێك گەشتنە ژێر پێی من و دەروازەی ڕێگاکە، دەنگی قیژەو ناڵەی ئەو ژنە ئاشکراتر بەگوێ دەگەشت و لەناکاو خاوەنی دەنگەکە یانی ژنە تاوانبارەکەم ناسی. ئەو لئونا دەزگیرانەکەی من بوو....

ئاخ دەیانەوێت لئونا بکوژن....؟

شۆرشێکی سەیر لەناخمدا دروست بوو. سەرم گەرم، چاوەکانم پڕ خوێن و جەستەم لەرزێکی سەیر دایگرت. لە رق وتووڕەیی ددانەکانم لەیەك گیر کرد. بۆچەند ساتێك بەتەواوی کۆنترۆڵی خۆم لە دەستداو نەمدەزانی دەبێت چی بکەم بەڵام سەرئەنجام بڕیاری خۆم گرت و لە تاشەبەردەکە سەرەوخوار شوربوومەوە.

هێشتا لەنێوان من و ئەوان مەودایەکی زۆربوو کە پیاوە رەش پێستەکانی هۆز لە شوێنی مەبەستدا دایاننا و خۆیان بەخێرایی گەڕانەوە چوونکە شێرەکان بەخێرایی نزیك دەبوونەوە. دوور نەبوو شێرەکان بەکۆمەڵ هێرش بکەنە سەر پیاوەکانی هۆز و ژمارەیەکیان لێ تیکە تیکە بکەن و لەناوبەرن بۆیە لە ترسی گیانی خۆیان لەگەڵ گەشتنە دەروازەی ڕێگاکە لئونایان بەدەستی بەستراو بەرەڵا کرد و خۆیان گەڕانەوە.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی من لە دەرفەت کەڵك وەربگرم و زووتر خۆم بگەیەنمە خوارەوە و بە ئاسوودەیی کاری خۆم ئەنجام بدەم. هێشتا نەمدەزانی هۆکاری تاوانبارکرانی لئونا چیە؟ چ گوناحێکی کردوە کە مووناك ئەم بڕیارەی لەبارەوە داوە بەڵام هەستم دەکرد لئونا گوناحێکی جگە لەخۆشەویستی بۆ من نیە و رەنگە مووناك لەمانەوەی ئەو لە مایلا لای من ئاگادار بووبێتەوە و بەمەرگ مەحکومی کردبێ بۆیە بەئەرکی سەر شانی خۆمم دەزانی یارمەتی بدەم.

بەم بیرانە بەخێرایی لە تاشەبەردەکان هاتمە خوار. هەرسات ئەگەری ئەوە بوو بەردێك لەژێر قاچمدا بخلیسکێت وبە مێشکەوە بەرەوخوار شۆڕ ببمەوە و ئێسقانەکانم لەبەرکەوتن بە بەردەکان و وردو خاشبن و دەست بەجێ گیان ئەسپەردەکەم بەڵام کە لە جۆرێك تووڕەیی و رق شێت ببووم بە هیچ شتێك جگە لە رزگارکردنی لئونا گوێم نەدەدا و بەبێ ترس دەڕۆشتمە خوار. لەوێوە بەخێرایەکی زیاتر دەستم بەکارکرد و سەرئەنجام کاتێك لئونا هاوارێکی دڵتەزێنی کێشا و بێدەنگ بوو من گەشتبوومە شوێنێك کە

تاخوارەوە نزیکەی زیاتر لە سی مەترم نەمابوو. لەو شوێنەدا کەمێك بەردی چکۆلەو گەورەم بۆ خوارەوە تل کردەوە. بەردەکان لە کاتێکدا لە سەریەك دەتلان و دەڕۆشتنە خوار، کۆمەڵێك بەردی بچووك و گەورەی تریشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. خۆشم لەگەڵ بەردەکان ڕۆشتمە خوار تا گەشتمە بەرزایی سێ مەتری بە قەڵمبازێك خۆم خستە ناو دەروازەی ڕێگاکە.

لە شوێنێکدا دابەزیم لەگەڵ شێرەکان زیاتر لە دوو سێ مەترمان بەین نەبوو. بەخۆشحاڵیەوە ژمارەی ئەو ئاژەڵانە زۆر نەبوو. هەرچەندە تاریك بوو تەنیا چوار شێرم بینی کە دەیان نەڕاند. دوو شێر بە پەنجەکانی خۆیان زەویان هەڵدەکەند و کلکیان تەکان دەدا.

چەند بەردێکم لەسەر زەوی هەڵگرت و بەدەستمەوە گرت. ئەم کارەم بووە هۆی بزواندن و شێت کردنی شێرەکان و یەك لەوان کلکی خۆی خستە نێوان دو قاچی و من تێگەشتم دەیەوێت پەلامارم بدات بۆیە یەکێك لە بەردەکانم بۆ هاویشت و جێگاکەی خۆمم گۆڕی و چەند مەترێك ڕۆشتمە دواوە. شتێك کە بۆم گرنگ بوو ئەوەبوو لئۆنا بدۆزمەوە، هیچ دەنگێکی لێ نەدەبیسترا، لئۆنا لە کوێیە؟ بڵێی شێرەکان هەڵیاندڕیبێت؟

کاتێك شوێنەکەم گۆڕی و هاتمە دواوە، شێرەکان کەمێك هاتنە پێش بەڵام لەهەمان کات نازانم بۆ پەلاماریان نەدام. ڕەنگە هێشتا تووڕە نەببوون و یان لەوانەیە لەبەر خواردنی یوری و هاوسەرەکەی تێرببوون و بێ نشتیان.

بەهەرحاڵ لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و لەدەوروبەری خۆمم ڕووانی. لە سێ چوار هەنگاویدا لئۆنام بینی بە دەستی بەستراو لەسەر زەوی کەوتووە.

کە ئەوم لەو حاڵەدا بینی گوومانم برد ڕەنگە شێرەکان هەڵیاندڕیبێت و دوای هاتنەخوارەوەی بەردەکان لێی دوور کەوتبێتنەوە. بەخێرایی خۆم پێگەیاند. بینیم لە ترسا بێ هۆش بووە، بەخۆشحاڵیەوە خەنجەرم کێشاو بەندی دەستیم کردەوە، دواتر هەڵمگرت و لەسەر تاشەبەردێك کە بەرزاییەکەی نیو مەتر بوو دامنا.

شێرەکان زۆر نزیك ببوونەوە، یەکێك لەوان کە شێرێکی نێر، یاڵدارو گەورە بوو، ڕۆشتە سەر بەرزاییەك و دەیویست لەوێوە پەلامارم بدات. دەرفەتم پێ نەدا و بەیەك گوولە لەسەر بەردەکە خستمە خوار.

تا ئەوسات لەتەقاندنی فیشەك خۆم دەپاراست. نەمدەویست دەنگی گوولە بەرز ببێتەوە و مووناك تێبگات کە من لەخۆم یان لئۆنا بەرگری دەکەم بەڵام چارەیەکم بێجگە

لەبەرگری نەبوو و سەرئەنجام بە هۆی پێویستی کارێکی مەترسیداری گەورەم کرد.

ئێستا کە تەقەکرابوو تەنیا یەك هیوام بوو ئەویش ئەوەبوو بایەك لەلایەکەوە هەڵبکات دەنگی تەقەی گوولە بەگوێی هۆز و سەرئەنجام بە گوێی مووناك نەگات و لەم کاتەشدا نەمدەتوانی هیوام بەم خاڵە هەبێت چوونکە یەکەم نەمدەزانی با لەکام لاوە هەڵیکردوە و دوەمیش دڵنیانەبووم بە هەڵکردنی با لەلای تر دەنگی گوولە بەگوێی هۆز نەگات.

شێرێك کە بە گوولە پێکرابوو، لە شوێنەکەی هەڵکەندرا و وەك کێوێك کە لەبەرزاییەکەوە داڕمێت لەبەردەم شێرەکانی تردا کەوتە سەر زەوی. ئەم کەوتنە شێرەکانی تری ڕام کرد و کەمێك ڕۆشتنە دواوە بەڵام گەڕانەوە و ئەم جارە یەکێتریان پەلاماری منی دا....

بەشێوەیەك پەلاماری دام کە گێژ ببووم و نەمتوانی خۆم کونترۆڵ کەم و لە هەوادا نیشانەم گرت. شوێنێك کە شێرەکە وەستابوو تا شوێنەکەی من هەشت مەتر دووری بوو. لەگەڵ ئەمەشدا شێرەکە بە جووڵەیەك ئەم دوورییەی بری و خۆی بە من گەیاند... خۆشبەختانە خۆم کێشایە دواوە و لە زیانی ئەو ئاژەڵە پارێزرام و بەبێ درەنگ هەر ئەوەندەی گەشتە زەوی نیشانەم گرت و مێشکیم پرژاند.

شێرەکانیتر بەشێوەیەکی کاتی ڕۆشتنە دواوە و من لەگەڵ ئەوەی هیلاك ببووم لئونام خستە سەرشان و لەو ڕێگاوەی کە هاتبووم ڕۆشتمە سەر.

شێرەکان بەدوامان‌دا دەهاتن بەڵام چوونکە ئێمە لەسەرەوە بووین، کۆنترۆڵی بارودۆخ لە دەستی مندابوو، هەر پەنجا مەتر یان سەد مەتر لئونام لەسەر زەوی دادەناو بە هاویشتنی بەرد شێرەکانم دوور دەکردەوە. و دوبارە بەهەڵگەڕان لەسەر کێوەکە درێژەم دەدا.

ئارەق لە روخسارم دەباری. کراسەکەم بە جەستەمەوە لکابوو لەگەڵ ئەوەشدا یەك ساتیش نەدەوەستام چوونکە دەمزانی وەستان بە نرخی گیانی هەردوکمان تەواو دەبێت و شێرەکان تیکە تیکەمان دەکەن، کارێکی تریشم دەکرد. ئەم کارە هەم بۆ رزگارکردنمان لە مردن بەکەڵك بوو هەم بووە هۆی زیاتر ماندوو بوونی خۆم.

لەهەمان کاتدا کە لئۆنام لەسەر شان دانابوو و لە کێوەکە دەڕۆشتمە سەر بە قاچی هەرچیم دەسکەوتایە لە دواوە بۆ خوارەوە تلم دەکردەوە.و بەرد و خۆڵ هەرچی بووایە هەندێ کات بەردە چکۆلەکان چوونکە بەخێرایی دەڕۆشتنە خوار دەبوونە هۆی

هەڵکەندران و تلێر بوونەوەی بەردەگەورەکان و کاتێك بەشێرەکان دەگەشت ترسی تیا دروست دەکردن و ئەو ئاژەڵە وەحشی و دڕندانەی لە جووڵە دەخست.

بەهەر دژواریەك بوو خۆم گەیاندەوە شوێنی یەکەمی خۆم و لەوێ لئۆنام لەسەر تاشەڕ بەردێکی پان دانا و خۆم لەپشت بەردێکی تر بۆسەم بۆ شێرەکان دانا. بەلاّم بەخۆشحاڵییەوە ئەو ئاژەڵانە ئیتر نەهاتبوونە سەر و لەنیوەی ڕێگادا گەڕابوونەوە.

کاتێك دڵنیابووم لەلایەن شێرەکانەوە ترسمان لەسەر نیە، دەستم بەسەر شان و مل و بازوی لئۆنادا هێناو دوای دژوارییەکی زۆر و تەرخانکردنی چارەکە کاتژمێریك هێنامە هۆش خۆی. لەگەڵ ئەوەی چاوەکانی کردەوە بەترسەوە لە شوێنەکەی بەرز بوویەوە ووتی: شێرەکان چیان لێ هات ! من زیندووم؟

دەستم خستە ناو دەستی و وتم:

بەڵێ ئازیزم تۆ زیندویت..... شێرەکان ڕایانکرد و من دوانیانم کوشت.

لئۆنا دەنگی منی ناسیەوە و وەك ئەوەی تا ئەو ساتە هەستی بە من نەکردبێت زەق زەق سەیری کردم و دواتر دەستی لەملم ئالاّند و دەستی بە گریان کرد.

دەستیم لە ملم جیاکردەوە و ووتم:

شوێنی گریان و نیگەرانی نیە دەبێت کارێك بکەین بە کەڵك بێت.

ئەو لە کاتێکدا بەدەست خوێنی ناوچاوی منی پاك دەکردەوە ووتی:

لە خۆشیا دەگریم..... نە لەخۆشی ئەوەی زیندوومام بەڵکو لەبەرئەوەی تۆ منت رزگارکردوە و بە ئازیز ناوم دەبەیت. ئایا راستە کە تۆمنت خۆش دەوێت و بەڕاستی پێم دەڵێیت ئازیز؟

بە گشتی من عەشقم نەدەناسی. بەلاّم بۆئەوەی لئۆنا بە ژیانی داهاتووی هیواداربێت ووتم: بەڵێ ئازیزم بەڕاستی تۆم خۆش دەوێت.

ئاخر من لە مووناك لاوازترم. ئایا بەم عەیبەشەوە منت خۆش دەوێت.

پێم ووت: بەڵێ تۆم خۆش دەوێت و لە هۆزەکەی ئێمەدا ژن تالاوازتربێ عاشقەکانی زیاترە.

دەتوت دنیایان پێداوە ئەوەندە شادمان بوو کە وەسف ناکرێت.

لێم پرسی: مووناك بۆ تۆی بە مەرگ مەحکوم کرد

روداوەکەی بەتەواوی بۆ باس کردم و ووتی:

وابزانم یەکێك لە ژنەکان کە لای ماڵی منەوە ماڵی هەیە مووناکی لە دیارنەمانی

شەوانەی من ئاگادار کردبوویەوە... چوونکە لەگەڵ ئەوەی هاتە ناو هۆز منی بانگ کرد و ووتی: (( مێردەکەم خستۆتە بەردەم شێرە برسیەکان و شێرەکان ئەویان هەڵدڕی و خواردیان )) قیژاندم و بێ ئیرادە شەقەزللەیەکی بەهێزم لەپەنا گوێی دا. لە گوومانی ئەوەی شێرەکان تۆیان هەڵدڕیوە شێت بووم و ئەم کارە مەترسیدارەم کرد و ئەو کە فێڵی بۆ ڕسوا کردنی من بەکاربردبوو. تێگەشت کە لە نێوان من و تۆدا پەیوەندی هەیە و دەست بەجێ دەستووریدا بمخەنە بەردەم شێرەکان. لەم کاتەدا کە من و لئۆنا سەرقاڵی قسەکردن بووین، لئونا لە شوێنەکەی هەستاو ووتی:

یەکێك لە پشتە سەرەوە لێت نزیك دەبێتەوە

بەخێرایی ئاوڕم دایەوە بەڵام لەتاریکیدا هیچم نەبینی. لئۆنا دەستی منی گرت و بردمیە پشت تاشەبەردێك. لەوێڕا زانیم تاقمێك لە پیاوانی هۆز کە هەستیان بەڕوداوەکان کردوە بۆ گرتنی ئێمە لە کێوەکە هاتوونە سەرو ئەوانیتریش لە هاتنەسەرەوەدان...

ئەگەری هەڵاتن نەبوو چوونکە لە ڕاکردن ئەوان چالاکتربوون. بڕیارم دا روبەڕویان ببمەوە. یەکەم کەس کە لە من نزیك بوویەوە بەقۆناغی تفەنگ لە کێوەکە خستمەخوار و دەستم بە شەڕ لەگەڵ ئەوانیتریش کرد. لئۆنا بەردی کۆدەکردەوەو لە کێوەکە دەیخستەخوارو بەم شێوە لە هاتنە سەری ئەوانیتر ڕێگری دەکرد. هەر بەردێك لئۆنا دەیخستەخوار یەك دوانی لەو کەسانەی بە دەستووری مووناك دەهاتنە سەر لەگەڵ خۆیدا دەبردە خوار و ڕەنگە دەیکوشت و لەناوی دەبرد.

ئێستا بیردەکەمەوە ئەگەر ئەو شەوە لئۆنا نەبووایە پیاوانی هۆز دەهاتنەسەرو بە ئاسانی دەستگیریان دەکردم. ئەو بوو بە هاویشتنی بەرد لە هاتنەسەری ئەوان ڕێگری دەکرد و دەرفەتی بە من دەدا شەڕیان لەگەڵدا بکەم.

کاتێك لئۆنا بەهاویشتنی بەردەکان سەرقاڵ بوو تەنیا دوو کەس هاتبوونە سەر من بەقۆناغی تفەنگ یەکیانم لەپێ خست بەڵام ئەویتریان هێشتا بەرگری دەکرد و لەگەڵ مندا شەڕی دەکرد.

دیاربوو مووناك دەستوری دابوو بە زیندوویی دەستگیرم کەن. ئەو کەدەیتوانی بەهاویشتنی بەرد و لێدان من لەپێ بخات ئەم کارەی نەدەکرد و تەنیا وەك ئەو کەسانەی دەیانەوێت کوشتی بگرن لە من دەئاڵا و هەوڵی دەدا دەستەکانم لەپشتەوە بگرێت و یان بەشێوەیەك دەستم بابدات کە توانای جووڵە لە من بستێنێت. من لەم دەرفەتە ئەوپەڕی

کەڵکم وەرگرت و سەرئەنجام یەکێك لەو جارانەی باوەشی بەمندا کرد بەشێوەیەکی وا بە لوولەی تفەنگ لەژێر چەناگەیم دا کەچەند هەنگاوێك رۆشتە دواوە و دوای هاوارێکی گوێ ئازاردەر لەسەر بەردەکان کەوت و بێهۆش بوو. کاتێك خۆم لەمەترسی رزگار کرد بڕیارمدا رابکەم بەڵام لەم کاتەدا کەوتمە بیری لئۆنا کە سەرقاڵی بەرد هاویشتن بوو. رۆشتمە هاریکاری ئەو، کاتێك گەشتم یەکێك لە پیاوەکانی خۆی گەیاندبووە سەرکێوەکە، ئەگەر ئەو دەهاتە سەر بە لەبەر چاوگرتنی ماندوویەتی و بازوە هیلاکەکانی من کارمان تەواو بوو، من زۆر زوو لەپێ دەکەوتم. خێرا پلانێکم داڕشت، لەسەر زەوی ڕاکشام و لەگەڵ ئەوەی ئەو هاتە سەر بە قۆناغە تفەنگ کێشام بە ئێسقانی سینەیدا و لە دواوە تلێر بوویەوە و لە تاریکی شەودا ون بوو.

بەکەوتنی ئەو شەڕی ئێمەش کۆتایی پێهات و من و لئۆنا بەخێرایی بەرەو لایەکیتری کێو کە لەخوارەوەی ئەو جەنگەڵە ڕەشەدا بوو، ڕامان کرد.

ناتوانم بە پێنوس و بە هیچ شێوەیەك بۆ ئێوەی روون بکەمەوە چۆن ڕامان کرد. هەرچی وزە لە جەستەماندا بوو بۆ ڕاکردن بەکارمان هێنا و هەوڵمان دەدا تا ئەو شوێنەی دەکرێت خێراتر بڕۆینە خوار.

هەرسات ئەگەری ئەوە هەبوو لەدواوە بەدواماندا بێن و بمانگرن... نیگەرانی گیانی خۆم نەبووم چوونکە دەمزانی مووناك منی خۆش دەوێت و ناتوانێت بە مەرگی من ڕازی بێت بەڵام بۆ لئۆنا دەترسام. ئەگەر جارێکیتر بکەوتایەتە دەستی مووناك بە دڵنیاییەوە بە ترسناکترین شێوە دەیکوشت.

مووناك لە هەمان کات کەجوان و خۆشەویست بوو ئەوەندە بێ بەزەیی بوو کە لە هیچ بوونەوەرێکدا نەم بینیوە و نەم بیستوە بە تایبەت لەبارەی ژنە جوانەکان بێ بەزەیی دەگەیاندە ترۆپك. لەم شێوەدا ئەوەی خێرایی بە هەنگاوەکانم دەبەخشی کە زووتر بڕۆم و لەوێ دوورکەومەوە مەترسیەك بوو کە هەڕەشەی لە گیانی لئۆنای جوان دەکرد.

سەرئەنجام لە کێوەکە ڕۆشینە خوار و چووینە ناو جەنگەڵ. ئێستا ڕاکردن لەم شوێنەدا دژواربوو. رۆشتن لەکاتی شەو لەجەنگەڵە چڕەکانی ئامازۆن کارێکی بێ مەترسی نیە. نەوەد و نۆ لەسەد ترسی مەرگی لەگەڵدایە.

دەمزانی و لئۆناش دەیزانی ڕاکردن لە جەنگەڵ بەو هەموو مار و مارمێلکە مەترسیدارانە هەڵاتنە بۆ ناو قورگی مەرگ، بەڵام دەمانتوانی چی بکەین. یەك لە سەد هیوای رزگاریمان بوو. ئەگەر دەوەستاین لە سەدا سەد مەرگ بوو. کەواتە دەبێت

ڕابکەین.

چڕی لق و گەڵای دارەکان ڕێگەکەی بەستبوو، تاریکی شەو لەمپەربوو کە ئێمە بەرپێی خۆمان ببینین بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕامان دەکرد و بەدەست هەرچی لەسەر ڕێگامان بوو لاماندەبرد و دەڕۆشتینە پێش. هەندێ کات خشەخشی مارەکان لەسەر ڕێگا وشکەکانی ژێرپێماندا دەبیسترا.... ساتێکی تر مارمێلکە چاوی زەق دەکرد و لەبەرانبەرئێمە هەڵدەبەزی و دادەبەزی. بەڵام ئێمە بێ گوێدان بە هەمووی ئەم مەترسیانە ڕامان دەکرد و بەخۆشحاڵیەوە نە مار پێوەیداین و نە مارمێلک کەمەری شکاندین.

جوان لەبیرم نیە چەند کاتژمێر ڕامانکرد بەڵام هەرچی بوو لە هۆز دوورکەوتبووینەوە. تەنیا کاتێک وەستام کە لئۆنا هیلاك ببوو. نزیك بوو لە هۆش خۆی بچێت. لئۆنا ڕەتەڵی دەبرد و لە تاریکیدا هەستم کرد خەریکە دەکەوێت. ژێر باڵیم گرت و لە ڕێگە ڕۆشتندا یارمەتیم دا. بەڵام لئۆنا بە دژواری ووتی:

من لێرە دانێ و بڕۆ... تۆ ڕاکە... ئیتر ناتوانم بە ڕێگادا بڕۆم گیانی خۆت لەبەر گیانی من بەفیڕۆ مەدە.

پێم ووت: ئەگەری نیە لێرەدا بەجێت بێڵم. ئەگەر ڕازیت چەند خولەکێك دەحەسێینەوە. لئۆنا ئیتر نەیتوانی وەڵامی من بداتەوە لە هیلاکی زۆر چاوەکانی بەست و بێ هۆش بوو. بە دەست کوێرە کوێر ژێر جەستەیم نەرم کرد و گیاکانم ساف و ڕێك کرد و خەواندم. خۆیشم لای دانیشتم پاڵم بە دارێکەوە داو بەوردی گوێم بۆ دەنگەکان هەڵخست.

هەموو ئاژەڵە وەحشیەکان شەوانە دێنەدەر و بەدوای نێچیردا دەگەڕێن. بە جوانی قیژەی مەیمونەکان، و خشەی مارەکان و نەڕەی شێرەکانم دەبیست و لە ترسا لەرزیم.

سەرەتا بڕیارمدا ئاگر ڕۆشن کەم. دەمزانی ئاگر لە نزیك بوونەوەی ئاژەڵەکان بەتایبەت شێر و پڵنگ ڕێگری دەکات بەڵام دواتر پەشیمان بوومەوە چوونکە هەڵکردنی ئاگر دەبووە هۆی ئەوەی نێردراوانی مووناك بە ئاسانی بماندۆزنەوە و دەستگیرمان کەن.

چەند خولەکێك تێپەڕی. هەناسەی لئۆنا گەڕایەوە دۆخی ئاسایی، زانیم خەوتووە، و بێ هۆش نییە، تا ڕادەیەك ئاسوودە بووم بەڵام چاوەکانی خۆیشم قورس بوو. خەو دایگرتم هەرچەندە هەوڵم دا چاوەکانم کراوە بێ و نەخەوم، نەکرا و یەك سات نەمزانی چی بوو کە لە هۆش چووم و ئیتر هەرچی ڕوویدا و هەرچی هات بە نهێنی لام مایەوە و

خەو منی داگیر کرد.

نەمزانی چەند کاتژمێرێك تێپەڕی. لە گەرمیەکی تایبەت کە لەسەر کوڵمی خۆم هەستم پێکرد لەخەو هەستام و ڕاپەریم. دەورووبەرم ڕووناك بوو.

لێرەو لەوێ تیشکی هەتاو کە لەناو لق و گەڵای دارەکان تێدەپەڕی و دەپرژایە سەر زەوی، دەبینرا. ئاه ڕۆژ بۆتەوە..... بەیانییە ! چ کاتێکی ڕۆژە، هیچ کام لەم شتانەم نەدەزانی.

ئەم گەرمیە چی بوو کوڵمی گەرم کردم؟ لەسەر سەری خۆمم ڕووانی و تیشکی هەتاوم بینی، دیار بوو هەتاو منی بێدار کردۆتەوە.

هاتە بیرم لئۆنا شەوی پێش لەگەڵمدا بوو.... کاتێك پەرێشان لە شوێنەکەم هەستام و لەولام ڕووانی بینیم خەوتووە. جلەکانی دڕاوە و تەنیا چەند تیکەی بچووك لە جەستەی دادەپۆشیێ.

چ جوانیەکی سەرسوڕهێنەر....

ڕووناکی ڕۆژ ڕوخساری ئەوی دڵگیرتر لە هەمیشە نیشان دەدا و بەتایبەت لە خەودا کە دوو ڕیز لە برژانگە ڕەشەکانی کەوتبوونە سەریەك، مرۆڤ لەسەیرکردنی تێر نەدەبوو.

لەم کاتەدا ئەویش چاوەکانی خۆی کردەوە و کە ڕوخساری منی لە بەرامبەر خۆیدا بینی بزەیەکی گرت و دەستی بەرز کردەوە....

خولەکێك دواتر لە شوێنەکەمان هەستاین. لئۆنا بەتەواوی حەسابوویەوە بەڵام دەیوت برسیەتی ئازارم دەدات. منیش برسیم بوو. لێم پرسی:

لە کوێین؟ چەندە لە هۆزەوە دوورین؟

لئۆنا سەد هەنگاوێك بەم لاولادا ڕۆشت و ووتی:

لەهۆز زۆر دوور کەوتوینەتەوە. نزیکەی ڕۆژێك ڕێگایە.

ووتم: لەم کام لادایین... لە ڕووبارەوە چەندە دوورین.

لئۆنا جارێکیتر لە دەورووبەری ڕووانی و ووتی:

گوومان دەکەم لە ڕووبارەوە نزیك بین. بەڵام لە ڕووبارەوە کەس ناتوانێت بە دوامان‌دا بێت چوونکە گێژاوێکی گەورە بە ڕێگەوەیە و کەس ناتوانێت لێی تێپەڕێت. تەنیا لە جەنگەڵەوە دەستیان بە ئێمە دەگات. ئەگەر....

بە خێرایی پرسیم: ئەگەر چی....؟

ئەگەر بتوانین خۆمان بگەیەنینە ئەوبەری ڕووبار بەتەواوی لە ئەمانداین.

دواتر لئۆنا سەیری ئاسمانی کردو ووتی:

پێم وایە نیوەڕۆیە، هەتاو لە ناوەڕاستی ئاسماندایە. ئێستا ناتوانم هیچ شوێنێك بدۆزمەوە. دەبێت بووەستین تا ئێوارەبێت تا من ڕێگە لەسەر لای ڕاست پەیابکەم.

ئێستا دەبێت برسیەتیمان نەهێڵین.

دەترسام نەکا ئەوانەی بەدوامانەوەن پێمان بگەن کاتێك بە لئۆنام ووت، ووتی:

مەترسە. ئەوان شەوانە ناوێرن بەدواماندا بێن. ناچار بەیانی بەڕێدەکەون و لەم شێوەشدا زووتر لە ئێوارە ناگەنە ئێرە ئەویش ئەگەر بەڕێگاکەی ئێمەدا بێن.

دەستخۆشیم لە هۆشیاری لئۆنا کرد و بەخەیاڵێکی ئاسوودە دەستم بە ڕاوکرد.

توتی سەیرو سەمەری تایبەت لە جەنگەڵدا بوون بەڵام نەمدەزانی کامیان بکەمە نیشانە کە بۆ خواردن بە کەڵك بێت. لئۆنا دەیووت: ئەمە بگرە، لەوەبدە.

بەڵام گوێم لە قسەکانی ئەو نەدەگرت چوونکە ئەوان شتی وایان دەخوارد من نەمدەتوانی بیخۆم و حاڵی تێك دەدام. بۆ نمونە ئەوان قەلەڕەشیان دەخوارد. لە گۆشتی بۆگەنی قەلەڕەش بێزاربووم یان ئەوان لە خواردنی مار چێژیان دەبرد بەڵام من بەبینینی دەترسام چ بگات بەخواردن.

بەم شێوە کەمێك دوورکەوتینەوە. لەم کاتەدا کەڵەکێویەکی بچووك لەبەرانبەرم تێپەڕی و بەخێرایی لەناو دارەکاندا ون بوو. کەڵە کێوی لەجەنگەڵی ئامازۆندا زۆر کەمە. بە بینینی شادمان بووم. بەدوایدا ڕام کرد. لە شوێنێکی پڕدار کە من تەنیا سەریم دەبینی، ئەو ئاژەڵە وەستا. لەپشت دارێکەوە کەمینم کرد و تەقەم کرد. گوولەی یەکەم کاری تەواوکرد و کوشتی.

خۆم پێگەیاند و سەرم بڕی بەیارمەتی لئۆنا کە لە بینینی کەڵەکێوی و کارکردنی تفەنگەکەی من شادمان بوو پێستمان داماڵی.

نیوکاتژمێر دواتر بۆنی کەباب بەرزبوویەوە و ئیشتیامانی زیاتر کرد. کاتێك کەباب ئامادەبوو، من و لئۆنا قاچمان لای ئاگرەکە درێژکرد و دەستمان بەخواردن کرد. خواردنی ئەو ڕۆژە هیچ کات بیرناکەم. تامی کەباب بەو شێوەی ئێمە دەمانخوارد و پێدەکەنین، ئێستا لەسەر زمانمدایە و چێژەکەی لەبیر ناکەم. هێشتا سەرقاڵی خواردن بووم کە لئۆنا هەستاو ڕۆشتە ناو جەنگەڵ بە کۆشێك میوە وەك مۆز و ئاناناس و پرتەقاڵی کێوی گەڕایەوە.

دوای ئەو هەموو گۆشتە چەورە، خواردنی میوە تامێکی تری بوو کە ئەویش

لەبیرناکرێت. دوای خواردن لئۆنا سەرمی خستە سەر ئەژنۆی و دەستی بە قژمدا دەهێنا و لەژێر لێویش گۆرانی دەچڕی. کاتژمێرێکی تر بەم شێوەیە تێپەڕی. لئۆنا هەستاو لە خۆری ڕووانی ووتی: لەم ڕێگاوە بڕۆین.

ئەو لای چەپی ڕێگەی دوێنێ شەوی نیشان دەدا و هەردوک بەرەو ئەوێ بەڕێکەوتین. چوونکە خیاڵمان ئاسوودە بوو لەڕێگا ڕۆشتندا پەلەمان نەدەکرد. نزیك ئێوارێ دەنگی ئاو لەدوورەوە دەبیسترا، هەنگاوەکانی خۆمان خێراتر کرد کە پێش تاریکی بگەینە ڕووبار. بەڵام بەداخەوە کاتێك گەشتین هەوا بەتەواوی تاریك ببوو.

لئۆنا ووتی: دوورتر لە بەستێنی ڕووبار داری گونجاو هەیە بەڵام پێم ووت:

چ کێشەیەکی هەیە، هەر لێرە لەسەر چەو ولمی بەستێن دەخەوین.

لئۆنا دەتوت دەترسێت، ساتێك بێدەنگ بوو و دواتر هەردوك لای یەك خەوتین. بەیانی زوو من بە دەنگی مەیمونە بچووکەکان کە بە ئەندازەی پشیلەیەکن و خۆیان بە لقی دارەکانەوە هەڵدەواسی و دەقیژێنن، لەخەو هەستام. لەهەمان کاتدا کە تازە چاوەکانی خۆم کردەوە دەستم درێژکرد تا دەست بەسەر قژی لئۆنا بێنم بەڵام لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم لئۆنا لای من نیە.

بەپەلە لە شوێنەکەم هەستام. گوومانم برد ڕەنگە بۆ هێنانی میوە ڕۆشتبێتە جەنگەڵ. چەند جار بانگم کرد بەڵام وەڵامم نەبیست. بۆ هەڵگرتنی تفەنگەکەم دەستم درێژکرد بەڵام ئەویشی لێ نەبوو. هەستامە سەر پێ، دەلەرزیم، ترس سەرتاپامی داگرتبوو.

سەیرێکی دەورووبەرم کرد، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە تفەنگەکەم دە هەنگاو ئەولاتر لای ئاوەکە بینی ئەی لئۆنا لەکوێیە؟ چەند جارێکیتر بانگم کرد بەڵام وەڵامم نەبیست. کاتێك گەڕامەوە شوێنی خۆم لەناکاو چاوم کەوتە سەر چەو و لمەکان شوێن پێیی سەیرم بینی، لای شوێن پێکەی دانیشتم و لێی ورد بوومەوە. بە جوانی یادگەی خۆمم پشکنی و سەرئەنجام گوومانم برد کە شوێن پێکە هی گووریلێکە.

لەگەڵ ئەوەی لەمە گەشتم هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا. لە زانکۆدا خوێندبووم کە گووریلی نێر زۆر حەزی لە ژنە و لەهەر شوێنێکدا ژن ببینێت بە لێهاتوویەکی سەیر دەیدزێت و دەیبات. بە خێرایی دەستم بەگەڕان کرد. لەهەمان کاتدا کە ڕام دەکرد چاوم لە شوێن پێکانی گووریل هەڵنەگرت. ئەو ئاژەڵە قورس و باریشی لەسەر شان بووە. نزیك نیوەڕۆ گەشتمە شوێنێك داری کەمتر لێ بوو بەڵام حەیزەرانی تیا ڕوابوو و

هاوشێوەی قامیشەڵان بوو.

لێرەدا شوێن پێی گوورێلەكەم ون كردو هەرچەندە گەڕام هیچ شوێنەوارێكم لەو ئاژەڵە نەبینی. بێ هیوا بووم و بڕیارمدا وەگەڕێم. لەم كاتەدا دەنگی ژنێك بیسترا و زانیم لئۆنایە.

لەم كاتەدا خۆم روبەڕوی گوورێلێكی گەورە بینی.

گووریل هەر ئەوەندەی منی بینی لئۆنای داناو بەرەو لای من هات. لئۆنا بەتەواوی ڕووت بوو. دیار بوو گووریل لە ڕێگادا تیكە تیكە جلەكانی دەرهێناوە و فڕێیداوە.

لئۆنا كاتێك خۆی ئازاد بینی بۆ ڕاكردن هەنگاوی هەڵنەگرت دەتوت توانای ئەم كارەی نیە.

گووریل لە كاتێكدا چاوی لەسەر تفەنگەكە هەڵنەدەگرت بەرەولای من هات و بە مشت دەیكێشا بە سەر سنگە گەورە و تووكاوییەكەی خۆی و ئەوەندە هاتە پێش تا گەشتە پەنجا هەنگاوی من. بە حسابێكی ورد بارودۆخی خۆم دەست نیشان كرد.

تفەنگەكەم ئامادەكرد بەڵام دەمزانی ئەگەر بە یەكەم گوولە ئەو ئاژەڵە نەكوژم لەژێر چنگ و ددانەكانی ئەو ئاژەڵە مەترسیدارە تیكە تیكە دەبم. بە دڵنیایی لەم بابەتەو لە كاتێكدا هێشتا ئەو ئاژەڵە لە من نزیك دەبوویەوە ناوچاویم نیشانە گرت و ئامادە وەستام تا نزیكتر بێت تا كاریگەری گوولە دڵنیاكەرتر بێت. لەو چەند ساتەی تفەنگ لەسەر شان و دەستم بوو ئەو ئاژەڵە گەورە و ترس ئەنگێزە خۆی بۆ شەڕ لەگەڵ من ئامادە دەكرد، بیری سەیرو سەمەر بە مێشكمدا تێپەڕی.

بیرم دەكردەوە لەم چەند كاتژمێرەدا گووریل چ بەلایەكی بەسەر لئۆنای جواندا هێناوە، ئایا دەست درێژی كردۆتە سەر؟ ئایا برینداری كردوە؟ و سەرئەنجام ئایا دەتوانم ئەم بێ تاوانە لە چنگی ئەم ئاژەڵە رزگار بكەم..؟

نەمدەتوانی وەڵامی هیچ كام لەم پرسیارانە بدەمەوە. ئەمەم باش دەزانی و لەناو كتێبەكاندا خوێند بووم كە گووریل حەزی لە ژنە وەك مرۆڤ وەك پیاو عەشقبازی لەگەڵ دەكات بەڵام ئەم خاڵەشم بۆ نامۆ بوو كە ئایا گووریل لەم چەند كاتژمێرەدا دەرفەتی عەشقبازی پێبڕاوە یان نا. ئەوەی دەمبینی ئەوەبوو گووریل جل وبەرگی لئۆنای بە تەواوەتی دڕاندووە و ڕووتی كردۆتەوە. لەلایەكیتر شوێنەواری مەستی و شەهوەت لەدەم و چاو و جووڵەكانی بە جوانی دەردەكەوت.

ئەو ئاژەڵە زلە دەمی كەفی كردبوو و كاتێك دەینەڕاند و ددانەكانی نیشان دەدا

کەفێکی سپی ڕەنگی لێ دەرژایەدەر و لەناو تووکی جەستەیدا ون دەبوو. چاوە سوورەکانی وەك دوو کاسەی خوێن سەرنجی لای من و تفەنگەکەم بوو. سووری چاوەکانی نیشانی دەدا مەستە و ئەم مەستیە هەمیشە بۆ مرۆڤێك کە بکەوێتە سەر ڕێگەی ئەم ئاژەڵە مەترسیدارە.

دەستە تووکن و نینۆکە درێژ و ڕەشەکانیم دەبینی کە بەرەو لای من درێژ دەبوون و دەیویست لە دوورەوە بمگرێت و تیکە تیکەم کات و ساتێك دواتر مشتەکانی خۆی بەست و وەك گورزێکی پۆڵایین دەیکێشا بە سنگی خۆیدا.

بەهۆی ئەم زەربانەی دەیکێشا بە سنگی خۆیدا، مووەکانی جەستەم ڕاست بوونەوە و لە ترسا دەلەرزیم. بەخێرایی لای خۆم بەراوردم کرد و ووتم:

ئەگەر نەتوانم بەیەکەم گوولە بیکوژم بەیەکێك لەم مشتانە ئێسقانی مێشکم دەشکێنێت و مێشکم دەخوات.

لە ئارەقدا خووسابووم، ئەژنۆکانم دەلەرزی و ئەم لەرزینە زیاتر دەبووە هۆی ترسی من چوونکە گوومانم دەکرد دەستیشم بلەرزێت و لەرزینێکی بچووك بەسە بۆ ئەوەی گوولە یەك مەتر لەسەروی گووریلەکە بپێکێت و من بخاتە گێژاوی مەرگەوە.

بەهەر حاڵ چارەیێکم جگە لەبەرگری لەخۆم و لئۆنای جوان نەبوو، ڕێگایەك بوو تا ئەوێ هاتبووم و دەبووا تەواوی بکەم. نەڕێگای هەڵاتن بوو نەهیوایەك بە سەرکەوتن و کوشتنی گووریل لە دڵمدا مابوو. تەنیا موعجیزە دەیتوانی لە مردن ڕزگارم بکات. دەڵێم موعجیزە ! سەرتان سوڕ نەمێنێت ئەم خاڵەتان بیربێت لە تەقەکردندا زۆر بە توانا نەبووم.

لێرەدا جێگەی یوری خاڵی بوو کە بەیەك گوولە مێشکی گووریل بپرژێنێت و من و لئۆنا لە مردن ڕزگار بکات.

گووریل هەرچی زیاتر لە من نزیك دەبوویەوە زیاتر دەبووە هۆی ترسی من و لەرزینی ئەژنۆکانم زیاتر دەبوو، ئەم حاڵەتە بەهەمان شێوە ڕوو لەزیاد بوون و کە گووریل گەشتە چوار هەنگاوی من. هێشتا تفەنگەکەم لەسەر دەست بوو و لولەکەییم بەرەو ناوچاوی گووریلەکە نیشانەگرتبوو و چاوێکی خۆم لەسەریەك دانابوو بەڵام لێتانی ناشارمەوە توانای ئەوەم نەبوو تەقە بکەم و گووریلەکە بکوژم. گووریل زۆر لە من نزیك ببوویەوە. لەترسا بەتەواوی بێ هەست و بێ جووڵەببووم. تەنانەت توانای بیرکردنەوەیشم لەدەست دابوو و کۆنترۆڵی دەمارەکانی خۆشم نەبوو. لئۆنا پاڵی بە دارەکەوە دابوو بە

چاوانی پڕ ترسەوە لە من و گووریلەکەی دەڕوانی و چارەنوسی ئەویش بەم شەڕە بەسترابوویەوە. ئەگەر گووریل سەردەکەوت لئۆنا هەم مەعشوقەکەی لەدەست دەدا و هەم لەناو دەچوو. بیری دەکردەوە من بۆ درەنگ دەکەم...؟ بۆ تەقە ناکەم........؟

گووریل هەنگاوێکی تریش نزیك بوویەوە. ئێستا دەنگی هەناسەی ئەو کە وەك دەنگی مرخەمرخی گامێشی قوربانیکراو دەهاتە گوێ، بەجوانی دەمبیست. ئەوەندە نزیك ببوویەوە ئەگەر دەستی درێژکردایە لوولەی تفەنگەکەی دەگرت بەڵام نازانم چی بوو خۆشبەختانە ئەم کارەی نەکرد.

لئۆنا لە دوایین ساتدا تێگەشت کە من کۆنترۆڵی خۆمم لە دەست داوە. زانی ترس دایگرتووم و توانای ئەوەم نیە گوولەکە بتەقێنم بۆیە بێ ئەندازە ترسا. چەند هەنگاو لەوشوێنەی گووریل هاتبووە پێش رایکرد و سەرئەنجام گووریل دەیویست پەلامارم بدات و بەچنگ و دیان ورگم هەڵدڕێت، قیژاندی.

دەنگی قیژەی لئۆنا بەهەمان ئەندازە کەمێ راچڵەکاند سەرنجی گووریلی راکێشا. گووریل لەروی غەریزەی جنسی وەك مرۆڤە. پیاوێك جووتەکەی خۆی لەبەردەم مەترسیدا دەبینێت. بێ ئیرادە دەبێت، تووڕە دەبێت و هەندێ کات کاری وا دەکات لە بارودۆخی ئاساییدا توانای ئەنجامدانی نیە.

گووریلیش وایە بۆیە هەر کە دەنگی قیژەی لئۆنای بیست بەرەولای ئەو سوڕا. گوومانی دەکرد نێچیرەکەی لەلایەن گووریلەکانی تر یان ئاژەڵە دڕندەکان پەلامار دراوە، بۆیە رای کرد و دو سێ هەنگاو بەرەو لئۆنا رۆشت. کە ئەوی بینی وەستاو دوبارە بەرەو لای من هاتەوە.

ئەم روداوە منیشی هێنایەوە هۆش وەك ئەوەی لە خەوێکی قورس و مۆتەکەیەکی مەترسیدار بە ئاگا هاتبێتم. لە ئارەقدا خووسام. جلەکانم بەهۆی تەڕی ئارەق بەجەستەمەوە لکابوون. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لئۆنا بەم فێڵە چەند چرکەیەك دەرفەتی پێدام هاتمە خۆم و دوای رێك کردنی تفەنگەکە ونیشانە گرتن قامکم لەسەر پەلەپتکە فشاردا.

دەزانی چی بوو....؟ یەك خوولەك، یەك چرکە و زۆرتر کوورتە بیر بکەنەوە و خۆتان بخەنە شوێنی من... بەدڵنیاییەوە بیرتان بۆ هیچ شتێك ناچێت و نازانن چی روویدا........؟

هیچ..... گەورەترین بەدبەختی روی تێکردم.... بەم شێوە کە ساچمەی فیشەکەکە

بەهۆی تەری هەوای جەنگەڵ گیری کردو گوولەکە نەتەقێنرا. تەنیا دەنگی تەقەیەکی زۆر کورت بیسترا و دەستی من لەترسا هاتە خوار.

لئۆنا کە لەگەڵ تفەنگەکەم و پرۆسەی کارکردنی ئاشنا نەبوو، نەیزانی چی بووە بەڵام گوومانی برد لەمپەرێك لەم رێگادا دروست بووە و لەسەر ئەم گوومانە و بەوشیاری خۆی دوبارە بڕیاریدا لەنزیك بوونەوەی گووریل بەمن رێگری بکات.

ئەم کارە بۆ لئۆنا زۆر مەترسیداربوو چوونکە دوورنەبوو ئەگەر گووریلی خۆی لەبەردەم مەترسیدا ببینایە لئۆناشی دەکوشت و لەوێدا فرێیدەدا. ئەم کارە زۆر مەترسیدار بوو بەڵام لئۆنا کە گیانی منی لە مەترسیدا دەبینی، کەمترین گرنگی بەگیانی خۆی نەدەدا.

دەنگی قیژەقیژە بەرزەکانی لئۆنا کاتێك بەرزبوویەوە کە گووریل لەمن نزیك ببوویەوە ئەم جارەیان لئۆناش بۆ ئەوەی گووریل هەڵخەڵەتێنێت و لەمنی دووركاتەوە خۆی خستە ناو گیاکان و لەبەر چاودا ون بوو. گووریلی زەبەلاح بە گوومانی ئەوەی گووریلێکی تر نێچیرەکەی بردووە ویان مار پێوەیداوە بەرەولای رایکرد.

لەم چەند چرکەدا منیش میلم دەهێنایەوە بەڵام گوولەکە لەناو لوولەکەدا گیری کردبوو و نەدەهاتە دەر من لەسەر ئەو خێراییە بووم لەبەرئەوەی پێش گەشتنی گووریل بە لئۆنا فیشەکێکی تر دانێم و تەقە بکەم، هەوڵم دەدا بەڵام ئەنجامم بەدەست نەدەهێنا چوونکە گوولەکە بەهیچ جۆرێك لە لوولەکە دەرنەدەهات. بێننە بەرچاوتان لەوکاتەدا چ حاڵێکم هەبوو و دوبارە حاڵەتی من لەبەرانبەر رووداوێکی سەیر کەرویدا وێنە بکەن. گووریل بەخێرایی خۆی گەیاندە سەر لئۆنا و ژێر باڵی گرت و بەرەو جەنگەڵ، ئەوێ کە دوبارە چری دارەکان دەستی پێدەکردەوە، رۆشت.

هێشتا چەند هەنگاو نەدەرۆشتبوو کە وەستاو نەڕەیەکی گوێ ئازاری کێشا. پشتی لەمن بوو. شتێکی گرنگم بێجگە لە پەلەقاژەی کردنی لئۆنا نەدەبینی. بەڵام گوومانم کرد رووداوێك بۆتە هۆی ئەم نەرە گوێ ئازاردەرە.

گووریل دو سێ هەنگاو بەرەو دواوە رۆشت یانی لە پشتەوە لەمن نزیك بوویەوە و دوبارە بەخێرایی بەرەو پێشەوە رایکرد بەڵام زیاتر لەدەهەنگاو نەدەرۆشتبوو کە نەڕەیەکی تری کردو وەستا. ئەوەی دووەم لە نەڕەی یەکەم بەرزتر و ترس ئەنگێزتر بوو.

چەند چرکەیەك تێپەڕی، گووریل مرخەمرخی دەکرد و هەندێ جاریش بەکورتی

دەینەڕاند. گوومانم برد رویەڕوی ئاژەڵێکی مەترسیدار بۆتەوە بەڵام ئەوەندە گێژبووم دەستم لەهەوڵدان بۆ دەرهێنانی فیشەکەکە هەڵگرت و سەیرم دەکرد.

لەم کاتەدا گووریل دەستی خۆی کردەوە و لئۆنا کە لەژێر باخەڵی دا پەلەقاژەی دەکرد کەوتە خوارو لەناو گیاکاندا ون بوو.

وەك دارێك وشك وبێ جووڵە بووم و لەپشتەوە سەیری گووریلم دەکرد.

گووریل کاتێك ژنە جوانەکەی رەهاکرد دەستەکانی خۆی بردە بەردەم سینگی و بۆ سێیەم جار هاواری کرد بەڵام من چوونکە سینگ و بەشی پێشەوەی ئاژەڵەکەم نەدەدی، لەهیچ نەگەشتم و هێشتا سەرسوڕماو وەستابووم.

ئەم جارە دەستی گووریل لەتەنیشتەوە هاتەخوار و لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم لە دەستەکانی خوێن دەچۆڕێت.

یانی چی....؟ خوێن....؟ من تەقەم نەکرد ! رەنگە لەبەر ترسی زۆر خۆم دەنگی گوولەکەم نەبیستبێت بەڵام گوولە گووریلەکەی بریندار کردوە. هێشتا لەم گوومانە پێکەنیناوی و بێهۆیەدا نقووم بووم کە گووریل چەند هەنگاوێکی تر رۆشتە پێش، رەتەڵی دەبردو سەرئەنجام سوڕاو بەپشتا درا بەزەویدا.

لێرەدا بوو ورەی خۆم بەدەست هێنا و بەخێرایی بەرەو گووریلەکە رۆشتم. دەزانن چیم بینی؟ بە دڵنیاییەوە ناتوانن گوومانی بۆ ببەن !

سێ تیر لەسنگی گووریلدا چەقیبوون و لەشوێنی تیرەکان خوێن وەك جۆگە دەهاتە خوار لەگەڵ بینینی ئەم دیمەنە لەگەڵ ئەوەی شادمان بم ترسێکی گەورەتر دایگرتم. چوونکە خێرا بیرم لەوەکردەوە کە کێ ئەم تیرانە لەگووریلداوە.

دەمزانی تەنیا وەحشیەکانی جەنگەڵ دەتوانن بەتیروکەوان تەقەبکەن. بەم شێوە ئێستا کەلەشەڕی گووریل ئاسوودە بووین، دووبارە ئەسیری وەحشیەکان و مووناك دەبینەوە.

گووریل لەم کاتەدا دوایین هەوڵی خۆی دا و چەند جار بەچەپ و راستدا سوڕا، یەك دو جار چاوە سوورەکانی خۆی کردەوە و بەستی و سەرئەنجام مرد.

بە خەمباری و ترسەوە سەرم بەرزکردەوە و سەیری شوێنەکەی لئۆنام دەکرد، لەناکاو لە شوێنەکەی خۆمدا وشك بووم چوونکە بینیم ژنێکی جوان پەرستاری لە لئۆنا دەکات و بەمیهرەبانیەکی تایبەت دەست بەسەر شانی دا دێنێت تا بەهۆشی بێنێتەوە.

هێشتا لەسەرسوڕمانی بینینی ئەو ژنە کە زۆر ئاشنا دەهاتە بەرچاوم،

نەهاتبوومەدەر کە دەنگی پیاوێکم لەپشت سەرم بیست کەدەیوت.

سەرۆك، پیاو نابێت لەکاتی مەترسیدا بشڵەژێت و دەست پێی ون کات. چی بوو ئاوا گێژببوون؟

وەك پریشکەیەك کە لە ئاگر جیادەبێتەوە سووڕام و بەدنیایەك خۆشحاڵییەوە یوریم لەبەر چاوی خۆمدا بینی.

ئاخ... یوری......؟ یوری.....؟

لە خۆشحاڵیدا بێ ئیرادە تفەنگەکەم فڕێدا و وتم:

یوری...... تۆیت؟.... تۆ زیندویت؟ بەهەڵەدا نەچووم؟

یوریش تیروکەوانەکەی خۆی فڕێدا و لەکاتێکدا تیروکەوانەکەی فڕێدا، یەکمان لە ئامێز گرت و سەرو روخساری یەکمان ماچ دەکرد، وتی:

سەرۆك..... من زیندووم، یوری بەئاسانی نامرێت و بەتەنیا جێتان ناهێڵێت. لە شادمانی زۆر دەمویست بقیژێنم. ئەوەندەی کە لە بیستنی مەرگی یوری خەمبار ببووم سەد بەرانبەر لە بینینەوەی شادمان بووم.

یوری بۆ من هەموو شتێك و هەموو کەسێك بوو چەندین جار منی لەمردن رزگار کردبوو. ئەم جارەش وەك موعجیزە بووە هۆی رزگاری من و لئۆنا. لەهەمووی سەرسوڕهێنەرتر ئەوەبوو چۆن لەدەست شێرەکان رزگاری بووە. بۆ سەدەمین جار ماچم کرد و وتم:

چۆن بوو لەمردن رزگارت بوو؟ مووناك پێی وتم تۆی خستۆتە بەردەم شێرەکان. باسی بکە.

یوری پێکەنی و وتی: من و ژنەکەم بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا رزگارمان بوو. ئەم بەسەرهاتە دووروودرێژە و دواتر بۆتی دەگێڕمەوە. ئێستا دەبێت ئەو ژنە بێنینەوە هۆش. جیاواز لەوەش ئێرە شوێنی ژیانی سەدان گووریلە و دوور نیە لەناکاو گەمارۆمان بدەن و لەناومان بەرن خێراکەن ئێستا کاتی قسەکردن نیە.

تیروکەوانەکەی خۆی هەڵگرت و دواتر تیرەخوێناویەکانی لەسك و سینەی گووریل دەرهێنا، بەگیاکان پاکی کردەوە. منیش تفەنگەکەم هەڵگرت و بەرەو لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری رۆشتم. یوری لباسەکانی خۆی دەرهێنا و وتی:

من بەولادا دەرۆم ئێوە بەخێرایی جلەکانی منی لەبەربکەن.

لئۆنا هێشتا بەهۆش نەهاتبوو، جلەکانی یوریم لەبەرکرد. یوریش بەشێوەی

وەحشیەکانی جەنگەڵ تەنیا قووماشێکی بەخۆیەوە بەست.

بەم حاڵەو لەکاتێکدا کراسێکی لێڵ رەنگی لەبەردابوو لئۆنای خستە سەرشان و هەرچوارمان بەرێکەوتین و بەخێرایی لەوێ دوور کەوتینەوە.

یوری لەرێگا و بەهەمان شێوە کە لئۆنای لەسەر شان بوو وتی:

من و کامووڕنی هاوسەرم کاتێك گەشتینە قەراغ رووبار، خۆڵەمێشی ئاگرمان بینی. سەرەتا وام زانی رەنگە وەحشیەکان لێرەوە تێپەڕیبێتن و لەم نزیکانە بن، بەڵام دواتر لەسەر چەو و لە جێگەی قۆناغە تفەنگەکەم بینی و زانیم ئێوە یان سپی پێستێکی تر لێرە بوون، لەگەڵ کامووڕندا هاتینە ناو جەنگەڵ، لەنزیکی ئەم شوێنە دەنگی قیژە بیسترا. بەخێرایی بەرەو دەنگەکە رامانکرد.

چەند خوولەك دواتر دەنگی گووریلم بیست، تیروکەوانەکەم ئامادەکرد و لەگەڵ ئەوەی ئێوەم روبەڕوی گووریل بینی دەست بەکاربووم و بەخۆشحاڵیەوە سەرکەوتم لەوەی بیکوژم.

لەرێگادا دەمویست لەیوری سەبارەت بەچۆنیەتی رزگاربوونی لەشێرەکان بپرسم بەڵام دەرفەت نەبوو چوونکە لەم کاتەدا گەشتینە شوێنی یەکەم یانی قەراغ روبارو یوری لئۆنای لەسەر چەو و لمەکان داناو هاوسەرەکەی دەست بەکار بوو و پەرستاری لێدەکرد تا بێتە هۆش و بتوانێت لە رێگەرۆشتن و هەڵاتن لەو شوێنە یارمەتیمان بدات.

لەوێ من و یوری لای یەك دانیشتین و دەستمان بەقسەکردن کرد. یوری لێی پرسیم:

سەرۆك چ پلانێکتان هەیە؟ دەتانەوێت چی بکەن.

لەوەڵامدا بیرم کردەوەو وتم:

راستیەکەت بووێت لەژیان لەم جەنگەڵە ترس ئەنگێزە بێزاربووم و دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ دنیای شارستانیەت بەڵام کێشەکە لەدوو شت دایە. یەك ئەوەی مووناك لەمن سکی پڕە و بەزووی منالی دەبێت. و ئەمە خۆی کێشەیەکی گەورەیە و بەپێچەوانەی ویژدان ناتوانم بەجێی بێڵم و بڕۆم چوونکە هەرچی بێت منالی منەو بەرانبەر بەو لێپرسراوم.

یوری پێکەنی و وتی: سەرۆك، ئێرە جەنگەڵی ئامازۆنە، لەگەڵ نیویۆرکدا بەهەڵە مەچن. ئەم جۆرە هەستانە لەم شوێنە ترس ئەنگێزەدا باوی نیە هەرگیز بیر لەو منالە و مووناك مەکەنەوە چوونکە چارەنوسیان جیاوازە. ئەگەر منالەکە کوڕ بێت لەهەمان رۆژی یەکەم دەکوژرێت و ئەگەر کچ بێت وەك دایکی دەژی ئێوە نابێت لەبەرئەم منالە خۆتان

مەخەنە قوورگی مەرگەوە. بەڵام کێشەی دووەم چییە؟

چەند ساتێك بێدەنگ بووم و دواتر وتم:

کێشەی دووەم لئۆنایە. ئەم کچە لەبەر من لەوڵات و دیاری خۆی ئاوارە بووە ئایا ویژدان رێگەدەدات لەم جەنگەڵەدا رەهای بکەم و برۆم... هاوسەرەکەی تۆش ئەم بارودۆخەی هەیە و ئەگەر بمانەوێت بگەرێینەوە بۆ دنیای پێش کەوتو ناچارین ئەوان لەگەڵ خۆمان ببەین.

یوری پێکەنی و وتی: تازە کێشەی سێیەمیش هەیە و ئەویش ئەوەیە لەرێگادا دووبارە لەگەڵ کالوویی دژمنە مەترسیدارەکەی خۆمان روبەڕو دەبینەوە و سینگوالا چاوەڕێتان دەکات و کاتێك بگەینە ئەویٚ بارودۆخی کۆن پێش دێت. بەسەرسوڕمان و نیگەرانیەوە وتم:

ئەی دەبێت چی بکەین...؟ ئایا دەبیٚ هەموو تەمەن لەم جەنگەڵەدا بمێنینەوە.

یوری شانەکانی بەرز کردەوە وتی: هەڵبەت ئاوا کارێك ئەگەری نیە بەڵام رێگایەکی تر بۆ دەرچوون لە جەنگەڵ هەیە. ئەم رێگایە بەرەولای باشووری جەنگەڵ و بەرەو زۆنگاوە مەترسیدارەکان درێژ دەبێتەوە و بەدڵنیاییەوە جگە لەوەی روبەڕوی کێشەی زۆر دەبینەوە نزیکەی ساڵێك بەرێگاوە دەبین....؟

یەك ساڵ.........؟

بەڵیٚ یەك ساڵ چوونکە رێگە ئەوەندە مەترسیدارە رۆژانە زیاتر لە سیٚ تا چوار میل ناتوانین برۆینە پێش. لەم کاتەدا قسەمان گەشتبووە ئێرە و هێشتا بڕیارم نەگرتبوو، لئۆنا هەستاو دانیشت و قسەکانی ئێمەی پچراند. من خۆم گەیاند بە لئۆنا سەریم خستە سەر سینەم و دەستم بەشانەکانیدا هێناو وتم: لئۆنا حاڵت چۆنە، چاکیت......!

لئۆنا چاوەکانی خۆی کردەوە، سەیرێکی من و دواتر سەیرێکی یوری و هاوسەرەکەی کرد و وتی: ئاه من زیندووم؟ تۆ زیندوویت....؟ یوری لەکویٚ بوو.....؟

بەشێوەیەکی کورت روداوەکەم بۆ باس کرد و دواتر لەئاوی روبارم پرژاند بەسەرو جەستەیدا. کەمێك باشتربوو بەشێوەیەك خۆی دانیشت و وتی:

ئێستا زۆر باشم... هەست بەناڕەحەتی ناکەم...

یوری تفەنگەکەی هەڵگرت و رۆشتە جەنگەڵ و دواتر بەچەند مەلێکی جەنگەڵی گەڕایەوە، مەلەکان لئۆناو هاوسەرەکەی یوری ئاوەڕوتیان کرد و کەبابیان کرد. دواتر چوارکەس لەدەوری یەك کۆبووینەوە و دەستمان بەخواردن کرد. لەم کاتەدا لە لئۆنام

پرسی: چۆن گیرۆدەی گووریلا بوویت و چۆن تۆی دزی کە من هەستم پێنەکرد.

لئۆنا بزەیەکی گرت وتی: هاوسەرێکی تازەم دەست کەوتبوو بەڵام یوری مێردەکەی کوشتم، لەم گاڵتە هەموومان پێکەنیین. لئۆنا وتی:

ئەم مەترسیە بۆ پیاوەکانیش هەیە. ئێرە شوێنێکی مەترسیدارە کە هەزاران گووریلی نێرو مێی تیا دەژی گووریلای نێر منی دزی و دوورنیە گووریلا مێیەکانیش بێنە سەر ئێوە. چوونکە لەم جەنگەڵەدا پیاوی زۆر گیرۆدەی گووریلای مێ بوون کە ژیانیان لەو ژنە ونبووەکان کەمتر نیە.

من و یوری سەیری یەکمان کرد و من بەڕاستی ترسام. لئۆنا رووداوەکەی بەو شێوەیە باس کرد:

نیوە شەو لەدەنگی خشەخشی گەڵای دارەکان لەخەو هەستام. دەستم لەژێر سەری تۆدا مابوویەوە و سڕ ببوو، بەهێواشی دەستم لەژێر سەری تۆ هەڵگرت و بەرەولای چەپ تلام. لەم کاتەدا هەستم کرد دێوێکی رەش لەبەرانبەرم وەستاوە و بەچاوەکانی خۆی کەوەك دوچرا دەدرەوشانەوە، سەیری دەکردم. سەرەتا نەمزانی ئەو ئاژەڵە چیە، وام دەزانی خەو دەبینم و لەگەڵ ئەوەشدا نەکا تۆ لە خەو هەستیت وناڕەحەت بیت نەمقیژاند. بەڵام بەڕاستی زۆر ترسابووم.

کەمێك لە شوێنەکەی خۆم راست بوومەوە تابتوانم جوانتر ببینم بەڵام هێشتا بەتەواوی سەری خۆم لەسەر چەر و لم هەڵنەگرتبوو. کە دەستەکانی هاتە پێش و بەجووڵەیەکی خێرا بازووی گرتم و لەزەوی بەرزی کردمەوە کاتێك دەستە تووکنەکانی گووریلام بەرکەوت زانیم چ بەڵایەکم بەسەرهاتووە و گیرۆدەی چ ئاژەڵێك بووم. گووریل منی خستە ژێر باخەڵی و بەشێوەیەك ئەم کارەی کرد دەرفەتی هەوڵ و پەلەقاژەم دەست نەکەوت. ویستم بقیژێنم بەڵام ئەم کارەش لەئەستۆم بەرنەهات چوونکە گووریل بەدەستی خۆی جۆرێك دەمی گرتبووم وزەختی لێدەکرد نزیك بوو بخنکێم.

جەستەم لەنێوان بازو و سینەی توکنەکەی ئەودابوو دەتوت لەنێوان دوتاشەبەردام و زەختم لێدەکەن. لە تووکی گەرمی جەستەی بێزار بووم. لەترسا دەلەرزیم و لەهەمان کاتدا توانای قیژاندنیشم لێ سەندرابوویەوە. کاتێك گووریلا دەیویست بگەرێتە دواوە تۆ لەخەودا تلایت. گووریل بەگوومانی ئەوەی تۆ لەخەو هەستاوی هاتە پێش و قاچی خۆی بەرزکردەوە تابیکێشێت بەسینەی تۆدا و ئەگەر ئەم کارەی کردبوو بەدڵنیاییەوە تۆ مردبوویت بەڵام بەخۆشحاڵیەوە ئەم کارەی نەکرد و کە دڵنیابوو تۆ لەخەودایت تەنیا

تفەنگەکەتی هەڵگرت و فڕێیدا بۆلای ئاوەکە.

ئەم ئاژەڵە ترس ئەنگێزە بەخێرایی دوور دەکەوتەوە و بچوکترین دەنگی لێوە نەدەهات. دەتوت هەست بەمەترسی دەکات و بۆراکردن لەمەترسی بەبێ دەنگ و بەخێرایی دەڕۆشت. دو سێ کاتژمێر دواتر هەوا رووناك بوویەوە. کە رۆژبوویەوە گووریل وەستا. بەزیرەکیەکی تایبەت شوێنێکی بۆ وەستان هەڵبژارد کەمن ئەگەری راکردنم نەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی لەسەر خۆی نەبێت. تا ئەوساتەی نەمزانی چ مەترسییەکی لەسەرە و وامزانی گووریل لەتۆ دەترسێت بەڵام دواتر زانیم ترسی ئەو لە شتی ترە.

گووریل منی لای دارێك داناو دەستی بەچنینی میوە کرد. بڕێکی زۆر میوەی چنی و لای من داینا. جووڵەی وای دەکرد دیاربوو دەیەوێت تێمبگەیەنێت لە میوەکان بخۆم بەڵام من چ حاڵێکم بوو..... ئەوەی هەستم دەکرد نەشیاو بۆ وەسف کردنە. خۆتان بخەنە جێگەی من تابزانن چیم کێشاوە. کاتێك دڵنیابوو لەمیوەکان ناخۆم بۆ عشق بازی هاتە پێش. شەهوەت ئەو ئاژەڵە ترس ئەنگێزەی کردبووە یەك. سەرەتا بەدەستە تووکن و گەوەرکانی خۆی دەستی بەسەرو روخسامدا هێنا. زانیم خۆراگری بێ سوودە خۆم سپارد بەقەزاوقەدەر.

کەقسەی لئۆنا گەشتە ئێرە لەئارەقدا خوسام. بیرم کردەوە ئەگەر منیش گیرۆدەی گووریلێکی مێچکە ببم ئەم چارەنوسەم دەبێت. ئاوی دەمم قوت داو پرسیم:

دواتر چی بوو.... گووریل چی لەگەڵ کردی....

لئۆنا پێکەنی و وتی:

بەڵێ سەرەتا سەری خۆی هێنایە پێش و بەزمانە زبرو گەرمەکەی دەستی بەلێسانەوەم کرد سەرو سینەو گەردنی منی لێسایەوە و ئەم کارەی بەتەماح و چێژێکی تایبەت ئەنجام دەدا. خۆشبەختانە شانس هاوکاری کردم و لەکاتێکدا کاتی ساتە مەترسیدارەکان هاتبوو، لەناکاو گووریلا نەڕاندی و لەمن دوورکەوتەوە.

من و یوری بێ ئیرادە وتمان: چی بوو....! تۆ چیت کرد....؟

لئۆنا وەڵامی دایەوە: سەیرە، وادەزانن من توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکم هەبوو. وەك مردویەکی بێ گیان کەوتبووم و خۆیشم سەرم سوڕما کەچی بوو گووریلا نەڕاندی.

بەخێرایی لە شوێنەکەی خۆم هەستام و دانیشتم لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم گووریلێکی نێری تر لێمان نزیك دەبێتەوە. گووریلی نێر بۆنی مرۆڤ و بەتایبەت بۆنی ژن

بەجوانی دەکات و لە شوێنێکی دوورەوە شوێنی دانشتنی ژنێك لەناو جەنگەڵدا دیاری دەکات. بۆنی من بووە هۆی ئەوەی گووریلێکی تر نزیك بێتەوە و بۆ داگیرکردنی من دەست بەشەڕ کات، ئێستا دەمزانی گووریل لەچی دەترسا بۆ بێدەنگ رایدەکرد ترسی لە گووریلاکانی تر بوو، ئەو دو ئاژەڵە دڕندە کەوتنە گیانی یەك. یەك کاتژمێر شەڕ درێژەی بوو، تەپ و تۆز بەرزبوویەوە و هەردوکیان دەیاننەڕاند و لەیەکیان دەدا. تا ئەوەی گووریلی یەکەم سەرکەوت و گووریلی نێری دووەم بەجەستەیەکی خوێناوی رایکرد. لێرەدابوو دووبارە گووریلا منی خستە ژێر باڵ و رایکرد و کاتژمێرێکیتر رامانکرد تاگەشتینە قامیشەلانێك. لە قامیشەلاندا وەستا، سەیری دواوەی کردو مرخەمرخی کرد. زانیم لە پشتەوە هەڕەشەی لەسەرە بەلام ئەوەندە بێ هیوا ببووم گوومانم نەدەکرد تۆ هاتبێتیت. چەند خولەکێکیتر گووریل بەخێرایی رایکرد و منیشی لەگەڵ خۆیدا برد. ئەم جارە زانیم مەترسیەکەی زۆر نزیکە و بۆ دڵنیایی قیژاندم. گوریلا تورەبوو دەیویست بمخنکێنێت کە تۆ دەرکەوتیت. ئەوە ئیتر بۆخۆت باشتر لەمن دەیزانی و بینەری بوویت.

کاتێك قسەکانی لئۆنا تەواوبوو هەمووما‌ن لەئارەقدا خوسا بووین و تەنانەت رەنگی یوریش پەڕابوو، لئۆنا وتی: دەیڵێمەوە کە ئێرە شوێنێکی مەترسیدارە و رەنگە لەناکاو بکەوینە بەر هێرشی دەستەیەك گووریلی نێرومێ. کەواتە لەبیری گیانی خۆتانا بن.

بەخێرایی هەستام و وتم: کەواتە بەڕێکەوین، بەم فەرمانە ئەوانیش لە شوێنەکەیاندا هەستان و بەرەو باشوور بەڕێکەوتین. هێشتا مەبەست و شوێنێکی دیاریکراومان نەبوو و نەماندەزانی بۆ کوێ دەبێت بڕۆین. من و لئۆنا لە پێشەوە دەڕۆشتین و یوری و هاوسەرەکەی بەدواماندا دەهاتن.

دوشەوو دو رۆژ بەم شێوە رۆشتینە پێش. رۆژی سێیەم کاتی ئاوابوونی خۆر گەشینە شوێنێك کە جەنگەڵ دەستی لێنەدرابوو. لەقەراغ روبار شوێنەواری ژیان دەبینرا بەلام لەهەموو نیشانەکانی شتێکی گرنگ هەستی پێنەدەکرا.

یوری بەبینینی دارو لقەکانی کە دیاربوو بەمشار یان کەرەستەیەکی ئاسنی براونەتەوە، پێشنیازی کرد و وتی:

بۆ ژنەکان شوێنێکی ئەمن ئامادە بکەین و خۆمان بۆ لێکۆڵینەوە بڕۆینە جەنگەڵ بەپێشنیازەکەی رازی بووم و بەخێرایی لئۆنا و هاوسەرەکەی یوریمان ناردە سەر دارێکی کۆن. ئەوان لەناو لق و گەڵاکان لەچاو ون بوون بەشێوەیەك ئەگەر خۆشمان

بمانویستایە بیاندۆزینەوە، ئەگەر بانگیان نەکردینایە نەماندەبینین.

کاتێك خەیاڵمان لەو دوانە ئاسوودەبوو بەدرێژایی روبار درێژەمان بە پێشڕەوی دا.

کەمێك بەڕێگادا رۆشتین، یوری وتی: هەوا تاریك دەبێ چوونکە کراسەکانی ئێمە روناکە لەناو لق و گەڵای دارەکانەوە دەبینرێین باشترە رووت ببینەوە.

ئەو شەڕواڵی لە پێدا نەبوو و کاتێك کراسەکەی دەرهێنا، رووت بوو تەنیا تیکە قووماشێکی لێڵ رەنگی وەك وەحشیەکان بەخۆیەوە بەستبوو منیش کراسەکەی خۆمم دەرهێناو هەر دووك کراسکانمان لەناو لق و گەڵای دارەکاندا شاردەوە و درێژەمان بە پێشڕەوی دا.

کاتێك دوایین تیشکەکانی هەتاو لەبەرزترین لقی دارکان هەڵدەگیرا لەناکاو یوری کە لەبەرانبەر مندا دەڕۆشت و تفەنگەکەی منیشی لەدەستا بوو وتی:

سەیرکەن.... بەلەم.

سەیری قەراغ روبارم کرد. بەلەمێکم بینی خاڵی و دوسەوڵ لەچەپ و راستی دانرابوو. بە بینینی بەلەم من و یوری هەمشادمان بووین و هەم ترساین. شادمانیمان بۆ ئەوەبوو ئەگەر بەلەمەکەمان بدزیایە دەمانتوانی خۆمان بگەیەنینە ئەو بەری رووبار و لەشوێنی مەترسی دوور بکەوینەوە بەڵام ترسەکەمان لەوە بوو کە بوونی مرۆڤی لەو شوێنەدا دەسەلماند و جۆرێك مەترسیتری پێ رادەگەیاندین. بەخۆمم وت:

ئەگەر لێرە روبەڕوی هۆزە وەحشیە مرۆڤ خۆرەکان کە یوری زۆر جار باسی کردبوون ببینەوە چی دەبێ، ئەوان چۆن تیکە تیکەمان دەکەن و دەمانخۆن.....؟

چەند ساتێك، واق وڕماو و بێ جووڵە ماینەوە و سەرئەنجام یوری وتی:

باشترە ناو بەلەمەکە بپشکنین و دواتر بڕۆینە ناو جەنگەڵ...

بەرەو بەلەمەکە رامانکرد و چوونکە هیچی تیانەبوو بەهەمان خێرایی بەرەو لێواری جەنگەڵ کە لەقەراغ روبارەوە پێنج سەد مەتر دوور بوو، گەڕاینەوە.

یوری نزیکەی سەد هەنگاو لەپێش منەوە بوو بۆیە خێراتر گەشت جەنگەڵ بەڵام هێشتا زۆر نەڕۆشتبوو کە چەمایەوە و ئیشارەی لەمنیش کرد بچەمێمەوە.

منیش چەمامەوە و بەکۆمە کۆم خۆم پێگەیاند و هەردووك لەپشت گیاکاندا خۆمان شاردەوە. لەترسی زۆر نزیك بوو هەناسەم بێستێت بەڵام یوری ئارام بوو و بزە لەسەر لێوەکانی دوور نەدەکەوتەوە. ئەو لە هیچ نەدەترسا. چەند خولەکێك بەترسەوە تێپەڕی و سەرئەنجام دەنگێك بیسترا. دەتوت چەند کەس پێکەوە قسە دەکەن و یان هەلهەلە

لێدەدەن.

کەمێك سەرم بەرزکردەوە تاخاوەن دەنگەکان ببینم. بەڵام یوری سەری داخستم و وتی: مرۆڤ خۆرەکان.... مرۆڤ خۆرەکانی (( یالاشی ))

ئەگەر ئەو کەمێك منی کێشایە خوار بەڵام بەبیستنی ناوی مرۆڤ خۆرەکان، خۆم تا سەر خاك کێشایە خوار. بەڕاستی ترس ئەنگێز بوو، تا ئەو رۆژە ناوی مرۆڤ خۆرەکانم بیستبوو بەڵام هیچ کات خۆم لەچەند مەتری ئەواندا نەبینیبوو و ئێستا کەمرۆڤ خۆرەکان لەبەرانبەرماندا بوون. بەڕاستی شوێنی ترس بوو. دەنگەکان نزیك دەبوونەوە تائەوەی گەشتنە چەند هەنگاوی ئێمە. لەگەڵ تاریکی ئێواریَ کۆمەڵێکی دەکەسیم لە وەحشیەکان بینی بەرەو بەلەمەکە دڕۆن.

لە بەرانبەر ئێمەوە تێپەڕین بەڵام ئێمەیان نەبینی کە لەپشت گیاکانەوە خۆمان داشاردبوو. دوای چەند خولەك سوار بەلەمەکە بوون و بەخێرایی لەقەراغ روبار دوورکەوتنەوە.

کاتێك ئەوان رۆشتن دڵۆپە گەورەکانیَ ئارەق لەروخسارم دەچۆڕا و جەستەم ساردببوو و دەلەرزیم لە یوریم پرسی: دەبێت چی بکەین؟ رابکەین.

یوری وتی: نا..... کەرەستەی راکردنمان نیە. دەبێت لێرە خۆمان وەشارین، شوێنی نیشتەجیَ بوونی ئەم هۆزە لەوبەر روبارە و دیار نیە بۆچی هاتوون بۆ ئێرە بەرهەحاڵ دەبێت ئەمشەو بگەڕێینەوە لای لئۆناو کاموونی و تابەیانی بیرێك بکەینەوە.

بەدوایدا رۆشتم بەچەند هەنگاو دووری. دەتوت لەجەهەنەم رادەکەم. دەتوت دەمەوێت لەدەست پاشای دۆزەخ هەڵبێم. هەستم دەکرد لەپشت سەرم مرۆڤ خۆرەکان رادەکەن و چنگ دەهاون تابمانگرن.

هەڵبەت هەموو ئەمانە هەمووی فکرو خەیاڵ بوو و من لەهەمان کاتدا کە دەمزانی تووشی خەیاڵ بووم، دەترسام. بەگشتی بینینی قیافەی مرۆڤ خۆرەکان ترسێکی وای تیادروست کردم کەشیاونیە بۆ وەسف کردن. لەو جەنگەڵە چاوەڕوانی هەر روبەڕوبوونەوە لەگەڵ هەموو روداوە ترس ئەنگێزەکان بووم جگە لەوەی رۆژێك روبەڕوی هۆزی مرۆڤ خۆرەکان ببمەوە و یان گرفتاریان ببم، ئێوە کە ئەم دیڕانە دەخوێننەوە رەنگە نەتوانن رادەی ترسی من هەست پێبکەن. مافی خۆتانە چوونکە تەنیا کەسێك دەتوانێت تێبگات کە من چ حاڵێکم بووە خۆی لەو شوێنەدا گیری کردبێت و روبەڕوی ئەم دیمەنە بووبێتەوە.

مرۆڤ خۆرەکان مووناك و پیاوەکانی نەبوون.... نازی منیان هەڵنەدەگرت. لەگەڵ ئەوان نەمدەتوانی گاڵتە بکەم چوونکە گیان و ژیان لەئارادابوو. ئەم رووداوە هەڵگری گاڵتە نەبوو. خێرایی هەنگاوەکانی خۆم زیاد کرد تاگەشتمە شان بەشانی یوری کە لەوپەری خوێنساردیدا دەڕۆشت و بیری دەکردەوە. دەمویست یوری بازووم بگرێت تاکەمێك لەترسەکەم کەم ببێتەوە. دەمویست یەك دو هەنگاو لەپێش یوریەوە بم تا ئەو بکەوێتە پشت سەرم و ئاگاداریم بکات لە پشتەوە لەلایەن مرۆڤ خۆرەکانەوە هێرشم نەکرێتە سەر.

رێگایەك کە کاتی رۆشتن گرنگیم بە درێژییەکەی نەدەدا کاتی گەڕانەوە ئەوەندە درێژ وترس ئەنگێز ببوو کە هەرساتێکی یەك ساڵ و هەرهەنگاوێکی یەك کیلۆمەتر دەهاتە بەرچاو. نازانم بۆ رێگا درێژببوویەوە. وئێمە نەدەگەشتینە ئەو دارەکۆنەی لئۆناو هاوسەرەکەی یوری لەسەر بوون.....؟

بەدرێژایی رێگا هەزاران بیرو خەیاڵم کردەوە. حاڵی مەحکوم بە ئیعدامێکم بوو کەدوایین شەوی ژیانی بەسەر دەبات و دەزانێت بەیانی لەسەر کورسی کارەبایی دایدەنیشێنن. منیش کە مرۆڤ خۆرەکانم بینی ئەم حاڵەتە دەستی پێدام و دڵنیابووم بەیانی گیرۆدەیان دەبم و لەناو سکیاندا هەرس دەبم.

٦

بەهەر شێوەیەك بوو گەشتینە دارەکەو لێی ڕۆشتینە سەر و لەسەر لقێکی ئەستوور و پان کە شوێنی دانیشتنی دەکەس دەبوو لای لئۆنا دانیشتم. لە گۆشتی مەلەکان کەمێك مابوویەوە لئۆنا خواردی و یوری و هاوسەرکەشی بەو پەری خوێنساردی سکی خۆیان تێرکرد بەڵام من دەمم وشك ببوو وەك ئەو کەسانەی تایان هەبێت، ئیشتیام نەبوو. بەخۆمم وت:

بەدڵنیاییەوە بەیانی بەدەست مرۆڤ خۆرەکان دیل و تیکە تیکە دەکرێین. لەم شێوەدا چ پێویستیەکم بە خواردن هەیە. برسی بم راحەت تر دەمرم. دوای خواردن جارێکیتر لەگەڵ یوری سەبارەت بە ڕێگاکانی ڕاکردن قسەمان کرد بەڵام لەبارەی ئەوەی بینیبوومان یانی ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ مرۆڤ خۆرەکانی یالاشی هیچمان نەوت و بەشێوەیەکی نهێنی قسمان دەکرد کە لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری تێنەگەن. کاتێك دەمانویست ناوی مرۆڤ خۆرەکان ببەین بە ئنگلیزی قسەمان دەکرد و ئەوان هەستیان بە مەبەستەکەی ئێمە نەدەکرد.

ئەگەر لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری بیانزانیایە ئێستا کە لەنزیك مرۆڤ خۆرەکاندا نیشتە جێین بە دڵنیاییەوە دەترسان ولەبەرئەوەی ژن و لاوازبوون دەبوونە هۆی ناڕەحەتی و نیگەرانی ئێمە.

یوری لەبارەی راکردن لەو شوێنە وتی: ئێستاکە هیچ ڕێگایەك بۆ ڕاکردن نیە. لەڕێگەی جەنگەڵەوە ڕێگا ئەوەندە مەترسیدارە یەکسانە لەگەڵ مەرگ. بە بۆچوونی من سەفەرکردن لەورێگاکە زیاتر لەیەك ساڵ دەخایەنێت جۆرێك خۆ کوشتنە چوونکە تا ئێستا هیچ مرۆڤێك لە زۆنگاوەکان بەزیندوویی دەرنەچووە. لەڕێگەی سەرەوش ڕێگەی هەڵاتنمان نیە چوونکە ڕوبەڕوی دانیشتوانی هۆزەکەی مووناك دەبینەوە و شتێکی سروشتیە کە ئەوان بە زیندوویی نامانهێڵنەوە بەتایبەت ئەگەر لئۆنایشمان لەگەڵدا بێت. تەنیا لەڕێگەی ڕوبارەوە دەتوانین بڕۆینە پێش و یان ئەوەی خۆمان بگەیەنینە ئەوبەر و لەم شێوەیشدا ڕوبەڕوی هۆزی مرۆڤ خۆرو زۆر وەحشی یالاشی دەبینەوە.

بەترس و نیگەرانیەوە پرسیم: بە بۆچوونی تۆ دەبێت چی بکەین....؟

یوری بۆ چەند ساتێك بیری کردەوە و وتی: ئێستا دەبێت لەم شوێنەو لەسەر ئەم دارە کەشوێنێکی ئارام و دڵنیایە بمێنینەوە. هەڵبەت مانەوەی ئێمە لێرە زۆر ناخایەنێت چوونکە گیرۆدەی مرۆڤ خۆرەکان دەبین و ئەوان دەمانبینن و دیلمان دەکەن و دەمانخۆن ویان ئەوی بەخویندنەوەیەکی تەواو رێگایەك بۆ هەلاتن دەدۆزینەوە.

لەم کاتەدا لئۆنا سەری خستە سەر شانی من و چاوەکانی بەست و خەوت. یوری و هاوسەرەکەشی لەسەر لقی دارەکە جوامیلکەیان دایەوە و خەوتن. تەنیا من بەئاگابووم و نەمدەتوانی بخەوم.

مێشك و دەمارەکانم نارەحەت بوو لەگەڵ بیستنی بچوکترین دەنگێك وەك کەسانێك دەستیان بە وایەری رووتی کارەباوە بێت، رادەچڵەکیم و بەم راچڵەکانەش لئۆناش ئاگای دەبوویەوە و چوونکە لە رووداوەکە ئاگادار نەبوو هەناسەیەکی هەڵدەکێشاو خەوی لێدەکەوتەوە.

نازانم چەند کاتژمێر بەم شێوە تێپەڕی و چ کاتێکی شەو بوو کە چاوەکانم هیلاك و پێڵوەکانم قورس بوو و خەو بردمیەوە. کاتێك چاوەکانم کردەوە هەستم کرد جەستەم دێشێت و سەری لئۆناش لەسەر شانم نیە. بە بیرەوەریەك کە لە ون بوونی جاری پێشووی لئۆنا هەمبوو لەشوێنەکەم بەرزبوومەوە و لە دەوروبەری خۆمم ڕوانی. بەلام بەوپەڕی شادمانیەوە بینیم لئۆنا کەمێك ئەولاتر دانیشتووە و لەگەڵ مەیمونێکدا یاری دەکات. مەیمون چەند مۆزێکی بۆ هێنابوو و لئۆناش یەکێك لەوانی پاك کردبوو و دەیخوارد و کەمێکیشی دەخستە دەمی مەیمونەکە کە هەڵبەزو دابەزی دەکرد.

من بیرەوەری شەوی پێش و ئەو هەموو نارەحەتی ونیگەرانیەم لەبیرکردبوو سەرقاڵی سەیرکردنی ئەو دیمەنە تازە بووم و چێژم دەبرد.

دوای چەند خولەك لئۆنا هەستی بەوەکرد کەمنیش هەستاوم، لەسەر لقەکە بەرێگادا رۆشت و هاتە لای من، مۆزێکی پاك کردو دایەدەستم. من کەشەوێ هیچم نەخواردبوو برسی بووم. بەچێژێکی زۆرەوە مۆزەکەم خوارد و لە لئۆنام پرسی:

یوری و هاوسەرکەی لە کوێن.

سەری خۆی بەرزکردەوەو لەلابەلای لقە چرەکانی دا شوێنێکی بەرزی نیشان دام و وتی: سەیرکە ئەوان چوونەکوێ.

سەیرم کرد ئەوانم لەسەر بەرزترین لقی دارەکەبینی. هاوسەرکەی یوری سەرقاڵی خواردنی میوەبوو بەلام یوری لەدوورەوە لە شتێکی دەڕوانی و دەستی لەسەر برۆی

دانابوو تا تیشکی هەتاو کە تازە لەنووکی دارەکانی دەدا، لەچاوی نەدات. لەم کاتەدا بوو کەوتمە بیری مرۆڤ خۆرەکانی یالاشی. دەتوت ئیتر ترسم نیە و یان ئەگەر دەترسم بەرادەی شەوی پێش نیە زانیم ترسی بێ وێنەی دوێ شەو بەهۆی تاریکیەوە بووە و بەنەمانی تاریکی لەتووند وتیژی ترسەکەم کەم بۆتەوەو لە لایەکیتر fەهۆی حەسانەوە دەمارەکانم ئارام بۆتەوە.

من و لئۆناش لە لقەکان رۆشتینە سەر وخۆمان گەیاندە ئەو شوێنەی ئەوان لیێ دانیشتبوون. شوێنێکی بەرزو جوان بوو. روبار لەژێر قاچی ئێمە لەخرۆشاندابوو. جەنگەڵیش تاڕادەیەکی کەم لەژێر پێماندا بوو. وادەهاتە بەرچاو ئەودارەو و شوێنێک کە ئێمە هەڵمان بژاردوە لانی کەم دە مەتر لە لقی دارکانیتر بەرزترە.

یوری بەیانی زوو رۆشتبووە جەنگەڵ و بڕێکی زۆر میوەی وەحشی چنیبوو. یەك لەمیوەکان لە کەدو دەچو تامێکی زۆر شیرین و دڵگیری بوو. وامزانی رەنگە جۆرێك ئاناناس بێت بەڵام یوری وتی ئەمە ئاناناس نیە بەڵام کەدوی وەحشیەو دارێکی گەورەی هەیە. کاتێك لقی ئەو دارە بەردەگرێت ئەوەندە قورس دەبێت کە تاسەر زەوی دەنوشتێتەوە.

لەو میوەم زۆر خوارد و تێر بووم. ئێمە هێشتا سەرقاڵی خواردن بووین و قسەمان دەکرد کە لەناکاو یوری لە شوێنەکەی خۆیدا هەستاو دەستی بەهەمان شێوە خستە سەر برۆی و دوای چەند سات لە کاتێکدا رەنگی پەڕابوو وتی:

سەیرکە مرۆڤ خۆرەکان بەرەو ئێرە دێن.

ئەم جارە بێ ئاگایی ئەو بووە هۆی ئەوەی لئۆناو هاوسەرەکەشی تێبگەن.

ئەو دوانە زۆر ترسابوون لئۆنا دەلەرزی و وتی: چی بکەین......؟ چ دەبێت......؟

پێم وت: مەترسە ئازیزم. تفەنگم پێیە.جیاواز لەوەش ئێمە لەسەر دارەکەین، هەرکەس نزیك ببێتەوە دەکوژرێت لەلایەکیتر دیارنیە کە ئەوان کاریان بە ئێمە بێت.

راستیش دیارنەبوو کە ئەوان کاریان هەبێت.... بەرەو لای ئێمە دەهاتن بەڵام زیاتر سەرنجیان لای قەراغی روبار بوو. ژمارەیان زۆر پەرێشان بوون.... کاتێك جوان نزیك بوونەوە یوری وتی: سەیرکە کۆمەڵێك ژن و منداڵیشیان لەگەڵدایە.

ئێمە زەق زەق سەیرمان دەکردن بەڵام لەهەمان کات لەپشت لق و گەڵاکان خۆمان داشاردبوو تانەبینرێین. لئۆنا بازوی گرتبووم و فشاری دەدا و هیچ هەستی بەوەنەدەکرد کە نینۆکەکانی لەگۆشتەکەم دەچەقێنێت. چەند خولەکێك بەترس

وناڕەحەتیەکی سەیر تێپەڕی. دڵم وەك دڵی مەلێك کە بیانەوێت سەری ببڕن و چەقۆ لەدەستی قەسابدا ببینێت لێدەدا و نزیك بوو لەقەفەسەی سینەم بێتەدەر. قورگم لەترسی و ناڕەحەتی زۆر دەگوشرا، تفەنگەکەم لەدەست گرتبوو فشارم دەدا بەڵام دەستم بەڕادەیەك دەلەرزی کەتفەنگەکەشم تەکانی دەخوارد.

لەم بگرە وێنەدا بووین کە ئەوان گەشتنە نزیك دارەکەی ئێمە و سەرنجیان بەرەو قەراغ روبار راکێشرا. لێرەدابوو کە روبەڕوی دیمەنێکی سەیر بووینەوە.

دەنگە دەنگی زۆریان لێوە دەبیسترا، ژنان و پیاوان و منداڵەکان دەیانقیژاند و دەتوت شێن و رۆ رۆدەکەن یوری جوان ورد بوویەوە وتی:

سەیرکەن دەیانەوێت ئەم تاقمە بخەنە ناو ئاوی روبارو بیانکوژن. منیش وردبوومەوە بینیم کە چەند لە پیاوە زلەکان لە کاتێکدا تیروکەوانیان لەدەستابوو و تیر لەناو کەوان ئامادە بوون و نیشانەیان لە قەرەباڵغیەکە گرتبوو بۆ پێشەوە پاڵیان پێوە دەنان. چەند ژنێکی جوانیش لەناویاندا بوون. دەڵێم جوان سەرتان سورنەمێنێت چوونکە ژنانی هۆزەکانی ئامازۆن هەموویان خۆش ئەندام و بەزۆری جوانن و چوونکە پێستێکی قاوەیی رەنگیان بوو وەك ژنە جوان و روخسارەکانی هیندی خۆیان دەنواند.

مەحکومین لەیەك دەئاڵان، پێچیان دەخوارد و دەڕۆشتنە پێش بەڵام ئەوانەی کە هەرەشەیان دەکرد تەنیا چوار کەس بوون. چوارکەس چەکدارو ئەوانیان بۆ پێشەوە برد کە لەئاوی رووباردا بیانخنکێنن. ئەو چوارە هەندێك شتێکیان دەوت و لە قەرەباڵغیەکەش وەڵامیان دەدرایەوە. یوری بۆ قسەکانی ئەوان کە جوان دەبیسترا گوێی هەڵخست و وتی: سەیرە، من لەقسەکانی ئەوان تێدەگەم..... یانی چی.....؟

وتم: رەنگە زمانی ئەوان هاوشێوەی زمانی هۆزەکانی تر بێ و تۆ بەهۆی لێکچونی وشەکانەوە تێدەگەیت. هەرگیز لێکچوون لەنێوانیاندا نیە بەڵام خۆیشم نازانم چۆن تێدەگەم. چی دەڵێن؟

یوری لەکاتێکدا بزەیەکی رەزامەندی لەسەر لێو بوو وتی:

بەخۆشحاڵیەوە ئەمانە وەحشی و مرۆڤ خۆر نین. ئەمانە کە دەیبینی مەحکووم کراون بەمەرگ لە هۆزێك و تیرهاوێژەکان لە هۆزێکی ترن کە بەردەوام پێکەوە لەشەڕدان.

بەخۆشحاڵیەوە پرسیم:

کەواتە مرۆڤ خۆر لەم جەنگەڵەدانیە.

یوری وتی: بۆ نا..... ئەوانەی دوێ شەو بینیمان مرۆڤ خۆر بوون بەڵام بەنهێنی بۆ

پشکنین هاتبوونە ئەمبەر روبار و بەخێرایی گەڕانەوە. ئەوان لەترسی ئەم هۆزە ورەی نزیك بوونەوە لە قەراغی راستیان نیە. بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

تۆ ئەم زانیاریانەت لەکوێوە هێناوە؟

یوری سەیری کردم و وتی: خۆیشم نازانم بەڵام هەرچی دەڵێم لەراستیەکەیدا گوومانم نیە.

لەم کاتەدا دەنگی قیژەی ژنەکان بەرزبوویەوە چوونکە دوان لەمەحکوومکراوەکان کە بەرگریان کردبوو بە تیرە ژاراوییەکان پێکران و کوژران. بەبینینی ئەم دیمەنە شڵەژام.... هەندێ کات مرۆڤ هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات و نازانێت چی دەکات. منیش ئەو رۆژە نەمزانی چیم کرد... یەك سات هەستم کرد کە یوری دەیەوێت بمگرێت. من لەتووڕەییدا دەلەرزیم و یوری زیاتر لەمن تووڕەبوو... ئەو دەیەویست تفەنگەکەم لەدەست بسەنێت بەڵام درنگ ببوو چوونکە دەنگی تەقەی گوولە بیسترا و دەست بەجێ یەکێك لەوان لەو چوار کەسە کوژرا. سیانەکەی تر کە هەرگیز چاوەڕێی ئەم رووداوەیان نەدەکرد بەترسەوە رۆشتنە سەر سەری و بەسەیرکردنی کونێك کە لەپشتیدا دروست ببوو سەرقاڵ بوون. دەنگی گوولە ئەوانی تری ترساند بەڵام هەرچی گەڕان هیچیان نەبینی. دەمویست گوولەی دوەم بتەقێنم بەڵام سەرنەکەوتم چوونکە یوری تفەنگەکەی لەدەست سەندم و بەتووڕەییەوە وتی: ئەمە چ شێتیەتیەکە؟ ئێوە بەکوشتمان دەدەن.

بەخۆشحاڵیەوە پێویستی بەتەقە نەکرد و ئەو سیانەی تر بەقاوەقیژ رایانکرد. مەحکومکراوەکان لەگەڵ ئەوەی خۆیان ئازاد بینی لەلایەکیترەوە رایان کردو لەناو دارەکاندا ون ببوون. دوای هەڵاتنی ئەوان تازە، هاتمە خۆم. جەستەم لەئارەقدا خوسابوو دەتوت لەئاو هاتومە دەر.

یوری وتی: ئێوە ئەوانتان رزگارکرد بەڵام بوونە هۆی مەرگی خۆتان و ئێمە.... ئێستا پیاوەکانی هۆز دێن و دەماندۆزنەوە و دیلمان دەکەن.....

هێشتا قسەکە تەواو نەببوو کە لەناکاو قەرەباڵغیەکی سەیر بیسترا و بەدوای ئەودا یەکەم دەستەی وەحشیەکان چەکدار بەتیروکەوان گەشتنە سەر لاشەکە.. ئاژاوەیەکی سەیر دەستی پێکردبوو و هەمووان دەیانقیژاند سەرۆکی هۆزەکە بەنیشانەی تایبەت دیاری کرابوو دەستووری بەپیاوانی خۆیدا بگەڕێن و بەشێوەیەك کە یوری دەیوت جەختی دەکردەوە سەر دارەکانیش بگەڕێن.

لئۆنا لەترسا دەلەرزی. رەنگی پەڕابوو و روخساری لەنێوان دەستەکانیدا

شاردبوویەوە و دەگریا.

هاوسەرەکەی یوریش ئاوا حاڵێکی بوو. بارودۆخی منیش باشتر لەوە نەبوو. تەنیا یوری وەك ئاژەڵێکی دڕندە و خوێنخۆر لەکاتێکدا تفەنگەکەی لەدەست گرتبوو، سەیری دەکردن و دیانەکانی لەیەك گیر دەکرد. من بە ئەخلاقی یوری ئاشنابووم. هەرکاتێك روخساری ئاوای لێدەهات و بەوشێوە دیانەکانی لەیەك گیر دەکرد دەمزانی دەیەوێت بڕیارێکی مەترسیدار بگرێت.

یەکەمجار ئەم قیافەی لەپشت دیواری قەڵایەك کە کالوویی و هاوڕێکانی تەقەیان لێدەکردین، بینیم و جوان بیرمە کە دوای ئەوە چی کرد و چۆن بووە هۆی رزگارکردنی من.....

لەم سەفەرەدا چەندین جار من ئەم قیافەی ئەوم بینیبوو و هەرجارەو یوری کارێکی مەترسیداری ئەنجام دەدا بەخۆشحاڵیەوە گیانی بەسلامەتی دەردەبرد. دەیویست چی بکات....؟ نەمدەزانی، تەنیا دەمزانی ئەوە بوو کە یوری بەدڵنیاییەوە ناهێڵێت بەئاسانی گیانی من بەفیڕۆ بڕوات و مفت خۆرایی بکوژرێم. تاوانی من بوو بەبێ ئاگایی خۆم ئەم کارەساتەم دروست کرد بەڵام ئەمجارەش فریام کەوت و مەترسی لەمن دوور کردەوە.

لەوکاتەدا کەوەحشیەکان دەوریان گرتبووین و سەرقاڵی گەڕان بوون و ئەم فکرەم لەسەر پەروەردە دەکرد بەڵام لەناکاو ئەم پرسیارەم لەمێشکمدا نەخشی بەست کە گریمان ئەگەر یوری بیەوێت رزگارم بکات چۆن بەسەر ئەم کۆمەڵە زۆرە وەحشیانەدا سەردەکەوێت و بەکام سیلاحە ئەم هەموو پیاوە چەکدارە بکوژێت. هەڵبەت ئەگەر رەشاشێکمان پێبووایە بەباشی دەمانتوانی بەرگری لەخۆمان بکەین بەڵام بەتفەنگێك و سی چل فیشەك چۆن ئەم کارە مەترسیدارە و گەورەیە ئەگەری بوو.

لێرەدابوو ترسێکی بێ پایان تێکەڵاو بەبێ هیوایی سەراپامی داگرت و دڵ و رۆحمی داگیرکرد و جارێکیتر دەستم لەگیانی شیرینی خۆم شۆرد. لئۆنا لەم کاتەدا سەری خۆی بەرزکردەوە چاوە فرمێسکاویەکانی لەمن بڕی و بەگریانەوە وتی:

دەیانەوێت بمانکوژن با لەیەك ماڵئاوایی بکەین. کارێك بکە من پێش تۆ بکوژرێم و مەرگی تۆ بەچاو نەبینم.

لەم کاتەدا کە من و لئۆنا ماڵئاوایمان دەکرد دەنگی یوری بیسترا، وتی:

دەرۆمە خوار... ئێوە خۆتان بگەیەننە بەرزترین لقەکان تا نەبینرێن.

ئەمە دوایین کارێکە دەتوانم ئەنجامی بدەم و لەمەرگی دڵتەزێنی ئێوە سیانە رێگری

بکەم. جیاواز لەم شێوە هەرچوارمان دەکوژرێین.

دەمویست رێگەی لێ بگرم بەڵام دەرفەتی ئەم کارەم نەبوو چوونکە یوری بەخێرایی تفەنگەکەی بەیەکێك لە لقەکانی دارەکەوە هەڵواسی و رۆشتە خوار. چاوەرێ بووم هاوسەرەکەشی بێتە لای ئێمە دانیشێت بەڵام لەوپەری سەرسوڕماندا بینیم ئەویش بەدوای یوریدا ڕۆشتەخوار خوار. یوری بە تووڕەیی روی خۆی سوڕاند و وتی:

تۆ لەکوێوە دێیت....؟ لەوێ بمێنە، بەڵام ئەو لەکاتێکدا دەگریا وتی:

ئەگەری نیە، منیش دەبێت لەگەڵ تۆدا بکوژرێم.. ئەگەر بڕیاربێت ئەوان تۆ بکوژن ناتوانم بەبێ تۆ بژیم.

یوری بەوپەڕی رەزامەندی بزەیەکی هێنایە سەر لێو وتی:

ئافەرین بۆ تۆ ئەی ژنی چاو نەترس. ئافەرین، کەواتە لەگەڵ مندا وەرە. لای تۆ بەئاسانی مەرگ تەحەموول دەکەم و شیرین دەمرم. وەرە ئەی ژنی جوان و دڵگیرم.

لەم کاتەدا کەئەوان بەیەکەوە قسەیان دەکرد وەحشیەکان هەستیان پێکردو بەقاوەقیژ، یەکیان ئاگادار کردەوە، یوری هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەی لەدارەکە رۆشتنە خوار و هەرچی لەوان نزیکتر دەبوونەوە قەربالغی وەحشیەکان لەژێر دارەکە زیاتر دەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان سەیری سەرەوەی دارەکەیان دەکرد. بەخۆشحاڵیەوە من و لئۆنا بەشێوەیەك خۆمان داشاردبوو ئەوان نەیاندەدین. تەنانەت ئەگەر جوانیش ورد بوونایەتەوە بینینمان کارێکی دژواربوو چ بگات بەوەی بەبێ سەرنج چاویان بەئێمە بکەوێت.

جیاواز لەوەش هەمووان بەچاوانێکی سەرسوڕمانەوە لە یوری و هاوسەرەکەی کە لە دارەکە دەڕۆشتنە خوار دەیانڕوانی و سەرەنجدانی وەحشیەکان بەدوکەس دەرفەتی کاری تری پێنەدەدان.

کاتێك یوری گەشتە دوا لقی دارەکە کە چوار مەتر لەزەوییەوە بەرز بوو، یەکێك لە وەحشیەکان تیرێکی لەکەوان داناو دڵی یوری نیشانە گرت و ئامادەی تیر هاویشتن بوو. هاوسەری یوری لەگەڵ ئەوەی ئەم دیمەنەی بینی قیژاندی و وتی:

ئاگاداربە دەیانەوێت بەتیر بتپێکن.

یوری بە بیستنی قیژەی ژنەکەی لەسەر لقێك پەڕییە سەر لقێکی تر، ئەو ئەم کارەی بەخێراییەکی وا ئەنجامدا کەوەسف ناکرێت و ئەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی تیر

لەکەوانی وەحشیەکە دەرچوو بەڵام لەجیاتی ئەوەی لەدڵی یوریدا بچەقێت لە لقی دارەکە رۆچوو و لەوێدا مایەوە.

یوری چوونکە دەیزانی دوبارە نیشانەی دەگرنەوە بەدەنگی بەرز هەندێك شتی وت کە نەتەنیا بۆ من بەڵکو بۆ لئۆنا وهاوسەرەکەشی نەشیاو بۆ تێگەشتن بوو.

یوری پێشتر، یانی کاتێك وەحشیەکان دەیانویست ئەو تاقمە بکوژن و فریاندەنە دەریا بە ئێمەی وت کەزمانی ئەوان دەزانێت و بەجوانی تێدەگات. بەراستیش وابوو خۆشی نەیدەزانی چۆن زمانیان دەزانێت و بێ ئیرادە بەزمانی خۆی هەندێ شتی وت کەئێمە حاڵی نەبووین. کاتێك یوری قسەی خۆی کرد و بێدەنگ بوو، سەرۆکی هۆز کەهەمان وەحشیە رەنگ کراوەکە بوو بە بەرزکردنەوەی دەستی لە تیر هاویشتنی دوبارە بەرەو یوری و هاوەسەرەکەی رێگری کرد. ئەویش بە نۆرە خۆی شتێکی بەیوری وت کەتێنەگەشتم بەڵام لەئیشارەی دەستی زانیم فەرمانی پێدەدات لەدارەکە بڕواتە خوار.

یوری تائێرە سەرکەوتوبوو لەوەی گیانی خۆی و هاوسەرەکەی بپارێزێت بەڵام دیارنەبوو کاتێك وەحشیەکان ئەوانیان گرت لەگەڵیان دەست هەڵگرن و ئێمە بەجێ بێڵن. وەحشیەکان لە ژێر دارەکەدا لوولیان دەدا و زیاتر لەهەزار ژن و پیاو لەدەوری یوری و هاوسەرەکەی کۆ ببوونەوە. یوری بۆ ئەوەی مەترسی لە من و لئۆنا دووربکاتەوە بەخێرایی لەدارەکە دابەزی و دواتر دەستی کردەوە هاوسەرەکەشی لە دارەکە داگرت و لای خۆی داینا

وەحشیەکان زەق زەق لە هاوسەرەکەی یوریان دەڕوانی، هۆکاری نیگا پڕ سەرسوڕماوەکانی ئەوان ئەوەبوو دەیانبینی ژنێکی سپی پێست لەگەڵ پیاوێکی رەش پێستدایە.

رەنگە ئەوان لەهەموو تەمەنیان ژنێکی سپی پێستیان نەبینیبێت و لەبەر ئەمە سەریان سوڕمابێت. هاوسەرەکەی یوری لەهۆزی ئامازۆن و ژنانی ئامازۆنیش پێستێکی گەنم رەنگ و ناسکیان هەیە و بەدڵنیاییەوە لەگەڵ ژنانی تردا جیاوازن. زۆر بەکەمی لەناو ژنانی ئامازۆن ژنێکی پێستی رەش دەردەکەوێت و ئەمە شتە سەیرەکانی ئەم هۆزەیە کە بۆتە هۆی سەرسوڕمانی مرۆڤ ناسان و هەموو زاناکانی سروشت.

ئەگەر ژنێکی ئامازۆنی لای ژنێکی ئەمریکایی دابنێین جیاوازیەکەیان دیارە بەهەمان شێوە ژنێکی ئامازۆنی لەگەڵ ژنێکی رەش پێستدا جیاوازی رەنگی هەیە. سەرسوڕمانی وەحشیەکانیش لەبەر ئەمەبوو کە ژنێکی جوانی گەنم رەنگیان لەگەڵ یوری کە پیاوێکی

ڕەش پێستی ئێسقان گەورە بوو، دەدی. یووریش لەگەڵ وەحشیەکان لەڕوانگەی ئەندام و شێوە و ڕەنگی پێست جیاوزییەکی زۆری نەبوو. بەهەرحاڵ سەرۆکی وەحشیەکان بە بەرزکردنەوەی دەستی و وتنی چەند وشەیەك ئاژاوە و قەرەباڵغیەی تازەی دروست کرد و لەناکاو بەچاوی خۆمان بینیمان سەدان وەحشی بەرم و تیروکەوانەوە هێرشیان کردە سەر یووری.

لەم شەڕەدا کەس بەزەیی بەکەسدا نەدەهاتەوە. هەموو لە سەرو شانی یەك دەڕۆشتنە سەر و من دڵنیابووم ئەگەر ئەوان مەبەستی کوشتنی یوری و هاوسەرەکەیان نەبێت ئەو بێچارانە لە ژێر دەست و قاچی ئەواندا دەکوژران و دەخنکان.

تەپ و تۆزو چەو ولم بەرز بوویەوە و قەرباڵغیەکی گوێ ئازاردەر دروست بوو. بەخۆشحاڵیەوە دوای چەند خولەك یان چرکە قەرباڵغی و دەنگەدەنگ خەوت و بەشادمانییەوە بینیم یوری و هاوسەرەکەی زیندوون و لەم شەڕەدا نەکوژراون.

دەستەیەکی شەش حەوت کەسی دەست وقاچی یوریان بەست و بەکێشان کێشان بردیانە ناو جەنگەڵ و دەستەیەکیش دەست و پێی هاوسەرەکەیان ڕادەکێشا. یوری بەرگری نەدەکرد و خۆی سپاردبوو بەقەزاو قەدەر. بەڵام ئەو ژنە جوانە هەوڵی دەدا و پەلەقاژەی دەکرد و دەیویست خۆی لە دەستیان ڕزگار بکات.

وەحشیەکان بێ ئەوەی سەرنج بدەنە ئەو دارەی ئێمەی لەسەر بووین، ئەو دوانەیان بردە ناو جەنگەڵ و چەند خولەك دواتر ئەوانیش بێدەنگ بوون. زانیم لێمان دوور کەوتونەوە.

لئۆنا لە خۆشحاڵیدا لە پێستەکەی جێگای نەدەبووەوە و لەبەرئەوەی خۆی و منی لەمەرگ بەرزگاربوو دەبینی شادمان بوو. ئەو حسێبی گیانی خۆی و منی دەکرد بە پێی عادەت بۆ کەسانیتر نیگەران نەدەبوو بەڵام من کەهاوڕێکەم لەمەترسیدا بینی نیگەران بووم. بێ ئیرادە لئۆنام لەخۆم دوورکردەوەو وتم: کەمێك ئۆقرە بگرە... با ئاسوودەبم...

چەند خولەکێك دەستم لەسەر ناوچاوم داناو بیرم کردەوە و سەرئەنجام چوونکە زانیم ناتوانم ئارام بگرم و خۆم لەداخ و خەمی مەرگی یوری ڕزگار بکەم بە لئۆنام وت:

تۆ لێرە دانیشە...... لەسەر ئەم لقە کە دانیشتوی نەجووڵێیت..... تیدەگەیت....

لئۆنا لەناکاو دەستی بەگریان کرد و وتی: تۆ بۆ کوێ دەڕۆیت؟ بەتەنیا جێم دەهێڵی.....

لەکاتێکدا لە لقەکە دەڕۆشتمە خوار وتم: دەگەڕێمەوە..... دەمەوێت بەدوایاندا بڕۆم

و لەچارەنووسی یوری و هاوسەرەکەی ئاگاداربم....

لئۆنا چوونکە دەیزانی ناتوانێت پەشیمانم بکاتەوە، ئیتر قسەی نەکرد وتەنیا گریا. دەتوت لەمەرگی من دڵنیایە و دەیزانی ئەگەر بڕۆم دەکوژرێم بۆیە هەر لەوکاتەوە دەستی بەگریان کرد. لەتووڕەیی وناڕەحەتی هەزاران هەست و گوومانی تر دەلەرزیم و ببوومە ئاژەڵێکی وەحشی و ئەم تووڕەییە منی کوێر کردبوو. ئەنجامەکانی ئەم کارە مەترسیدارەم نەدەزانی و تەنیا لەبەر سەندنی تۆڵە لەوەحشیەکان کە دەیانویست یوری و هاوسەرە بێ تاوانەکەی بکوژن لەدارەکە هاتمە خوار تا بەدوایاندا بڕۆم. لەرێگا تفەنگەکەم لە لقی دارەکە کردەوە و فیشەکم تێکرد و لەدارەکە هاتمە خوار. لەسەر دارەکەوە رێگەی رۆشتنی وەحشیەکانم دیاری کردبوو بۆیە بەبێ دژواری رێگاکەم دۆزییەوە و بەخێرایی دەستم بەراکردن کرد. ئەگەر لق و گەڵای چڕی دارەکان کە هەرسات زیاتر رێگاکەیان لێ دەگرتم نەدەبوو رەنگە لەیەك دو خولەکدا خۆم بە وەحشیەکان دەگەیاند بەڵام خۆشبەختانە یان بەدبەختانە بەهۆی چڕی و ئاڵۆزی لقی دارەکان و گەڵا پێچاوپێچەکان لە خێرایی من کەم دەبوویەوە.

رەنگە کاتژمێرێك زیاتر یان کەمتر رامکرد و سەرئەنجام گەشتمە شوێنێك کە داری گەورە کۆن و چڕی لێبوو. لە جەنگەڵ و ئەو شوێنەی من لێی وەستابووم ئاسمان نەدەبینرا و دەتوت رۆژ لەناکاو گەشتووەتە ناوچەی شەو. هەموو شوێنێك تاریك بوو لق وگەڵای دارە بەرزکان وەك تاقێکی بەرز لەسەر جەنگەڵ دەبینرا. هەموو شوێنێك تاریکی دایگرتبوو و من لەوێ بەدواوە زیاتر چاودێری خۆمم دەکرد چوونکە هەستم دەکرد لە ناوچەی مەترسیدار نزیك بوومەتەوە. تفەنگەکەم لەسەر دەست گرت و بەنەرمی هەنگاوم هەڵدەگرت.

دەنگی وەحشیەکان لەدوورەوە دەبیسترا و کاتێك کەمێکی تر لەم ناوچە تاریکە رۆشتمە پێش، بینیم وەحشیەکان خۆیان بەسازکردنی جەژنی کوشتنی یوری و هاوسەرەکەی ئامادە دەکەن. ئاگرێك لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکە دەبینراو لەبەر رووناکی ئاگرەکە هەموو شوێنێك بەجوانی دەبینرا.

بە شێوەیەك ئەگەر ئاگر نەدەبوو لەو تاریکیەدا من توانای بینینی یوریم نەبوو. لای ئاگرەکە یوریان بەدارێکەوە بەستبوویەوە ودارێکی تر لەولا دەبینرا بەڵام هاوسەرەکەی یوریم نەدەبینی. سەرەتا وامزانی ئەویان لەرێگا لەبەر خۆراگری کوشتووە و جەستەیان فرێداوە بەڵام لەم کاتەدا دەنگی قیژەی وەحشیەکان سەرنجی منیان بۆ خاڵێکی تر راکێشا و لەوێدا بینیم تاقمێك هاوسەرە جوانەکەی یوری رادەکێشن و بەرەو یوری و

دارەکەی دەبەن. ئەو هێشتا بەرگری دەکرد، پەلەقاژەی دەکرد و بەزمانی خۆی جنێوی دەدا و ئەوانی بە تووڕەیی خواکان دەسپارد. بینینی ئەم دیمەنە زۆر ناڕەحەتی کردم و تووڕەیی منی زیاد کرد بەڵام کاتێك سەیری زۆری وەحشیەکان و سیلاحەکانی ئەوانم کرد کە لەتیرە ژاراوییەکان و رمە درێژەکان پێك دەهات، بەئاگا هاتمەوە و بەسەر تووڕەیی خۆمدا زاڵ بووم و گەڕامەوە و هێواش هێواش بەرەو شوێنێك کە لئۆنام لێ بەجێ هێشتبوو بەڕێکەوتم.

توانای بینینی مەرگی یوری و هاوسەرەکەیم نەبوو ئەگەر ئەم تواناییەم هەبووایە لەوێدا دەوەستام و تاکۆتایی سەیرم دەکردن. خەم و پەژاریەکی بێ وێنە دڵ و رۆحی داگیر کردم و دەمویست لەپرسەی باشترین هاوڕێ و رزگارکەری خۆمدا بگریم. هێشتا نەگەشتبوومە شوێنی خۆم کە دەنگی گامب گامبی تەپڵی وەحشیەکان بەرزبوویەوە. وام دەزانی رێورەسمەکەیان کۆتایی هاتووە و ئەوانیان کوشتووە بۆیە تەپڵ لێ دەدەن.

چەند خولەك دواتر گەشتمە شوێنێکی رووناك و هەتاوی. دارەکەم دۆزییەوە و لێی رۆشتمە سەر لئۆنا بێ سەبرانە چاوەڕێی دەکردم، کاتێك چاوی بەمن کەوت لەشادمانیدا دەستەکانی لەیەکدا و چەند لقێك بۆ پێشوازیم هات.

کاتێك رۆشتم دەگریاو ئێستا لەشادمانیدا فرمێسك لەچاوانی دەباری. بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی خۆم لەو ناڕەحەتیە قووڵەم رزگار کەم. لئۆناش کاتێك بەم حاڵەدا منی بینی لەسەر لقێکی تر دانیشت و بێدەنگ بوو. یەك کاتژمێر بەم شێوەیە تێپەڕی و من لەدەنگی تەپڵی وەحشیەکان کە لە دوورەوە دەبیسترا گوێم دەگرت. لەناکاو دەنگی تەپڵەکە پچڕاو بێدەنگی سەرانسەری جەنگەڵی داگیرکرد.

هەڵبەت نەمانی دەنگی تەپڵی وەحشیەکان زۆر سەرسوڕهێنەر نەبوو. من و لئۆناش زۆر سەرمان سورنەما چوونکە واماندەزانی رێورەسمەکە کۆتایی هاتووە بەڵام شتێك دەبووە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە ئەوەبوو دوای دو خولەك دەنگی تەپڵ بەتوندی و ریتمێکی تر بەرزبوویەوە و هەرایەکی سەیری دروست کرد. ئەم جارە لەگەڵ دەنگی تەپڵ هاواری شادمانی دەبیسترا، وەحشیەکان دەیانقیژاند و ئێمە بەجوانی لەو بەرزاییەوە دەنگیانمان دەبیست. دەنگەکان کەم کەم لێمان نزیك بوونەوە. دەتوت بەرەو لای ئێمە دێن، یانی چی؟ رەنگە پێشتر ئێمەیان بینیبێت و بۆدیل کردنمان دێن. لئۆنا سەیری کردم و وتی: گوومانی تیانیە بەرەو ئێرەدێن. تا کات هەیە باڕاکەین.

دژایەتیم کرد وتم:

بووەستە رنگە ئەوان بۆ شوێنێکی تر بڕۆن و کاریان بەئێمە نەبێت.

نیو کاتژمێر تێپەڕی و دەنگەکە نزیکتر بوویەوە تائەوەی وەحشیەکان لەدوورەوە

دەرکەوتن. ئێستا دڵ لە سینەی من و لئۆنادا دەلەرزی چوونکە بەجوانی دەمانبینی چاویان لەدارەکەی ئێمە بڕیوە کەمێکی تر کەنزیك بوونەوە لەناکاو لئۆنا قیژاندی و دەستی لەیەك داو وتی: سەیرکە. یوری و هاوسەرەکەی لەپێشیانەوەن.

منیش یوریم بینی بەڵام لەبارودۆخێك کەشیاوی وەسف کردن نییە، بەڕاستی سەیر بوو چوونکە یوری پێدەکەنی و کڵاوی تایبەتی سەرۆکی هۆزی لەسەر دابوو.

پێش هەرشتێك ئەم بیرەم لا دروست بوو رەنگە وەحشیەکان زەختیان لە یوری و هاوسەرەکەی کرد بێت و ئەوانیش بەڵێنیان داوە شوێنی خۆشاردنەوەی ئێمەیان پێ بڵێن بەڵام بەخێرایی بەخۆم وت: وەحشیەکان لەکوێوە دەیانزانی ئێمە چوار کەسین؟

لەلایەکیتر یوری کەگیانی خۆی لەبەر من خستە مەترسیەوە کەسێك نەبوو خیانەتێکی وا بکات و ئێمە لەچنگی وەحشیەکاندا دیل بکات. بەم شێوەیە بیری پەرێشان و نیگەرانی مێشك و رۆحمی داگیرکردبوو و لەهەمان کات چاوم لەوان بوو کەلێمان نزیك دەبوونەوە. شتێك کەزۆر بەلامەوە سەیر بوو، ئەوەبوو یوری کڵاوی تایبەتی سەرۆك هۆزی لەسەر کردبوو و پێدەکەنی. یانی چی.....؟ یوری چ کاتێکی ترسناکی بۆ گاڵتەو شۆخی هەڵبژاردوە.

سەرئەنجام وەحشیەکان لێمان نزیك بوونەوە و گەشتنە ژێر دارە کۆنەکە کەئێمە خۆمان لەسەری شاردبوویەوە. لەم کاتەدا یوری و هاوسەرەکەی لەریزی وەحشیەکان جیابوونەوەو چەند هەنگاوێکی تر هاتنە پێش تا گەشتنە شوێنێك کە ئێمە دەبینراین.

یوری سەری خۆی بەرز کردەوەو لەلابەلای لق و گەڵای دارەکان سەیری کردم، پێکەنی و وتی: وەرنەخوار..... بووینە ئاسراو بووینە ئاسراو یانی چی....؟ من چ ئاسراوێکم لەگەڵ ئەم دێوە بێ شاخ و کلکانەدا هەیە......؟

یوری چی دەڵێت......؟ رەنگە شێت بووە. بەدەنگێك کە لەناڕەحەتی دەلەرزی وتم: یوری........ خۆتی؟ بەڵێ سەرۆك خۆمم. وەرنەخوار تا بەجوانی بۆتان بگێڕمەوە. مەترسیەك لە ئارادا نیە. من ئێستا سەرۆکی ئێوەم.

وەحشیەکان سەیری دارەکەیان دەکرد بەڵام نەدەجوڵان. لەوتوێژی من و یوری حاڵی نەدەبوون چوونکە بەئنگلیزی قسەمان دەکرد و کەس جگە لەئێمە دوانە ئەم زمانەی نەدەزانی تەنانەت لئۆنا و هاوسەرەکەی یوریش.

بۆ دڵنیایی زیاتر وتم: یوری..... بەهەڵەدا نەچوبێتیت. ئەم وەحشیانە هەندێك جار مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنن ئەو قاقای لێداو وتی:

نا سەرۆك خەیاڵتان ئاسوودە بێت. تا کاتێك لەناو ئەمانەدان بەتەواوی لەئەماندان. لەگەڵ ئەوەی دەمزانی یوری درۆم لەگەڵ ناکات لەنزیك بوونەوە لەوەحشیەکان دەترسام

بۆیە چەند خولەکێکی تریش دەرنگم کرد، بیرم کردەوە و بەلئۆنام وت:

چارەنیە دەبێت بڕۆینە خوار بابەتەکە زۆر سەرنج راکێش دێتە بەرچاو.

لئۆنا پێش من رۆشتمە سەر لقێکی تر و پێکەنی و وتی:

بڕیاربوو شێرەکان هەڵماندرن و بمانخۆن ئێستا کە شێرەکان نەیانتوانی ئەم کارە ئەنجام بدەن باوەحشیەکان تیکە تیکەمان کەن. مرۆڤ جارێك زیاتر نامرێت.... دەبابڕۆین.

ئەمەی وت و وەك مەل لەلقێکەوە بۆ لقێکی تر رۆشت. دوای ئەو منیش لقەکانم بەجێ هێشت و رۆشتمە خوار. یوری لەرووی خۆشەویستی دەستی لەسەر شانم دانا وتی: سەیرکە سەرۆك! ئەم کڵاوە شیاوە بۆ من.......؟

لە وەڵامی ئەودا لەکاتێکا هێشتا دەنگم دەلەرزی وتم:

هەڵبەتە شیاوە بەڵام نازانم ئەم کڵاوە چۆن چووە سەر تۆ زۆر سەیرە.

یوری پێش ئەوەی وەڵامەکەی من بداتەوە، تفەنگەکەی لەدەست من گرت و دواتر روی کردە وەحشیە رووت و قووتەکان کە دەوریان گرتبوو، هەندێ شتی وت کەم تێنەگەشتم. لە روخساری وەحشیەکان ترسم و نیگەرانیم خوێندەوە. یوری لەمبارەوە وتی: دەبینی ئەوان لەبینینی ئەم تفەنگە سەریان سوڕماوە و نارەحەت بوون. دەبێت کاری تفەنگەکەیان نیشان بدەین هەربۆیە من لەدەستی ئێوەم وەرگرت.

دوبارە هەندێ شتی وت و دەستەکانی راوەشاند. دەنگی گامب گامبی تەپڵ بەرزبووەیەوە، وەحشیەکان لەگەڵ ئەوەی هێشتا نارەحەت بوون و لەژێر چاوەوە سەیری تفەنگەکەیان دەکرد بەرێکەوتن.

لەپێش هەموویانەوە من و یوری دەڕۆشتین و دوای ئێمەش لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری و دوای ئەوان وەحشیەکان بەتەپڵ کووتان و سەماکردن و هەلهەلە کێشان رێیان دەکرد.

لەرێگادا بەیوریم وت: کاتێك تۆیان بەدارەکەوە بەستبوویەوە و هاوسەرکەت خۆراگری دەکرد، من لەپشت دارەکان بووم و بیرم دەکردەوە چۆن ئێوە دوانە رزگاربکەم بەڵام چوونکە فیشەکی کەمم پێبوو، پەشیمان بوومەوە.

یوری پێکەنی و بەخۆشحاڵیەوە وتی:

باش بوو تەقەتان نەکرد چوونکە بەدڵنیاییەوە ئێمە دەکوژراین.

لێم پرسی: بڵێ بزانم چۆن رزگارتان بوو چۆنە ئەوان رێز لەتۆ دەگرن و کڵاوی سەرۆکەکەی خۆیان کردۆتە سەر تۆ؟

یوری بیری کردەوەو سەرئەنجام وتی: بەسەر هاتێکی دوور و درێژە، بەڵام بەکورتی

بۆتی باس دەکەم. لەبیست ساڵ پێش وەفدێکی زانستی دێتە ئەم سنووره و لەئەنجامی شەڕو پێکدادان لەنێوان پیاوانی ئەم هۆزە و ئەواندا رودەدات. ژمارەیەك لە وەحشیەکان دەکوژرێن و لەوانە هەموو بنەماڵەی سەرۆك و سەرۆك خۆشی جگە لە کوڕێکی ١٢ ساڵە کە دەکەوێتە دەست ئەو وەفدە زانستیە و لەگەڵ خۆیان دەیبەنە دنیای شارستانیەت و لەهەتیو خانە دای دەنێن. قسەکەی یوریم پچڕاند وتم:

چیرۆکم بۆ دەگێریتەوە؟ لێم پرسیی چۆن رزگارت بووە؟

یوری هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

منیش وەلامت دەدەمەوە، گوێ بگرە. رزگاری ئێمە پەیوەندی بە رابردویەك هەیە کە دەبێت لێی ئاگادار بن.

دواتر چەند ساتێك بێدەنگ بوو و درێژەی دا.

ئەو کورە دوانزە ساڵە من بووم کە لەهەتیو خانەدا گەورەبووم و دواتر بۆ پەیاکردنی کارێکی گونجاو رۆشتمە برازیل. لەبەرئەوەی کارم دەست نەکەوت بوومە رێنیشاندەری راوچیەکان لە جەنگەڵ. لەرابردوی خۆم ئاگادار نەبووم. تەنیا شتێك کە دەمزانی ئەوەبوو منیان لە جەنگەڵ هەڵگرتووە و سپاردویانم بە هەتیوخانە. نیشانەیەکم بوو ئەویش ئەمەیە، سەیری کەن....

یوری لەم کاتەدا پشتی کردە من. کە سەیرم کرد سەرم سوڕما. لەپشتی ئەو لەژێر ملی تاخوار پەڕاسوەکانی خاڵ کوترابوو و وێنەی سەیرو سەمەر دەبینرا. ئەم خاڵانەم لەپشت یوریدا نەبینیبوو و ئێستا دەزانم بۆ لەهەندێ کاتدا یوری لەداکەندنی کراسەکەی خۆی بەدوور دەگرت و هیچ کات لەبەرچاوی مندا بەتەواوی رووت نەدەبوویەوە.

هەروەها بیرمە ئەو رۆژەی ژنانی ئامازۆن ئێمەیان رزگار کرد کاتێك لە ژوورەکەدا یوری هاتە هۆش خۆی بەپەلە هەستاو کراسەکەی لەبەرکرد.

ئەو درێژەی بەقسەکانی دا وتی: ئەم خاڵانە بە بەردەوام بیری پێ دەکردمەوە. بەردەوام لەخۆمم دەپرسی ئەم خاڵانە چیە و کێ لەپشتی مندا کوتاویەتی تا ئەوەی رۆژگار من و تۆی پێك گەیاند و هێنای بۆ ئێرە. ئەمڕۆ بەیانی کاتێك وەحشیەکان لە ژێر دارەکەدا قسەیان دەکرد هەستم کرد زمانی ئەوان دەزانم. سەرەتا سەرم سوڕما بەڵام دواتر زەینم روون بوویەوە و بەخۆمم وت: (( رەنگە منیش لەم هۆزە بم ))

بۆیە خۆبەخشانە رۆشتمە خوار......

## ٧

کاتێك منیان بەدارەکەوە بەست و هاوسەرەکەشمیان بەڕاکێشان بۆلای ئاگرەکە هێناو بەستیانەوە، سەرۆکی هۆز دەستوریدا جلەکانم بدڕێنن تا بۆقامچی خواردن و مردن ئامادەبم. لەم کاتەدا کە وەحشیەکان سەرقاڵی تەپڵ لێدان و هەلهەلە لێدان بوون چەند کەس هاتنە پێش و جلەکانی منیان دڕاند. بەڵام لەناکاو قیژاندیان و ڕۆشتنە دواوە.... هاواری ئەو چەند کەسە سەرنجی سەرۆکەکەیانی ڕاکێشا و بە کورنوش کردن ڕۆشتنە دواوە. هەموو هۆزەکە کەوتنە سەر ئەژنۆ و کورنوشیان برد و دەنگی تەپڵەکان پچڕا. خۆیشم سەرم سوڕما بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چێژم دەبرد. چەند خولەك دواتر ئەو کەسەی سەرۆکیان بوو هەستا، بەندی دەست و قاچی منی کردەوە، کەوتە سەرخاك و نووکی پێڵاوەکەمی ماچ کرد.

کەسانی تریش بۆ ماچ کردنی پێڵاوەکەی من هێرشیان هێناو ئەم کارە نیو کاتژمێری خایاند تا ئەوەی هەموو هاتن و قاچی منیان ماچ کرد و ڕۆشتن. دوای ئەم کارە، سەرۆکی هۆز هاتە پێش کڵاوەکەی کردە سەر من و ڕوی کردە پیاوەکان و وتی:

خوای جەنگەڵ و ئاگرەکان، کوری سەرۆکی هۆزەکەمانی بۆ گەڕاندینەوە. نیشانەی بنامەڵەیی سەرۆکی هۆزەکەمان لەپشتی ئەودایە و لەم ساتە بەدواوە سەرۆکایەتی هۆز دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنە سەرەکییەکەی. تازە دەمزانی کە خاڵەکانی پشتم نیشانەی بنەماڵەکەم بوو. من سەرۆکی ئەم تاقمەم. من کە زمانەکەیانم دەزانی کۆنتڕۆڵی خۆم لەدەست نەداو قیافەی سەرۆکم بەخۆ دەگرت و دەستوورم دا شادمانی و سەمابکەن و دواتر خۆم کۆمەڵێکم هەڵگرت و بۆ ڕزگاری ئێوە هاتم.

لێرەدا قسەی یوری تەواو بوو، بەڵام دەرفەتی قسەکردنم پێ نەبڕا چوونکە کۆمەڵێك بۆ پێشوازیمان هاتبوون و دوبارە قەرەباڵغی دەستی پێکردەوە.

بەرێزەوە ئێمەیان بردە ناو هۆزو ئەو شەوە جەژنێکی بەشکۆیان سازدا و تا نزیك بەیانی سەمایان کرد و خواردیان و قیژاندیان. تائێرە هەموو ڕوداوەکان بەپێی حەزی ئێمە بەتایبەت یوری بوو بەڵام ڕوداوێك ڕویدا کە بێ ناڕەحەتی نەبوو.

لەكۆتایی شەو، رەنگە نزیكەی بەیانی بوو چوونكە ئێمە سەرنجمان بە تێپەڕبوونی كات نەدەدا، یەكێك لە پیرە پیاوانی هۆز خۆی بەیوری گەیاندو هەندێ شتی پێ وت كە بۆ ئێمە نەشیاو بوو بۆ تێگەشتن. بەهەمان ئەندازە كە ئەو قسەی دەكرد لەبەر رووناكی سور رەنگی ئاگر قیافەی یوریم دەبینی تێك دەچێت و شوێنەواری نیگەرانی تیا دەردەكەوێت.

وتوێژی ئەوان چەند خولەكێك درێژەی كێشاو لەكۆتاییدا بینیم یوری سەری خۆی تەكان دا و من بەم شێوە لەرەزامەندی یوری تێگەیشتم.

ئیتر رەزامەندی بۆچی و پەیوەندی بەچ بابەتێكەوە بوو نەمدەزانی. دوای ئەوەی یوری سەری خۆی تەكان دا، پیرە پیاو رویكردە پیاوانی هۆز كە بەوردی لەم وتوێژە وردببوونەوە و چەند فەرمانێكی دەكرد.

دەست بەجێ دەنگی شادی بەرز بوویەوە و دوبارە قەربالغی كۆمەڵێك پیاو بەم لاولادا رایان كرد و دوای چەند خولەك لەكاتێكدا یەك یان دو كچیان گرتبوو دەگەڕانەوە. بەئیشارەی چاو و برۆ لەیوریم پرسی كە چییە؟ ئەو پێدەكەنی و هیچی نەدەوت تا ئەوەی لە گۆڕەپانی هۆز زیاتر لە دوسەد كچ و ژن كۆكرایەوە لە دەوری ئاگرەكە بە ریز وەستان. لەهەمووی ئەم ماوەدا دەنگی گامبی تەپڵەكان دەبیسترا و كۆمەڵێك ژن و پیاو، پیرو گەنج بەدەوری ئاگرەكەدا سەمایان دەكرد و كاتێك هیلاك دەبوون لەپێ دەكەوتن شوێنی خۆیان بەكەسان تر دەدا.

كاتێك ژنان و كچانی هۆز كۆكرانەوە، یوری بەهێواشی لە شوێنەكەی هەستاو لەكاتێكدا داردەستی تایبەتی لەدەست گرتبوو پێستی پڵنگی لەسەر شان دانابوو، بەرەو ریزی ژنان و كچان بەڕێكەوت زۆربەی كچەكان هیچیان لەبەردا نەبوو، هەندێكی تریان پەڕی رنگاورەنگی باڵندەكانیان لەسەرو سینەی خۆیان بەستبوو و دیاربوو ئەم كارە لەبەر رازاندنەوە ئەنجام دەدران نەلەبەر داپۆشینی خۆیان، بەهەرحاڵ كاتێك یوری گەشتە بەرانبەریان سەرەتا دیانەكانی خۆیان نیشان دەدا و دواتر لەو شوێنەی وەستابوون سوورێكیان دەخواردو دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان.

لەم گەڕانەدا یوری ژمارەیەكی هەڵبژارد و ناردنیە ناوەڕاستی بازنەكە. ژمارەی هەڵبژێردراوان زیاتر لە چل كەس بوو.

دوای ئەوە ئەو چل كەسە هەڵبژێردران یوری لەناویاندا شەشی هەڵبژارد و ئەوانیتر خەمبار گەڕانەوە شوێنی خۆیان.

شەش هەڵبژێردراوەکە ئەندامی ڕێك و دیانی سپی و ڕوخسارێکی جوانتریان بە بەراورد لەگەڵ ئەوانیتر دا هەبوو. یوری هاوسەرەکەی خۆشی لای ئەوان داناو داردەستەکەی بەرزکردەوە و هەندێ شتی وت کاتێك یوری قسەکەی تەواو کرد هەموو پیاوانی هۆز ئاوازێکی کورتیان خوێند.

هێشتا لەم دیمەنەم دەڕوانی و سەرم سوڕمابوو کە ئەم کارانە بۆچیە. ئەو شەش کچە بۆچی هەڵبژێردران و هاوسەری یوری بۆ ڕۆشتە لای ئەوان کەلەناکاو هەستم کرد یوری بەرەو لای من دێت. کاتێك گەشتە بەرانبەرم بە ئنگلیزی پرسی:

لەم ڕێورەسمە هیچ حاڵی بوویت؟

بە پێکەنینەوە وتم: نا، هیچ. بەڵام ئێستا تۆ دەیڵێیت و من تێدەگەم.

یوری وەڵامی دایەوە:

سەرۆکی هۆز دەبێت بە ئەندازەی ڕۆژەکانی هەفتە ژنی هەبێت. ئەگەر ژنەکانی باوکم زیندو بوونایە منی داماو ناچار بووم لەگەڵ ئەواندا بژیم بەڵام بەخۆشحاڵیەوە ئەوان مردوون. ئەم کچانەی دەیانبینی کچ و ژنە بێ مێردەکانی هۆز بوون کەمن شەشیانم هەڵبژارد. پیرە پیاوانی هۆز بە بەدبەختی قبوڵیان کرد کە من ژنە کۆنەکەم رابگرم و سوور بوون لەسەر ئەوەی هەر حەوت ژنی سەرۆك هۆز دەبێت کچان و ژنانی هۆزبن. سەرئەنجام ئەوانم ڕازی کرد.

بێ ئیرادی پێکەنین گرتمی و وتم:

باشە، خراپ نییە، ئێستا وەك پاشاکانی هەزارو یەك شەو هەرشەو لەماڵی ژنێکت بەسەر دەبەیتت.

دەمویست لەگەڵ یوریدا گاڵتە بکەم کە هاتە قسەو هەواڵێکی ناڕەحەت کەری پێدام و وتی: سەرۆك بەداخەوە دەبێت هەواڵێکی خراپتان پێ بدەم.

بەناڕەحەتیەوە لێم پرسی: کام هەواڵ؟

بەپێی ڕێورەسمی هۆز مانەوەی سپی پێستان لەناو هۆزدا یاساغە. ئەم هەواڵە پیرە پیاوان بەمنیان دا وئەوکاتەی دەتانبینی لەگەڵیانا قسە دەکەم، باسی ئێوە هاتەپێش. ئەوان دەیانوت:

( باوکانی ئێمە هەواڵیان داوە سپی پێستێکی جادووگەر لەئاسمانەوە دێت و ماڵەکانی هۆز دەسوتێنێت و دانیشتوانی هۆز دەکوژێت و دواتر سوار مەلێکی گەورە دەبێت و دەڕواتەوە بۆ ئاسمان )) لەو ڕۆژەوە مانەوەی سپی پێستەکان یاساغ کراوە و

ئەوان دەیانوت تۆو لئۆنا ناتوانن لێرە بمێننەوە تەنانەت دەیانویست هاوسەرەکەی منیش دەرکەن بەڵام سوور بووم و سەرئەنجام توانیم ڕێگە چارەیەك بۆ ئەم کارە بدۆزمەوە....

شادمان بووم و وتم:

ئێستا کە ڕێگە چارەت دۆزییەوە ئەم هەواڵە ناخۆشەت بەمن نەدایە.

یوری کە دەتوت ناڕەحەتە چەند ساتێك بێدەنگ بوو و دواتر وتی:

پیرە پیاوانی هۆز دەڵێن ئێوە دەبێت ببن بەخزممان تا بەڵگەیەك بۆمانەوەمان هەبێت.

یوری لێرەدا پێکەنی و وتی:

کێشە نییە، یاسای ئەوان زۆر سەیر نییە چوونکە لەگەڵ یاسای مانەوەی کەسانی بیانی لەگەڵ ئەمریکادا هاوشێوەیە. بەپێی یاسای ئەمریکا هەربیانیەك هاوسەرگیری لەگەڵ ئەمریکاییەك بکات دەتوانێت ببێتە هاوڵاتی ئەمریکا. لێرەش یاسا وایە هەرکەس سێ ژنی لەم هۆزە هەبێت دەتوانێت لەم هۆزە بمێنێتەوە.

لەناڕەحەتی زۆر لەئارەقدا خوسام. هێشتا ریزی کچەکان لەوێدا بوون و من لەژێر چاوەوە سەیرم کردن. یوری سەیری دەکردم و کاتێك ڕەنگ پەڕانی منی بینی وتی:

سەرۆك زۆر نیگەران مەبن، لێرە هەرچی ژنی زیاترتان هەبێت ئاسوودەترن چوونکە هەموو ئەرکەکان لەسەر شانی ژنە بێجگە لەڕاو و شەڕ. ئەوان خواردن و ئازوخەی ئێوە دابین دەکەن.

لئۆنا کەلای من دانیشتبوو لەم وتوێژەدا هیچ حاڵی نەبوو پرسی:

چی دەڵێن، باسی چی دەکەن؟

یوری پێش ئەوەی من قسە بکەم هەمووشتێکی بە لئۆنا وت و لەوپەری سەرسوڕماندا بینیم لئۆنا ڕەزامەندی نیشانداو هیچی نەوت. یوری درێژەی دا و ئەم جارە بە زمانی ئامازۆنی بۆ ئەوەی لئۆناش تێبگات وتی:

ئێوەش دەبێت دوکەس لەناو ئەم ژنانەدا هەڵبژێرن. ئەوانم ڕازی کردوە لئۆنا لای خۆتان ڕابگرن. خەم مەخۆ دواتر بیرێك دەکەینەوە تا هۆکاری بەڕێکەوتنی ئێوە ئامادە بکەم....

وتوێژی ئێمە سیانە لێرەدا کۆتایی پێهات و هەرسێکمان بەرەو ریزی کچەکان بەڕێکەوتین. وام زانی لئۆنا حەسودی دەکات و ناچارە بەڕوی خۆیدا ناهێنێت و ڕەزامەندیەك کەدەریبڕیوە رووکەشە و لەئەنجامدا خەم دەخوات و ناڕەحەت دەبێت.

لەبارەی بۆچونی لئۆنادا وام بیردەکردەوە بەلاّم جیاواز لەهەمووی ئەم قسانە نەمدەتوانی سیّ ژنم هەبێت. ئەم بابەتە هەم پێکەنیناوی و هەم ترس ئەنگێزە.

چۆن دەمتوانی هەڵس وکەوتیان لەگەڵدا بکەم و بیرم دەکردەوە ژیانی داهاتووم لەگەڵ ئەم ژنانەدا چی دەبێت....!

بەهەرحاڵ چارەیەکم نەبوو جگە لەوەی سیّ ژنم هەبێت و رازی بم وەك هەراجەکانی خۆرهەلاّت. لەناو ئەم بیرانەدا بووم گەشتینە ریزی ژنان و کچان. هەموویان چاویان لەمن بڕیبوو... لەچاوی هەموویاندا حاڵەتێکی تایبەتم دەدی دەتوت بەنیگاکانیان قسەم لەگەڵ دەکەن و دەپاڕانەوە تا هەڵیانبژێرم. بەدڵنیاییەوە وایان دەزانی هاوسەربوونی من شانازییە. نەیاندەزانی چەندە لاوازو ناتەوانم. لەو شوێنە ترس ئەنگێزدا هیچ کارێکم لەدەست نایەت. جارێك لەبەرانبەر ریزەکەدا تێپەڕین. یوری لە بەرانبەر ئەوانەی جوانتر بوون بە ئانیشك دەیکێشا بە کەلەکەی مندا و ئیشارەی دەکرد هەڵبژێرم بەلاّم خۆشیم لەهیچیان نەدەهات. جاری دوەم دەستی پێکرد و من کەجارێك هەموویانم بینیب و هەڵم سەنگاندبوون بەیوریم وت:

ناشرینن، ئەوانەی باشتر بوون تۆ هەڵت بژارد. ئێستا هەموو پیس و پۆخڵەکانت بۆمن داناوە من نیوە شەو لەمانە دەترسم.

لەم گاڵتەیە هەردوکمان پێکەنیین و تازە لەپێکەنین ئاسوودە ببووین کە لە ژێردارێك چاوم بەکچێك کەوت کە دوور لەهەمووان وەستابوو و پرچە رەشەکانی بەگوڵی سپی وەحشی جەنگەڵ رازاندبوویەوە. چاوم تێبڕی و لەڕووناکی ئاگر لە روخساری ئەودا دوچاوی رەش و درەوشاوەم وەك چاوی ئاسك بینی. وا دەهاتە بەرچاو لەسەر پێستی رەشی نیگار کێشێکی بەتوانا هەموو هوونەری خۆی بەکار بردووە. برژانگی درێژ، لووتی باریك، دەمێکی باریك و رازاوە بەلێوی ئەستوور بەلاّم رەش. ئەندامیشی جوان بوو. لەسەر یەك ئەگەر بمانەوێت بەراوردی بکەین، لەهەموو کچەکانی تر جوانتر بوو. کاتێك چاوم پێی کەوت وەستام.

یوری بەمەبەستەکەی منی زانی و پرسی: ئەوە چۆنە؟

وتم: خراپ نیە

بەم شێوە یەکێك لە دو ژنەکەم هەڵبژارد. کاتێك هاتە ناو ناوەڕاستی گۆڕەپان چاوم بە لئۆنا کەوت و بەهێواشی پرسیم:

دەبینی.... چارەیەکمان جگە لە جیّ بەجیّ کردنی یاساکانی ئەوان نیە....

بەو پەری خوێنساردی وتی: کێشە نیە... ئێمە بۆ هەمیشە نامانەوێت لێر بمێنینەوە سەرئەنجام ڕۆژێکی تر دەگات من و تۆ تەنیایین نیگەرانی من مەبە.

لئۆنا لەگەڵ ئەوەی ژنێکی وەحشی و جەنگەڵی بوو، بیرێکی ڕۆشن و بەرزی بوو ئەو شەوە بەڕاستی لە پاکی دڵی خۆشحاڵ بووم بەخۆم وت:

(( خۆزگە ژنانی وڵاتە پێش کەوتووەکانیش وەك ئەو بیریان بکردایەو یاسای حەسوودی ورق هەڵگرتنی ژنان لەناو دەچوو. ئەوسا پیاوان هەناسەیەکی ڕەحەتیان هەڵدەکێشا ))

دوای هەڵبژاردنی ئەو کچە، هاوسەری دوەمیش هەڵبژێردرا. بێوەژنێك بوو نۆزدە ساڵە کە دەیانوت مێردەکەی ئەو کەسە بوو بەگوولەی من کوژرا.

هەرچەندە زۆر لەوانیتر جوانتر نەبوو بەڵام لەبەر هەستی مرۆڤ دۆستی ئەوم هەڵبژارد چوونکە خۆم بە لێپرسراوی مەرگی مێردەکەی دەزانی.

هەریەك لەم دوانە تازەماڵی جیایان هەبوو و دەیانویست من بەرنە ماڵی خۆیان. بڕیارماندا من نیوەی شەو لەماڵی یەکیان و نیوەکەی تر لەماڵ ئەویتریان بگوزەرێنم بەڵام کێشە لێرەدا بوو من بۆ هەرشوێنێك دەچووم ناچار لئۆنا لەگەڵمدا بوو. دوای چەند خولەك وتوێژ ئەم کێشەیەش چارەسەرکرا و کچێك کە سەرنجی منی ڕاکێشاو ناوی تۆما بوو، ئامادەبوو لەماڵەکەی خۆیدا ڕایبگرێت.

بەم شێوەیە یەکێك لەشەوە سەیرەکانی ژیانم دەستی پێکرد و لەبەرئەوەی لەبەرانبەر یاسای هۆز لێپرسراو بووم و و گەرنا من و لئۆنایان لەهۆزەکە دەردەکرد ناچار بووم بەو بارودۆخە ڕازی بم.

بەجۆرێك دەستم پێکرد کەنیوەی دووەمی شەو لەماڵی ترمابم و هەرواشی لێهات. بەیانی زوو چاوم کردەوە لئۆنا لەسەر سەرم وەستابوو دەستی بەقژمدا دەهێنا.

لەولای ژوورەکە سەبەتەیەك پڕ میوە بەرچاو دەکەوت و چوونکە زۆرم برسیبوو بەخێرایی لە شوێنەکەی خۆم هەستام و دەستم بەخواردن کرد. تفەنگەکەم لەخۆم جیانەدەکردەوە بۆیە شەو کاتێك دەمویست لە یوری جیاببمەوە و بڕۆمە حیجلە، تفەنگەکەم لێ وەرگرت. لەو کاتەی میوەم دەخوارد تفەنگەکەم لەسەر ئەژنۆ بوو. لە لئۆنام پرسی: شەو بەئاسوودەیی خەوتیت...

نا لەبەرئەوەی خەوی ترس ئەنگێزم دەدی...

شانەکانم بەرز کردەوە وتم: بۆ خەو ئەویش لە شوێنێکدا مرۆڤ لەکاتی بێداریشدا

پارێزراو نیە زۆر گرنگی دامەنێ و لەبیریکە.

لۆنا کەدەتوت نایەوێت نهێنی دڵیم بۆ باس بکات چەند ساتێك بێدەنگ بوو وتی:

نازانم چیە... نازانم خەو بوو یان بێدار... دیمەنێکی ترسناکم دەدی نزیك بوو بقیژێنم.

بابەتەکە بەم وەسفە کەمێك دژوار بوو، بۆیە وتم:

خۆشت نازانی خەو بوو یان بێداری؟

لئۆنا لەکاتێکدا بەحەسیری ژوورەکە یاری دەکرد وتی:

تۆو تۆما لەولا خەتبوون. راستیەکەت بووێت ناڕەحەت بووم نەمدەتوانی بخەوم. هەرچەندە زەختم لەخۆم کرد خەوم لێنەکەوت... دواتر لەماندوویی زۆر حاڵێکی تایبەت دەستی پێدام کە نازانم خەو بوو یان بێ هۆشی. بینیم، بەڵێ بەچاوی خۆم بینیم تۆما بەهێواشی دەستی تۆی لەسەر سینەی بەرز کردەوەو هەستا و لەسەر نووکی پێ بەرەو دەرگا رۆشت. کاتێك ئەو گەشتە دەرگاکە، سێبەرەکەیم بینی و هەستم کرد سێ پیاوی زل تا نزیك دەرگاکە هاتن. ئەوان شاخیان بوو و لەتاریکیدا قیافەی ئەوانم بەجوانی نەبینی. تۆما بۆ بینینی ئەوان رۆشتە دەر و دوای یەك خولەك گەڕایەوە و لای تۆ خەوت.

لەسەرسوڕماندا سەیری دەمی ئەوم دەکردو ئیتر میوەم نەدەخوارد. ئەو درێژەیدا، یەك خولەك تێنەپەری کە ئەو سێ پیاوە یەك یەك زۆر لەسەر خۆ هاتنە ژوور.

ئەوەندە لەبیستنی ئەم قسانە ناڕەحەت بووم بێ ئیرادە دەستم بە تفەنگەکەمەوە گرت و پرسیم: دەی...... دواتر...... رەنگە خەوت بینیوە....

لئۆنا وتی: خۆشم نازانم، رەنگە خەوبوو. بەڵام بینیم ئەو سیانە هێدی هێدی بەرەو لای من هاتن. سەرەتا وام زانی دەیانەوێت تۆ بکوژن بەڵام دواتر ئەوانم بەراشکاوی لای خۆم بینی... بێدەنگ بووم تێگەشتم مەبەستیان هەرچی بێت منم. یەك دو سات دواتر کە دەستی یەکێك لەوان بەرم کەوت بەرەو دەمم هات سەرم بەرزکردەوە کە بقیژێنم... هەر ئەوەندەی سەرم بەرز کردەوە ئەوان ونبوون و رۆشتن کاتێك قسەی لئۆنا گەشتە ئێرە لای خۆم بیرم کردەوەو وتم: (( ئەوان ونبوون و رۆشتن )) کەمانای نییە، چۆن ونبوون. بەدڵنیاییەوە خەوت بینیوە.

دڵم دایەوەو دڵنیام کرد جگە لەخەو هیچی تر نیە. لئۆناش ئارام بوویەوە و ئەو رۆژەم لەگەڵ تۆماو هاوسەرەکەیترم بەسەربرد.

وەك یوری وتبووی لەو هۆزەدا مرۆڤ هەرچەندە زیاتر ژنی هەبووایە ئاسوودە و

راحەتتر دەبوو چوونکە ژنان دابین کردنی ژیانی پیاوانیان لە ئەستۆدایە و بەچنینی میوەو کارەکانیتر سەرقاڵ دەبن تەنیا کارێك کەلەپیاو چاوڕەێن ئەوەیە لەمافە کۆمەلآیەتیەکانی هۆز پارێزگاری بکات. لەشەڕی نێوان هۆزەکاندا بەشدار بێت و لەکاتی بێکاریدا بڕواتە راو... تەنیا ئەمە.

ئەو رۆژە چەند باڵندەیەك و کەڵەکێویمان راو کرد.

تۆما و لیچی میوەیان کۆدەکردەوە. چوارکەسی میوەمان خوارد.

کاتی شەو وەك دانیشتوانی هۆز لەدەوری ئاگر دانیشتین و سەماو رابواردن خوێندنی گۆرانی دەستی پێکرد.

ئەو یەك رۆژی مانەوەم لەو هۆزە کاریگەری زۆری لەسەر رۆحیەم داناو ئەخلاقی منی گۆڕیبوو. شەو داهات. ئەم جارە نیوەی یەکەمم لەماڵی تۆماو نیوەی دووەمم لەماڵی لیچی گوزەراند. لئۆنا لەماڵی تۆمادا مایەوە، بەیانی کەلە خەو هەستام لیچی پەرێشان خۆی بەمن گەیاند و هەندێ شتی وت کەتێنەگەشتم بەڵام لە ئیشارە و نیشانەکانی کەبەدەست وسەر دەیدا زانیم مەبەستی لئۆنایە.

دەستی منی گرت و بەرزی کردمەوە و بەئیشارە تێیگەیاندم بەدوای لئۆنادا بڕۆم. منیش بەراکردن خۆم گەیاندە ماڵی تۆما وپرسیاری لئۆنام لێکرد. بەڵام بەخوێنساردی شانەکانی بەرز کردەوە و وتی نازانێت.

بە پەلە رۆشتمە لای یوری. کاتێك رۆشتمە ژوور لەسەر دۆشەکەیەکی پەر خەوتبوو و حەوت ژنەکەی دەست و قاچیان دەشێلا.

یوری کاتێك منی پەرێشان بینی هەستاو وتی: چی بووە........؟

پێم وت: لئۆنا ونبووە و هەرچی لە تۆما دەپرسم شانەکانی بەرزدەکاتەوە و لەزمانی تێناگەم. ئەو بەخێرایی دوانی لەرەشەکان ناردو تۆمایان هێنا.

چەند خولەکێك قسەی لەگەڵدا کردو دواتر یوری وتی:

دەڵێت لئۆنا تا بەیانی خەوتبوو. بەیانی زوو هەستاو رۆشت و ئیتر هەواڵی نیە.

بەیوریم وت:

ئەمە نابێت. دەبێت بیدۆزینەوەو دواتر باسی رووداوی خەوەکەیم بۆکرد.

یوری کاتێك لەم رووداوە ئاگادار بوویەوە، جادوگەرانی هۆزی بانگ کردو دەستووری پێدان بە خێرایی لئۆنا بدۆزنەوە. بەڵام ئەوانیش بەخوێنساردی وتیان نازانین.

نزیك بوو شێت ببم. تۆما خۆی پێوە دەلکاندم و خۆشەویستی بۆ دەردەبڕیم بەڵام چوونکە بەهۆکاری ونبوونی لئۆنام دەزانی، پشتم تێکردو گوێم پێ نەدەدا.

شەو هات و من لەهەموو شتێك هیوابڕاو بووم. لای ئاگر دانیشتم و بیرم کردەوە. روخساری لئۆنا لە چاومابوو، دڵم بۆی دەسوتا. بەدبەختانە لەزمانی لیچی نەدەگەشتم دەتوت دەیەوێت شتێکم پێ بڵێت بەڵام لە ترسی تۆما ناوێرێت.

شەربەتی ئاناناسم دەخواردەوە کەلیچی ئیشارەی کرد وزانیم بۆ ژوورەوە بانگم دەکات. کاتێك هەمووان سەرقاڵی سەما کردن بوون و سەرخۆش بە شەربەتی ئاناناس وەك شێت دەیانخوێند بەهێواشی لە شوێنەکەم هەستام و لەوێ دوورکەوتمەوە. خێرا خۆم گەیاندە ماڵی لیچی. لیچی بە ئیشارە هەندێ شتی وت کەتێنەگەشتم. بەڵام لەناکاو بەدوقامکە لەسەر سەری خۆی شاخی دروست کرد. بەم ئیشارەیە خێرا کەوتمە بیری ئەو روداوەی لئۆنا باسی کردبوو و سەرنجی زیاترم بەقەسکانیدا. دوای یەك کاتژمێر بە دژواری تێگەشتم کە لیچی دەڵێت:

جادوگەران بەیارمەتی تۆما لئۆنایان دزی و ئەم شەو دەیکوژن.

بۆ ونبوونی لئۆنا بیرم لەهەموو شتێك دەکردەوە مەگەر جادوگەرانی هۆز کەئەویان دزی بێت.

یانی چی؟ بۆچی؟ ئاخر بۆ ئەم کارەیان کردوە؟

دەمویست ئەم بابەتە لە لیچی بپرسم بەڵام بەدبەختانە لەزمانم نەدەگەشت و بە ئیشارەش نەمدەتوانی تێیگەیەنم. جیاواز لەمانەش لیچی دەترسا. بەردەوام لە دەرگای ژوورەکەی دەڕوانی و ئیشارەی دەکرد. لە مەبەستەکەی گەشتم. ئەو دەیوت رەنگە بمبینن و تۆڵەم لێ بکەنەوە کە بۆ پەردەم لەسەر ئەم نهێنیە هەڵگرتووە.

دەمویست بڕۆمە لای یوری بەیارمەتی ئەو شوێنی لئۆنا بدۆزمەوە بەڵام لیچی دەترساو دەپاڕایەوە تا لەم کارە چاو بپۆشم. سەرئەنجام بیرێك بەزەینم گەشت و تێمگەیاند لەژوورەکە بمێنێتەوە تا بگەڕێمەوە.

رازی بوو بەترس و لەرز لە سوچێکدا دانیشت و بەخێرایی لەوێ دوورکەوتمەوە و رۆشتمە لای یوری. کاتێك گەشتمە شوێنی سەما کردن هێشتا قەربالغی درێژەی بوو. دڵنیابووم تاکۆتایی هاتنی سەماکە لئۆنا لەئەماندایە چوونکە جادوگەران هەموویان لەوێ بوون و بەپێی یاسا نەیاندەتوانی بڕۆن. یوری لەناو ژنەکانی خۆی لەسەر سفرەیەك پڕ لەمیوە دانیشتبوو و گوێی بەمن نەدەدا. سەرەتا بڕیارمدا راستەوخۆ بڕۆمە

لای و بابەتەکەی بەگوێدا بچرپێنم بەڵام هەستم کرد جادوگەران سەیرم دەکەن. بۆیە بێ گوێدان بەخوێنساردی لەشوێنەکەی خۆم دانیشتم و بیرم کردەوە.

یەک لەجادوگەران لەکاتی سەما کردن خۆی بەمن گەیاند و کەوی گیراوەیەك کە لە جۆرێك شەربەتی سەرخۆشکەری پر بوو، دایە دەستم هەمووان ناچاربوون لێی بخۆن و منیش کەمێکم خوارد و چوونکە عادەتم پێ نەگرتبوو کاریگەری لەسەر دانام و منی مەست کرد.

لەوحاڵەدا کەهاوشێوەی سەرخۆش بووم بیری سەیرو سەمەرە هێرشیان کردە سەرمێشکم. بیرم دەکردەوە لئۆنا لە چ حاڵێکدایە؟ چی لێ دەکەن...؟ ئایا دەتوانم ئەو ژنە بەدبەختە کە لەبەر من لە هۆزەکەی رایکردوە، رزگار بکەم یان نە؟

قیافەی میهرەبان و روخسارە جوانەکەیم لەبەر چاوی خۆمدا دەدی. ئەندامیم لە زەیندا وێنە کردو بەهەمان شێوە کەلە شەربەتەکە سەرم گەرم بوو، لەخەیاڵەکانی خۆمدا پیاسەم دەکرد.

چەند خولەکێك بەم شێوەیە تێپەری. دەڵێم چەند خولەك !! رەنگە یەك کاتژمێر. لە شوێنەکەم هەستام و لەکاتێکدا رەتەڵم دەبرد خۆم بەیوری گەیاندو لای دانیشتم.

یوری کە بەجوانی ئەخلاقی منی دەناسی لەگەڵ ئەوەی چاوی پێم کەوت هەستی کرد روداوێك رویداوە. بە ئیشارەی چاو لێی پرسیم چی بووە.

کەس لەوەێ ئینگلیزی نەدەزانی بۆیە بەئاسودەیی و بەدەنگی بەرز هەموو شتێکم پێوت. ووتم: لیچی لەماڵەکەی خۆیدا دانیشتوە و چاوەرێیە. بەبیانوویەك هەستە بابرۆینە لای ئەو. یوری دەست بەجێ لە شوێنەکەی هەستا، بەهەستانی ئەو دەنگی تەپڵەکان پچرا و هەمووان گومانیان کرد کۆتایی بەرێورەسمەکە هاتووە، بەڵام ئەو هەندێ شتی وت رێگەی دا درێژە بەسەماکردن بدەن و خۆی لەگەڵ مندا بەرێکەوت.

لەرێگادا لەیوریم پرسی: ئەوان بۆ لئۆنایان دزیوە؟ مەبەستیان چیە؟

یوری وتی: ئەم مەترسیە بۆ هاوسەرەکەی منیش هەیە. ئەوان ژنانی سپی پێستیان خۆش دەوێت بەدڵنیایەوە بۆ مەبەستی مەترسیدار بردویانە و دوای ئەوە دەیکوژن و لاشەکەی لە جەنگەڵدا فرێ دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارە بەپیرۆز و جێگەی سەرنجی خواکان دەزانن.

وتم: تۆما لەم کارەدا بەشدارە، ئەو چ مەبەستێکی هەیە.

یوری وتی: ئەو لە حەسوودیدا ئەم کارەی ئەنجام داوە بۆتە هۆی بزواندنی

جادوگەران. بەدڵنیاییەوە تۆی خۆش دەوێت و نایەوێت هاوسەری سپی پێستت هەبێت.

لەم کاتەدا لەماڵەکە نزیك بووینەوە، یوری وتی:

دەبێت ئەم جارە کارێکیان لەگەڵدا بکەین کە ئیتر قەت لەم کارانە ئەنجام نەدەن چوونکە هەڕەشە لەسەر ژنەکەی منیش هەیە.

لیچی لە تاریکی ژوورەکە چاوەڕێی دەکردین، بە بیستنی دەنگی وتوێژەکەمان خۆی داشارد و کاتێك ڕۆشتمە ژوور و نەمبینی ترسام چوونکە ئەم بیرم لادروست بوو رنگە جادوگەران بەبابەتەکەیان زانیبێت و تۆڵەیان لێ سەندبێتەوە.

لەم بیرەدابووم کە لیچی خۆی نیشان داین.

ئەو زۆر دەترسا و لەترسا هەندێ شتی هێنایە سەرزمان کە بۆمن نەشیاو بۆتێگەشتن بوو، یوری ماوەیەك قسەی لەگەڵدا کردو لەئەنجامدا وتی:

ئەو دەڵێت لەلای ئاوابوونی خۆر ماڵێکی حەسیری هەیە کە تاقمێك لە جادوگەران تیایدا سەرقاڵی کاری سەیرو سەمەرەن. لئۆنایان بردوە بۆ ئەوێ.

بەخێرایی وتم: نیشانی ئەو ماڵەی لێوەربگرە. ڕێگاکەی لێ بپرسە بائێستا بڕۆین.

یوریش ئەم پرسیارەی کردو وەڵامەکەی بۆ وەرگێرامەوە و وتی ئەو دەڵێت. من ئەو شوێنە نازانم دەبێت بووەستن تا جەژنەکە تەواو بێت و جادوگەران بڕۆن. تەنیا ڕێگەی دۆزینەوەی ئەوماڵە کەلەناو دارەکاندا داشاردراوە بەدوادا چوونی جادوگەرانە. جگە لەمە ڕێگەیەکی تر نیە.

لیچی کەبێ ئەندازە دەترسا ئەمەی وت و لەژوورەکە ڕۆشتەدەر.

من و یوری تەنیا ماینەوە و راوێژمان کرد. وتوێژی ئێمە نیو کاتژمێری خایاند و سەرئەنجام یوری ڕێگەیەکی دۆزیەوە وتی:

من درۆمە جەژنەکە، جادوگەران سەرقاڵ دەکەم و تۆ لێرەدا خۆت دادەشاریت. کاتێك جادوگەرانم ئیزن دا تۆ بەدوایاندا دەرۆیت. منیش دواتر پەیوەستت دەبم تا بەهاوکاری یەکتر لئۆنا رزگار بکەین. ئەمە ئەنجامێك بوو ئێمە لەوتوێژی نیو کاتژمێری خۆمان گرتمان بۆ دۆزینەوەی شوێنی لئۆنا. ڕێگایەکی ترمان لەبەردەمدا نەبوو. ڕەزامەندی خۆم نیشاندا. یوری گەڕایەوە بۆ ناوجەژنەکە و من لەناو دارەکاندا خۆم داشارد.

لەو شوێنەی خۆم داشاردبوو، گۆڕەپانی ماڵەکان بەجوانی دەبینرا. سەمای ترس ئەنگێزو لەهەمان کات سەرقاڵکەری وەحشیەکانم دەبینی. یوری و جادوگەرانیش

دەبینران. بەم شێوەیە ئاسوودە دەبووم کە هیچ جوولەیەك لەبەر چاوم ون نابێت. بەڵام سەرخۆشی ئەو شەرابە لەحنەتیە باوێشکی پێدەدام و هاوشێوە کەسانێك مۆرفینیان لەخۆیان دابێت باوێشکم دەدا، سەرم دەهاتە خوارو پێڵوەکانم قورس دەبوو و خەو بەرچاومی تاریك دەکرد. هەرچەندە زەختم لەخۆم دەکرد ڕێگرتن لەخەو ئەگەری نەبوو بەپێچەوانەوە زیاتر باوێشکم لێدەداو خەو بەسەرمدا زاڵ دەبوو.

لەناکاو ئەم گومانەم بۆ دروست بوو رەنگە جادوگەران ژەهر خواردیان کردبێتم !

ئاخ ! چ بەڵایەکی گەورە ' ئەگەر ژەهر خوارد کرابێتم چی بکەم....؟ بەڵام ژاراوی بوون جگە لەقورسی پێڵوەکان وباوێشکدان شوێنەوارێکی تر لەجەستەمدا نەدەبینرا... ئەی ئەگەر ژەهر خوارد نەکراوم ئەم باوێشکدانە چیە؟

رەنگە دەرمانێکی تایبەتیان دەرخوارد دابێتم کەبێ هۆشم کات و بمخەوێنێت و لەئەنجامدا بێ هۆش ببم و خەوم لێبکەوێت و کات بەفیڕۆ بڕوات و ئەوان مەبەستەکەیان بخەنە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە.

کاتێکیش لەناو ئەم بیرانەدا بووم، باوێشکم لێ دەدا. وەك پشیلەیەکی نەخۆش و مریشکێکی ئاوڵە گرتوو سەر تا ئەژنۆم دەڕۆشتە خوار و دواتر وەك ئەو کەسانەی کارەبا لەجەستەیان درابێت، رادەچڵەکیم و بەزەخت چاوەکانی خۆم دەکردەوە.

دەمویست زووتر جەژن کۆتایی پێ بێت و جادوگەران بڕۆن بەدوای کاری خۆیاندا. بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر جادوگەران کاتژمێرێکی تر درێژە بە سەماکردن بدەن بەدڵنیایەوە خەوم لێدەکەوێت و بەهیچ شتێك بەخەبەر نایەمەوە و لەئەنجامدا لێۆنا دەکوژرێت. لەهەمووی خراپتر ئەوەبوو سات بەسات خەوەکەم قورستر و حاڵم خراپتر دەبوو.

لەناکاو بیرێك بمێشکم گەشت و بەخێرایی خستمە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە. لە کتێبی. ئەفسانەیی هەزارو یەك شەودا خوێندبووم کە فلان کەس بۆ ئەوەی خەوی لێنەکەوێت و چاودێری فلان کەنیزە بکات دەستی خۆی دەبڕی و خوێی دەکردە سەر برینەکە منیش بەخێرایی خەنجەرەکەم لەکەمەر دەرهێناو تیغە تیژەکەیم لەسەر پشتی دەستم داناو جوڵاندم.

تیغەکە کەمێك رۆشتە خوار و دەستی بریم. خوێن هاتەدەرو کزانەوەیەکی سەیری دروست کرد. چەند خولەکێك سەرقاڵی برینەکە بووم و دوای ئەوەی خوێنەکە وەستایەوە، کزانەوەکەی هەرما و لە ئەنجامی ئەم کارە ناڕەحەتە کەم کەم خەو لەچاوم

ڕەوی و بەئاسوودەیی درێژەم بەچاودێری کردندا بەڵام هەندێ کات دەردی زۆر ئازاری دەدام و ناڕەحەتی دەکردم.

نەمزانی چەند کاتژمێر یان چەند خولەك تێپەڕی، بینیم یوری لە شوێنەکەی هەستا. تەپڵەکان وەستان، سەماکەرەکان ڕۆشتن و ئاگر کوژایەوە و گۆڕەپان چۆڵ بوو.

یوری بۆ ئەوەی گوومانیان نەبزوێنێت راستەوخۆ لەگەڵ ژنەکانی رۆشتە ژوورەکەی خۆی و بەم شێوەیە جادوگەرانی ئیزن دا. جادوگەران هەر ئەوەندەی لەلایەن یوریەوە ئاسوودە بوون لەیەك کۆبوونەوەو شتێکیان وت و بەرەو جەنگەڵ ڕۆشتن. لە حەشارگەکەی خۆم بەجوانی ئەوانم دەبینی و تائەو شوێنەی رووناکی ئاگری بەردەم ماڵەکان دەگەشت بەچاو بەدوایاندا ڕۆشتم و دواتر کە لەناو تاریکیدا ون بوون لەحەشارگەکەم هاتمە دەرو بەدوایاندا بەڕێکەوتم.

ئەوان زۆر لەسەرخۆ هەنگاوێان هەڵدەگرت و کەمێك کە لەریزی ماڵەکان دوورکەوتنەوە خێرایی هەنگاوەکانیان زیاتر کردو هێواش هێواش دەستیان بەراکردن کرد.

تفەنگەکەم لەدەستم دا فشار دەداو لەتووڕەیی زۆر دیانەکانم لەیەك گیر دەکرد. دەمویست هەرچی زووتر بە گوولە بیانکوژم بەڵام دەترسام ئەم کارە ببێتە هۆی ئەوەی لئۆنا لەدەستم بڕوات. نیگەرانیەکی ترم بوو ئەویش نەهاتنی یوری بوو.

بۆ ئەوەی یوری لەدواوە بگات چەند خولەك لەشوێنەکەی خۆمدا وەستام تائەوەی سەرەئەنجام یوری کەرمێکی درێژی لەدەستا بوو گەیشت بەڵام بەدبەختانە لەم کاتەدا ئەوانمان ون کردبوو و بەهۆی تاریکی ڕێگاکەشمان نەدەبینی.

یوری دڵنیای کردم و وتی:

ئاسوودەبە، وەحشیەکان بەبێ سەما کەس ناکوژن و سەماش بەبێ تەپڵ ناکرێت.

لەم وتوێژانەدا بووین کە لەناکاو دەنگی گامپ گامپی تەپڵ لە دوورەوە بیسترا.

یوری بێدەنگ بوو، گوێی هەڵخست و وتی:

دەنگی تەپڵی ئەوانە، بەم دەنگە بڕۆینە پێش.

بڕێکی زۆر بەرێگادا رۆشتین و هەرچی زیاتر دەڕۆشتین دەنگی تەپڵ باشتر دەبیسترا. نزیکەی کاتژمێرێك بەرێگادا ڕۆشتین تا لەدوورەوە ڕۆشنایەکی سور ڕەنگ بینرا.

یوری دەستی منی گرت و وتی:

ئەوان لە ژوورەوەن بەڵام پاسەوانیان هەیە. دەبێت زۆر ئاگادار بین.

زۆر لەسەرخۆ رۆشتینە پێش. لەناوچەی دارکان ماڵێکی حەسیری دەبینراو لەناو ماڵەکە رووناکی ئاگر بەرچاو دەکەوت. لەناو دارەکان رێگەمان خوارکردو بەجۆرێك رۆشتینە پێش دڵم بەتوندی لێی دەدا و لەهەمان کات چاوی خۆم بڕییە سەر حەسیرەکە و لەناوماڵەکەم ڕوانی. دەستەکانی لئۆنایان بەتەناف بەستبوویەوە و لە سەقفەکەوە هەڵیان واسیبوو. چاوەکانی لئۆنا کراوەبوو و کەنووکی پەنجەکانی قاچی دەگەشتە سەر زەوی، هەندێ کات ماندوویی جەستەی خۆی بە فشاردانی قاچەکانی لەسەر زەوی بەدەر دەکرد.

تووڕەیی لەناخمدا هەرایەکی دروست کردبوو، بەیوریم وت:

خێراکە.... ئەوان سەما دەکەن... ئێستا دەیکوژن.

یوری رمەکەی لەدەست گرت. منیش لە دەستێکما خەنجەرو لەدەستەکەی ترما تفەنگەکەم گرتبوو. هەردوکمان بەخێرایی بەرەو دەرگای ژوورەکە رامانکرد. رەش پێستێك لەبەرانبەر دەرگاکە وەستابوو. بەڵام فریای قیژاندن نەکەوت چوونکە رمەکەی یوری دڵی کون کردو خستی.

من و یوری رۆشتینە ژوور، ئەوان ئێمەیان نەبینی و سەرقاڵی سەما کردن بوون. من لەدەرفەت کەڵکم وەرگرت و چەند هەنگاوێك نزیك بوومەوە کە لەناکاو یەکێك لەجادوگەران کە دەمامکێکی ترس ئەنگێزی بەستبوو قیژاندی.

دەرفەتم پێ نەداو بەیەك مشت تەختی زەویم کرد و لەهەمان کاتدا بەخەنجەر تەنافەکەی لئۆنام بڕی. شەڕێکی توند دەستی پێ کردو دەنگی قیژە بەرز بوویەوە.

نەمدەزانی ئەم قیژانە هی کێیە و لەقورگی کێ دێتەدەر. ئاگرەکە کوژایەوە، دوکەڵی دارە نیوە سووتاوەکان تێکەڵ بەتەپ و تۆزی ژوورەکە هەموو شوێنێکی گرتبوویەوە و لەئەنجامدا چاوی من هیچ شتێکی نەدەدی و جوان شتەکانم بۆ جیانەدەکرایەوە.

شادمانیم لەوە بوو کە لئۆنام رزگارکردوە. ئەو دەلەرزی.

ئەمە دڵنیایی و هێز بوو بۆمن کە پێش هەرکار و هەرشتێك لئۆنا رزگاری بووە. بەڵام نەدەبووا یوری بەتەنیا جێ بێڵم. لەمرۆڤایەتی و هاوڕێیەتی بەدوور بوو و ئەگەر یوری بەهەمان شێوە درێژی بەشەڕ دەدا هیلاك دەبوو و دەکوژرا.

دەمویست یارمەتی بدەم. سیلاحم لەدەستابوو. تفەنگەکە لەدەستێك و خەنجەر لەدەستێکی تردابوو و لئۆنا لەناو بازووەکانمدا بوو. بەڵام توانای ئەنجامدانی هیچ

کارێکم نەبوو. دەنگێکم دەبیست لەدەنگی یوری دەچوو بەڵام ئەم دەنگەش لەناو دەنگ و قیژەکانی تردا ون دەبوو. چەند خولەك تێپەڕی، نەمزانی جوان لەبیرم نیە کە لەناکاو لە رووناکی ئاگرە نیوەکوژاوەکە قیافەی کەسێکم بینی وەك ئاژەڵێکی دڕندە پەلاماری دام. لەناو دەمیدا خەنجەرێك دەبریسکایەوە. بریسکەی خەنجەر کە لەنێوان لێوەکانی دا بوو پێش هەرشتێك سەرنجی منی بەرەو مەترسی مردن راکێشا و بەخێرایی خۆم کێشایە دواوە.

دەمویست لێی دوور بکەومەوە تا ئەو شوێنەی دەکرێت هێرشەکەی دواخەم بەڵام لەبەرئەوەی لئۆنا لەناو بازووەکانمدا جێگیر بوو، نەمتوانی هاوسەنگی خۆم بپارێزم، دو قاچم لەیەك ئاڵا و لەدواوە کەوتمە سەر زەوی، لئۆناش کەوتە سەر سینەم.

بەهۆی ئەم روداوە رەش پێستی دێو ئاسا کە خەنجەری لەناو لێویدا هەڵگرتبوو بۆ هێنانەخوار بردبوویە سەر، نەیتوانی مەبەستەکەی جێ بەجێ بکات و یەك دو چرکە لەسەر سەری من و لئۆنا کە کەوتبووین وەستا و دوبارە دەستی بەرزکردەوە کە خەنجەرکەمان لێ بدات. لئۆنا قیژاندی و پەڕیە ئەولا وبەم شێوە ئەو لەمردن رزگاری بوو.

رەش پێست سەرەتا دەیویست ئەو بکوژێت بەڵام کاتێك لئۆنا تلاو لەزەربەی خەنجەرەکە دوور کەوتەوە سەرنجی بۆ لای من کە هێشتا لەسەر زەوی دابووم راکێشرا. خەنجەرەکەی بردەسەر، ساتی نێوان ژیان و مردن بوو. یەك دو چرکەی دواتر دەستی رەش پێست دەهاتە خوار و نووکی کانزایی خەنجەری لەدڵی من رۆدەچوو و دەکوژرام.

چاوەم رەش ببوو، سەرم گێژی دەخوارد. ئەگەر کەسێکی وشیاور و زیاد لەرادە چالاك بوومایە لەویەك دو چرکەدا دەمتوانی خۆم لەمردن رزگار بکەم بەڵام بەداخەوە ئەوندە زرنگ نەبووم و ئێستاش نیم. گێژببووم و بێ ئەوەی بچوکترین پەچەکردار نیشان بدەم لەچاوەڕوانی مەرگدا مامەوە و رەنگە دڵم دەیوست زووتر بمکوژێت و لەم هەموو بەڵاو بەدبەختیە رزگارم بێت. هەرچەندە لەوکاتەدا دەرفەتی بیرکردنەوەم نەبوو....

دەستی رەش پێستی خوێنخۆر هاتە خوار، خوارتر تا ئەو رادەی زۆر لەدڵ و سینەی من نزیك بوویەوە بەڵام لەناکاو رەش پێست قیژاندی و هەنگاوێك رۆشتەدواوە پەرێشان و ترساو لە شوێنەکەم بەرزبوومەوە. دەتوت تازە لەخەو هەڵدەستم و ئەو شتانەی نەمدەبینی، دەیبینم، لەرووناکی کەم رەنگی ئاگر بینیم رەش پێست ناتوانێت لەسەر پێی خۆی بووەستێت. چۆن بوو رۆشتە دواوە....؟ بەم حاڵەش دەیوست بێتە پێش و

خۆی هەڵداتە سەر من بەڵام ئیتر توانایی نەبوو، ڕەتەڵی دەبرد و نەیدەتوانی هاوسەنگی خۆی رابگرێت.

لە شوێنەکەی خۆم دانیشتم ووردبوومەوە و لەم کاتەدا بوو تیرێکم لەناو سکی ڕەش پێستدا بینی تیر بەشێوەیەك لەدڵی ڕۆچبوو تەنیا نووکەکەی لەسەر پێستە خوێناویەکەی دەبینرا و بەهۆی ئەم تیرە ژاراوییە بوو کەدیارنەبوو کێ لێیداوە، ڕۆشتە دواوە و من لەمردن رزگارم بوو.

لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و لە شوێنەکەی خۆم هەستام. دەرفەتی باشتر لەمە بەدەست نەدەهات. لەگەڵ ئەوەی گێژبووم لە شوێنەکەم هەستام. لەم کاتەدا لئۆنا لەدواوە پەیوەستم بوو و کەلێم ڕوانی، کەوانێکم لەدەستیدا بینی و زانیم ئەو ڕەش پێستە دێوئاسایە ئەو لەپێی خستوە.

هێشتا ڕووی خۆم بۆ لای یوری نەسوڕاندبوو کە قیژاندی و وتی: یوریان کوشت...

و بەپەنجە ئەولای ژوورەکەی نیشان دا. لەوێدا کەوتبوو و یەك لەجادوگەران لەسەر سینەی دانیشتبوو یەکیتریش کەوت و دەیویست هەستێتەوە. سیان کوژرابوون. ئەوەی لەسەر سکی یوری دانیشتبوو و دەیوست بیکوژێت دوایین کەسی جادوگەران بوو و ئەگەر ئەویش دەکوژرا، بێجگە لەو بریندارە هەموویان کوژرابوون.

ئیتر شوێنی درەنگ کردن نەبوو. لئۆنا دەیویست بەتیرو کەوان ڕەشەکە بکوژێت بەڵام ڕێگریم لێکرد چوونکە ئەگەری هەبوو بەهۆی تاریکی تیرەکە بەهەڵەدا بڕوات و یوری بکوژێت و بۆیە خۆم ڕۆشتمە پێش و بە فیشەکێك مێشکیم پرژاند.

جادوگەر وەك ورچ لەسەر یوری هەستاو لەولا کەوت. ئەوەی کەمابوو دەیویست رابکات بەڵام یوری لەدواوە رمەکەی بۆ هاویشت بەشێوەیەك نووکی رمەکە لەسینەی دەرچوو و خەڵتانی خوێن لەبەر دەرگای ژوورەکە گیانی دا.

بەم شێوە لەو شەوە مەترسیدارە لئۆنامان لەمردن رزگار کرد و خۆشمان لە مەترسیەکی گەورە رزگارمان بوو و ئاسوودە بووین بەڵام کاتێك بەڕێکەوتین و بەرەو ماڵەکانی هۆز ڕۆشتین یوری وتی:

کوشتنی جادوگەران کارێکی ئاسان نیە. ئێمە ئەوانمان بۆ پاراستنی گیانی خۆمان کوشت. بەڵام کاتێك بەیانی دانیشتوانی هۆز لەم ڕوداوە ئاگادار ببنەوە تیکە تیکەمان دەکەن. بەسەرسوڕمانەوە وتم:

ئەوان پەلاماری ئێمە دەدەن، کاریان بەتۆو هاوسەرەکەت نیە. یوری وتی:

جیاوازی نییە، چ من، چ ئێوە لای ئەوان یەکین. ئەوان جادوگەران بەنێردراو نوێنەری خوای جەنگەڵ دەزانن و ئەگەر جادوگەرێك بکوژرێت چاوەڕوانی دەرکەوتنی نەخۆشی، بوومەلەرزە و مەترسی تریان هەیە بۆیە بۆ رێگرتن لە تووڕەیی خوا بکوژی جادوگەر ئەگەر سەرۆکی هۆزیش بێت دەیکوژن. ئەوەیە کەمنیش لەمەترسیدام چەند خولەکێك لەمبارەوە وتوێژمان کردو پرسیم: دەبێت چی بکەین؟

دەبێت بڕۆینە هۆز، هاوسەرەکەم هەڵبگرم و لێرە رابکەین. جگە لەمە رێگایەکی تر نیە چوونکە جیاواز لەم رێگایە لە بەرەبەیاندا هەموومان دەکوژرێن. گاڵتە نیە ئێمە هەر پێنج جادوگەرەکەی هۆزمان کوشتووە، ئەوانە وەك پزیشکی هۆز وان و کاری تایبەت ئەنجام دەدەن. خێرا.......خێرا بالێرە دوور بکەوینەوە، لئۆنا رەزامەندی نیشان داو سەرئەنجام هەرسێکمان رێکەوتین و خێرایی هەنگاوەکانمان زیاتر کرد هەرچەندە زیاتر لەهۆز دوور دەکەوتینەوە ترس بەسەرماندا زاڵ دەبوو دڵم لەترسدا لێی دەدا بەڵام قسەم نەدەکرد و بەرووی خۆمدا نەدەهێنا. دەمویست ئیتر قاچ نەخەمە ئەو شوێنە و ئیتر رووی رەش پێستەکان نەبینم.

بەخۆشحاڵیەوە لەنزیك هۆز یوری بەمنی وت:

ئێوە دونەفەر لێرەدا بمێننەوە. من بەتەنیایی دەڕۆم و هاوسەرەکەم دەهێنم کە ئەگەر مەترسیەك هەرەشە لەسەر ئێمە بکات لانی کەم ئێوەی لێ دوور بن.

من لەم پێشنیارە زیاد لەرادە خۆشحاڵ بووم و خێرا وەستام. لئۆناش بێ درەنگ لام وەستا و یوری بەخێرایی لەناو دارەکان لەچاو ون بوو. چاوەڕوانی زۆر ناخۆشە، بەتایبەت لەئاوا بارودۆخێکدا. هەر دەنگێکم دەبیست دەموت:

یوریان کوشت.... یوریان گرت.

بەڵام دواتر بێدەنگی جێگیردەبوو خامۆشی دەبووە فەرمانڕەوا. دوکاتژمێر بەم شێوە تێپەڕی و سەرئەنجام دەنگی خشەخشی شاخ و گەڵای دارەکان بیسترا و چەند خولەك دواتر یوری هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەی بەراکردن خۆیان گەیاندە ئەوێ و بێ ئەوەی بووەستن و قسەمان لەگەڵدا بکەن، دوورکەوتنەوە تەنیا یوری وتی:

راکەن، خێراکەن، پاسەوانەکان هەستیان بەکوژرانی جادوگەران کردوە.

یوری و هاوسەرەکەی لەپێشەوە دەڕۆشتن و من و لئۆناش دەست لەناو دەست بەدوایاندا رامان دەکرد. هەموو شوێنێك تاریك و رەش بوو. نەماندەزانی بۆ کوێ دەڕۆین و رێگای بەردەممان بەکوێی جەنگەڵ کۆتایی پێدێت. بەڵام چوونکە گیان وژیان

لەئارادابوو رامانده‌کرد و دەڕۆشتین.

لئۆنا زیاتر لەوانیتر هیلاك ببوو هەڵبەت منیش هەناسە بڕکێم پێکەوتبوو و نزیك بوو لەپێ بکەوم بەڵام چوونکە لئۆنا ناسك و بێ هێز بوو، چەند جار دەستی راستی لەملم ئالاندو وتی: دەمرم. بووەستن. خەریکە دەمرم.

ئەگەر بەدەست من بووایە دەوەستام بەڵام یوری یەك ساتیش درەنگی نەدەکرد و کاتێك هاوسەرەکەی هیلاك بوو، باوەشی گرت. وەك بەرخۆلەیەکی یەك ساڵە لەباوەشی گرتبوو و لەناودارو لقەکانەوە تێدەپەڕی و دەڕۆشت.

جوان بیرم نیە چەند کاتژمێر رۆشتین و چەند لەوێ دوور کەوتینەوە.....

بینیم یوری وەستا و سەیرێکی دەروبەری کرد و وتی:

زۆر باشە، ئێستا دەتوانین بحەسێینەوە، ئێرە شوێنێکی ئەمن و ئارامە. زۆر لێیان دوور کەوتوینەتەوە.

لە هیلاکی زۆر لە ئارەقدا خوسابووم، کەوتم، لئۆناش کەوت و سەری خستە سەر پشتی من و خەوت. دەترسام بخەوم بەڵام ئەوەندە هیلاك بووم توانای خۆڕاگریم لێ سەندرابوویەوە، کەم کەم پێڵوەکانم قورس بوو و بەهەمان شێوە کە کەوتمە سەرزەوی خەوێکی قورس منی بردەوە، یوری و هاوسەرەکەشی چەند هەنگاو ئەولاتر خەوتن. نەسیمێکی فێنك هەڵیکردو مەلەکان لەسەر دارەکان دەیانخوێند و بەم لاولادا دەپەڕین کەلەخەو هەستام. هەوا رووناك ببوویەوە. دیار بوو رەشەکان ئێمەیان نەدۆزیبوویەوە ویان هەربەشوێنماندا نەهاتوون.

پێش هەرشتێك سەیری لئۆنام کرد. هەنگاوێك ئەولاتر بەپشتا کەوتبوو لەناو خەوێکی خۆشدا دەخولایەوە. یوری و هاوسەرەکەی دەتوت لەسەر دۆشەکی پەڕی قاز خەوتوون، رمێکی کوورتی ئاسنی لای یوری کەوتبوو، دیاربوو شەوێ پێش یوری لەکاتی راکردن سیلاحیشی ئامادەکردوە. دووبارە سەرنجم بە لئۆنا دا. لەروناکی زیو رەنگی بەیانی جوانیەکی دڵگیری هەبوو. قژەکانی لەم لاولای گیاکاندا پەخشان و پەرێشان بوون و دیمەنێکی تایبەتی پێ دابوو. پێم حەیف بوو سەری لەسەر زەوی بێت، رۆشتمە پێش و سەریم هەڵگرت و خستمە سەر ئەژنۆم و هێواش هێواش دەستم بەقژیدا هێنا. تازە لئۆنا چاوەکانی کردەوە کە دەنگێکی ترس ئەنگێز بیسترا. بەشێوەیەك بوو جەنگەڵ لەدەنگی لەرزی. دووبارە ئەو دەنگە بەگوێی گەشت و تا هاتم برۆم تفەنگەکەم هەڵبگرم پڵنگێکی زل و دێو ئاسا لەبەرانبەرم دەرکەوت. تفەنگەکەم لەولابوو. ئەگەر

بەرەو تفەنگەکە برۆشتمایە لە پڵنگە کەنزیکی دەبوومەوە دەبووا چی بکەم؟ لئۆنا هەستاو رایکردو رۆشتە لای یوری... من خۆم لەبەرانبەر پڵنگەکە دانابوو تا هێرش نەکاتە سەر ئەوانیتر.

ئاژەڵی دڕندە و برسی هاتە پێش. پێشتر تائەوەی لە تفەنگەکەمن تێپەڕی و هیوای دەست گەشتن بە تفەنگەکە لێ سەندم.... لەترسا دەلەرزیم کەلەناکاو یوری رمەکەی خستە بەردەم پێی وتم:

هێواش هەڵیگرە، سەیر چاوەکانی بکە. ئەگەر سەیری زەوی بکەیت پەلامارت دەدات. من بێ ئەوەی چاوم لە پڵنگ هەڵگرم رمەکەم هەڵگرت بەڵام هێشتا کەمەرم راست نەکردبوویەوە پڵنگ نەراندی و لەسەر دوردەست چەمایەوەو پەلاماری دام.

ساتێکی مەترسیدار بوو. رمەکەم لەدەستدابوو بەڵام دەمتوانی چی بکەم. لەچاو تروکانێکدا پڵنگ لەسەر هەوا بەرز بوویەوە و بەرەو لای من هات. تەنیا کارێك دەمتوانی ئەوەبوو رمەکە بۆ بەرگری کردن لەخۆم بگرم و ئەم کارەشم کرد بەڵام ئایا رمەکە دەیتوانی لەمەرگێکی دڵتەزێن و دڵنیا رزگارم بکات...؟ ئەمە پرسیارێك بوو لەو دەرفەتە کەمەدا و لەوساتە خێرایە لەخۆمم کرد و نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە چوونکە پڵنگ لەسەر زەوی و ئاسمان بەرەو لای من دەهات و پەنجەکانی کردبوویەوە. نینۆکەکانی وەك خەنجەرێکی پۆڵا لەناو گۆشت و تووکی دەستەکانی هاتبووە دەر و لەبەرانبەر چاوە ترساوەکانی مندا بوو. ئەوەندە بەس بوو یەك لەم نینۆکانە بگاتە من و لەپێم بخات. بەهەرحاڵ جگە لەوەی کردم کارێکی ترم پێ نەکرا. بەدەستی راست رمە کورتەکەم لەبەرانبەر خۆمدا گرت و دەستی چەپم وەك نوێڵ لەسەر زەوی دانا تا بەیەکەم پەلامار نەکوژرێم.

لەناکاو وەك بڵێی دنیایان بەسەرمدا روخاندبێت بەرچاوم تاریك بوو و شتێکی قورس و مەترسیدار کەوتە سەرم. پڵنگ پەرییە سەر من. یەکەم زەربەیەك بەر من کەوت نینۆکی دەستی چەپی بوو کەلەسەر ناوچاوم دانیشت و هەڵیدڕاند

رەنگە ئەو گوومانەتان بۆ دروست ببێت کە چۆن لەوکاتەدا هەستم بەوەکرد کە پڵنگ ناوچاوی منی هەڵدڕی... هەڵبەتە من وام بیرنەکردو توانای بیرکردنەوەشم نەبوو... هەموو ئەمانەم دواتر زانی.

تەنیا شتێك هەستم کرد ئەوەبوو بەرگەی خۆڕاگری ئەو شتە قورسەم نەبوو و کەوتم. ناوچاوم سووتاو خوێن کەوتە بەرچاوم. تەنیا ئەمە و ئیتر نەمزانی چی بوو.

چی تێپەڕی و چ ڕوداوێك ڕویدا. کاتێك چاوم کردەوە سەرم لەسەر ئەژنۆی لئۆنا بوو و ئەو ژنە میهرەبان و جوانە بەڕومدا پێدەکەنی. باوەڕم نەدەکرد زیندووم. بەگشتی جێگەی باوەڕکردن نەبوو کە مرۆڤ لە زەربەی ئەم ئاژەڵە دڕندە و مەترسیدارە گیان بەدەربەرێت.

یەکەم گوومانم ئەوەبوو مردوم و ئێرە دنیای ڕۆحەکانە کەسەری خۆم لەسەر کۆشی لئۆنا دەبینم. چەند جار پێڵوەکانی چاوم تروکاند، یەك دو جار سیەکانم پر کردو خاڵی کردەوە، تێگەشتم کە بەڕاستی زیندووم چوونکە جگە لەهەمووی ئەمانە دەنگی لئۆنام دەبیست دەیوت: ئێستا باشیت.؟ هەست بەئازار ناکەیت....؟

دەست و پێی خۆم جووڵاند و وتم: نا..... دەڵێی زیندووماوم.

لئۆنا بێ ئیرادە پێکەنی و وتی: مەگەر بڕیاربوو بمریت.

سەرم بەرزکردەوە تا پرسیاری پڵنگەکە بکەم بەڵام لەم کاتەدا سووتانەوەم لەناوچاوانمدا هەست پێکردو دوبارە سەرم خستە سەر ئەژنۆی لئۆنا.

لئۆنا ناوچاوی منی بەپارچەیەك لە کراسەکەی بەستبوو، ژێر باڵی گرتم و بەرزی کردمەوە.

لەگەڵ ئەوەی دانیشتم لاشەی پڵنگەکەم لەبەرچاوی خۆمدا بینی. ڕمەکە بەشێوەیەك لەسینەیدا ڕۆچبوو کەنووکە خوێناورییەکەی لای بڕبڕەی پشتیەوە دەرچوبوو و دەبینرا. بینینی پڵنگەکە هەموو شتێکی پێوتم و پێویستم نەبوو پرسیار بکەم بەڵام لئۆنا وتی:

بەخۆشحاڵیەوە پڵنگ پێش ئەوەی تۆ ببینێت کوژرا، دەبینی ڕمەکە چۆتە ناودڵی.

پرسیم: فشاری دەستم ئەوەندە بەهێز بوو ڕمەکەی تا ئەوشوێنە لەدڵی پڵنگ داچەقاند.

لئۆنا قا قا پێکەنی و وتی: بەهەڵەدا چویت... کاتێك پڵنگ پەڕیە سەرتۆ، تۆ کەوتیت بەڵام یوری لە پشتەوە خۆی حەشاردابوو و ئامادەبوو، هێرشی برد، ڕمەکەی هەڵگرت و بەهەموو هێزی لەدڵی پڵنگەکەی چەقاند.

بەڵێ ئەم جارەش یوری تۆی لەمردن ڕزگار کرد.

سەرەتا شادمان بووم کەپڵنگێکم کوشتوە بەڵام دەرکەوت ئەم هونەرەش لەیوری بووە نەلەمن. بەهەرحاڵ لەمردن ڕزگارم بوو و کاتێك ناوی یوری هاتە پێش، سەیری ئەم لاولام کرد و وتم: یوری لەکوێیە؟

لئۆنا وەڵامی دایەوە: لەگەڵ هاوسەرەکەی بۆ میوە و ئاو ڕۆشتوون

بەسەیرکردن و ژێرەوژو کردنی پڵنگەکە سەرقاڵ بووم کە یوری و هاوسەرەکەی گەڕانەوە. کاتێك چاوی بە من کەوت پێکەنی و لەکاتێکدا میوەکانی دەڕژاندە سەر زەوی وتی: سەرۆك ئێوە زۆر زوو بێ هۆش دەبن... کەمێك لەم میوانە بخۆن دڵتان بەهێزبێت. بێ هۆشی ئێوە نزیك بوو ئێمەش بەکوشتن بدات.

هەڵبەت یوری گاڵتەی دەکرد و هەمووومان بەم قسە پێکەنین و بەخواردنی میوە کە تەنیا خواردنی ئێمە بوو سەرقاڵ بووین. کاتێك ئێمە سەرقاڵی خواردنی بووین و لئۆنا پاشماوەکەی وەك توێشوی رێگا هەڵدەگرت یوری خەنجەری کێشاو بەلێهاتوویی پێستی پڵنگەکەی دامالی.

دوای ئەنجامی ئەم کارانە درێژەمان بەرێگەدا. بەهەمان شێوە یوری وتبووی لەنزیکی ئەوێ سەرچاوەیەکی ئاوی مەعدەنی بوو کە لە داوێنی تەپۆلکەیەکی سەر سەوز دەردەکەوت. بەڵام دەوروبەری سەرچاوەکە تا مەودایەکی زۆر دوور دارو گیاکان بەهۆی هەڵمی ئاوی گۆگرد وشك ببوون. یوری کەدەتوت چەندین ساڵ کاری پێستە خۆش کردنی کردوە بەکارامەیەکی تایبەت پێستی پڵنگەکەی بەئاوی گۆگرد شۆرد بێ ئەوەی دەستی پیس بێت ویان ئاو پێستی پڵنگەکە بریندار یان کون بکات.

ئەگەر ئاو بەپێستی پڵنگ بگەشتایە دەیرزاند و بۆیە یوری ئەم کارەی بەکارامەیی ئەنجامدا. دواتر بەرێکەوتین. ئەو رۆژە بێ رووداوی رووداوێکی شیاوی ئاماژە پێدان تێپەڕی. کاتێك هەوا تاریك بوو، یوری بەرمەکەی لەدەوروبەردا گەڕا و لەوەڵامی پرسیارێکی مندا وتی:

بەشەو دەبێت خواردنێك لەگۆشت بخۆین. مەبەستی ئەوەبوو ئاژەڵێك کە بۆ خواردن ببێت راوبکات بەڵام لەشانسی خراپی ئێمە هیچمان نەدی و یوری بەمەبەستەکەی نەگەشت. بەناچاری ئەو شەوەشمان بەمیوە بەسەر برد.

هەوا تاریك ببوو کە لەدارێکی گەورە رۆشتینە سەرو لەسەر ئەو دارە هەرکام شوێنێکمان بۆ خەوتن ئامادەکرد. شێوەی خەوتنی ئێمە لەسەردار بەم شێوە بوو کە لەسەر لقێك دادەنیشتین و سەرمان بە لقێکی گەورە ترەوە دەنا و دەخەوتین. سەرەتا ئەم کارە زۆر دژوار بوو بەڵام دواتر بەشێوەیەك بۆمان ببووە عادەت کە بێ جووڵە تا بەیانی دەخەوتین وەك ئەوەی لەسەر دۆشەکی پەڕی قازدا خەوتبێتین. بەیانی زوو یوری لەخەو هەستابوو. بەگشتی ئەو بەیانیان زووتر لەئێمە هەڵدەستاو وئەوبەیانیەش من و لئۆنای لە خەو هەستاند.

یوری وتی:

تا هەتاو هەڵنەهاتووە و گەرم نەبووە بەرێکەوین تا کاتی نیوەڕۆ بکەوینە رووبار

بەسەرسوڕمانەوە لێم پرسی: مەگەر روبار نزیکە؟

یوری وتی: بە پێی بەراوردەکانی من لە رووبار دوور کەوتوینەتەوە و وتی:

شەوی پێش دو سێ جار لەخەو راچڵەکیم و هەر دو سێ جارەکەش دەنگی ئاوم بیست. دەڵێی لەبەرزاییەکانی باکور یان شوێنێك کە تاڤگەکانی لێیە، نزیك دەبینەوە .

لئۆنا سەیرێکی دەوروبەری کردو وتی: کەواتە دەبێت لە هۆزەکەی ئێمە تێپەڕبوو بێتین...... بەهەڵەدا چوویت. دەنگێك دوێ شەو بیستووتە دەنگی تاڤگەکان نەبووە، تاڤگەکان بەسێ رۆژ دووری لە تاڤگەکەی ئێمە و جێگیرن.

یوری سوور بوو لەسەر باوەڕەکەی. سەرئەنجام بڕیاردرا هەرچی زوتر درێژە بەپێشڕەوی خۆمان بدەین و بۆ ئەم مەبەستە لەدارەکە هاتینە خوارو بەڕێکەوتین.

هەوای بەیانی جەنگەڵ سازگار و رۆح بەخش بوو، نەسیمێکی فێنك هەڵیکردبوو و چوونکە هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو، گەرمی هەوامان هەست پێنەدەکرد. یوری ئەوەشی بەبەڵگەوە بۆ قسەکەی خۆی هێنایەوە وتی:

ئەم نەسیمە لەسەر ئاو بەرز دەبێتەوە......

نزیکەی سێ کاتژمێر رێگامان بڕی. وردە وردە شوێنەواری ماندوویی تیامانا دەرکەوت و لئۆنا کە قاچەکانی بەهۆی بەرکەوتن بەبەرد و چقڵ و دڕك بریندار ببوو، خۆی خستە سەر شانی من و دەیناڵاند. یوری سوور بوو و دەیوت:

تا هەتاو نەگەشتۆتە ناوەڕاستی ئاسمان بەڕێگادا بڕۆین و گەرمای دوای نیوەڕۆ بحەسێنەوە.

بەڵام لئۆنا توانای لێ برابوو دانیشت و وتی:

ئێوە بڕۆن. من ناتوانم بەڕێگادا بێم. قاچم خوێناوی و برینداره، پێشنیارم لێکرد پێڵاوە دراوەکانی من لەپێ بکات بەڵام رازی نەبوو و وتی:

قاچی تۆ ناسکتر لەقاچی منە. چوونکە ئێمە عادەتمان گرتووەو ئێوەی سپی پێست (( ناسکن )).

یوری کە ئەم حاڵەی بینی بە رووتاڵی و رەزامەندی نیشاندا چەند کاتژمێرێك لەوێدا بمێنینەوە. شوێنێك کە بۆمانەوەی چەند کاتژمێری هەڵبژێردرابوو، نزیك قامیشەڵان بوو و یوری کاتێك چاوی بە قامیشەلان کەوت رووی گرژ کرو وتی:

بەرانبەر ماڵی ڕێوی ماڵمان کردوە، لەمەبەستەکەی نەگەشتم وداوای ڕوونکردنەوەم لێکردو وتی:

قامیشەلان شوێنێکی مەترسیدارە زۆربەی ئاژەڵەکان لەقامیشەلاندا خۆیان دادەشارن. بۆیە بە باوەڕی من ئێرە شوێنێکی ئارام و ئەمن نیە.

لەبەرئەوەی لئۆنا توانای ڕێگە ڕۆشتنی نەبوو کار لەم قسانە تێپەڕیبوو. هەرکام لەسووچێك لە ژێر سێبەری دارێك پاڵکەوتین و خەوتین. لەهیلاکی زۆر لە دنیایەکی تایبەتدا دەسووڕامەوە کەدەنگی لئۆنا بەرز بوویەوە کە دەیوت:

بابخەوم وازم لێ بێنە.

سەرم سوڕما کە لەگەڵ کێدا قسە دەکات. لە شوێنەکەم هەستام و بەو پەڕی سەرسوڕمانەوە بینیم کە چەند ئاژەڵێك لەبەردەم قاچیدا کۆبوونەوە و یەك لەوان بەری قاچی دەلێسێتەوە و لئۆنا وایدەزانی من گاڵتەی لەگەڵ دەکەم. دەیوت وازم لێ بێنە بابخەوم. ئەو ئاژەڵانە هاوشێوەی مرۆڤ بوون بەڵام لە مەیموون دەچوون.

لە بینینی ئەم دیمەنە قاقام لێداو بە پێکەنینی من لئۆنا و یوری و هاوسەرەکەشی سەریان بەرز کردەوە.

لئۆنا کاتێك مەیموونەکانی بینی بەشادمانی چەمایەوە کە یەکێکیان بگرێت و بەڵام لەناکاو یوری قیژاندی و وتی:

دەستی لێ مەدە.... هەستە..... هەمووتان هەستن..... ئەمانە بێچوە گووریلن.

بەبیستنی ناوی گووریل مووی جەستەم ڕاست بوو و لئۆنا قیژاندی و دەستی خۆی کێشایە دواوە.

ئەو کەجارێك گیرۆدەی گووریل ببوو زیاتر لە ئێمە دەترسا. یوری بەخێرایی ڕاست بوویەوەو لەکاتێکدا کەمەری دەبەست، وەك سەرکۆنە کردن وتی:

نەموت ئێرە شوێنێکی مەترسیدارە. ئێرە ناوچەی گووریلەکانە. دەبێت ڕابکەین و گەرنە گرفتاریان دەبین. گووریلەکان وەك مرۆڤ پێکەوە دەژین و هیچ کات ژمارەیان لە سەد دانە کەمتر نیە خێراکەن.

هێشتا قسەکەی یوری تەواو نەببوو و ئێمە لە شوێنەکەماندا هەستابووین کە لقەکانی بەرانبەرمان جووڵان و سەرو کەلەی چەند گووریلێك پەیابوو.

یوری لەگەڵ ئەوەی چاوی بەگووریلەکان کەوت بە دەست ئیشارەیەکی کرد و وتی:

ئێوە ڕابکەن من سەرقاڵیان دەکەم... خێراکەن

من و لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری بەخێرایی رامان کرد. گووریلەکان کە ژمارەیان چوار تا پێنج دانەبوو، بەخێرایی بەدواماندا هاتن. ئێمە چوونکە بچوکتر بووین باشتر لەناو دارەکانەوە تێدەپەڕین و ئەوان بەهۆی گەورەیی نەیاندەتوانی وەك ئێمە رابکەن بەڵام لەجیاتی ئەوە بەهێزێکی سەیر لقەکانیان دەشکاندەوە دارە بچوکەکانی سەر رێگایان ورد دەکرد.

شتێك کە ئەوان بەدوایدا رایان دەکرد بوونی دو ژن لەناو ئێمەدا بوو. گووریلە مێچکەکان بەدوای من و یوری و گووریلە نێرەکان بەدوای لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری رایان دەکرد. هەرکام مەبەستێکیان بوو. یوریش بەدوای ئێمەدا رایدەکرد و و گووریلەکان بەدوای ئێمە چوار کەسەوە بوون....

هەر ئەوساتە دووریمان کەمتر دەبوو تا ئەوەی گەشتینە بەرزاییەکی کەم. لەوێوە رێگا دەبوو بەسەرەو خواری. هاوسەری یوری و لئۆنا کە لەپێشتر بوون رۆشتن. منیش لەبەرزاییی یەك مەترەوە پەڕیم بەڵام دەنگی قیژەی یوری بەرز بوویەوە.

میلم هێنایەوە و بەخێرایی گەڕامەوە دواوە بینیم یەکێك لەگووریلەکان یوری لەسەر دەست بەرز کردەوە و و فڕێیدا.

یوری وەك گولەی تۆپ چەندین جار لەهەوادا سوڕاو چەند مەتر لەولاتر درا بەئەرزدا.

ئەگەر نەبوو یوری زیندومابێت. باوەڕ پێنەکراوبوو. هەرکەسیتر لەجیاتی من بووایە و ئەم دیمەنەی ببینیایە چاوی لەم دیمەنە دەپۆشی و بەمردوی لەقەڵەم دەدا بەڵام هێشتا نەمدەتوانی باوەڕبکەم کە ئەو مردوە. یوری وەك تۆپ وەك کۆڵە پشتێکی قورس دەهەنگاو ئەولاتر کەوت.

جووڵەیەکی کەمی کرد و ئیتر لەشوێنەکەی هەڵنەستا. خوێن لە ملی دەچۆڕا. جوان نەمدەتوانی لێکی بدەمەوە و بزانم کوێی قڵشاوە و خوێن لەکوێوە دێت. ئەوەندەم بینی خوێن سات بەسات زیاتر دەبێت. بە بینینی ئەم دیمەنە کۆنترۆڵی خۆم لەدەست داو بەڕادەیەك ترسام وەسف ناکرێت.

لەبیرم چوویەوە لەکوێدام و گووریل وەحشیەکان لەچەند هەنگاویدا سەیرم دەکەن. هەموو شتێك، هەمووکەس تەنانەت لئۆنا و خۆشم لەبیر کردبوو و سەیری یوریم دەکرد. سەرم گێژی دەخوارد، چاوم رەش بوو ئەژنۆکانم دەلەرزی. ئارەقێکی سارد ناوچاوی گرتمەوە و هەستم کرد ئاگریان رژاندۆتە ناوکاسەی سەرم و مێشکم دەسوتێنن. نەمزانی چەند سات و چەند خولەك بەم شێوەیە تێپەڕی.....؟ کتوپڕ بەدەنگی لئۆنا

هاتمە خۆم.

لئۆنا و هاوسەری یوری لەسی چل هەنگاویدا لەپشت دارەکان وەستابوون و سەیری ئەم دیمەنە سەیرەیان دەکرد. دەنگی لئۆنا منی هێنایە خۆم و تارووی خۆم وەرگەڕاند بینیم یەکێك لە گوورێلەکان خەریکە پەلامارم دەدات و دەستی راستی بۆ گرتنی گەردنی من درێژکرد.

لئۆنا کە لەدوورەوە بینەری ئەم دیمەنە بوو قیژاندی. ئەگەر ئەوە نەیقیژاندایە رەنگە منیش چارەنوسی یوریم پێ دەبرا. بەڵام بەخۆشحاڵیەوە هاتمە خۆم و خۆم کێشایە دواوە. ئەم کارە زۆر بەخێرایی ئەنجامدرا بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێم کە دووریم لەگەڵ مەرگ و ژیان چەند چرکە بوو بەشێوەیەك ئەگەر چەند چرکەیەك درەنگتر خۆم بکێشایەتە دواوە، چنگە پۆڵاینەکەی گوورێل منیشی گرتبوو. بەهەرحاڵ رۆشتنە دواوەی من بووە هۆی ئەوەی دو سێ هەنگاو ئەولاتر بکەوم و قاچەکانم روبکەنە ئاسمان... گوورێلا بەخێرایی دەهاتە پێش و دوبارە پەمالاری دام، ئەم جارەشیان تلام و لێی دوور کەوتمەوە.

دو سێ مەتر ئەولاتر هەستام و تفەنگەکەم بەرەو سینەی گوورێل نیشانە گرت. بەگشتی گوورێلەکان زۆر زیرەکن بەڵام چوونکە تا ئەو رۆژە تفەنگیان نەبینیبوو و لەچۆنیەتی کارکردنی ئاگادار نەبوون، نەترسا و بەنەرمی هاتە پێش.

ئەم دەرفەتە بۆ تەقەکردن بەس بوو. پەنجەم لەسەر پەلەپیتکەکە فشاردا و گوولە تەقا. لەناکاو گوورێل کەوت. کێوێك گەشتبووە دو هەنگاوی من لە شوێنەکەی هەڵکەندراو دوبارە کەوتەوە سەر زەوی.

ئەگەر بەرز کەرەوەیەك گوورێلی لەزەوی بەرزکردایەتەوە ولەولاتر فرێیدایە، بەم شێوە دەنگی نەدەهات. گوورێل وەك کێوێك بە ئەندازەی یەك مەتر بەرزبوویەوە، سوورا و بەمێشکەوە درا بەزەویدا. قیژەیەکی مەترسیداری کردو ئیتر تەکانی نەخوارد. بەروانینێك زانیم گولە چی بەسەر رۆژگاریدا هێناوە. دەرفەتی زیاترم نەبوو سەیری بکەم بەڵام لەم دەرفەتە کەمەدا بینیم گولە مێشکی کون کردوە و لە پشتە سەری دەرچووە.

تەنیا ئەو گوورێلە هەرەشە بوو بۆ سەرمن، چوارەکەی تر دوورتر بوون و ئەگەر بیانەویستایە پەلامارم بدەن دەرفەتم هەبوو بۆیە هەناسەیەکم بەئاسوودەیی هەڵکێشاو میلم هێنایەوە و ئامادە بۆ بەرگری کردن وەستام.

چوار گوورێلەکەی تر لەجیاتی ئەوەی هێرش بکەنە سەر من خۆیان گەیاندە سەر گوورێلە کوژراوەکە و سەیریان دەکرد. هەندێ کات سەیری من و هەندێ کات سەیری گوورێلە کوژراوەکەیان دەکرد و لە دوورەوە دیانە پیسەکانی خۆیان نیشان دەدام و دەیان نەڕاند.

چوار گورێلەکە چاودێری منیان دەکرد و لەگەڵ ئەوەی تفەنگەکەیان ئامادەی تەقەکردن بینی، نەڕاندیان و وا رایان کرد...... راکردنی ئەوان سەیرو سەرنج راکێش بوو.

وەك ئەو کەسانەی لەبەرانبەر مەترسیەکی گەورە رایان دەکرد.

دوو گولەم تەقاند هیچیان بەر ئەوان نەکەوت و لەناو لق و گەڵای دارەکان لەبەر چاو ون بوون و رۆشتن. چەند هەنگاوێك بەدوای ئەواندا رۆشتم و گەڕامەوە... ئەم رووداوە زۆر بەخێرایی رویدا و دوای چەند خولەك دڵنیابووم لەمەترسی رزگارمان بووە و گوریلەکان رایان کردوە و مەودایەکی زۆر دوورکەوتونەتەوە. کاتێك بۆ لای یوری گەڕامەوە لئۆنا لەسەر سەری بوو. هاوسەرەکەی سەری خستبووە سەر ئەژنۆی و لئۆنا شانی دەشێلا. بەراکردن خۆم گەیاندە ئەوێ و پێش ئەوەی سەیری بکەم لە لئۆنام پرسی: مردووە.....؟

چاوی هاوسەرەکەی یوری نوقمی فرمێسك بوو و من بەبینینی چاوە فرمێسکاویەکانی ئەو ئەم پرسیارەم کرد.

لئۆنا کە دەیزانی من زۆر نیگەران و ناڕەحەتم بەخێرایی وەڵامی دایەوە ئەو زیندووە، بەخۆشحاڵیەوە زۆر بریندار نەبووە.

قسەکانی تریم نەبیست یان هەرگوێم نەگرت.

پێش هەرشتێك سەرم خستە سەر شانی یوری و گوێم لە لێدانی دڵی گرت. دڵی لێیدەداو وا دەهاتە بەرچاوم کە لێدانەکەی ئاسایی بێت. سەری شکابوو خوێنێکی زۆر لەناوچاواییەوە روخساری داپۆشیبوو.

دوای دڵنیابوون لەوەی کە لێدانی دڵی ئاساییە، بە پاك کردنەوەی برین و بەستنی سەری سەرقاڵ بووم و ئەم کارەم بەخێرایی ئەنجام دا بەشێوەیەك نیو کاتژمێر دواتر یوری بێجگە بێ هۆشی کێشەی تری نەبوو.

خوێنەران بەدرێژایی ئەم داستانە لەگەڵ یوریدا ئاشنابوون باش دەیناسن. ئەو پیاوێکی بەهێز و لەش ساغ بوو و هەر ئەم لەش ساغیە ببووە هۆی ئەوەی بەردەوام

لەمەترسیەکان بەسلامەتی رزگاری بێت.

ئەو رۆژە ئەگەر گووریلا منی گرتبوو و بەوشێوەی باسیکرا دەیکێشام بەزەویدا بەدڵنیاییەوە دەست بەجێ گیانم دەدا. هەرکەسێکیتر لەجیاتی یوریی بووایە دەمرد بەڵام یوری گیانی بەسلامەتی دەربازکرد و یەك کاتژمێر دواتر کاتێك بەنیگەرانی سەیری روخساریمان دەکرد بەهۆش هاتەوەو لەگەڵ کردنەوەی چاوەکانی دەست و پێی خۆی جووڵاند، بزەیەکی گرت وتی:

کورینە.... زیندووم. راستی نەمردوم.....؟

لەشادمانیدا نزیك بوو بقیژێنم. باوەڕم نەدەکرد یوری بەهۆش هاتبێت و زیندوو بێت و کەبزەم لەسەر لێوی بینی چەمامەوەو بەشادمانیەوە پرسیم:

یوری حاڵت چۆنە هەست بەئازار ناکەیت؟

ئەو بۆ دڵنیایی زیاتر جارێکیتر دەست و سەرو ملی تەکان دا و وتی:

نا تەنیا سەرم ئازاری هەیە. ناوچاوم دەسوتێتەوە. بێجگە ژانە سەر ئازاری ترم نیە.

ئەوسات بەیارمەتی هاوسەرەکەی کە زۆر باڵی گرتبوو هەستاو پاڵی بەدارێکەوە داو دانیشت. لەم کاتەدا چاوە کەوت بەو خوێنە زۆرەی رژابووە سەر زەوی و وتی:

ئەمە خوێنی منە؟ من ئەم هەموو خوێنەم هەبوو نەمدەزانی؟

لەوکاتەشدا لەگاڵتە کردن وازی نەدەهێنا و زیاتر بۆ ئەوەی نیگەرانی ئێمە لابەرێت پێدەکەنی و قسەی دەکرد. چەند سات دواتر پرسی:

باشە: پیاوان و خاتوونەکان چیان لێهات؟

ئەو باسی گووریلەکانی دەکردو پیاوان و خاتوونەکان مەبەستی گووریلە مێچکەو نێرەکان بوو. رووداوەکەم بۆ باس کردو دواتر گووریلە کوژراوەکەم نیشان دا و وتم:

ئەم ئاژەڵە بوو تۆی فرێدا و منیش لەجیاتی تۆ ئەوم یەك مەتر بەرزکردەوەو فرێمدا. دەبینی چەند جوان مردوە.

یوری بیری کردەوەو پرسی: بێهۆشی من چەندەی خایاند...

نزیکەی کاتژمێرو نیوێك

بێدەنگ بوو سەیری دەوروبەری کردو وتی:

دەبێت بەخێرایی لێرە دوور کەوینەوە. ئەم ئاژەڵە خوێنخۆرانە بەم ئاسانیە لەبیرمان ناکەن دڵنیام ئێستا لەدەوروبەرماندان و بەدوای دەرفەتێکی گونجاو دەگەرێن. خێراتر بەرێکەوین. یوری ئەمەی وت و پشتی بەشانی هاوسەرەکەی بەست و هەستا. ئێمەش

هەستاین و بەڕێکەوتین. چەند هەنگاوێك کە دوور کەوتینەوە یوری وەستا. بەدەست ناوچاوی گرت و وتی:

دەڵێی سەرم زۆر ئێش دەکات..... بەڵام شتێکی گرنگ نیە..... بابڕۆین.

ئەژنۆکانی دەلەرزی و بەیارمەتی ئەو رمەی لەدەستیابوو بەرێگادا دەڕۆشت. رۆشتمە پێش و شانم خستە بەردەستی تاپاڵی پێوەبدات بەڵام رازی نەبوو و وتی:

مەگەر من ژنم دەتەوێت یارمەتیم بدەیت.. تا گیانم هەیە دەڕۆم.

لەوە بەدوا زەحتی زیاتر لەخۆی دەکردو بەرێگادا دەڕۆشت و جۆرێك نیشانی دەدا وەك بڵێی هیچ ئازارو نیگەرانیەکی نیە. بەم شێوەیە ڕۆشتنی ئێمە درێژەی بوو ئەو رۆژە تا ئاوابوونی خۆر رۆشتین بەڵام بە پێچەوانەی رۆژی پێش چوار پێنج جار هەرجارەی نیو کاتژمێر حەواینەوە.

کاتێك هەتاو بەرەو رۆژ ئاوایی ئاسمان دەڕۆشت گەشتینە شوێنێك کە هەوا نمدارو وشك بوو. گەردیلەکانی ئاو بەجوانی لەهەوادا هەستی پێدەکرا و دەنگی رژانی تاڤگە بەر گوێ دەگەشت. یوری ئەوە شوێنەی بۆ مانەوەو حەسانەوە پەسەند کردو بڕیار درا من و لئۆنا بۆ ئامادەکردنی خواردن و میوە بڕۆینە جەنگەڵ. یوری و هاوسەرەکەی لەوێدا مانەوە و ئێمە بەڕێکەوتین. لئۆنا لەسەر بنەمای ئاشنا بوونی بەجەنگەڵ، چەند ساتێك گوێی لە دەنگەکانی دەورووبەر گرت و وتی:

دەڵێی جەنگەڵی دەورووبەری هۆزی....

قسەکەیم بڕی و وتم: جەنگەڵی دەورووبەری هۆزی ئێوە بەجوانی دەناسم. یەك هەفتەی تەواو لەگەڵ مووناکدا تیای سوڕاینەوە جارێکیش دوورخرامەوە و زیندانی بووم. ئێرە لەگەڵ هاوشێوەی سنووری هۆزی نیە.

ئەم رستانەم بۆ ئاسوودەیی بیرو خەیاڵی لئۆنا وت لەراستیدا خۆشم نیگەران ببووم و بەوردی لە چواردەورم دەڕوانی. وا دەهاتە بەرچاوم کە لئۆنا راستی دەوت. بەهەر حاڵ چارەیەك نەبوو دەبووا ئاگادار بوومایە. بڕێك میوەمان کۆکردەوە و بەخێرایی گەڕاینەوە.

شەو رووداوەکەم لەگەڵ یوریدا باس کرد وتم: دەبێت رێگامان بەرەو رۆژئاوا خوار بکەینەوە و گەرنە هەرچوارمان گیرۆدەی ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن دەبین و مووناك تۆڵەیەکی وەحشیانەمان لێ دەستێنێت. یوری وتی:

بەیانی پێش هەڵاتنی خۆر بەرەو رۆژ هەڵات دەڕۆین تا لە هۆز دووركەوینەوە.

ئەو شەوە بەئارامی تێپەڕی. بەیانی زوو لئۆنا لەخەو هەڵیساندم و بەڕێکەوتین. دەمویست پێش هەڵاتنی خۆر لەوێ دوورکەوینەوە بۆیە بەخێرایی دەڕۆشتینە پێش. لەبەر خێرایی دو سێ کاتژمێر دواتر هیلاك بووین و یوری لەسەر داوای لئۆنا کەقاچی بریندار ببوو، وەستا. بڕیارماندا تا دوای نیوەڕۆ بحەسێینەوە و دواتر درێژە بە ڕێگامان بدەین.

یوری وتی: وەرە با بۆڕاو بڕۆینە دەوروبەر. چەند ڕۆژێکە گۆشتمان نەخواردوە.

لئۆنا و هاوسەرەکەی یوری لەوێ مانەوەو من و یوری بەڕێکەوتین. هێواش هێواش دەڕۆشتینە پێش و هەستمان بەوە نەکرد کە زۆر لەوێ دوور کەوتوینەتەوە و نزیکەی کاتژمێرێك دواتر یوری لەناکاو وەستا و لەکاتێکدا ڕەنگی پەڕابوو و چاوەکانی دەبریسکانەوە بەدەنگێکی لەرزان وتی: دەزانی ئێمە لە کوێداین....؟

بەسەرسوڕمانەوە وەڵامم دایەوە: نا نازانم.

بە بینینی قیافەی پڕ ترسی یوری گوومانم کرد هەستی بەمەترسیەکی گەورە کردوە. ئەو کەم دەترسا و هەرکات چاوەکانی دەبریسکانەوە دیاربوو کەبەڕاستی ترساوە، یوری دارێکی بە پەنجە نیشان دا و وتی:

سەیرکە. ئایا دەیناسیتەوە.... سەیری دارەکەم کرد و لەناکاو وەك ئەو کەسانەی دەستیان لەکارەبا درابێت. لەرزیم. دەزانن بەدارەکەوە چیم بینی، تیرێك... تیرێك لەناوەڕاستی دارەکەدابوو ولەنووکە ڕەنگینەکەی دیاربوو پەیوەندی بەژنانی ئامازۆنەوە هەیە بەدەنگێکی لەرزان پرسیم: دەبێت چی بکەین....؟

وتی: لەبەیانیەوە تا ئێستا لە جیاتی ئەوەی لەهۆز دوورکەوینەوە بەخێرایی لێیان نزیك بووینەوە و ئێستا لێیان زۆر دوورنین. هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کەدەنگی خشەخشی گیاکانی دەوروبەرمان بەرزبوویەوە. لەترسا دەستی یەکمان گرت و بەخێرایی بەرەو دواوە گەڕاینەوە چوونکە کۆمەڵێك لەئازاترین ژنانی هۆزەکە گەماڕۆیان دابووین کە لەسەروی هەموویان مووناك دەبینرا.

مووناك لەگەڵ ئەوەی چاوە بەمن کەوت ساتێك درەنگی کرد. دەتوت دەیەوێت میهرەبانیم لەگەڵدا بکات بەڵام خێرا حاڵەتی گۆڕی و وتی: بیانگرن.

ژنان کەهەموویان بەتیروکەوان ورم چەکداربوون هێرشیان کردە سەرمان و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. مووناك خۆی بۆلای من هات و بەدوایدا تاقمێك لەژنان هێرشیان کردە سەرم. نەتوانای ئەوەم بوو لێیان بدەم نەتوانای ئەوەم بوو بەتفەنگ یەك دوان لەو

ژنە جوانانە بکوژم. چەند ساتێك لە شوێنەکەی خۆم وەستام و کە مووناك گەشتە دو هەنگاویم وتم: مووناك مەیەرە پێش، تەقەدەکەم. دەتکوژم...

ڕەنگی وەك مەخمەڵ سور ببوو شوێنەواری تووڕەیی لەروخساریدا دیاربوو. شتێك کە سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوەبوو لەسکیدا شوێنەواری سك پڕ بوونم نەدەبینی. لەخۆم پرسی بڵێی منالەکەی لەبار چو بێ یان بوویەتی؟ چی بووە؟

نەمتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە چوونکە بەجوانی نازانم چەند مانگ بوو ڕۆشتبووم. حسێبی تێپەڕبوونی زەمەنم نەبوو و هەندێ کات چەندین مانگ بەدوای یەك بەخێرایی تێدەپەڕی و نەمدەزانی.

مووناك بێ گوێدان بەقسەکانی من و بۆئەوەی زیانی پێ نەگەیەنم و بەگوومانی ئەوەی گاڵتە دەکات خۆم کێشایە دواوە، بەڵام قاچم لەبەردێك گیراو بەپشتا کەوتم.

ئەویش کەوتە سەر سینەم وتا هاتم خۆم کۆبکەمەوە تیغی درەوشاوەو بروسکەداری خەنجەرم لەدەستیا بینی و زانیم بەڕاستی دەیەوێت بمکوژێت. تفەنگەکەم فرداو بەهەردو دەست کێشام بەسنگی دا. شتێکی سەیر بوو، ئەگەر ئێوە لەجیاتی من بوونایە ئەم دیمەنەتان بدیایە نەتاندەتوانی لەسەرسوڕمانی خۆتان ڕێگری بکەن. مرۆڤ لەهەرکەس و بوونەوەرێك چاوەڕوانیەکی هەیە. کاتێك ئێمە لەناو هۆزە وەحشیەکاندا بووین دەمانزانی بوونەوەرێکی خوێنخۆرو بەهێزو چوار شانەن بەڵام کاتێك لەگەڵ ژنانی ئامازۆندا ڕووبەڕووبووینەوە وەك ئەوە ڕۆژە هێرشمان کرایە سەر بابەتەکە زیاتر گاڵتە ئامێز دەهاتە بەرچاو چوونکە ژنێکی ناسك و جوان تا چەند دەتوانێت بێ بەزەیی و دڵ ڕەق بێت. جیاواز لەوەش سەرسوڕمانی من هۆیەکیتر بوو کێشام بەسەر سینەی مووناکدا. ئەگەر ئەم دو مشتەم لەبەرد دابوو لەشوێنەکەی خۆی دەجووڵا بەڵام مووناك وەك کێوێك ڕاوەستابوو و تەکانی نەدەخوارد.

مشتەکانی من زیاتر تووڕەی کرد و ئەم جارە خەنجەرەکەی بردەسەر و هێنایە خوار. دەستیم گرت و تلاین بەرادەیەك سەرقاڵی کردبووم و هیلاك ببووم نەمدەتوانی سەرنج بەهیچ شتێکی تر بدەم نەمدەزانی چی بووە و چی بەسەر یوریدا هاتوە.

تەنیا ئەوەم دەزانی شەڕو پێکدادان درێژەی هەیە و چوونکە ئەویش بەهێزە کۆمەڵێکی زۆر لە گەڵیا لەشەڕدا بوون. من و مووناك چەندین جار ژێرو ژو بووین. هەندێ کات ئەو لەسەر سینەی من دادەنیشت و هەندێ کات من بەڵام من چوونکە مەبەستی کوشتنیم نەبوو زیاتر بەرگریم دەکرد. زۆربەی چالاکیەکان لەلای ئەوەوە بوو

چەندین جار مەرگ تا نزیك چاوم هات و گەڕایەوە.

ورده ورده هیلاك بووم بەڵام مووناك هێشتا بەهێز بوو. لەپێشی ئەوانەی لەجەنگەڵ و هەوای ئازاد دا دەژین بە بەراورد لەگەڵ شارنشینەکان ئەمەیە ژنێکی لاوازو ناسك لەکاتژمێرێك شەڕو پێکدادان هیلاك نابێت بەڵام من کەپیاوو بەهێز بووم کەوتبوومە هەناسکە برکێ. بەهەرحاڵ هیلاکی من زیاتر دەبوو لەکاتی شەڕو پێکدادان بیرم لەوە کردەوە کەدەبێت ئەم شەڕە کۆتایی پێبێت. لەگەڵ ئەوەشدا دڵم لای یوری بوو دەترسام نەکا بیکوژن. لەم کاتەدا مووناکم دا بەزەویداو لەسەر سینەی دانیشتم ، ئەم جارە هەرەچەندە هەوڵیدا تەنانەت گازی لەدەستم گرت نەیتوانی لەسەر سینەی بەرزم کاتەوە.

کاتێك پەلەقاژەی دەکرد و بەهێواشی داموکام و و لەکاتێکدا هەناسکە هەناسکم بوو کوڵمم ماچ کرد. ئەو سەری تەکان دەداو روخساری بەچەپ و راستدا دەسوڕاند تا نەتوانم ماچی بکەم.

بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ ژنان پیاوانیان هەڵخەڵەتاندوە و درۆیان لەگەڵدا کردون. با ئەم جارە پیاوێك ژنێك هەڵخەڵەتێنێت.

لەخۆم پرسی بڵێی روی خۆشم نیشان بدات؟ دەبێت چی بکەم؟ بڵێی باوەڕبکات؟

بەهەرحاڵ پلانەکەم جێ بەجێم کرد و بەهێواشی لەهەمان کات کەسەری تەکان دا وتم: مووناك ئازیزم.... من تۆم خۆش دەوێت..

لەگەڵ ئەوەی ئەم قسەم لەزمانم هاتەدەر تەکان خواردنی سەری کەم کردەوە. بەچاوی خۆم بینیم روخساری گۆڕا.

بۆیە بە وزەیەکی زۆرتر وتم:

مووناك باوەڕبکە من لەبەر تۆ گەڕاومەتەوە... دەمتوانی لەهەمان رێگا بەرەو شارو دیاری خۆم بڕۆم بەڵام عەشقی تۆ بووە هۆی ئەوەی وەگەڕێم... بەم هەموو رەنج و دژوارییە لەبەرتۆ رازی بووم...

مووناك سست بوو زەق زەق لەچاوەکانی منی دەڕوانی. لەچاوەکانیدا چەند دڵۆپ فرمێسك دەبینرا بەڵام لە هاتنە خواری رێگری کرد و روانینەکەی سەیربوو دەتوت دەیەوێت بەنیگا راستی وتەکانم هەست پێ بکات.

بزەیەکم گرت و وتم:

شەوانە خەوم بەتۆوە دەبینی، لەخەودا دەمبینی دەگریایت زۆر نیگەرانت بووم. نەمدەزانی چیت بەسەر هاتوە.

بەبیستنی ئەم قسانە کەڕاست یان درۆ بۆ ئەو شیرین و هەڵخەڵەتێنەر بوو، دەستەکانی سست بوو بەهەردولایدا درێژبوو و بێ ئیرادە دڵۆپە فرمێسکەکان لەچاوی هاتنە خوار و لەهەردولای کوڵمەکانی کەوتە سەر خاك. تێگەشتم بەڕاستی منی خۆش دەوێت.... هێشتا عاشقی منەو لەم بابەتە شادمان بووم و بۆئەوەی دڵدانەوەم کردبێت سەریم خستە سەر سینەم و دەستم بە قژیدا هێنا.

مووناك سەری لەناو دەستم دەرهێناو رویکردە ژنانی تر کەسەرقاڵی شەڕبوون لەگەڵ یوریدا و بریندارو خوێناویان کردبوو وتی: بەسە وازی لێ بێنن.

بەدەستووری ئەو ژنان دەوری یوریان چۆڵ کرد بەڵام بەهۆی برینەکانی توانای وەستانی نەوبوو، سەرەتا پاڵی بەدارێکەوە دا و دواتر کەوتە سەر زەوی و دەستەکانی درێژ بوو.

من و مووناك سەر گەرمی رازو نیاز بووین. ئەوسا لەمووناکم پرسی:

چیت لەمناڵەکە کرد؟

سەری بەرز کردەوەو سەیری کردم و وتی: ئەو هەیە کچێکی جوانە، تەنیا کێشە ئەوەیە کچی تۆیە. دەترسم کاتێك گەورەبوو وەك تۆ ژنێکی عەیاش بێت و هۆزەکەمان بشێوێنێت.

بەسەرسوڕمانی تێکەڵ بەشادمانی بەناڕەحەتی و ترسەوە پرسیم:

راست دەکەیت.... مناڵت بوو.....؟ بەم خێراییە؟

لەوەڵامدا وتی: دەڵێی لەم ماوەدا زۆر خۆشت لێ گوزەراوە مناڵەکە ئێستا دادەنیشێت.

دواتر قسەکەی بڕی و بیری کردەوەو پرسی:

لئۆنا لەکوێیە؟ ئەوت چی لێکرد....؟ لەم ماوەدا لەگەڵ ئەو سەرگەرم بوویت...

ئێستا کەباسی لئۆنا هاتە پێش نەمدەزانی چی بکەم و چی بڵێم دەمزانی ئەم خوێنساردی و ئارامیە دەسکردو روکەشە. ئەو ژنێکی حەسوود و لەلئۆنا بێزاربوو. بۆیە لە وەڵامی پرسیارەکەیدا کەمێك وەستام و دواتر وتم:

ئەو ژنێکی داماوە، تۆ بێ هۆ تاوانبارت کردو من ناچار بووم لەدەست شێرەکان رزگاری بکەم و لەگەڵ خۆمدا بیبەم. لەیەکێك لە هۆزە دوورە دەستەکان دام بەمێردو ئێستا لەوێ دەژی. ئەم درۆیەم بەخێرایی دروست کردو وتم بەڵام نازانم چۆنم وت کە مووناك قاقا پێکەنی و وتی:

منداڵەکەمان کێشەیەکی دیکە لەتۆ بەمیرات دەبات و ئەویش درۆ کردنە.

بۆ؟ لەکوێوە زانیت من درۆ دەکەم.

لەکاتێکدا سەری لەسەر سینەم جێ بەجێ دەکرد وتی:

لەوێوە کە لئۆنا ئێستا لەدەستی مندایە. پێشتر ئەو و هاوسەرەکەی یوریم دەستگیرکردو دواتر هاتم بەشوێن ئێوەدا.

لە درۆیەك کە کردبووم هەم شەرمم دەکردو هەم کەوتمە لەرزین.

بەشادمانیەوە لەم کاتەدا دەنگی ناڵەی یوری بیرەکانمی پچراند. یوری داماو چەندین برینی بەرکەوتبوو و لەم برینانە خوێنی زۆر لێ رۆشتبوو و هەموو جەستەیان خوێناوی کردبوو. بەهۆی خوێن بەربوون چاوەکانی نەدەکرانەوە و بێهۆش دەهاتە بەرچاو.

هاورێ لەگەڵ ژنانی تر یوریمان لەسەر دەست بەرزکردەوەو بەرێکەوتین.

لەم کاتەدا دەرگای ژوورەکە کرایەوەو پیرێژنێك کە دەتوت پەرستاری منداڵەکەیە، هێنایە ژوور. منداڵێکی جوانکیلە بوو لەگەڵ ئەوەی چاوم بەروخساری کەوت نیشانەکانی بنەماڵەی خۆمانم تیابینی. چاڵێکی بچکۆلە لەسەر چەناگەی بوو. ئەمەش یەکێك لەنیشانەکانی بنەماڵەی ئێمەیە. چاوەکانی روانینی هەموو شتێکی لە دایکی دەچوو. لەسەیرکردنی چێژم دەبرد. مووناك لەوەی دەیبینی منداڵەکەم خۆش دەوێت شادمان بوو و ئێمەی لەحاڵی خۆماندا بەجێ هێشت و رۆشت.

کاتژمێرێك دواتر کەوتمە بیری لئۆنا. منداڵەکەم دا بەپەرستارەکەی و پرسیم:

مووناك بۆ کوێ رۆشت؟

رۆشت بۆ زیندان. ئەوێ کە ژنان زیندانن.

بەخێرایی لەژوورەکە هاتمەدەرو بەرەو زیندان کە شوێنەکەیم دەزانی رام کرد. لەگەڵ رۆشتنە ژوور روبەڕوی دیمەنێکی دڵتەزێن و نارەحەت کەر بوومەوە. لئۆنایان بەدارێکی کورتەوە بەستبوو و مووناك خۆی بەقامچی درکاوی لێی دەدا.

جلەکانی لئۆنا درابوو و شوێنی برینی قامچیەکە لەپشتیدا دەبینرا.

جەستەی خوێناوی بوو و کاتێك دەنگی منی بیست بەلاوازی و بێحاڵی سەری بەرز کردەوە، و سەیرێکی منی کرد و دواتر سەری داخستەوە، دەلەرزیم نەمدەتوانی لەسەر پێ خۆم بگرم.

چەند کەس لە ژنانی ئامازۆن لەوێ بوون کەدەمبینی ئەوان بەخوێنساردی بگرە

بەحەزیشەوە لەم دیمەنە پر ئازارە دەروانن زیاتر توورە دەبووم.

ئەمە چ وەحشیگەریەکە. بۆ دەبێت بەقامچی ئەویش بەقامچی درکاوی لە ژنێکی بێ تاوان بدەن؟

یانی چی؟

دەمویست قورگی مووناك بگرم و لەناو قامکەکانمدا فشاری بدەم تابخنکێت بەلام ئەم کارە یەکسان بوو لەگەڵ مەرگ. دەمتوانی چی بکەم.

گرنگتر لەهەموو شتێك ئەوەبوو لئۆنا لەو ئەشکەنجە رزگار بکەم. ئەم کارە لەگەڵ ئەوەی ئاسان دەهاتە بەرچاو بەرادەیەك دژواربوو کە ئێستاش بەبیرهێنانەوەی دەترسم.

لەگەڵ ئەوەی لەرق و توورەییدا دەلەرزیم و کۆنترۆڵی بیرو هەستەکانی خۆم لەدەست دابوو. سەرنجم لای ئەم خاڵە گرنگەبوو کە ئەگەر دەستی مووناك بگرم و بۆ رزگاری کردنی لئۆنا نیوەنجی گەری بکەم، ئەو زیاتر توورە دەبێت لئۆنای تەنیا لەبەرئەوەی دەزگیرانی من بوو دابووە بەرقامچی و ئەشکەنجەی دەدا. ئەو گوناحێکی تری جگە لەراکردن لەگەڵ مندا نەبوو و مووناك بۆ ئارام کردنەوەی دڵی پەرێشانی خۆی بەقامچی لێی دەدا. هەر قامچیەکە کەلەسەر پشتە ناسکەکەی ئەو دادەبەزی، کەمێك غروور لە خۆ رازی بوونی مووناکی بەهێز دەکرد و من بەسەرنجدان بەم خاڵە دروست لەوکاتەدا وتم:

چی دەکەیت.....؟ مووناك بۆ لێی دەدەیت... دەستم کێشایە دواوە و لەگرتنی قامچیەکە خۆم بەدوور گرت. بەهۆی راکردن ئەوەندە هیلاك بووم هەناسکە هەناسکم بوو. بەهۆی بینینی ئەو دیمەنە و رەنگە بەهۆی ماندوویی و راکردن جەستەم لەئارەقدا خوسابوو و دەنکە گەورەکانی ئارەق لەسەر ناوچاوم دەبینرا. مووناك کەمنی بینی دەستی لەکارکێشایەوەو هەناسەی تازەکردو بە لەخۆرازی بوونێك کەتایبەت بەخۆی بوو وتی: ها.... نارەحەت دەبیت؟ ناتوانیت خۆشەویستەکەت لەئازاردا ببینیت...؟

بەدەنگێکی نەرم و لەهەمان کات شێوە پارانەوە وتم:

بەهەڵەدا چوویت لەنێوان من و ئەودا هیچ پەیوەندیەك نیە... بەلام مرۆڤایەتی فەرمانم پێ دەدات لەقامچی لێدانی ژنێکی لاواز رێگری بکەم و یانی لانی کەم هۆکاری ئەم کارە ناشرین و قێزەونە بپرسم:

مووناك دەستی قامچیەکەی لەدەستیدا سووراند و وتی: ئەو تاوانبارە و لەیاسای ئێمەدا ژنانی خراپەکار دەبێت ئەشکەنجە ببینن و دواتر بکوژرێن.

ئەم جارەیان توورەییم دا بەدەنگی خۆم و وتم: ئەو تاوانبار نیە....

و ئەوسا ساتێك بێدەنگ بووم: نەمدەزانی دەبێت چی بڵێم. ئەم خاڵەم باش دەزانی بەزۆر و هەڕەشە ناتوانم مووناك لەقامچی لێدان یان کوشتنی لئۆنا پاشگەز بکەمەوە، بۆیە وتم: گریمان توشی گوناح بووبێت تۆ دەبێت بەزەییت پیایدا بێتەوە. هەرچی بێت ئەویش ژنە.

مووناك وەك بڵێی گرێی دڵی کرابێتەوە چەند جارێك لێوەکانی گاز گرت و وتی:

چۆن ئەو بەزەیی بەمندا نەهاتەوە.

چ بێ بەزەییکی نیشان داوە کەشیاوە بۆ ئاوا سزایەك.

مووناك سەری داخست چەند ساتێك بیری کردەوە و دواتر کەسەیری منی کرد بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بینیم چاوەکانی پڕبووە لە فرمێسك. بەدەنگێك کە قوڵپی گریان دەیپچراند وتی: ئەو لەگەڵ تۆدا پەیوەندی بوو، لەگەڵ تۆدا رایکردو من نزیکەی یەك ساڵ شەوان تابەیانی گریام. ئەگەر چارەنووس و رووداوەکان ئێوەیان نەهێنایەتەوە ئێرە، رەنگە پێکەوە راتان دەکردو دەڕۆشتن و ئیتر تۆم نەدەبینی و مناڵەکەم بێ باوك دەمایەوە.

خێرا لەم بارودۆخە کەڵکم وەرگرت و بەئیشارەی دەست لە ژنان کەلەوێدا بوون دەستوورمدا بڕۆنە دەر. کاتێك زیندان چۆڵ بوو بەمیهرەبانیەوە وتم:

تۆ بەهەڵەدا چوویت. تۆم زیاتر لەهەرکەسێکی تر خۆش دەوێت و عەشقە منی لێرەدا راگرتووە ئەگەر تۆم خۆش نەدەویست دەڕۆشتمە شارەکەی خۆم و تۆم بەتەنیا جێ دەهێشت. بەڵام قامچی لێدانی ئەم ژنە بێ تاوانە کارێکی نارەوایە. ئێمە لە وڵاتی خۆمان هیچ کات قامچی لە ژنان نادەین و هەرپیاوێك لە ژنەکەی خۆی یان ژنێکی تر بدات ئەو لای خەڵك شەرمەزار دەبێت کەچەند مانگ لەماڵ ناڕواتە دەر و ئیتر کەس هات و چۆی ناکات. لەلایەکیتر قامچی لێدان و کوشتنی ژن شوومە.نا ئازیزم ئەمە کارێکی باش نیە. کاتێك ئەم قسانەم دەکرد لە ژێر چاوەوە سەیری لئۆنام دەکرد. ئەو لەبەر قامچی وەشاندن باش ئاگای لەخۆی نەبوو. سەری لەسەر سینەی چەمابوویەوە و رەنگە بێ هۆش بوو بەڵام دڵنیابووم کە دەنگم نابیستێت.

بۆیە بەدڵنیایی و ورەی پێویست قسەم دەکرد.

لئۆناش منی خۆش دەویست. عادەتی بەمن گرتبوو وئەگەر ئەم قسانەی لەزمانی منەوە ببیستایە خەفەتی دەخوارد و مردن و لێدان و ئەشکەنجە بینینی بەباشتر دەزانی.

گریمان ئەگەر لئۆنا دەنگی منی دەبیست، ئارامکردنەوەی مووناکی نەدەبینی.

هێواش قسەم دەکرد و ئارام کردنەوەی کاری خۆی کرد و مووناکی ئارام کرد. بەشێوەیەك قامچیەکەی فرێدا.

بەهێواشی تم: ئازادی کە ئازیزم.

ژن لەهەر شوێنێکی دنیا و هەر بارودۆخێکدابێت تایبەتمەندی هاوشێوەیان هەیە.

لەنێوان ژنێکی شارنشینی ئەمریکایی یا ئەوروپایی لەبارودۆخ و کاتی تایبەت هیچ جیاوازیەك نیە. مووناك خۆی بۆمن لووس دەکرد و وتی:

لەبەر تۆ ئازادی دەکەم بەڵام مەرجێکی هەیە.

بەسەرسوڕمانەوە لەهەمان کاتدا بەشادمانیەوە پرسیم:

چ مەرجێك........؟ بەم مەرجە کە ئەو لەم هۆزەو لەنزیکی تۆ نەبێت. دەترسم بەبینینی ئەو ئارامی من بشێوێنیت.

بەخێرایی وتم: ئەمە چ گومانێکە؟ دڵنیابە ئەوم خۆش ناوێت. ئەگەر ئەو لەهۆزدا نەبێت چی بکات؟ دەینێرم بۆ مایلا ! ئەو شوێنەی تۆ تیایدا زیندانی بوویت و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی تەنیا نەبێت و ئاژەڵە دڕندەکان نەیخۆن چەند کەس لە ئازاترین پیاوە ڕەش پێستەکانی لەگەڵدا دەنێرم کە ئاگاداری لێ بکەن..... ڕازی دەبیت....

بەخێرایی لای خۆم بەراوردێکم کرد ئەویش ئەوەبوو.بەشێوەیەکی کاتی لەکوشتنی لئۆنا ڕێگری دەکرا و دواتریش چارەیەکی بۆ دەدۆزمەوە. لەوەڵامدا وتم:

بەڵێ ڕازی دەبم...... بۆ من جیاوازی نیە.

مووناك بەشادمانی دەستووری ئازادی لئۆنای دەرکرد و بەخێرایی چەند کەسێك ڕاسپارد تا بۆ مایلا بیگوێزنەوە. بەم شێوە لئۆنا لەمردن ڕزگاری بوو بەڵام من بۆی نیگەران و پەرێشان بووم. دڵم بۆی دەسوتا. هەندێ کات بیرم دەکردەوە و بەخۆمم دەوت: مووناك زۆر درۆ دەکات. ڕەنگە بەم شێوە منی هەڵخەڵەتاندبێت و بەنهێنی لئۆنای کوشتبێت...؟

دوور نیە...

بۆ باوەڕ پێنەکردن بەم بیرانە ناڕەحەت کەرە بەڵگەم دەهێنایەوە و هەوڵم دەدا تا ئەو شوێنەی دەکرێت ئەم گومانە باوەڕ پێ نەکەم. هەندێ کات لەخۆمم دەپرسی:

گریمان لئۆنا لەمایلابێت چی دەکات. من کەپیاوم و توانای جەستەیی بەهێزم هەبوو لەمانەوە لەو دوورگە ترس ئەنگێزە دەترسام..... دەوروبەری بەزۆنگاوە مەترسیدارەکان گەمارۆ دراوە.... تمساحە خوێنخۆرەکان شەوان دەکەونە ڕێ و هەر بوونەوەرێکی

زیندوو لەڕێگای خۆیاندا ببینن دەیدڕن و دەیخۆن....

نزیکەی هەفتەیەك تێپەڕی و من بێ ئەوەی لەبیری لئۆنا ئاسوودەبم، خۆم بە لێپرسراوی ئەم بەدبەختیە دەزانی، خۆم سەرکۆنە دەکرد کە بۆ لەسەرەتاوە ڕوی خۆشم پێ نیشان دا.

هەر ڕۆژ تێدەپەڕی ناڕەحەتی و نیگەرانی من زیاتر دەبوو تا ڕۆژێك ڕۆشتمە لای یوری و پێم وت: یوری لئۆنا لە مایلا زیندانیە. زۆر نیگەرانم بۆی.

یوری پرسی: مەبەستت چیە؟

دەبێت بڕۆینە ئەوێ تا بەنهێنی چاوم پێبکەوێت... دڵم بۆی لێدەدا. ڕاستیەکەت دەوێت گوومان دەکەم مووناك ئەوی کوشتبێت.

یوری ناوچاوی دا بەیەکدا و وتی: واز لەم بیرە منالآنە بێنە. ناتوانی لەگەڵ مووناکدا گاڵتە بکەیت. تازە خەیاڵی ئاسوودە بووە و لەکەلی شەیتان هاتۆتە خوار. ئەگەر تێبگات ڕۆشتویتە لای لئۆنا، دەزانیت چی دەبێت.......؟

چی دەبێت.........؟ئەم جارە هەردوکتان دەکوژێت و منیش بەدوای ئێوە دا دەکوژرێم. یوری دەیویست لەم بیرە پەشیمانم بکاتەوە. بەڵام سوور بووم و پێمداگرت و سەرئەنجام یوری وتی ئەمڕۆ بەبیانوی ڕاو دەڕۆینە دەر و چوونکە دەبێت لەرووبار تێپەڕین من بەلەمەکەم لەناو گیاکانی بەستێندا حەشارداوە.

ئاوابوونی خۆر سوار دەبین و بەیانی زوو دەگەڕێینەوە.

هەمان ڕۆژ دوای نیوەڕۆ بەبیانوی ڕاو ڕۆشتینە ناوجەنگەڵ لەبەرئەوەی ماوەیەك لەمایلا بووم، ئەوێم باشتر لەیوری دەناسی بۆیە بەئاسانی و بەبێ ئەوەی ڕەش پێستەکان پێمان بزانن لئۆنام دۆزیەوە.

لئۆناش لەبینینی من ئەوەندە شادمان بوو نزیك بوو بێهۆش ببێت.

یوری خێرا شوێنی خۆی دروست کردو لەناو گیاکاندا ڕاکشا و تفەنگەکەی لەسەر سینەی داناو خەوت. من و لئۆناش لەژێر نووری مانگدا دەستمان بەوتوێژ کرد و دوای ماوەیەك خەو بەسەرماندا زاڵ بوو لەناکاو بەدەنگێکی ترسناك لەخەو هەستام. هێشتا چاوەکانم نەکردبوویەوە کە قیژەی مەترسیداری لئۆنا بیست و تا هاتمە خۆم ڕوبەڕوی دو پڵنگی زل و دڕندە بوومەوە.

دووری ئێمە لە پڵنگەکان زۆر کەم بوو و دەرفەتی هیچ کارێك نەبوو، تێگەشتم کە ئەو دو پڵنگە نێرو مێ شەوی پێش وەك من و لئۆنا لەناو گیاکاندا بەسەریان بردبوو.

لئۆنا لەترسا دەلەرزی بەهێواشی وتی:

مەجووڵێ، مەجووڵێ، سەیری چاوی پڵنگ مەکە تووڕە دەبێت.

سەری خۆم داخست. لئۆناش سەری خۆی سوڕاند. لەم کاتەشدا دەنگی پێ لەسەر گیا وشکەکان دەبیسترا. هەردو پڵنگەکە بەخێرایی رووی خۆیان سوڕاند.

رەش پێستێکی چوارشانەی باڵا بەرز بەدەنگی لئۆنا بەراکردن خۆی گەیاندە ئەوێ و پڵنگەکان بە بینینی ئەو لە ئێمە پەشیمان بوونەوەو رویان کردە ئەو.

گوومانی لئۆنا راست بوو، هەڵبەت من لەوکاتەدا توانای بیرکردنەوەم نەبوو. وامدەزانی زۆر ترسەنۆك بووم بەڵكو لەبارودۆخێكدا بووم هەرکەس لە جیاتی من بووایە زراوی دەتۆقی.

دو پڵنگی برسی لە دو هەنگاویدا.....؟ کێ توانای رووبەڕو بوونەوەی لەگەڵ ئەم دڕندانە هەیە.....؟

ئەویش بەو دوورییە کەمەو ئەو بارودۆخە مەترسیدارە.

وتم توانای بیرکردنەوم نەبوو و راست دەڵێم چوونكە وەك ئەوەبوو جەستەم ببێتە پارچە گۆشت و ئێسقان بەبێ دەمار. مێشكم كاری نەدەكرد... و هەموو هەستەكانیشم بەبێ كەڵك دەبینی. دواتر كە ئەو دیمەنە ترسناكەم لەبەرچاوی خۆمدا وێنەكرد و لەتەنیایدا دادەنیشتم و بیرم لەو رووداوە دەكردەوە جارێكیتر دەستخۆشیم لەبیرتیژی و ئامادەیی زەینی لئۆنا دەكرد. ئەگەر بەتەنیا لەو شوێنەدا بوومایە زەق لەچاوی پڵنگەكەم دەڕوانی و لەئەنجامدا ئەو ئاژەڵە برسیانە هەڵیان دەدریم و لەجیاتی ناشتایی دەیانخواردم و ئەم جارەش لئۆنا گیانی منی لەمەترسیەكی دڵنیا رزگار كرد و وتی:

سەیری چاوی پڵنگ مەكە، تووڕە دەبێت.

بەهەمان شێوە كە پێشتر نوسیم سەرم داخست. رەنگە رەش پێستە ترساو و پەرێشانەكە بووە هۆی پەشیمان بوونەوەی پڵنگ بەڵام بەهەرحاڵ سەر داخستنی ئێمەش بێ كاریگەر نەبوو. رەش پێستی داماو لەگەڵ ئەوەی وەك لئۆنا لەدانیشتوانی جەنگەڵ و بەم رووداوانە ئاشنابوو لەگەڵ بینینی پڵنگ كۆنترۆڵی خۆی لەدەست دا و دەستی كرد بەلەرزین بەدرێژایی تەمەن كەسم نەبینیوە و نەم بیستوە بەوشێوە بلەرزێت.

ئەژنۆكانی سست بوون و دەلەرزین. وەك دو ستونی بوومەلەرزە لێدراو... پەنجەی دەستیشی كردەوەو لەبەردەم خۆیدا گرتبووی. وای دەزانی بەم كارە لەهێرشی پڵنگ

مەرگی خۆی دەتوانێت رێگری بکات.

بەهەرحاڵ ئەو داماوە چاوی لەچاوە خوێناوی و ترس ئەنگێزەکانی پڵنگ هەڵنەدەگرت و لەهەمان کاتدا کە دەلەرزی و دەمی نیوە کراوەبوو، زەق زەق سەیری دەکرد.

پڵنگی یەکەم کە لە ئێمە نزیکتربوو چەندین جار بە پەنجە پان و نینۆکە خەنجەر ئاساکانی خۆی لەسەر گیاکانی کووتا وتەوپ وتۆزی لەدواوە لەهەوادا بەرز کردەوەو نەرەیەکی مەترسیداری کرد کە وەك تەقینەوەی بوورکان و پەردەی گوێی منی ئازاردا.

چەند جار گیاکانی لەدواوە بەرز کردەوە و هەنگاوێك رۆشتە پێش. مەترسی بەدڵنیایی لەئێمە دوور کەوتەوە و لەرەش پێست نزیك بوویەوە. پڵنگی دووەم هێشتا هەندێ کات سەیری ئێمەو هەندێ کات سەیری رەش پێستەکەی دەکرد وەك پشیلە دەمی خۆی بەرەو من کردەوە و دەینەڕاند و دیانە زەرد رەنگ و زمانە سورەکەی نیشان دەدا.

وا دەهاتە بەرچاو لەهەڵبژاردنی نێچیرەکەی گوومانی بوو و نەیدەویست چاو لەئێمە بپۆشێت و بۆلای رەش پێستەکە بڕوات. لەم کاتەدا مێچکە پڵنگ لەئێمە دوور کەوتەوە. ئەویش روی خۆی سوڕاند و لەکاتێکدا کلکی خستبووە نێوان دو قاچی وەك پشیلە کە بۆمشك دەخزێت بەرەو رەش پێستەکە رۆشت.

ئێستا ترس لەئێمە دوورکەوتبوویەوە و دەمانتوانی سەر بەرزبکەینەوە و سەیری ئەو دیمەنە ترس ئەنگێزە بکەین. کاتێك پشتیان لەئێمە بوو و دەستەکانم داناو ویستم هەستم. بەڵام لئۆنا وتی:

چی دەکەیت. مەجووڵێ، مەجووڵێ.

بەخێرایی زانیم لئۆنا راست دەکات. دەنگی خشە خشی گیا وشکەکان لەوانەبوو پڵنگەکان بۆ لای ئێمە بکێشێت. لەو حاڵەدا مامەوە و ئیتر نەجووڵام. رەش پێست کاتێك خۆی لەدو سێ هەنگاوی ئەو ئاژەڵەدا بینی، دەستی لەگیان شۆردو دەمی نیوەکراوەی خۆی کردەوەو بەهەموو هێزو توانای خۆی قیژاندی.

دەنگی ئەو لەناو دەنگی نەرەی پڵنگەکان ون بوو.... هەردو پڵنگەکە پێکەوە نەڕاندیان بەڵام بەخۆشحاڵیەوە پەلاماریان نەدا، تەنیا لەسەر دەست چۆکیان دادا وەك پشیلەیەك لەخوارەوە بپەرێتە سەر دیوار. وامزانی دەنگی رەش پێست بەکەس نەگەشتوە بەڵام لەم کاتەدا بینیم سێ وەحشی تر بەخێرایی بەرەو لای ئێمە دێن و

هەرکام رمێکی درێژیان لەدەستدایە.

کاتێك ئاژەڵێکی دڕندە وەك شێر، پڵنگ، بەور و دڕندەکان لەم شێوە خۆی بۆ پەلاماردان و هێرش کردنە سەر مرۆڤ ئامادە دەکات، هیچ کەسێکی تر هیچ کارێکی پێ ناکرێت مەگەر ئەوەی پێش پەلاماردان فریای کەون و بەتیرو کەوان یان رم ئاژەڵەکە لەپێ بخەن.

ئەم کارە ئەوەندە دژوارە. کە بەزۆری جێ بەجێ نابێت. بۆیە رەش پێستەکان بۆئەوەی گیانی ئەو رەش پێستە رزگاربکەن، لەدوورەوە دەستیان بەقاوەقیژ کرد، قاوەقیژی کەسانێتر هەندێ کات کاریگەری باشی هەیە و ئاژەڵەکە تووڕەدەکات و سەرنجی بۆلای کەسانێتر رادەکێشێت بەڵام هەندێ کات کاریگەری خراپی هەیەو پەلاماری خێراتر کرد.

هەموو ئەم روداوانە لەچەند چرکەیەکدا رویاندا... مەودای گەشتنی رەش پێستی یەکەم و دەرکەوتنی ئەوانیتر ئەوەندەبوو ناتوانم بەدڵنیای بنوسم یەك خولەك یان دو خولەك زیاتر یا کەمتر. بەهەرحاڵ بۆ ئێمە و ئەو رەش پێستە بەدبەختە بەتەمەنێکی درێژ تێپەڕی.

پیاوی رەش پێست کە باردودۆخەکەی بەم شێوە بینی و دەنگی هاورێکانی بیست کەمێك ورەی گرت و بەخێرایی دو سێ هەنگاو رۆشتە پێش. پڵنگ کە چاوەڕێی ئەم جووڵەی لەنێچیرە گەمارۆدراوەکەی نەبوو پەڕی و دوبارە خۆی گەیاندە دو هەنگاوی رەش پێستەکە بەڵام رەش پێست ئیتر درەنگ کردنی بەرەوا نەدەزانی و لەوێوە کە بەختی رەش یەخەی گرتبوو رایکردو رێگەی جەنگەڵی گرتە بەر.

بەگشتی رەشەکان بەو قاچە درێژانەیانەوە جوان رادەکەن بەڵام ئەگەر خێرایی راکردنی ئەوان زیاتر لە ئەسپێکی عەربی بێت ناتوانن لەدەست پڵنگێکی برسی دەربازیان بێت. ئەو بەخێراییەکی سەیر رایدەکرد و پڵنگیش بەدوایاندا رایدەکردو دەینەڕاند.

من و لئۆنا لەناو گیاکانەوە بەجوانی دەمانبینی لەبەرئەوەی ئەو شوێنەی ئەو بۆی چوو داری کەمتری ولەگەڵ ئەوەش بە زۆنگاوەکە کۆتایی پێدەهات. بەچاوی خۆمان بەدوایدا دەڕۆشتین. رەش پێست بێ ئەوەی بزانێت بۆ کوێ دەروات لەسنووری گیاکان دوور کەوتەوە و بەرەو قامیشەلانی بەرانبەر رایکرد. ئێمە هێشتا دەمانبینی.

ئەو دوای تێپەڕین لەپانتاییەکی خاڵی لەدار، لەتاشە بەردێك رۆشتە سەر. لەم

کاتەشدا پڵنگەکە گەشت و بەپەڕینێك خۆی گەیاندە سەرتاشەڕبەردەکە. ڕەش پێست دەیویست لەسەرەتاشە بەردەکەوە خۆی بگەیەنێتە سەر دارێکی کۆنە کە لەوێدا بوو بەڵام دەرفەتی ئەم کارەی دەست نەکەوت و ناچار دەستی بەراکردن کردەوە ئەم خاڵەش دەبێت بڵێم ڕەشەکانی جەنگەڵ وەك ئاژەڵەکان بەهێزو چالاکن.

پڵنگ لەسەر تاشەبەردەکە پەڕی و ئێمە لەناو هەوادا بینیمان. بەبێ زێدە ڕۆیی پڵنگ لە بەرزایی بیست مەترەوە لەولاتر هاتەخوار و پشتەملی ڕەشی بەدبەختی بەدەمەوە بوو. نینۆکی ئاژەڵی دڕندە کە هەرکام وەك خەنجەرێکی پۆڵاینە، لەپشت و کەلەکەو ملی ڕەش پێستەکە ڕۆچبوو.

ڕەش پێست قیژاندی و دەستەکانی بەم لاولادا کردەوە بەڵام لە دەوروبەری ئەو بێجگە لەقامیشە ناسکەکان کەبەکەمێك فشار دەشکان، هیچی تری لێ نەبوو.

ئەو داماوە زیاد لەرادە زەختی لەخۆی کرد کە نەکەوێت و بەم جۆرەش دو سێ هەنگاوی تر رایکرد بەڵام ئیتر نەیتوانی هاوسەنگی خۆی رابگرێت ولەناکاو لەشوێنی خۆی هەڵکەنراو لەکاتێکدا هێشتا پڵنگ لەسەر پشتی بوو، تەقلەیەکی لێدا و وون بوو. لەدوایین ساتەکان قاچیمان بینی و قیژەیشیمان بیست و جگە لەمانە ئیتر شوێنەوارێك لەڕەش پێستەکە نەما. لئۆنا دەستی بەدەم و چاویە دەگرت قیژەیەکی کورتی کرد و وتی: ڕۆشت، ڕۆشت، چەقی.

چەقی یانی چی....؟

لەکوێدا چەقی.

لئۆنا بێ ئەوەی دەست لەروخساری هەڵگرێت وتی:

زۆنگاو... تمساحەکان ئەویان خوارد، پڵنگەکەش چەقی.

تازە تێگەشتم بۆ ڕەش پێست لەدوایین ساتدا تەقلەی لێدا و بۆ قاچەکانی بینرا و ونبوو. دەمویست لە شوێنەکەم هەستم و یارمەتی بدەم بەڵام بەداخەوە ئەم کارە نەدەکرا. چەند ڕەش پێستەکەی تر لەنزیکمانەوە هێشتا سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ پڵنگەکەی تر بوون و لەگەڵ ئەوەی بجووڵامایە دەیانبینیم و رسوایی دروست دەبوو.

تەنیا یەك کەس من و لئۆنای لەوێدا بینی بوو، ئەو ڕەش پێستەی هاوڕێ لەگەڵ پڵنگەکە لە زۆنگاوەکەدا چەقی لەبوونی من لای لئۆنا ئاگاداربوو و بەچاوی خۆی ئێمەی بینی بوو.

٨

بیرم دەکردەوە کەلەناکاو چاوم بەدیمەنی شەڕی رەش پێستەکان و پڵنگ کەوت و بینیم یەك لەوان رمەکەی بەهەموو تواناو هێزیەوە لەلایەك چەقاندە سکی پڵنگەکە و لەولای دەرچوو.

کۆتایی رمەکە هێشتا لەناو دەستی رەش پێست دابوو وپڵنگەکەش بم برینە کاریگەرە هێشتا هەڵبەزو دابەزی دەکردو پەلاماری دەدا و ئەوی بەدوای خۆیدا دەکێشا کە یەکیتریان رمەکەی بۆ هاویشت. رمەکە هەوای بری و راستەوخۆی لەسینەی پڵنگەکە چەقی. ئەم جارە برینەکە کاری بوو و پڵنگ وەك کێویك لە گۆشت و ئێسقان لەشوێنەکەی هەڵکەنراو نیومەتر بەرزبوویەوەو کەوت و نەجوولا.

لئۆنا هەر ئەوەندەی کاری پڵنگی بەتەواو بوو زانی، بەمنی وت:

خێرا خۆت داشارە..... خێرا..... پەلەکە...... ئێستا دێن بۆ ئێرە.

لە دەورووبەری خۆم روانی و بەدوای شوێنێکی گونجاو بۆ خۆداشاردن دەگەڕام بەلام شوێنێك بتوانێت لەچاوی رەش پێستەکان دوورمکاتەوە، نەبوو و ئەگەر لەناو گیاکاندا هەستامایە، دەیانبینیم. جیاواز لەوەش دڵم بۆ یوری لێی دەدا دڵنیا بووم ئەو لەم نزیکانەیە بەلام نەمدەزانی لەکوێیە و تفەنگەکەم لەدەستی ئەودا بوو.

بەرزی گیاکانی ژێر پێم لەشوێنێکدا زۆر و لەشوێنێکی دیکەدا کەم بوو.

لئۆنا وتی: بۆ وەستاویت...... لێرە.... لەژێر ئەم گیایانە خۆت داشارە.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کەدەنگی خشە خشی گیاکان لەپشت سەرمان هەستا.

بەترسەوە خەنجەرەکەم کێشا و سەیری دواوەم کرد بەلام بینیم یوری وەك سەربازێك کەدەیەوێت لە ژێرتەلە دڕکاویەکان تێپەڕێت بەسك بۆ لای من دێت. لەبینینی زیاد لەرادە شادمان بووم. ئێستا کە یوری دێت، هەرکێشەیەك ئاسان دەهاتە بەرچاو.

دیاربوویوری دوورییەکی زۆر لەسەر سك خزاوە چوونکە هیلاك و هەناسکە هەناسکی بوو. لێم پرسی: یوری چی بکەین؟

هەناسەیەکی تازە کردەوە و وتی:

لەئێستادا شوێنێك باشتر لەناو گیاکان نیە....

دەست بەجێ شوێنێکی لێوانلێو لەگیای نیشانی دا و وتی:

ئێرە... زووکە وەگەرنە دەرفەت بۆ هەمیشە لەدەست دەروات. ئەمەی وت و تفەنگەکەی دا بەدەستم و رۆشتە ناوگیاکان. سەرەتا ئەوم بەگیا داپۆشی و دواتر شوێنێکم بۆخۆم ئامادەکرد و خۆم داشارد. لئۆناش بەگیا منی داپۆشی و بۆئەوەی بەتەواوی لەبەرچاو ونبم خۆی لەوێ دانیشت.

ئەوێ تاریك و خنکێنەر بوو نەدەمتوانی چاوم وەکەم و نەبەجوانی هەناسە بدەم. بەهەر هەناسەیەك بڕێك گیاو تەپ و تۆز دەڕۆشتە ناو قورگ و سینەم، بەشێوەیەك نزیك بوو کۆکە بمخنکێنێت. تا ئەو شوێنەی ئەگەری بوو زەختم لەخۆم کرد نەکۆکم بەڵام ئەم فشارەم بووە هۆی دەرکەوتنی بەدبەختیەکی تر کەم کەم لووتم کەوتە خوران و نیشانەکانی پژمین دەرکەوت.

ڕێگرتن لەکۆکە ئاسانترە لەڕێگرتن لە پژمە و بەداخەوە لەم کاتەدا توشی هەردوکیان بووم. لەم ساتە مەترسیدارانە بوو کەرەشەکان بۆ ئاگاداری لەحاڵی زیندانی بەرەو ئەوێ هاتن و دەنگی خشە خشی قاچیانم لەسەر گیاکان دەبیست.

لەنێوان ژیان و مردن یەك خولەك مەودابوو. ئەگەر دەپژمیم یان دەکۆکیم بەهۆی روداوێکی تر گیاکان دەجوولانەوە و ئەوان دەیانزانی لەژێر کۆگای گیا وشکەکان خۆم داشاردوە و هەموو شتێك تەواو دەبوو. هەر لەوێ بێ ئەوەی بمکێشنە دەر بەڕم جەستەیان کون کون دەکردم و جەستەی خوێناوی منیان بەجێ دەهێشت !

بێننە بەرچاوی خۆتان چ حاڵێکمان بوو و چ مەترسیەکی گەورە هەڕشەی لێدەکردم. لووتم دەخورا و ئەمەش بەهۆی هەلمژینی خۆڵی ژێر گیاکان بوو. هەرچی زەختم لەخۆم دەکرد ڕێگرتن لەکۆکە و پژمە دژوارتر دەبوو. نازانم هیچ کات گیرۆدەی ئەم بەڵایە بوون.... تاقیتان کردۆتەوە ڕێگرتن لە کۆکە و پژمە چەندە دژوارە.

دڵم لەناو سینەدا دەلەرزی.... نەمدەوێرا چاوم وەکەم، توانای هەناسەدانم بوو. هەناسەیەکی کورت دەبووە هۆی پژمە و ئەگەر چاوەکانی خۆم وەکردایە پڕ دەبوو لەگڕوگیاو لەئەنجامدا بۆماوەیك بینایی خۆم لەدەست دەدا.

دەنگی خشە خشی قاچی رەشەکان لەسەر گیاکان بەجوانی دەبیسترا و ئەمە تەنیا شتێك بوو هەستم پێدەکرد. لەترسیو زەختێك لەخۆمم دەکرد نزیك بوو بخنکێم و لە حاڵەشدا سات بەسات دەنگی قاچی رەشەکان باشتر دەبیسترا. نەمزانی چەند سات

چەند خولەك چەند چرکە تێپەڕی.... لەڕاستیدا تێپەڕ بوونی کاتم لەبیر کردبوو، لەوپەری خۆشحاڵیدا هەستم کرد ئیتر دەنگ نابیستم، یانی چی....؟ چی بووە.....؟ ڕەشەکان ڕۆشتوون و بەشادمانیەوە گوێم هەڵخست و چوونکە دڵنیابووم دەنگی خشە خش و وردبوونی گیاکان لەژێر زەختی جەستەی ڕەشەکان نابیسترێت، لەدڵەراوکێ و ترسەکەم کە بوویەوە.

کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە تەنگانەوە هەموو بەڵا و بەدبەختیەکان هێرشی بۆ دێنن. لەو کاتەدا نزیك بوو دڵم داکەوێت. پژمەو کۆکە گیانمی هێنابووە سەرلێو بەڵام کاتێك دەنگی ئەوان نەما، پژمە و کۆکەوخورانی قورگ و لووتم لەناو چو.

لە ژێر گیاکان تەکانێکم بەخۆم دا و جێ بەجێ بووم. دەستی ڕاستم درێژکرد و گیاکانم لەسەر جەستەم لابرد و لەم کاتەدا هەستم کرد شتێك لای من دەجوڵێتەوە.

ئەم جارە دەنگی لێك پرژانی گیاکان دەبیسترا. دوبارە کەسێك سەرقاڵی ژێرو ژو کردنیانە. دڵنیابووم ڕەشەکان ڕۆشتوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەوێرا سەرم لەناو گیاکان دەرکەم چوونکە ئەگەر لەوێ بوونایە و منیان بدیایە کارم تەواو دەبوو. وەستام تا ڕوداوەکان خۆیان ڕوبدەن.... خولەکێك دواتر دەنگی لئۆنام بیست کەدەیوت:

وەرنە دەر...... ڕۆشتن.

بە بیستنی دەنگی ئەو نزیك بوو لەشادمانیدا بمرم. وەك مەحکوم بەئیعدامێك کە لە دوایین ساتەکانی جێ بەجێ کردنی حوکمی ئیعدام، حوکمی لێ خۆشبوونی پێ دەبەخشن. هەستام، گیاکانم لابردو هەناسەیەکم بەڕاحەتی کێشا.

هەتاو هەموو شوێنێکی ڕووناك کردبوویەوە، هەوایەکی ڕۆح بەخش و گیاندەر ڕۆشتنە ناو سیەکانم و دەتوت گیانێکی تازەم پێدەبەخشێت. یوریش هاتەدەر و سەیری دەوروبەری کرد. سەیربوو لەروخساری ئەودا شوێنەواری ترس نەدەبینرا و سەرم سورما، بەخۆمم وت بڵێی لەبەردو ئاسن دروستیان کردبێت ئەو چ جۆرە مرۆڤێك بوو لەهیچ ڕووداوێك نەدەترسا؟

لئۆنا ڕەنگی پەریبوو بەڵام پێدەکەنی و ئارام دەهاتە بەرچاو. لێم پرسی:

ڕۆشتن..... مەترسی نەماوە..؟

بەڵێ ڕۆشتن بەڵام گومانیان پەیاکردبوو..... شوێن پێی یوری....؟

خێرا پێی وت: یوری ژێر پێڵاوەکەت ببینم.

یوری قاچی بەرز کردەوە و ژێر پێڵاوەکەی نیشاندا. لئۆنا وتی:

بەڵێ ئەوان شوێن پێی یوریان لەسەر زەوی نمدار بینیوە و گوومانیان لادروست بووە. لەکاتێکدا لەمردنی هاوڕێکەیان زیاد لەرادە خەمبار دەهاتنە بەرچاو منیان خستە ژێر پرسیارەوە.

بەخێرایی پرسیم: دواتر چی بوو........؟ بۆ کوێ ڕۆشتن.

وتی: دواتر لەمایلا دەگەڕێن و ئەگەر بەلەمەکەی ئێوە لەناوگیاکاندا نەبینن دوبارە دەگەڕێنەوە بۆ لای من.

یوری پرسی: ئایا لەلایەن ئەوانەوە ترسێك هەڕەشە لەئێمە دەکات؟

لئۆنا پێکەنی و وتی:

چاوەڕێن میوانداریتان بکەن...؟ ئەگەر ڕوبەڕوتان ببنەوە بەدڵنیایەوە شەڕ دەست پێ دەکات و لەبەرئەوەی ژمارەی ئەوان زۆرترە بەدڵنیاییەوە ئێوە دەکوژرێن. دوای ئەوەی ئێوە کوژران نۆرەی منە. چوونکە ڕووداوەکە بۆ مووناك ڕاپۆرت دەکرێت و ئەویش من دەکوژێت.

لئۆنا جۆرێك قسەی دەکرد دەتوت لەرووداوێك کە بەدڵنیایی بەم نزیکانە ڕوودەدات باس دەکات. لەبیستنی ئەم قسانە لەرزیم بەڵام یوری ئارام و ڕەنگی نەگۆڕی. دوای ئەوەی لئۆنا بێدەنگ بوو پرسیم:

ئێستا دەبێت چی بکەین؟ تۆ دەڵێیت چی؟

ئەم جارە لئۆنا بەشێوازی پاڕانەوە وتی:

پێم باشە بەخێرایی مایلا بەجێ بێڵن. ڕازی بەمەرگی ئێوە نیم. لەبەر من خۆتا مەخەنە مەترسیەوە. ئەگەر بە سلامەتی گەشتن ئیتر بیری من مەکەنەوە. هیچ کات ڕوومەکەنە مایلا و من بسپێرن بەدەست ڕوداو و پێشهاتەکان.

لئۆنا دەپاڕایەوە وتاکاتێك بەڵێنی لەمن وەرگرت ئارام نەبوو. منیش بەڵێنم پێدا ئەگەر زیندوو بۆ هۆز گەڕامەوە هیچ کات نەگەڕێمەوە بۆ مایلا.

ئەوەی ڕەش پێستەکان لەهاتنی ئێمە بۆ ئەو شوێنە گوومانیان لادروست ببوو، پەرێشان بووم. گریمان بێ مەترسی دەگەشتینە هۆز. ڕەش پێستەکان هەموو شتێکیان بە مووناك دەوت ئەویش بە پێی ئامادەنەبوونی یەك ڕۆژی ئێمە هەموو شتێکی دەزانی.

دوبارە نائاگایی من بووە هۆی دروست کردنی ڕوداوی مەترسیدار و یوری بەروانینەکانی خۆی تێیگەیاندم مەترسی گەورە لەبەردەمدایە. بەهەرحاڵ چارەیەکمان جگە لەڕۆشتن نەبوو. لە لئۆنا ماڵئاوایمان کردو بەخێرایی لەوێ دوورکەوتینەوە.

چەندین مەتر ئەولاتر ڕۆشتینە ناوچری دارەکان و لەچاو ون بووین بەڵام هێشتا مەترسی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ رەش پێستەکانی مایلا لەئارادابوو وهەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش ئەم مەترسیە زیاتر دەبوو.

کەم کەم گەشتینە بەستێنی روبار و دەنگی تاڤگە دەبیسترا. لەوێ لەخێراییی هەنگاوەکانمان کەم کردەوە چوونکە ماندوو ببووین و هەناسەبڕکێم پێ کەوتبوو.

لەژێر دارێکی گەورەی مۆز وەستام. بەبیانوی چنینی مۆز حەوامەوە. یوری سور بوو لەسەر ئەوەی لە چنینی مۆز چاو بپۆشم بەڵام برسیەتی و تینوویەتیم کردە بیانو و وتم:

کێشە نیە، تۆ لەدارەکە بڕۆرەسەر. من ئاگادارم.

یوری کە هەمیشە دوای کەمێك دژایەتی بەپێشنیارەکانی من رازی دەبوو، ئەم جارەش بەبێزاری و ناڕەحەتیەوە قبوولی کرد و قاییشی تفەنگەکەی کردە ملی و لەدارەکە ڕۆشتە سەر. دارەکە زۆر ساف و بەرز بوو و یوری بەدژواری خۆی دەکێشایە سەر. لەکاتی ڕۆشتنە سەر بۆڵە بۆڵی دەکرد و لەژێر لچەوە قسەی دەکرد.

دەمزانی لەدڵدا بەمن و عەقڵە منداڵانەکەم جنێو دەدات.

پرسیم: یوری..... چی بوو........؟

ئەو بەوردی سەیری لای راست رێگەکەمانی کرد و لەوڵامی مندا وتی:

بەدواماندا دێن. پاسەوانەکانی مایلا رم و قەمە بەدەست بەرەو ئێرە دێن. دەبێت خێراکەین و گەرنە دەکوژرێین.

ئەمەی وت و بەخێرایی لەدارکە هاتەخوار. کاتێك گەشتە خوار بەتووڕەیی سەیری کردم و وتی: بۆ وەستاوی....... با ڕاکەین.

هەردوك بەراکردن بەرەو لای بەستێنی رووبار و شوێنێك کە بەلەمەکەمان داشاردبوو بەڕێکەوتین بەڵام بەداخەوە درەنگ ببوو چوونکە نیو خولەك دواتر پاسەوانەکان ئێمەیان بینی و بەقاوەقیژ بەدواماندا هاتن.

یوری سەیرێکی دواوە کرد و وتی:

دەبێت بەرگری بکەین، هەڵاتن ئەنجامی نیە.

دەست بەجێ تفەنگەکەم لەسەر دەست کردو لوولەکەی لەسەر سینەی یەکەم کەس کە لەئێمەوە زۆر دوور نەبوو نیشانە گرت.

ئەوان کە لەشێوەی کاری تفەنگ ئاگادار نەبوون بەبێ ترس هاتنە پێش و گوێیان نەدەدا. دەنگی تەقە بەرز بوویەوە و رەش پێستی یەکەم وەك کێوێك لە شوێنەکەی بەرز

بوویەوە و وەك بەرانێك لەبەرزایەوە فڕێیان دابێت، بەدەوری خۆیدا سوڕاو کەوت. قیژەی ئەو ترسی خستە دڵی ئەوانەوە. یەکێك لەوان قەمە تیژو پانەکەی خۆی بۆ من هاویشت. قەمە وەك فیشەکە شێتە هەوای بڕی و ئەگەر بەخێرایی سەری خۆم نەکێشایتە دواوە، سینەمی دەقڵیشاند، قەمەکە بەئەندازەی دوسانتی مەترڕۆشتە ناو دارەکە و لەمردن رزگارم بوو. یوری دوبارە تفەنگەکەی لەسەر دەست بەرزکردەوە کە ئەو رەش پێستە بکوژێت بەڵام نەیتوانی چوونکە لەم کاتەدا دەنگێك لەپشت سەرمان بیسترا کەزیاد لەرادە ترس ئەنگێزو گەورە بوو.

یوری وەك بڵێی دەیزانی ئەم دەنگە لەچییەو لەکوێوەیە بەخێرایی ئاوڕی دایەوە. منیش جارێکیتر خۆم لەبەرانبەر دێوێکی ترسناك و گەورەدابینی. ئەمەی لەبەرانبەرماندابوو ئاژەڵێك بوو بەرز، زل و دێو ئاسا. قیافەی وەك مرۆڤ بەڵام جەستەی لە گووریل گەورەتر و پێست و تووکەکەی سور رەنگ بوو. لە کتێبەکان ناو باسێکی کورتم لەسەر (( ئەورانگوتانی )) سور رەنگ و مەترسیدا خوێند بوو و ئەو رۆژە خۆم روبەڕوی ئەورانگوتانی سور دەبینی.

دووری ئەو ئاژەڵە دڕندەو خوێنخۆرە لەگەڵ ئێمە دا زۆر کەم بوو و ئەگەر یوری سێ گولەی یەك لەدوای یەکی بەڕویدا نەدەتەقاند رەنگە لەهەمان ساتی یەکەم بەزەربەی دەست و پێی لەپێی دەکەوتین.

گوولەکان بەری دەکەوتن بەڵام برینداری نەدەکردن. بەهەرحاڵ دەنگی تەقەی گوولەکان بووە هۆی بەدرەنگ کەوتنی پەلاماری ئەو ئاژەڵە و ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ من چوونکە سیلاحم لەدەستدا نەبوو. دەست بەجێ قەمەکەم لەدارەکە کردەوەو خۆم بۆ بەرگری ئامادەکرد. پاسەوانەکان لەپشت سەرمان بوون و بەباشی دەیانتوانی بمانکوژن بەڵام ئەم کارەیان نەکرد چوونکە ئەگەر ئێمەیان دەکوشت لەمپەری نێوان ئەورانگوتان و خۆیان لەناو دەچوو. ئەو ئاژەڵە هێرشی دەکردە سەریان. لەبەرئەوەی ببینە بەڵا گەردانی ئەوان لە کوشتنی ئێمە خۆیان پاراست. خۆشیان نەتوانای راکردنیان بوو نە توانای ئۆقرەگرتن. لەترسا دەلەرزین و نەیاندەزانی چی بکەن. ئەو ئاژەڵە یەکەم هێرشی کردە سەرمن و بەقەمەکەم زەربەیەکم لەبەری دەستە پان و تووکنەکەی داو کشایە دواوە. یوری وەك مشکێك کە روبەڕوی پشیلە بوو بێتەوە هەنگاو بەهەنگاو دەڕۆشتە دواوە. دەنگی ترسناکی ئەو ئاژەڵە جەنگەڵی دەلەرزاند و موی لەسەر ئەندامی بیسەرەکەی راست دەکرد دوو هەنگاو رۆشتبوومە دواوە لەرەش

پێستەکان نزیك ببوومەوە، کەڵکم لەبارودۆخ وەرگرت و پێم وتن:

بۆ وەستاون.... وەرن یارمەتیمان بدەن، ئەگەر ئەو ئاژەڵە ئێمە بکوژێت ئێوەش دەکوژێت بەڵام ئەگەر پێکەوە بین دەتوانین گەمارۆی بدەین و بیکوژین.

رەش پێستەکان سەیری یەکیان کردو دەست بەجێ هاتنە پێش. ئەوان سلاحی باشتریان لەدەستدابوو.

لەم جۆرە شوێنانەدا رم و تیروکەوان سەدان جار لەفیشەك باشتر کار دەکات و من کەباش ئەوانم دەناسی، وتم: گەمارۆی بدەن. دەوری بگرن و بەهەر شێوەیەك دەکرێت لەم لاولاوە برینداری بکەن. هەوڵبدەن برینەکانی کوشندەبن.

ئەوان بەدەوری ئەورانگوتاندا بلاو بوونەوە و هەمان شێوەی من فەرمانم دەدا ئەنجامیان دەدا. ژمارەی پاسەوانەکان لەخولەکی یەکەم پینج کەس بوو. یەکیان بەگوولەی یوری کوژرابوو چواریان مابووەوە. لەهەمان ساتی یەکەم یەکیان لەسەر دەستی ئەورانگوتان بەرزبوویەوەو بەشێوەیەك کێشای بەزەویدا دەست بەجێ گیانیدا.

مانەوە سیان و شەرو پێکدادان دەستی پێکرد. ئەورانگوتان چوونکە دەستی درێژتربوو باشتر هێرشی دەکردو ئێمە لەبەرانبەر جەستەی گەورەی ئەو سێ بەرانبەر بچوکتر بووین.

یوری دەیویست تەقە بکات بەڵام رێگەم لێگرت وتم:

فیشەکەکان بۆ تەنگانە هەڵگرە، بووەستە رەنگە بەنێزە کوشتمان کاتێك من ویوری سەرقاڵی ئەم وتوێژەبووین یەکێتر لەرەش پێستەکان لەدەستی ئەو ئاژەڵەدا گرفتار بوو. ئەمیان زۆر دڵتەزێن کوژرا کەبیرهێنانەوەی موو لە سەر ئەندامەکانم راست دەکات. ئەورانگوتان سەری گرتە ناو دەستی و بایداو وەك ملی جۆلەکە هەڵیکەند و فرێیدا. جەستەی بێ سەری رەش پێست لەخوێندا پەلەقاژەی دەکرد و بێ جووڵە کەوتە سەر زەوی.

ئێستا دو رەش پێست مابوونەوە کەدروست بە پێچەوانەی ئێمە وەستابوون. بەم مانایە کە ئەورانگوتان لەنێوان ئێمە چوار کەسدا بوو. بەم جیاوازیە کەڕوی لەوان بوو پشتی لەئێمە. راکردن یەکێك لەڕێگاکانی رزگاری بوو بەڵام ئەم کارە ترسێکی گەورەی بەدواوە بوو و یوری خێرا سەرنجی منی بۆ راکێشا.

دەتوت سەرەتا خۆشی بیری لەم خاڵە نەکردبوویەوە و دواتر پێی زانی.

بەهەرحاڵ پێی وتم:

با پاسەوانەکان رابکەن چوونکە ئاژەڵەکە بەدوایاندا دەڕوات و ئێمە رزگارمان دەبێت. بیرۆکەیەکی باش بوو بەڵام کێ دەیوت پاسەوانەکان دەیانەوێت رابکەن. لەکوێوە بزانین ئەوانیش هەستیان بەم خاڵە نەکردبێت.

دو رەش پێستەکە ئیتر تواناو ورەی هێرش کردنیان نەبوو. تازە تێگەشتبوون شەڕکردن لەگەڵ ئەو ئاژەڵە دێو ئاسایە کارێکی ئاسان نیە و بێجگە مەرگ ئەنجامێکی تری نیە. بۆیە دەستیان لەهەوڵدانی بێ هۆ هەڵگرت و چاوەڕێی پێشهاتەکانیان کرد.

لەم کاتانەدا مرۆڤ زیاتر سەرنجی بۆلای مۆعجیزەو روداوە تایبەتەکان رادەکێشێت و رنگە لەوساتە پر ترسانەشدا ئەوان چاوەڕێی بوون هەورەتریشقەیەك ئەو دێوە زلە لەپێ بخات و گیانیان رزگار بکات. کاتێك کار گەشتە ئێرە جارێکیتر بەیوریم وت:

چاوەڕێی چیت یان دەبێت رابکەین یان دەبێت ئەم ئاژەڵە بکوژین. ئەم رەش پێستە داماوانە تاوانیان چیە؟ یوری وەڵامی نەدامەوە، لەکاتی بیرکردنەوەدا وادەهاتە بەرچاو. چەند ساتێك بە بێدەنگی تێپەڕی و سەرئەنجام وەك بڵێی رێگە چارەیەکی عاقلأنەی دۆزیبێتەوە، بزەیەکی گرت و وتی:

نەخشەیەکم کێشاوە...... باوەڕی تۆ چیە......؟

پرسیم: چ بیرێك...... پلانی تۆ چیە؟

دوبارە وەڵامی نەدامەوە و لەجیاتی وەڵامدانەوە هەنگاوێك لەمن دوورکەوتەوەو بەدەنگی بەرز رویکردە پاسەوانە رەش پێستەکان کەلەترسا چاورێی مەرگیان دەکرد و وتی: ئەم ئاژەڵە ئێوە دوانەش وەك ئەوانیتر دەکوژێت بەڵام من بەم داردەستە سحریە خۆم دەتوانم رزگارتان بکەم.

ئەورانگوتان بە بیستنی دەنگی یوری روی بەرەولای ئێمە سوڕاند بەڵام یوری بەخێرایی جێگاکەی گۆڕی لەوێ دوورکەوتەوە و دوبارە لەگەڵ رەش پێستەکاندا دەستی بەقسەکردن کرد. چاوەکانیان دەبریسکایەوە و دیاربوو لەم پێشنیارە زیاد لەرادە شادمانن. یوری درێژەی دا بەمەرجێك بڵێن ئێمەتان لەمایلادا نەبینیوە و هیچ بەموناك نەڵێن بەداردەستەکەی خۆم ئەم ئاژەڵە دەکوژم.

رەش پێستەکان پێکەوە وتیان ئەم کارە دەکەین.... قسەناکەین. دڵنیابن.

یوری دوای بیستنی بەڵێن و دڵنیایی لەوەی هیچ شتێك بەموناك ناڵێن وەك ئاژەڵێکی دڕندە و خوێنخۆر پەلاماری ئەورانگوتانی داو میلی هێنایەوە ولەچەند هەنگاوی ئەو ئاژەڵەدا وەستا.

ئەورانگوتان کە بەهیچ جۆرێك چاوەڕوانی بینینی ئەو لەنزیکەوە نەبوو دەستی بردە پێش و زەربەیەکی بۆ سەری یوری نارد بەڵام یوری خۆی کێشایە دواوەو لەمەترسی وردبوون ڕزگاری بوو.

لەپشتەوە لەئەورانگوتان نزیك بوومەوە. سیلاحەکەم تەنیا ئەو قەمە تیژەبوو کەرەشەکان هاویشتبوویان.

یوری لولەی تفەنگەکەی ڕێك لەبەرانبەر سەری ئەورانگوتان گرت و تەقەی کرد. دڵنیابووم گولە لەو دێوەدا کاریگەر نابێت و گوولە وەك سوزنێك کەبەر دیوارێکی پۆڵایین بکەوێت ورد دەبێت بەڵام یوری لەکارەکەی خۆیدا کارامە بوو. شوێنێکی نیشانە گرت کەلەسەدا سەد سەرکەوتنی لەگەڵدابوو. گولەی یەکەم ڕاست لەچاوی ئەورانگوتان چەقی و لەپشتە سەری دەرچو و ئەوئاژەڵە گەورەی وەك کێوێك لەزەوی هەڵکەندو فرێیدا.

کوژرانی ئەورانگوتان لەجێگای خۆیدا بووەهۆی شادمانیم بەڵام شتێك زیاتر خۆشحاڵی دەکردم ئەوەبوو دەمبینی پاسەوانەکان لەبەر سەرسوڕمانی زۆر لەشوێنەکەیاندا وشك و هاوشێوەی دوپەیکەری ڕەشی بێدەنگ و کپ بوون.

گوومانیان نەدەکرد داردەستە جادویەکە ئەم هێزەی هەبێت و ئێستا کەبەچاوی خۆیان دەیانبینیی نەیاندەتوانی ڕێگە لەسەرسوڕمانی خۆیان ڕێگری بکەن.

هێشتا نەیاندەوێرا نزیك ببنەوە.

یوری وتی: لە تفەنگ دەترسن؟

بەڵام بە بۆچوونی من ئەوان لەجەستەی بێ گیانی ئەورانگوتان دەترسن. بەهەرحاڵ کاتێك دڵنیابووین مردوە خۆمان گەیاندە سەری و سەیرمان کرد.

بە بەراوردێکی ورد باڵای ئەو ئاژەڵە دوبەرانبەرو نیوی من و قامکەکانی دەستی بەم جیاوازیە کە ئەستوور و درێژتر بوون لەقامکی مرۆڤ دەچوون.

یوری پێش هەرشتێك ئاژەڵەکەی پشکنی و وتی:

مێچکەیەو مناڵیشی لەسکدایە.

بەدڵنیایەوە لەم ناوەدا ژمارەیەکی زۆر ئەورانگوتان دەژین و ئەگەر بزانن ئێمە یەکێکمان لەوان کوشتوە. نایەڵن ئاسوودە بین و تاتۆڵەی نەستێنن ناگەڕێنەوە، ئەورانگوتان بەپێچەوانەی گووریل زیاد لەرادە رقاوی و فێڵبازن. دەبێت ئاگاداری خۆمان بین. گوێم لەقسەکانی نەبوو و دەمویست پێستی سور ڕەنگی و جوانی

ئەورانگوتان دابماڵم و لەگەڵ خۆمدا بیبەم. ئەم بابەتەم لەگەڵ یوریدا باس کردو وتم:

ئەگەر ئەم پێستە لەگەڵ خۆمان بەرین بۆ ئەمریکا بەدڵنیایەوە بە دەهەزار دۆلار دەیفرۆشین ئەگەر بازرگانانی پێست لێمان نەکرن، چوونکە پێستی ئەورانگوتان سورە بەمۆزەخانە یان دەزگا زانستیەکان بەنرخێکی بەرز دەیفرۆشین.

یوری رەزامەندی نیشان داو وتی:

مانەوە لەم شوێنەدا زۆرمەترسیدارە جیاواز لەوەش داماڵینی پێستی ئەم ئاژەڵە لەتوانای ئێمە دا نیە و تەنیا رەش پێستەکان دەتوانن ئەم کارەبکەن.

یوری دەیویست پەشیمانم بکاتەوە بەڵام سوور بووم و پێمداگرت و سەرئەنجام تەسلیم بوو. دوو رەش پێستەکە هێشتا وەك پەیکەرێك لەبەرد لەوێدا وەستابوون، بانگی کردن.

ئەوان دەترسان نزیك ببنەوە بەڵام یوری ورەی پێدان و وتی:

مەترسن....... مردووە ...... وەرن

ئەوان هەنگاو بەهەنگاو وەك بیانەوێت لەداری ئیعدام نزیك ببنەوە، لێمان نزیك بوونەوە. یوری سەرەتا لەبارەی مەرجێك کە پێشنیاری کرد بوو قسەی کرد و وتی:

ئەگەر لەبارەی رووداوەکانی ئەمڕۆ لەگەڵ مووناکدا قسە بکەن و ئەو لەهاتنی ئێمە بۆ مایلا ئاگادا بکەنەوە لەهەر شوێنێکدا بن بەداردەستەکەی من دەکوژرێن.

ئەوان توانای قسەکردنیان لەدەست دابوو بۆئەوەی وەڵامیان دابێتەوە یەك لەوان سەری وەك پشتڕاسکردنەوە بۆ قسەکانی یوری تەکان دا.

دواتر یوری دەستوری پێدان پێستی ئەورانگوتان داماڵن و لاشەکەی داشارن. لەم بارەوە وتی:

ئەگەر لاشەکەی بەم شێوە لێرەدا بمێنێتەوە ئەورانگوتانەکانی تر تۆڵە دەستێننەوە و ئێوە دوکەس کە لەمایلا دان و لێوەیان نزیکن دەکوژرێن. باشترە پێستەکەی داماڵن و جەستەکەی لەژێر خۆڵدا وەشارن و کەمێك گژو گیاو دوکەڵ دروست بکەن تا بۆنی خوێنی ئەورانگوتان بە لووتی ئاژەڵەکانی تر نەگات. هەستی بۆنکردنی ئەم ئاژەڵە زیاد لەرادە بەهێزە. و لەبۆنی خوێنەوە هەست هەموو شتێك دەکات. پێستەکەی وشك بکەن و بیدەن بە لئۆنا. ئەو بۆمانی رادەگرێت. پاسەوانەکان بەئیشارەی سەرو دەست دڵنیایان کردەوەو بەڵێنیان پێدا دەستوورەکانی جێ بەجێ دەکەن.

بەم شێوە بەخەیاڵێکی ئاسوودەر بەرەو قەراغی رووبار، شوێنێك پێشتر بەلەمەکەمان

تیا حەشاردابوو بەڕێکەوتین.

لەوێوە تا شوێنی حەشاردانی بەلەمەکە زۆر دوورنەبوو بەڵام چوونکە ئیتر هەستمان بەمەترسی نەدەکرد و لەپاسەوانەکانی مایلا ئاسوودەبووین، ڕێگەکەمان بەگەڕان و سەیرکردن بڕی و لە سەر هەردیمەنێکی جوان چەند خولەکێك دەوەستاین و سەیرمان دەکرد.

نزیکەی کاتژمێرێك بەم شێوە تێپەڕی. گەشتبووینە نزیکی رووبارو ئەگەر لەبەرزاییەکانی روباڕو و دواتر لەدەربەندەکەی پشتی تێپەڕینایە، دەگەشتینە تاڤگەکانی رووبار و دوای ئەوەش بە بەستێنی رووبار.

لەم شێوەشدا تێپەڕین لە تەپۆڵکەی سەرسەوز و دەربەندەکەی پشتی شتێکی چاوەروان کراوبوو. لەسەر نوکی تەپۆڵکەکە بووین کە دەنگی بیستنی چەند دارێکمان لەخوارەوە بیست.

دەنگی شکانی دارکان لە شوێنێکەوە بوو ئێمە چەند خولەك پێشتر لێی تێپەڕیبووین. ئەویٚ نە لەبەرانبەر هەرەشەی بادابوو نەلافاو و ئاوی رووبار ، هەربۆیە بووە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە.

یوری وەستا. چاوە رەش ونیگا کاریگەرەکانی لەخوارەوە دەبڕی. پەرینی رەنگی نیشانی دا هەستی بەمەترسیەك کردوە بەڵام چوونکە عادەتی بوو پێش دڵنیایی قسە نەکات هیچم نەپرسی چوونکە دڵنیابووم وەڵامی راست ناداتەوە.

یەك دو خولەك تێپەڕی. دەنگەکان دووبارە بوونەوە و یوری بەخێرایی خۆی لەپشت دارێکی کۆندا داشاردو بەدەنگێك ترسی پێوە دیاربوو پێشنیاری کرد خۆم داشارم.

هێشتا لەهیچ حاڵی نەببووم بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆم لەپشت دارێك داشاردو لەگەڵ سەیرکردن، یوری تفەنگەکەی خستە سەر دەست و میلی هێنایەوە. تازە دەمم بۆ پرسیارکردن کردەوە کەلە خوارەوە و لەناو لق و گەڵای دارەچرەکان سێبەری سور رەنگم بینی و هەموو شتێکم بۆ دەرەکەوت.

دەستەیەك ئەورانگوتان لەرەگەزی هەمان ئاژەڵی کوژرا بەدوامانندا دەهاتن. وەك کەسێك دەستی لەوایەری کارەبا درابێت هەموو ئەندامەکانم کەوتە لەرزین. هەناسەم توند ببوو دڵم بەشێوەیەك لێیدەدا دەتوت دەیەوێت لەناو سینەم بێتەدەر.

بەم حاڵە و بەدەنگێکی لەرزان و گیراو وتم:

باهەڵێین...... بۆ وەستاویت....... ژمارەیان زۆرە.

پرسی: دەیانبینی.

وتم: تائێستا چواریانم بینیوە. رەنگە زۆرترین. زووکە

وتی: راکردن بێ ئەنجامە، ئەوان وازمان لێ ناهێنن. دەبێت بیر لەفێڵێك بکەینەوە.

وتم: چ فێڵێك.

بەخێرایی دەستی یوریم گرت و بەدوای خۆمدا کێشامە خوار. ئاژەڵەکان بەخێرایی دەهاتنە سەرو ئێمە بەخێرایی لەولای تری تەپۆڵکە دەڕۆشتینە خوار.

بەم بەراورد کردنە کاتێك ئێمە گەشتینە کۆتایی دەربەندەکەی لای تاڤگەکان، ئەوان لەبەرزاییدا بوون و بەجوانی ئێمەیان دەبینی.

ئەگەر چەند خولەکی تر لەپشت تەپۆڵکە درەنگیان بکردایە ئێمە خۆمان بە بەلەمەکە دەگەیاند و لە ئاومان دەدا بەڵام بەداخەوە درەنگ ببوو، ئەورانگوتانەکان دەنگی سەیرو سەمەرەیان لەخۆیان دەردەهێنا. دەتوت دەیانەوێت هەر لەوێوە هەڵماندرن و بمانخۆن.

بەیوریم وت: خێراکە لە بەلەمەکە زۆر دوورنین.

قسەکە لەدەممدا تەواونەبوو چوونکە لەم کاتەدا بارانی بەرد بارین دەستی پێکرد.

ئەو ئاژەڵانە بەردی گەورەو بچووکیان بۆ دەهاویشتین. بچوکترین بەردێك کەدەهاتە خوار بەئەندازەی شوتیەك بوو و ئەگەر یەکێك لەوبەردانە بەر سەری من یان یوری بکەوتایە چی دەبوو. بەخێرایی خۆمان خستە سەر زەوی و لەپشت گیاکان خۆمان داشارد و بەڵام خۆشاردنەوە سوودی نەبوو چوونکە ئەوان بەردیان بۆ هەرشوێنێك دەهاویشت و ئێمە لەهەرشوێنێکی بێ قەڵغاندا بوویانەیە لەبەردەم مەترسیدا بووین.

مەترسی سات بەسات زیاتر دەبوو. چەند دانە لە ئەوراگوتانەکان درێژەیان بە بەردباران داو ئەوانیتر سەرەو خوار بوونەوە تابمانگرن.

وێنەکردنی ئەم دیمەنە ترس ئەنگێزە بۆ ئێوە کە لە شوێنێکی گەرم و نەرمدا دانیشتوون و بەخوێندنەوەی ئەم دێڕانە سەرقاڵن بەدڵنیاییەوە زۆر ترسی نیە. بەدڵنیاییەوە هەرچەندە توانای بیرکردن و وێنەکردنی بەهێزتان هەبێت ناتوانن بزانن من و یوری لەوکاتەدا چ حاڵێکمان بووە و چ خولەك و کاتژمێرێکمان بردەسەر.

بوگزەرێین. لەو بارودۆخە ترسناکە دا کەسات بەسات ئەورانگوتانەکان لێمان نزیك دەبوونەوە لەناکاو یوری وتی:

ئێمە چەند ئەحمەقین.... بۆ لێرەدا خەوتووین.... چاوەڕێی چین. سەری خۆم بردە دواوەو بەردێکی دەکیلۆیی کەبەرەو سەرم دەهات کەوتە سەر زەوی و بەخێرایی پرسیم

بۆ کوێ بڕۆین، چی بکەین. یوریش بەنۆرەی خۆی چەندین بەردی لەخۆی دوور کردەوە. وتی: ئێرە شوێنێکی مەترسیدارە هەرچی بەردبهاون چ جوان نیشانەیان گرتبێت چ خراپ راستەوخۆ بەرەو ئێمە دێت. دەبێت شوێنەکەمان بگۆڕین و بەشێوەیەکی کاتی خۆمان لەم مەترسی دوورکەینەوە.

سەیرێکی سەروخوارم کرد. چەندە ئەورانگۆتانێك بەرەو لامان دەهاتن. بەردەگەورەکانی سەرە رێگایان هەڵدەکەندو دەیانهاویشت.

یوری وتی: دەبینی ئەوان دڵنیابوون ئێمە راناکەین و تەسلیم بووین، کەمێك هێواشتر دێن. دەبێت لەم دەرفەتە کەڵك وەربگرین.

من کە لەئارەقا خوساو لەترسا دەلەرزیم بەبێ هیوایی وتم:

دەبێت چی بکەین......؟ زوو بیڵێ گەشتن...... رزگارم کە.....

یوری لەهەمان کاتدا کەخوێنساردی خۆی دەپاراست و چەندین جار ئەم خوێنساردییەی ئێمەی لەمردن رزگار کردبوو، لەوکاتەشدا وای نیشاندەدا ئارامە و یان لەراستیدا نەدەترسا. لەوەڵامدا وتی:

دەبێت لەولای تری دەربەندەکە بڕۆینە سەر. ئەم ئاژەڵانە قورسن و ئێمە سووك. بەهەمان ئەندازە کە لەهاتنە خوارەوە چالاکن لەسەرکەوتن لاواز و سستن بەڵام ئێمە کە کەمێك حەساوینەوە باشتر رادەکەین.

بەخێرایی قسەکەییم پچراند و وتم: بێ سوودە. ئەم کارە زۆر منالآنەیە.

یوری بەتووڕەیی و توندی کەم وێنە لە شوێنەکەی خۆی تانیوە هەستاو وتی:

سپی پێستەکان هەمیشە ترسنۆکن. ئێستا کاتی ئەم قسانە نیە دەبێت خێرا راکەین. عاقڵانە نیە دانیشین و خۆمان بەدەست ئەم دێوە بێ شاخ و کلکانە بسپێرین.

ئەگەر بڕیارە بمرین دەبێت پیاوانە بمرین نەوەك پیرێژن بێ بەرگری تەسلیم بین.

ئەمەی وت و بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام یان بۆچوونی من بێت لەولاتر رۆشتە سەر. سەرولێژیەکی توندو مەترسیداربوو. کەمتر شوێنی پێ دەست دەکەوت بەڵام یوری وەك مریشك هەڵدەگرا و هەندێ کات ریشە گیایەکی دەگرت و هەناسەی دەکێشاو دەستی بەڕۆشتن دەکردەوە.

یوری رۆشتە سەرو ئەورانگوتانەکانیش دەهاتنە خوار. کاتێك یوری رایکرد ئەوان خێرایی خۆیان زیاد کردو ئەو سیانەش کەبەردیان دەهاویشت سەرو خوار بوونەوە تا پەیوەستی ئەوانیتر بن.

ئێستا منیش کاری خۆمم دەزانی و لەبەرئەوەی بەردباران نەما بەخێرایی لەشوێنەکەم هەستام و بەرێگای یوریدا رۆشتم. هەڵبەت ئەم رێگا زیاد لەرادە دژوار و منی هیلاك کرد. بەڵام چوونکە مەرگ چەند مەترێك لەپشت سەرمەوە بوو، لێی رام دەکرد و رۆشتمە سەر، ئێستا خێرایی من لە یوری زیاتر و سات بەسات لێی نزیك دەبوومەوە. تاچەند خولەك دەرفەتی ئەوەم نەبوو سەیری دواوە بکەم چوونکە وامزانی ئەو یەك دو چرکە چەندین مەتر دەمخاتە دواوەو ئورانگوتانەکان نزیك دەکاتەوە. گەشتبوومە نیوەی سەرولێژییەکە و لەیوری زۆر نزیك ببوومەوە کەوەستام. من بۆ تازەکردنەوەی هەناسە و چەند هەناسەیەکی قووڵ ئاورم دایەوە و سەیری خوارەوەم کرد. پێش ئەوەی چاوە خوڵاویە هیلاکەکانم دواوە ببینێت چەند دەنگێکی سەیرم بیست.

دەزانن ئەو دەنگانە لەدەنگی چی دەچوو. قەت دەنگی گای سەربراوتان بیستووە؟ ئەگەر گامێشێکی گەورەی بەهێز سەر ببرن و بەجێ بێڵن، ئەو داماوە قوربانیکراوە چۆن هەناسە دەکێشێت و دەمرخێنێت......؟

دەنگێك کە بیستم هاوشێوەی ئەو دەنگە بوو، پشتمی لەرزاند چوونکە هەستم کرد مەترسیەکی گەورە بەدوامەوەیە لەبەرئەوەی دەرفەتی بیرکردنەوەی زۆر نەبوو بەخێرایی ئاورم دایەوە و دەست بەجێ قیژاندم و رۆشتمە سەر. دەزانن چیم بینی.....؟

یەکێك لەئەورانگوتانەکان. لەدرهەنگاوی لەپشتەسەرم دابوو و بەهەناسە برکێ وەك دێوێك دەهاتە سەر. رەنگە ئەگەر دەستی درێژکردایە بیتوانیایە بمگرێت. بەڵام بەخۆشحاڵیەوە ئەم کارەی نەکرد. قیژەکەی من سەرنجی یوری راکێشا و بەخێرایی گەڕایەوە و تفەنگەکەی خستە سەر دەست. ناتوانم باسی بکەم یوری بەچ خێرایەك تەقەی کرد. خێرایی کارەکەی سەیر و نەشیاو بۆ باوەڕپێکردنە. تەنیا دەنگی گولەم بیست و دواتر هەستم کرد کێوێك لەپشت سەرم هەڵکەندراو کەوتە سەرزەوی. کاتێك ئاورم دایەوە بینیم گولەکە لەکەلەکەی چەپی ئاژەڵەکە رۆشتۆتە ناو. دەست بەجێ دڵی کون کردوە و کوشتویەتی. ئەورانگوتان لەپشت سەری من کەوت و مرد بەڵام یەکیتر هاتە سەر. ئەویش بە پێنج مەتر دووری لەپشتە سەری من بوو. نەرەیەکی مەترسیداری کردو بەچەند هەنگاوی بەرز خۆی بەمن گەیاند و بەری دەستە پان و درێژەکەی خۆی بۆ گرتنی من درێژ کرد. رەنگە پێش گەشتنی ئەو دەمتوانی چەند مەترێك دوورکەومەوە بەڵام توانای راکردنم لێ سەندرابوو و وەك جۆلەکەیەك لەلایەن مارەوە گەمارۆدرابێت لە

شوێنەکەمدا مامەوە.... دەستی ئاژەڵ نزیك بوو ملم بگرێت کەتەکانێکم بەخۆمدا و بەقەمە تیژەکەی خۆم چەند جارێك کێشام بەدەستیدا و خۆم کێشایە دواوە.

دەستی بریندار ببوو. خوێن فیچقەی دەکرد. وەك منالێك کە زەردەواڵە پێوی دابێت دەستی بردە ناو دەمی و خوێنەکەی لستەوە و دوبارە هێرشی هێنا. لەم ماوەکورتەدا دەرفەتم دەست کەوت و چەند مەترێك ڕۆشتمە سەرە. یوریش بۆ یارمەتیدانم هاتە خوار. بەخۆشحاڵیەوە دارێکی کۆن وەك پشتێون لەسەر تەپۆڵکەکە بوو. ئێمە هەردوکمان خۆمان گەیاندە پشت دارەکە و خۆمان خستە پشت گیاکان. لقێکی گەورەی دارەکە بەپەل و پۆکانی خۆی لەسەر سەری من خواربببوویەوە و ئەم پەلە ببووە هیوای من چوونکە بالآی ڕێگەی پێ نەدەدا بچەمێتەوە و لەژێریەوە تێپەڕین. لەم کاتەدا شتێك لەناکاو وەك کێو بەر ڕوخسارم کەوت و دنیای لەبەرچاو لێڵ کردم. زەربەی ئەو شتە کەنەرم و لووس بوو ئەوەندە توندبوو چاوێکم نزیك بوو بێتەدەر. بەقیژاندن چاوی خۆمم گرت و ڕۆشتمە دواوە. لەهەمان کاتدا هەستم کرد تفەنگەکە لەدەستم دەرچوو. گوومانم کرد ئەورانگوتان سیلاحەکەی لێگرتم. بەدژواری چاوەکانم کردەوە. تێگەشتم یوری ئەم کارەی کردوە خۆی خستۆتە سەر ڕێگای من ! بۆ یوری تەقەی نەکرد؟ تەپ و تۆز هەستا بوو و ئەورانگوتان بەدەوری خۆیدا دەسورا.

شتێکی درێژی دەیسورانەوە و دەیکێشا بەدارو بەردا.

ورد بوومەوە و بەوپەڕی سەرسوڕمان بینیم مارێکی بووئای گەورە بەدرێژایی دەمەتر کە لەسکیەوە نیو مەتر دەبوو، پەلاماری ئەورانگوتانی داوە و ئەو دو ئاژەڵە پێکەوە شەڕ دەکەن. مارەکەش خۆی بەمندا کێشابوو. بەشادمانیەوە نەیتوانیبوو بمگەزێت یان بریندارم بکات.

ماری بووئا ترسی گەستنی نیە و یان ئەگەر هەیبێت زۆر کەمە. لەناو هۆزە وەحشیەکاندا ئەوانەی لەناو جەنگەڵدا دەژین ڕەنگە کەس نەبێت گەستن و پێوەدانی ماری بووئای بینیبێت. ئەم مارە گەورەو ترسناکە کەسەری بچووك و چاوی وردو درەوشاوەی هەیە زیاتر بەهێزە تایبەتەیەکەی خۆی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەخنکێنێت و دواتر بەئاسانی قووتی دەدات.

مرۆڤێك بەئاسانی لەناو سکی ئەم ئاژەڵەدا جێگەی دەبێتەوە و دواتر هەرس دەکرێت و تەنانەت ئێسکەکانیشی نامێنێتەوە.

لەوکاتەدا چاوم بەماری بووئا کەوت هەستم کرد چ مەترسیەکی گەورەم پشت

سەرناوە. نزیك بوو لەشادمانیدا بگریم و دەست بەسەما کردن بکەم بەڵام لەویٚ لەو بارودۆخەدا بۆ ئەوکارانە گونجاو نەبوو. هەرسات ئەگەری ئەوە هەبوو یەکێك لەو دوانە بەسەر ئەویتردا زاڵ بێت وبێتە سەروەختی ئێمە.

ئۆرانگوتان لەشەڕ لەگەڵ بووئا توانایەکی سەیری بوو. بەخێرایی دەسوراو مارەکەشی دەەسوراند و لەم ناوە دا جاروبار سەرو سکی دەکێشا بەدارو بەردا و هەوڵی دەدا دەرفەتی چالاکی بەو مارە نەدات بەڵام ئەویش لەکارەکەی خۆیدا بەتوانابوو و باش دەیزانی چی دەکات.

بۆ ئێمە سەیرکردنی ئەم دیمەنە ترس ئەنگێزە لەهەمان کاتدا سەرنج راکێش بوو چوونکە نەماندەزانی بەچی کۆتایی پێدێت، پشتمان دەلەرزی و بەوپەڕی سەرسوڕمان سەیر یەکمان دەکرد. بەیوریم وت لەم دەرفەتە کەڵك وەرگرە و ئەورانگوتان بە گوولە بپێکە. ئەگەر مارەکە بکوژێت ئەورانگوتان بەدواماندا دێت و دەمانکوژێت.

یوری وتی: ئەم کارە باش نیە چوونکە ماری بووئا رەحم و بەزەیی ناناسێت. کاتێك رکەبەرەکەی لەپێ خست تازە بۆ تێرکردنی سکی بەدوای ئێمەدا دێت.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: مەگەر مار دەتوانێت وەك ئاژەڵەکانیتر بەدواماندا بێت.

وتی: ترسی مار لەئاژەڵە وەحشیەکان زیاترە و بەهەمان ئەندازە خێراتر دەتوانێت نێچیرکەی بگرێت و لەپێی بخات. ئەم مارە هەرجارە قەف دەخوات و دواتر وەك ئیسپرنگێك کە کرابێتەوە لە شوێنەکەی دەپەرێت و دەیان مەتر لەولاتر دەکەوێت و لەم شێوەشدا دەبێت بزانین چەند بەئاسانی خۆی بەئێمە دەگەیەنێت.

کاتێك ئێمە سەرقاڵی ئەم وتوێژانە بووین لەناکاو دەنگێکی مەترسیدار بیسترا. دەنگی ئەورانگوتان بوو. کۆتاییمان بە قسە هێنا و سەیری دیمەنی شەڕەکەمان کرد.

ئێستا ئەورانگوتان نەدەسورایەوە. رەنگە توانای قڕاندنیشی نەبوو. دیمەنێکی سەیر بوو کەوەسف کردن و باس کردنی بەپێنوس و لەسەر کاغەز ئەگەری نیە و تاکەسێك نەیبینێت ناتوانێت بەجوانی لەزەینیدا وێنەی بکات.

مار لە دەرفەتێکی کەم کەڵکی وەرگرت و کلکی لەدارەکە گیر کردبوو. هێزی ئەورانگوتان ئەوەندە زۆرە دتوانێت بەزەربەیەکی دەست دارێکی چەندین ساڵە هەڵبکەنێت و بیشکێنێت بەڵام لەم کاتەدا لەهەڵکەندنی مارەکە ناتەوان دەهاتە بەرچاو.

مارەکە کەم کەم خۆی کورت دەکردەوە و لەدارەکە دەئالا. ئەورانگوتان بەپێی غەریزەی سروشتی خۆی دەیزانی ئەگەر سەری مارەکە بەر بدات لەچاو تروکانێکا

دەمرێت و دەبێتە پاروی ماری بووئا بۆیە تا ئەو شوێنەی هێزی بوو خۆراگری دەكرد.

مار لەم لاوە دەكێشرا و ئەورانگوتان لەولای تر. ئەم تاقی كردنەوەی هێزە ئەوەندە درێژەی كێشا كە سەرئەنجام توانای ئەورانگوتان تەواو و دەستەكانی سست بوون.

لەم كاتەدا مار لەناكاو كلكی خۆی كردەوە و بەكلكی زەربەیەكی وای لەسەر ئەورانگوتان دا ئەو ئاژەڵە بەو جەستە قورسەوە لەزەوی هەڵكەندراو نزیكەی هەشت مەتر ئەولاتر كەوتە سەر زەوی.

سەری مارەكەی بەر دابوو بەڵام دەرفەتی ئەوەی دەست نەكەوت لەشوێنەكەی هەستێت و خۆی بۆ بەرگری یان راكردن ئامادە بكات چوونكە مارەكە وەك یوری وتبووی قەفی خوارد و دووری خۆی لەگەڵ نێچیرەكەی بە پەرینێك بری و خۆی لە دەوری ئەورانگوتان ئاڵاند.

دەنگی هاواری یەكەم سەرنجی راكێشاین. بەهۆی بەركەوتنی زەربەی یەكەم ئەورانگوتان دواتر نەیتوانی بقیژێنێت چوونكە مار خۆی لەدەوری ئاڵاندو ئەوەندەی زەخت لێكرد تا ئێسقانەكانی شكا. باوەربكەن دەنگی وردبوونی ئێسقانەكانیمان بیست و بینیمان چۆن لەناوچوو.

ئەورانگوتان گیانی داو مار بەبێ درەنگ سەرنجی بۆلای ئێمە راكێشرا و خۆی بۆ ئەم لا هەڵدا. ئەم كارەی ئەوەندە بەخێرایی ئەنجام دا ئەگەر یوری بەرگری نەدەكرد كارمان تەواو و ئێمەیش چارەنوسی ئەورانگوتانمان پێدەبرا جگەلەوەی لەناوسكی دا جێگەمان دەگرت.

یوری وەك دێوێكی وەحشەتناك و ئاژەڵێكی درندە تفەنگەكەی فرداو قەمە تیژەكەی لەدەست من سەندو رۆشتە پێش.

پەرینی یوری بووە هۆی بزاندنی مار و مار دوبارە قەفی خواردو ئامادەی پەلامار بوو، یوریش قاچەكانی بەدووری نیو مەتر كردەوەو قەمەكەی لەدەستی دەجووڵاند.

لەترسا دەلەرزیم و نەمدەزانی چی بكەم. شەڕ لەگەڵ ماری بووئا گاڵتە نەبوو و من نەوەد نۆ لەسەد دڵنیابووم یوری لەم شەڕەدا دەدۆڕێت و دەكوژرێت. ئەم گوومانە دەیترساندم و دەیلەرزاندم. لەئارەقدا خووسابووم و لەترسا وزەی لەسەر یەك نانی پێڵوەكانیشم نەبوو.

مار قەفی خوارد. سەری هێنایە پێش و بەیەك جووڵە پەر.ی من كێشرانی مارم لەسەر هەوا بینی و دواتر هەستم كرد یوری بەخێرایی جێگاكەی گۆڕی و ئیتر نەمزانی

چی بوو.

چوونکە لەترسی ئەوەی نەوەك کلك یان سەری مارم بەرکەویت رۆشتمە دواوە.

شەرێکی قورس لەنێوان یوری و بۆئا دەستی پێکردو یوری چەند برینێکی لە جەستەی مارەکە دروست کردبوو. چەند شوێنێکی هەڵدریبوو. لە شوێنە هەڵدراوەکان گۆشتێکی سپی رەنگ بێزارکەر دەرکەوت. لای خۆم بەراوردم کرد ئەگەر یوری زەربەیەکی بەهێز لەسەری مارەکە بدات کاری تەواوە و مارەکە دەکوژرێت.

مار لەگەڵ ئەو برینانەی هەڵیگرتبوو لەپەلاماردان وازی نەدەهێنا و کێشان کێشان بۆ لای یوری دەپەڕی و بۆئەوەی لەکارەکەی خۆی دڵنیابێت کلکی بەدارەکەوە بەستبوو پەلاماری دەدا. یوری ئێستا دەرفەتی باشتری بۆ هێرش کردن بوو ولەگەڵ ئەوەی ئارەق لەسەر و روخساری دەباری نزیکەی کاتژمێرێك شەڕ لەنێوانیاندا درێژەی بوو تا ئەوەی یوری قاقایەکی بەرزی کێشا و قەمەکەی فرێدا.

ئەمە پێکەنینی سەرکەوتن بوو کەلەو شوێنە بێدەنگەدا دەنگی دەدایەوە و نەمانی ترسی رادەگەیاند. هەستم بەوەکرد مار هێشتا لەدارەکەوە ئالاوە و تەکان دەخوات بۆیە سەرم سورما پرسیم: چی بوو......؟ چیت کرد؟

یوری بە بەری دەستی ئارەقی ناوچاوی سری و وتی:

سەرم بری...... سەیری کە.

سەری مار لەچەند هەنگاویدا لەسەر زەوی کەوتبوو هێشتا هەڵبەزو دابەزی دەکرد. زمانە درێژو ترس ئەنگێزەکەشی هەندێك جار دەردەکێشاو و دەیبردە ناو.

جەستەی بێ سەری لەدارەکەوە ئالابوو و دەکرایەوە. نیشانی دەدا هێشتا گیانی نەسپاردوە. یوری بێ ئەندازە هیلاك ببوو لای دارێك دانیشت و وپاڵی پێوەدا و چاوەکانی بەست

پرسیم: بۆ دانیشتوی زووکە بابڕۆین.

وتی: بووەستە. یەکەم زۆر ماندووم. دووەم برسیمە و سێیەم دەبێت پێستی ئەو مارە داماڵم تا ئەگەر زیندوو گەڕامەوە بۆ دنیای پێش کەوتو بۆ هاوسەری داهاتووم جانتاو پێڵاوی لێ دروست بکەم. منیش دانیشتم. کەمێك لەبارەی پێستی مار قسەمان کرد تا هیلاکیمان نەما بەڵام لەوێ هیچ شتێك بۆ خواردن گیر نەدەکەوت و بەناچاری بەسکی برسی و بەرەو ناو جەنگەڵ و قەراغ رووبار بەڕێکەوتین. لەبەرئەوەی برسی بووین نەمادەتوانی بەخێرایی بڕۆین بەڵام چارەیەك نەبوو و دەبووا خێرایی

هەنگاوەکانمان زیاد بکەین و ئەم کارەشمان کرد و بەسکی برسی و جەستەیەکی ماندو و رۆحێکی پەرێشان بەخێرایی بەرەو قەراغ رووبار رۆشتینە پێش تا ئەوەی گەشتین. بەلەمەکەمان لەناو گیاو قامیشەکاندا دۆزییەوە. هەندێ کات یوری سەوڵی لێدەداو هەندێ کات من بەڵام شتێك کە ئێمەی زیاتر هیلاك دەکرد ئەوە بوو ناچار بووین بەپێچەوانەی رەوتی ئاو سەوڵ لێبدەین و بڕۆینە سەر.

بەهەر شێوەیەك بوو ئەم کارەشمان کرد و گەشتینە ئەو شوێنەی سەرەتا لەوێوە بەرێکەوتبووین ئەو شەوە لە جەنگەڵدا ماینەوە و بەیانی رۆژی دواتر بەرەو هۆز بەرێکەوتین. لەوێوە یەك یەکی دانیشتوانی هۆزی ژنان دەبینران و ئەوان چوونکە ئێمەیان دەناسی لەوەی ئێمە یان بەو بارودۆخە پەرێشانە دەبینی سەریان سورما بوو.

لە نزیکی هۆز یەکێك لەژنان کە هاورێی لئۆنا بوو خۆی بەئێمە گەیاندو بەهێواشی وتی: مووناك بەدواتانا دەگەرێت و زۆر تووڕەیە.

رەنگ لەروخسارم پەری و بەناڕەحەتی پرسیم: بۆ........؟ ئێستا لەکوێیە؟

وتی نازانم بەڵام ئێستا لە پەرستگایە و سەرقاڵی دۆعاکردنە. جاری پێشوش کاتێك دەیویست یەکێك لە مێردەکانی خۆی بکوژێت رۆشتە پەرستگاو سەمای کردو و دۆعای کرد.

گوومان دەکەم مەترسیەك هەرەشەتان لێدەکات

لەگەڵ بیستنی ئەم رستە لەئارەقدا خوسام. لەراستیدا دەبێت بڵێم لەماوەدا ئێمە ژیانمان نەدەکرد بەڵکو بۆمان برابوویەوە کە کۆمەڵێك رووداوی خوێنین پشت سەر بنێیین.

هەرچی پێش دەهات ئازاردەر بوو. سەرەتا کاتی سەفەر لەگەڵ چێژبینینی دیمەنە جوانەکان و خۆشگوزەرانی هاورێ بوو بەڵام لەکاتێکەوە روبەڕوی مووناك ببووینەوە و ئەو عاشقی من بوو، بارودۆخی ژیانمان گۆرا و شیرینی لە چێژو ئارامی لەژیانمان برا تاشوێنێك حسێبی تێپەرینی کات و سات و بەسەر چوونی شەو ورۆژمان لەدەست دا و ببووینە ئاژەڵێکی جەنگەڵی.

حسێبێکی ترم دەکرد بەڵام مووناك حسێبێکی تر. ئەو سەرۆکی ژنانی ئامازۆن بوو. تێنەدەگەیی من گەشتیارێکم و نابێت وەك غولامی هۆز و نۆکەرەکانی هەڵس و کەوتم لەگەڵ بکات بەڵام نەمدەوێرا ئەم بابەتەی لەگەڵدا باس بکەم و بڕیاری لەسەر بگرم.

رەنگە بتوانن گوومان بکەن خواستەکانی ئێمە دوانە چەندە جیاوازبوو تا چ رادەیەك

لە ژیاندا دەمانتوانی بەئاواتەکانی خۆمان بگەین. جیاوازیەکی تر لەنێوان من و مووناکدا بوو. ئەو دەیتوانی بەئاسانی هەر بڕیارێك لەبارەی منەوە بگرێت و بەهەرشێوەیەك بیەوێت سزام بدات. بەڵام من توانای هەناسە کێشانم نەبوو و تەنانەت خاوەن ئیرادە و دەسەڵاتی خۆم نەبووم چ بگات ئەو بخەمە سەر ڕێگەو حەزەکانی خۆم.

بەهەرحاڵ ئەو ساتەی لەگەڵ ئەوژنەدا لەجەنگەڵ ڕوبەڕو بوومەوە و ئەم هەواڵە پڕ ئازارەم لەزمانی بیست، کار لەم قسانە گوزەرا بوو ئیتر دەرفەتی چاك کردنەوەی وێرانیەکان نەمابوو.

ژنی ئاماژە پێدراو ئەمەی وت و بەخێرایی لەناو دارەکانی جەنگەڵ ون بوو و ڕۆشت. من و یوری تا چارەکە کاتژمێرێك بێدەنگ لە شوێنی خۆماندا وەستابووین و زمانی قسەکردنمان نەبوو. لە نێوان ئێمەدا نیگا ئاڵ وگۆڕ دەکرا و بەم نیگایانە خراپی بارودۆخمان لەیەکتر دەگەیاند.

بێدەنگی درێژەی بوو تائەوەی یوری وەك هەمیشە هەنگاوی یەکەمی هەڵگرت و بازوومی گرت و بە دەنگێك کە هێزی ڕۆح و ورەی دڵی نیشان دەدا وتی:

بێهۆ دەترسیت، ڕەنگە دۆعا کردنی ئەو لە پەرستگا هۆکارێکی تری هەبێت و پەیوەندی ڕۆشتن بە مایلاوە نەبێت.

ئاوی دەمم قوتدا و وتم:

دڵنیام بەرانبەر بە ئێمە بڕیارێکی مەترسیداری گرتووە و لە دیداری من لەگەڵ لئۆنا ئاگادار بۆتەوە. یوری هەوڵی دەدا لەم گوومانە دوورم کاتەوە بەڵام ئەگەری نەبوو من لەسەر باوەڕەکەم سوربووم و لەمبارەوە وتم:

هەرچی بێت ورەی ڕۆشتنە ناو هۆزم نیە. تەنانەت توانای ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ مووناك لە خۆمدا نابینم. بێهۆ هەوڵ دەدەیت و من لێرەوە بەرەو قەراغی جەنگەڵی باران دەڕۆم و لەسنوری دەسەڵاتی مووناك دەڕۆمە دەر.

یوری قاقا پێکەنی و وتی:

نیگەران مەبە، دڵم روونە و پێم دەڵێت کە مووناك هێشتا تۆی خۆش دەوێت.

وتوێژی من و یوری نزیکەی کاتژمێرێکی خایاند و لەئەنجامدا نەیتوانی من بۆ ڕۆشتن بۆ هۆز ڕازی بکات و ناچار تەسلیمی بۆچوونی من بوو و بڕیارماندا لە چاوەڕوانی ڕوداوەکانی داهاتوو لەناو جەنگەڵدا بمێنینەوە.

زۆر باشە..... مانەوە لەجەنگەڵ بڕیاری لەسەر درا. بەڵام نەمانزانی لەکوێ بژین

کەبتوانین هەم بینەری باروردۆخ بین و هەم لەزیانیش بەدوور بین.

جەنگەڵ مەرز و سنوری بۆ نەبوو و ئەگەر وابووایە دەمانتوانی لەسنووری دەسەڵاتی مووناك بڕۆینەدەر و بچینە شوێنێکی تر.

لەوێ مووناك بەیارمەتی ئەو پیاوە بەهێزانەی لەبەردەستیا بوو، ئەیتوانی هەموو کارێك بکات و دۆزینەوەی ئێمە لە جەنگەڵی چڕدا کارێکی ئاسان بوو چوونکە ئەو بۆ هەموو شوێنێك دەڕۆشت و کاری کردو لەهەرشوێنێك ئیرادەی دەکرد هەنگاوی هەڵدەگرت. تەنانەت بۆ کوشتنی من ئەوەندەی دەسەڵات بوو هەموو جەنگەڵ بسوتێنێت تا من لەناو کڵپەکانی ئاگردا گرفتاربم و بسوتێم و ببمە خۆڵەمێش.

مووناکم باشتر لەهەر کەسێکی تر دەناسی. ئەو ژنێکی جوان بوو وەك هەموو ژنەجوانەکانی دنیا دڵێکی ڕەق، ڕۆحێکی تاریك و سەرشێتێکی حەسوودی لەخۆرازی بوو.

لەرەحم و بەزەیی هیچ تێنەدەگەشت و ویژدانی نەدەناسی و رەنگە دڵرەقترین ژنی دنیا دەژمێردرا.

ئەوەندە ڕقاوی بوو ئەگەر هەزار ساڵیش تێپەڕیایە منی لەبیر نەدەکرد و تاگیرۆدەی نەدەکردم و لەناوی نەدەبردم ئارامی نەدەگرت.

بەم بڕیارە لەو ڕێگاوە لێی هاتبووین گەڕاینەوە.

لەڕێگادا بیرم دەکردەوەو بەپێچەوانەی جارەکانیتر هەستێکی ترم بوو. دەتوت دەستێکی بەهێز دڵم لەناو پەنجەکانیدا دەگوشێت و چنگی لێ دەگرێت.

یوری چەند هۆکارەکەی پرسی و سەرئەنجام وتی:

گوومانم نەدەکرد ئەوەندە ترسنۆك بیت.

لەوەڵامی ئەم قسە ناچار پەردەم لەسەر بێدەنگی و ئەندێشەی خۆم هەڵماڵی و وتم:

نیگەرانی مناڵەکەم.

یوری دەتوت لەهەموو شتێك بێ ئاگایە وتی:

کامە مناڵ.....؟ باسی کێ دەکەیت؟

مناڵی من و مووناك... کچێکی جوان و نازدارە دەترسم مووناك بیکوژێت!

ئەو مناڵەی یاری لەگەڵ دەکردم... بەسەر ملمدا هەڵدەگەرا و بەرووومدا پێدەکەنی مناڵێکی شیرینە و دەترسم مووناك کاتێك لەدۆزینەوەی من بێ هیوابێت ئەو بکوژێت تادڵی ئارام بگرێت.

یوری بەسەرسوڕمانەوە وتی:

چۆن شتی وا ئەگەری هەیە....؟ بەهەمان ئەندازە کەباوك منالّەکەی خۆی خۆش دەوێت دایکیش منالّەکەی خۆش دەوێت. رەنگە حەزو خۆشەویستی دایك بۆ منالّەکەی زیاتر لەباوکی بێت. لەم شێوەدا مووناك چۆن رازی دەبێت جگەرگۆشەکەی خۆی بۆ گرتنی تۆڵەیەکی وەهماوی بکوژێت.

لەکاتی ئەم وتوێژانەدا لەجادەکانی باریکی جەنگەڵ لەناودارەکان رۆشتینە پێش و بەبێ ئەوەی بزانین بۆ کوێ دەرۆین.

لەناکاو دەنگی پێمان لەپشت سەری خۆمان بیست. لەترسا نزیك بوو دڵم لەلێدان بکەوێت. دەتوت کەسێك بەدواماندا رادەکات و بەهۆی ڕاکردن دەنگی قاچی کە لەسەر گیا وشکەکاندا دەروات بەگوێ دەگات. دەستی یوریم گرت و وەستاین. یوری کە دەنگەکەی نەبیستبوو بەناڕەحەتی بەقسەی کردم. دەیویست خۆشی دەنگەکە ببیستێت.

شادمانیمان لەوەبوو دەنگەکە هی یەك کەس و نیشانی دەدا تەنیا یەك کەس یان دوکەس بەدوامانەوەیە و خۆراگری لەبەرانبەر دو کەس زۆر دژوار نەبوو، بەهەرحاڵ لەپشت دارەکان خۆمانشاردەوە و چاومان لەو رێگەی دەنگەکەی لێ دەهات، بڕی.

یەك دو خولەکیتر سێبەرێك دەرکەوت و دواتر ژنە ئامازۆنیەکە لەجەنگەڵدا چاومان پێی کەوتبوو پەیابوو.....

وەستاین. دەمانویست دڵنیابین لەوەی تەنیایە. کاتێك دڵنیایی بەدەست هات لەپشت دارەکان هاتینەدەر و چووینە سەر رێگاکەی چوونکە بەبینینی زانیمان بەدوای ئێمەدا هاتووەو کارێکی گرنگی هەیە.

ژنی داماو گەنج و جوانیش بوو. هەناسکە هەناسکی پێکەوتبوو و رایدەکرد و لەکاتی رۆشتن چاوی لەزەوی و شوێن پێکانی ئێمە کە لەسەر زەوی نمدار دەمایەوە، هەڵدەگرت. کاتێك چاوی بەمن کەوت شادمان بوو و خێرایی خۆی زیاد کرد تاگەشتە بەرانبەرمان و وەستا. بەهۆی راکردن ئەوژنە هیلاك و توانای وەستانی نەبوو. بەهەست کردن بەم خاڵە ژێر باڵیم گرت و لەژێر دارێکدا دامناو لای دانیشتم.

کاتێك ئارام و حەسایەوە، بەترس و لەرزەوە وتی:

خێرا، راکەن.... مووناك زۆر تووڕەیە. من رۆشتمە هۆز و بەروداوەکەم زانی و بۆئەوەی ئێوە ئاگادار بکەمەوە. خۆم خستە مەترسیەوە و تائێرە هاتووم.

پرسیم:

ڕووداو چیە........؟ چی بوو.......؟ گووناحی ئێمە چیە و بۆ تووڕەبووە؟

بەسەرسوڕمانەوە سەیری کردم و وتی: یانی ئێوە نازانن چی بووە؟

من و یوری سەیری یەکترمان کرد و وتم:

نا نازانم چ گووناحێکم کردووە. یوری کەهەر بێ تاوانە و پەیوەندی بەمووناکەوە نیە باش بوو دەمزانی کە ئەو قسەکەی بری و وتی:

یەک لەپاسەوانەکانی مایلا کە زیندوو رزگاری بووە بەمەلە لە روبار تێپەڕیوە و خۆی گەیاندۆتە هۆز و هەموو شتێکی بۆ مووناک باس کردووە. ئەو وتوویەتی ئێوە سەردانی لئۆناتان کردوە و شەوتان لای ئەو بەسەر بردوە. مووناک دوای بیستنی ئەم هەواڵە ڕۆشتە پەرستگا و سوێندی خوارد ئێوە بکوژێت.

لێم پرسی: ئایا هیچ مەترسیەک هەرەشە لەکچەکەم دەکات؟

نا، چوونکە مووناک منالی تری نیە و ئەمە دەبێت جێگری بێت و لەبەرئەمە لەکوشتنی چاو دەپۆشێت بەڵام بێ گوومان لئۆنا دەکوژێت. ئەگەر ئەتوانن بۆ ڕزگارکردنی لئۆنا کارێك بکەن.

لەگەڵ ئەوەی ئەم ڕستەم لێ بیست وەك بڵێی چرایەکیان لەمێشکمدا داگیرساندبێت وشیاربووم و لەناکاو سەرنجم بۆلای لئۆنا ڕاکێشرا بێ درەنگ لەشوێنەکەم هەستام و بەخێرایی بەیوریم وت:

زووکە.... خێراکە.. دەبێت لئۆنا ڕزگار بکەین. هێشتا ئەم ڕستەم تەواو نەکردبوو دەنگی تەپڵ بەرز بوویەوە. ئەو ژنە وتی:

هاتن..... ڕاکەن، زۆر لێرە نزیك بوونەتەوە... خێرا لێرە دووربکەونەوە. ئەو ڕاستی دەوت. سپا و غولامە وەحشی و خوێنخۆرو چەکدارەکانی مووناك بەتەپڵ لێدان لەشوێنەکەی ئێمە نزیك دەبوونەوە و لەسەر ئەو گوومانە ئەوانمان لەیەك کیلۆمەتری خۆماندا هەست پێکرد.

کێ دەتوانێت هەست بەترسی من بکات......؟ ئەم جارە ئەگەر گرفتاری مووناك دەبووم بێ کەمترین بەزەییەك وبێ درەنگ دەیکوشتم. بەجۆرێك ئەو ژنە ئامازۆنیە دەیوت ئەم جارە مووناك بەڕاستی دەیەوێت بمکوژێت. چوونکە ڕۆشتبووە پەرستگاو ڕێورەسمی پێویستی ئەنجامدابوو و بەباوەڕی خۆیان مۆڵەتی لەخوای جەنگەڵ وەرگرتبوو.

لەم شێوەدا چ چارەنوسێکی شووم و ترس بزوێن چاوڕێی دەکردم....؟ خوا دەیزانی.... دەنگی گامپ گامپی تەپڵ بەردەوام دەبیسترا و هەرساتێك تێدەپەڕی دەنگەکە نزیکتر بە گوێ دەگەشت و هەستم کرد دوریمان لێیان لەیەك کیلۆمەتر کەمترە.

یەك شت دەبووە هۆی شادمانی ئێمە، ئەویش بەلەمەکە هێشتا لەناو گیاکاندا بوو ئەگەر بێ مەترسی خۆمان پێدەگەیاند لەمەرگ رزگار و لەسنووری دەسەڵاتی مووناك کەمێك دوور دەکەوتینەوە.

گامپ گامپ.... گامپ گامپ ئەمە دەنگێك بوو بێ پچڕان گوێمانی ئازار دەدا و بەهۆی بیستنی دەست و پێی خۆمان ون کردبوو و کۆنترۆڵیشمان بەسەر بیرکردنەوەی خۆماندا نەبوو.

ئەم جارەش یوری وەك هەمیشە زووتر لەمن هاتە قسە و بەڕەنگێکی پەڕاو و روخسارێکی پەرێشان و ترساو وتی:

بۆ وەستاویت...... چاوەڕێی چیت......؟ کات بەفیڕۆ مەدە....... ئەم بێ ئاگاییە قەرەبوو ناکرێتەوە.

بەم چەند رستە کە بەدەنگێکی لەرزان وترا هاتمە خۆم و جووڵەیەکی خێرام کرد. یوری لەپێشەوە دەڕۆشت و من بەدوایدا رام دەکرد و هەردوك هەناسە برکێمان پێکەوتبوو، لەئارەقدا خوسابووین کەدەنگی قیژەی ژنێك هات.

ئەم دەنگە ئێمەی لەشوێنی خۆماندا چەقاند چوونکە لەوکاتەدا چاوەڕێی بیستنی هەر دەنگێك بووین جگە لەدەنگی قیژەی ژن !

یوری سەیری کردم و منیش هەروا. ئەم نیگایانە دنیایەك قسەو مانای تیابوو دەمویست راستیەکە بزانم بەڵام چۆن دەکرا.

یوری پرسی: ئەمە چ دەنگێك بوو !.....

نازانم...... رەنگە ژنانی ئامازۆن کە بەدوامانەوەن. گێرۆدەی ئاژەڵە وەحشیەکان بوون. دوریش نیە هێشتا قسەکەم تەواو نەبوو کە دوبارە ئەو قیژە بیسترایەوە بەڵام ئەم جارەیان ئەوەندە دڵتەزێن و مەترسیدار بوو کە بێ ئیرادە چەندین مەتر بەرەو دەنگەکە رام کرد.

یوریش بەدوای مندا رایکردو سەد مەتر ئەولاتر وەستاین. لەراستیدا یوری قۆڵی منی گرت و ئەوەندە زەختی لێ کردو رایکێشا تا لەجووڵە کەوتم خۆی بەرانبەرم وەستا تا دووبارە بەرەو مەترسی نەڕۆم.

لێم پرسی: بۆ لەبەرانبەرمدا وەستاویت.... بابڕۆم دەبێت بزانین ئەم دەنگە چیە رەنگە مەترسیەك هەڕەشە لەمووناك بکات. بەتووندی وتی:

مەگەر هێشتا خۆشت دەوێت....؟ ئەو ئێستا دوژمنی تۆیە. تۆ وەك دوژمنێکی خوێنخۆر دەبینێت و تۆ شێت بوویت کە بۆ رزگار کردنی گیانی خۆت دەخەیتە مەترسیەوە. تا نا بووەستە ئەو ئەم قسانەی دەکرد بەڵام هیچم نەدەبیست و سەرئەنجام لەدەستی رام کرد وبەرەو دەنگەکە رۆشتم. یوریش بەناچاری بەدوامدا هات و هەردووکمان لەو شوێنەی بێ دارە تێپەڕین و رۆشتینە ناو ئەوخاڵە لە جەنگەڵ کە دارکانی چڕ و لێك نزیك و تاریك بوو.

مەودایەك بەبێ مەبەست و ئامانج رامانکرد.... نەڕێگەمان دەزانی و نەدەمانزانی بۆکوێ دەڕۆین و چی دەبێت.

نزیکە چارەکە کاتژمێرێك سەرگەردان بووین و هێشتا نەگەشتبووینە هیچ شوێنێك و هیچمان دەست نەکەوتبوو.

لەم کاتەدا ئاماژەدان بە دو شت پێویستە، یەکەم ئەوەی یوری بەردەوام بۆڵە بۆڵی دەکرد و لەژێر لچەوە جنێوی پێدەدام، بۆ نمونە چەند جارێك کە دووریمان کەم بوویەوە بیستم کەدەیوت:

نە بۆگیانی خۆی بەها دادەنێت و نەبیر لەمن دەکاتەوە، ئێرە مەترسیدارە لەوانەیە لەناکاو گەمارۆمان بدەن و بمانکوژن.

ئەو لەم قسانەی دەکرد، دەمبیست و گوێم پێ نەدەدا و هەندێ کاتیش تەنیا هەستم بە بۆڵەبۆڵەکەی دەکرد بەهەرحاڵ گوێم پێ نەدەدا و سەرقاڵی کاری خۆم بووم.

خاڵی دووەمی شیاو ئاماژەپێدان ئەوەیە دەنگی تەپڵ بەردەوام بەگوێمان دەگەشت بەڵام نەماندەتوانی بزانین دەنگەکە لەکوێوە دێت دەتوت لەچوار سوچی جەنگەڵەوە تاقمێك تەپڵ لێدەدەن و دەنگەکان وا تێکەڵاو ببوون جیا نەدەکرانەوە.

سەرمان گێژی دەخوارد. نەدەنگی قیژەکە رێگاکەی بۆ دیاری کردین و نەبەدەنگی تەپڵەکان دەمانتوانی بڕۆینە پێش.

لەئاوا باروردۆخێکدا بوو لەناکاو دەنگێکی سەیر بیسترا... ئەم دەنگە هاوشێوەی هەلهەلەبوو لەسەر ئەو پێشینەی هەمبوو دەمزانی وەحشیەکان هەندێ کات هەلهەلە لێدەدەن و ئەوەشم دەزانی وەحشیەکانی ئامازۆن هەلهەلە لێدان نازانن. کەواتە ئەم دەنگانە پەیوەندی بەکێوە هەیە و لەقوورگی چ کەسانێك دێتە دەر.

بەناڕەحەتی وەستام و لەپشتەسەری خۆم یانی یوریم ڕوانی. یوری بەڕەنگی پەڕاو پاڵی بەدارێکەوە دابوو وەستابوو وچوونکە بەقیافەو روخساری ئەو بەتەواوی ئاشنابووم، تێگەشتم یوری ئەو پیاوەی چەند کاتژمێر پێشتر نیە و زۆر ترساوە و پەرێشان بووە.

بەهەنگاوی هێواش بەرەو لای ڕۆشتم. بازوویم گرت و پرسیم:

چی بووە یوری........؟ بۆ ترساویت؟ قسە بکە.......

یوری قسەی نەدەکرد بەڵام تێگەشتم لەبەر هۆکارێك قسە ناکات و رەنگە دەیویست من نەترسم بۆیە پرسیارەکەم دوبارە کردەوە و چوونکە وەڵامی نەدایەوە، پرسیارەکەم جارێکیتر دوبارەکردەوە وئەوەندە تەکانم داو پرسیارم کرد تاهاتە قسەو وتی:

شتێکی گرنگ نیە..... پەرێشان بووم......

بەڵام من رازی نەبووم هەردو بازوویم گرت وتم:

راست بڵێ... دەبینم تۆ لەشتێك تێگەشتوویت و ناتەوێت بەمن بڵێیت. ئەم جارە یوری سەیرێکی منی کرد و سەری داخست و چوونکە سوور بوونی منی بینی سەری هەڵبڕی و وتی: دەبیستیت.... تائێستا لەهەڵەدا بووین. ئەم دەنگە پەیوەندی بەوەحشیەکانی ئامازۆنەوە نیە ئامازۆنیەکان هەلهەلە ناکێشن و کاتێك هەلهەلەکانم بیست تێگەشتم وەحشی تر لەم نزیك و دەوروبەرەدان.

پرسیم: مەبەستت چیە.... وەحشیەکانی تر بۆ چ مەبەستێك بەرەو ئێرە هاتوون؟ چ کارو ئامانجێکیان هەیە.....

یوری وتی: بۆ تۆڵە سەندنەوە لە ئامازۆنیەکان.

تۆڵە؟ تۆڵە بۆچی؟

یوری وەستا. ئاوی دەمی قووت داو دوای چەند سات بەهێواشی وتی:

ژنانی ئامازۆن لە سەد ساڵ پێش ئێستا بەردەوام هێرشیان کردۆتە سەر هۆزەکانی دەوروبەر و پیاوەکانیان بەدیلی گرتووە وو ژنانیان دڕندانە کوشتووە. ئێستاش هەرکات دەرفەتیان دەست کەوێت ئەم کارە دەکەن. لەسەر یەك هەمیشە لەنێوان ئامازۆنیەکان و هۆزەکانی دەوروبەر شەڕ بەردەوامە. مەترسیدارترین هۆزی ئەم ناوچەیە، هۆزێکە بە ناوی ((یوچی)). پیاوانی ئەم هۆزە رەنگیان قاوەییە و چاوەکانیان وەك دانشتوانی چین و ژاپۆن خرە.

ئەمانە خوێنخۆرترین وەحشیەکانی جەنگەڵن و هەرکاتێك هێرش بکەنە سەر ئامازۆن

ژمارەیەکی زۆر بێ بەزەییانە دەکوژن. گوومان دەکەم ئەم جارەش هێرشیان کردبێت چوونکە دووری هۆزەکەی ئەوان لێرەوە زۆرە و بێ ئامادەکاری ئەگەری نیە لەسنوورەکانی ئامازۆن نزیك ببنەوە.

بێ ئیرادە سەرنجم بۆلای مووناك و منالەکەم راکێشرا. گوومانم دەکرد ئەگەری هەیە لەم هێرشەدا مووناك و لەویش گرنگتر منالەکەم بکوژرێت.... دەبێت چی بکەین؟ لەیوریم پرسی ئێستا دەبێت چی بکەین....؟

یوری وتی: بۆچوونی تۆ چیە....؟ ئەمەش بزانە ئێمە ناتوانین شەڕیان لەگەڵدا بکەین سلاحمان نیەو بێ گوومان دەکوژرێین.

بەلام دەبێت مووناك و منالەکەی رزگارکەین. ئەو دوژمنی منە بەلام ناتوانم بینەری مەرگی ئەو بم ئەمە فرمانێکە مرۆڤایەتی پێم دەدات.

یوری بیری کردەوەو وتی: کەواتە خێرا بەرێکەوە..... خێراکە هەردوکمان بەخێراییەکی سەیر بەرەو هۆز بەرێکەوتین. مەودایەك کەدەرۆشتینە لەناکاو یوری وەستاو بەپەنجە شوێنێکی نیشان داو ئاوری دایەوە. سەیری شوێنەکەم کرد و بینیم لاشەی خوێناوی ژنێك لەوێدا کەوتووە.

رۆشتمە پێش، ئەو ژنەم بینی بەسەری براو سینەو سکی هەڵدراو لەوێ کەوتووە و مردوە، ئەو داماوە ببووە قوربانی ئێمەو لەبەر یارمەتیدانی ئێمە کوژرا. زیاد لەرادە دڵم بۆی سوتا. ئەوەندە خەمباربووم قوڵپی گریان قورگمی گرت و فرمێسك لەچاومدا کۆبوویەوە.

یوری بازومی گرت و وتی:

کات بەفیرۆ مەدە.... یوچیەکان ئەویان کوشتووە. ئەوان بەم شێوە دەکوژن. تەورێکی تیژی مەترسیداریان لە دەستدایە کە بەیەك زەربە سەری قوربانیەکانیان دەقرتێنن و بەدەستێکی تر کە خەنجەری تیایە سینە و سکیان هەڵدەدرن.

پێشنیارم کرد کە ئەو بەخاك بسپێرین و دواتر بەرێکەوین بەلام یوری نەیهێشت و دوبارە بەرێکەوتین. هەرچی لەو هۆزە نزیکتر دەبووینەوە دەنگی تەپڵ و هەلهەلەکان ئاشکرا دەهاتە گوێ و دیاربوو هۆزی ژنانی ئامازۆن گەمارۆ دراون.

یوری بەردەوام بەمنی دەوت:

ئاگادار بە... بەهەڵەشە کارنەکەیت. دەرۆشتینە پێش. لەسەر دورپیانێك کە رێگەیەکیان بەدووری بیست مەتر و بەهۆز کۆتایی پێدەهات و وەستاین.

یوری لەویٚ پیٚشنیاری کرد پاشماوەی ریٚگا کە لەسەردارەکانەوە ببڕین. ئەم کارە کەمیٚك کیٚشەی لەگەڵدایە بەڵام دڵنیاتربوو. بۆیە لەداریٚکی کۆن سەرکەوتین و لق بەلق دەرۆشتینە سەر دارەکانیتر و لەهۆز نزیك دەبووینەوە.

یوچیەکان لەژێر پیٚماندا بوون. هیٚشتا هیٚرشیان نەکردبوو و ئامازۆنیەکان ریزیان بەستبوو وپاریٚزگاریان لەهۆزەکەیان دەکرد.

لە شویٚنیٚکدا وەستاین. هەم ئامازۆنیەکان و هەم یوچیەکانمان دەبینی وچارەکە کاتژمیٚریٚك بەم شیٚوە تیٚپەڕی کە هیٚرش دەستی پیٚکرد.

زەوی و ئاسمان لیٚلْ و تاربوو. تەپ و تۆز و گژوگیا بۆ ئاسمان بەرزبوویەوە. دەنگی قیژەی ژنان و منالان و هاواری دڵتەزیٚنی پیاوان گویٚی کەڕدەکرد. هەندیٚ کات ئامازۆنیەکان و هەندیٚ کات یوچیەکان سەردەکەوتن. بەدژواری چاودیٚری گۆڕەپانی شەڕمان دەکرد و تا ئەوسات بیٚدەنگ بووین. لەناکاو چاوم بەدیمەنیٚکی سەیر کەوت. منالەکەم لەناو گیاکاندا دانیشتبوو و دەگریا. مووناك لەسەر زەوی کەوتبوو یوچیەکی خویٚنخۆر تەورەکەی خۆی پیٚگەیاندو دەیویست بیکوژیٚت.

دنیا لەبەرچاوم لیٚلْ بوو ئیتر نەمدەزانی چی بکەم. ساتیٚکی تر مووناك دەکوژراو منالە بیٚ تاوانەکەی منیشیان دەکوشت.

کاتیٚك سۆز دیٚتە پیٚش، هەموو شتیٚك لەناو دەچیٚت. مرۆڤ هەموو ئازارو خراپەو ناڕەحەتیەکانی رۆح و جەستەی لەبەر تیٚرکردنی سۆزیٚك لە سۆزەکانی خۆی لەبیر دەکات و حالی دەگۆریٚت کە وەسف ناکریٚت.

بەڕاستی شیٚت ببووم.... ئەویٚ ئەوەندە قەربالغ بوو دەنگی گریانی منالەکەم نەدەبیست بەلام دەمبینی و دیاربوو لەدڵەوە دەگریی. مووناکیش لەقولای ناخیەوە دەیقیژاند و داوای یارمەتی دەکرد. بەلام لەم کاتەدا کەس لەبیری گیانی کەس دا نەبوو هەرکەس لەبیری خۆیدا و هەولی دەدا بەرەکەی خۆی لە ئاو بکیٚشیٚتەدەر. لەم شیٚوەدا کیٚ دەیتوانی یارمەتی مووناك بدات و لەوکاتەدا لەمردن رزگاری بکات.

دنیا بەدەوری سەرمدا دەسوڕا، کولمەکانم سوربوون و ئیتر نەمزانی چۆن ئەم بیرە مەترسیدارە لەمندا دروست بوو کەیارمەتی مووناك بدەم و لەچنگالی مردن رزگاری بکەم.

ئەوەش بلیٚم کەزیاتر سەرنجم لای منالەکە بوو زیاتر دەمویست ئەو لەمردن رزگار بکەم. هەلبەت مووناکیشم خۆش دەویست. ناتوانم درۆبکەم... ناتوانم بیشارمەوە کە

مووناك و عەشقەکەییم لەبیر کردبوو.

هێشتا خۆشم دەویست.... هێشتا دڵم لەبەرئەو لێی دەدا.. بەڵام هەستێك کە بەرانبەر مناڵەکەم بۆ جۆرێکیتر بوو کەهیچ شیوەیەك لەگەڵ عەشقم بۆ مووناك شیاوی بەراورد کردن نیە.

بەهەرحاڵ بۆ ئاوا فکرێکی شێتانە لەسەر لقێکەوە پەڕیم و تفەنگەکەم لەدەست یوری کە مات و بێدەنگ دانیشتبوو، دەرهێنا.

پێش ئەوەی بپەرمەخوار، میلم هێنایەوە، لە خەزێنەی تفەنگەکەمدا سێ فیشەك هەبوو. لەیوریم پرسی ئیتر فیشەکمان نیە. ئەو بە نا وەڵامی دامەوە. دیار بوو بەو سێ فیشەکە دەبێ چارەنوسی خۆم و مووناك و مناڵەکەو یوری و لئۆنا دیاری بکەم. بەڵێ تەنیا سێ فیشەك مابوو و بەم سێ فیشەکە بۆ شەڕی کۆمەڵێك پیاوی وەحشی و خوێنخۆر دەڕۆشتم. یوری مەچەکی دەستی گرتبووم و دەیویست لەم کردەوە کەبەباوەڕی ئەو هەڵەبوو، ڕێگری بکات بەڵام بە ئەنیشك دەستیم لاداو پەڕیمە خوار.

هۆش و هەستی خۆم نەدەزانی و وەك شێت بەولادا رام کرد. بەخۆشحاڵیەوە دروست لەوکاتەی ئەوپیاوە خوێنخۆرە دەیویست تەورەکەی بێنێتە خوارو مێشکی مووناك بپرژێنێت یەکێك لەپیاوانی هۆزی ئامازۆن لەدواوە خۆی فرێدایە سەری و دەستی گرت. ئەو نەیتوانی بەسەر ئەو یوچیەدا زاڵ بێت و زۆر خێرا کوژرا بەڵام ئەم روداوە چەند خولەك مەرگی مووناکی درەنگ کرد و دەرفەتی بەمن دا خۆمی پێ بگەیەنم.

کاتێك گەشتم یەك هەنگاوی مووناك و یوچی، دوان لەوەحشیەکان ڕێگەیان لێم گرت ڕمەکانیان لەسەرم نیشانە گرت. بەڵام گوێم پێنەداو بەقۆناغە تفەنگ وەك پیاوە ئازاکان هێرشم کردە سەریان و بەیەکەم زەربە یەکیانم کوشت.

ئەویتریان بەخەنجەری یوری کە بەدوای مندا هاتبووە خوار کوژرا. بەم شێوە من گەشتمە سێ هەنگاوی مووناك.

ئەم جارەش یوچی تەورەکەی بەهەموو هێزی بەرز کردەوە و دەیویست بیکێشێت بەسەری مووناکدا. لەم کاتەدا چاوی مووناك بەمن کەوت و منی بینی.

راستی بۆ ئەو نەشیاو بۆ باوەڕکردن بوو و هەربۆیە کاتێك منی بینی لەخۆشیدا قیژاندی و تلێکی داو یەك مەتر لەبەردەم قاچی یوچی دورکەوتەوە بەشێوەیەك ئەم جارەش تەوری یوچی بەر زەوی کەوت و مەبەستی نەپێکا.

ئەمەش دەرفەتێکی چاك بوو کەیارمەتی زیاتری رزگارکردنی مووناکی دەدا. ئێستا

کاتی هەوڵ و کوشش بوو.

یوچی ئاوڕی دایەوە و من و یوری لەدوهەنگاوی خۆیدا بینی و وازی لەمووناك هێنا. تێگەشتبوو ئێمە مەبەستی گیانیمان کردوە. تفەنگەکەی منیشی نەدەناسی. نەیدەزانی ئەو شتە کانزاییەی لە دەستمدایە چیە بۆیە لێی نەترسا. بەڵام تا چاوی بە خەنجەرو رمەکەی یوری کەوت سوڕاو سەرنجی بۆ لای ئەو راکێشرا.

مووناك دەستی لەسەر روخساری دانابوو، مناڵەکەی لە ئامێز گرتبوو تا دیمەنی مەرگ نەبینێت. ئەو دڵنیابوو لەم شەڕەدا دەکوژرێم بۆیە روخساری داپۆشی و چاوەکانی بەست. یوچی هێرشی کردە سەر یوری و تەورەکەی بۆ حەواڵە کرد بەڵام یوری ئاگادار و وشیار رۆشتە دواوە و مەچەکی دەستی یوچی گرت.

یوچی هەلهەلەیەکی کێشا. دەنگێك کە لەقورگی ئەو هاتەدەر کەسانیتری ئاگادار کردەوە و بەخێرایی سێ یوچی تر بەرەو ئەوێ هاتن تا یەرمەتی ئەو وەحشیە بدەن. تێگەشتم ئیتر شوێنی درەنگ کردن نیە. لولەی تفەنگەکەم لەسەر مێشکی نیشانەگرت و تەقەم کرد. ئەو پیاوە وەحشیە وەك کێوێك لەسەر زەوی هەڵکەندراو و کەوت.

لەکاسەی سەری تەنیا کەمێکی بەملی مابوویەوە و سەری پەرش و بڵاو و بەم ىولادا بڵاو بوویەوە. مووناك سەری هەڵبڕی و کاتێك ئەم دیمەنەی بینی و منی بەزیندووی بینی زۆر شادمان بوو بەڵام ئەم شادمانیە زۆری نەخایاند چوونکە دەست بەجێ چاوی کەوتە سەر ئەو سێ یوچیە کە بە پەلە بەرەو لای ئێمە دەهاتن و دوبارە قیژاندی. ئەم جارەیان دەرفەتی زیاترمان بوو، ژێر باڵی مووناکم گرت و لەزەوی بەرزم کردەوە. مووناکی داماو کە خەرامان خەرامان بەرێگادا دەڕۆشت و وەك مێچکە شێر دەیخرۆشاند ئەوەندە ترسابوو ئەژنۆکانی دەلەرزی و ئەگەر پاڵی بەشانی من نەدەدا نەیدەتوانی بووەستێت.

سێ یوچیەکە پێمان گەشتن و یوری کە لەپێشتر وەستابوو لەگەڵیانا دەرگیر بوو. یوری زۆرباش شەڕی دەکرد. تا ئەو رۆژە شەڕی دەستەو یەخەی ئەوم نەبینیبوو.

زۆرانبازی ژاپۆنیتان بینیوە. بیستوتانە ژاپۆنیەکان چۆن زۆران دەگرن و چۆن بە تەکتیکی تایبەت رکەبەریان لە ئەرز دەدەن و دەست وقاچی دەشکێنن....؟

یوریش وەك ژاپۆنیەکان شەڕی دەکرد و کاتێك دەستی یەکێك لەوانی دەگرت نازانم چی دەکرد ز چ تەکتیکێکی بەکاربرد کەوەك مریشك بەرزدەبوویەوە وەك کێوێك دەدرا بەو دوانەی تردا و دەدران بەزەویدا.

مووناك بەدەنگێکی لەرزان پێی وتم:

بەداردەستەکەی خۆت بیانکوژە. ئەو دەکوژن... خێراکە من دو فیشەکم بوو ئەگەر ئەو دوفیشەکەشم بەکاردەبرد ئیتر هیچ نەدەمایەوە و تفەنگەکەم دەبووە پارچە ئاسنێکی شکاو کەبێجگە لەقورسی و زەحمەت کەڵکێکیتری بۆمان نەبوو. عاقڵانە ئەوەبوو لەو دوفیشەکە جۆرێك کەڵك وەربگیرێت ئەنجامێکی دڵنیاو ژیانی لێ بەدەست بێت.

لەسەر ئەم بیرە تفەنگەکەم دا بەمووناك و بەرەو یوری و ئەو سیانە رام کرد.

یوری قەمەکەی لەدەستدا بوو خەنجەرەکەی لەکەمەردا هەڵواسیبوو، لە دەرفەتێکی کورتتدا خەنجەرەکەم لە کەمەری کێشا، بەخێراییەکی سەیر کە ئێستا خۆشم سەرم سوڕدەمێنێت کەلەکەی یەکێك لە یوچیەکانم هەڵدڕی.

یوچی بەسکی هەڵدراو کەوتە سەر زەوی. دەنگی ناڵەو قیژەی سەرنجی دوانەکەی تری راکێشا و بووە هۆی ترساندنیان بەڵام دەرفەتی راکردن یان کارێکی تریان نەبوو چوونکە لەم کاتەدا قەمەی یوری سینەی یەکیتریانی کون کرد، ئەویش لای ئەو دوانەی تر کەوتە سەر زەوی:

سێیەم درەنگی نەکردو وەك کەسێك لە جەهەننەم و ئاگر رابکات رووی خۆی سوڕاندو بەهەلهەلە کێشان رای کرد.

هێشتا چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبوویەوە کە کۆمەڵێك یوچی دەرکەوتن، ئەوان بەرەو لای ئێمە دەهاتن. مووناك لەکاتێکدا مناڵەکەی لەئامێز گرتبوو بەدەنگێکی لەرزان وتی: رابکەن... خێرا. لەم رێگاوە، مووناك خۆی لە پێشەوە رایکردو من و یووریش بەدوایدا.

یوچیەکان زۆر لێمان دوور نەبوون. ئەگەر لە شوێنەکەی خۆماندا دەوەستاین نزیکەی دوخولەکی دەخایاند تا پێمان بگەن لەم شێوەدا کە رامان دەکرد خێرایی راکردنی ئێمە لەوان کەمتر و لانی کەم پێنج خولەکی خایاند تا دوورییەکەمان بەسەر بگات.

وەحشیەکان لە راکردندا زۆر بەتوانان. لەلایەکیتر مووناك بەجەستەی لاوازو لەرزان لەگەڵماندا بوو و لەگەڵ ئەوەشدا رامان دەکرد نەماندەتوانی بەو شێوەی پێویست بوو خێراییمان هەبێت.

مناڵەکەم لەئامێزگرت و بەسنگمەوە گوشیم. و دڵم ئۆقرەی گرت و چێژم دەبرد و

لەگەڵ ئەوەشدا رامان دەکرد کاتێك مووناك مناڵەکەی بەمندا باشتر توانی رابکات بەم شێوەیە لەوان دوور کەوتینەوە و گەشتینە سنوورەکانی جەنگەڵی چڕ کەداری زۆری تیابوو. ئەوێ شوێنێکی گونجاوتر و ئەمنتربوو. باشتر دەمانتوانی خۆمان بشارینەوە بەڵام لەکوێ..... چۆن...... بەچی..... سەیرێکی دواوەم کرد بینیم یوچییەکان وەك مێروو کە لە هێلانەکەی خۆی هاتبێتەدەر بەرەو نێچیرێك رادەکەن و پەلاماری دەدەن، بەدواماندا دێن. ژمارەی ئەوان زیاد لەرادە زۆر و ئەگەر دەستیان بەئێمە دەگەشت هەر تیکەیەکی گۆشتی جەستەمان بەر کەسێك دەکەوت و دەکەوتە سەر ڕمەکانیان.... ماوەیەکی تر رامانکرد. لەم کاتەدا مووناك وەستاو لەکاتێکدا بەتووندی هەناسە برکێی پێکەوتبوو وتی: لەم رێگاوە بێن. شوێنێکی گونجاوم هەیە.

منی بەدوای خۆیدا بۆ ئەو شوێنە برد کە تائەوکات نەچبووم وئەوناوچەم نەدەناسی. نزیکەی چارەکە کاتژمێرێکیتر رامان کرد و ئەوکات رۆشتینە شوێنێکی بێ دار و زیاتر هاوشێوەی گۆڕەپانێکی وەرزش یان گۆڕەپانی تێنس بوو.

لەوێش تێپەڕین و دواتر لەپشت ئەو شوێنە گەشتینە بەردەلانێك کە رێگەیەکی زۆر دژوار و نارێك بوو. مووناك لەوێدا وەستاو سێ بەردی گەورەی نیشان دا. وتی ئەو بەردانە هەڵگرن.

یوری چەمایەوە و بەفشار بەردەکەی لابرد. لەژێر بەردەکە کونێك دەرکەوت و مووناك یەکەم کەس بوو رۆشتە ناو و ئێمەی بەدوای خۆیدا برد.

یوری دوبارە بەردەکەی خستە سەر کونەکە و ئێمە لە رێڕەوێکی تەنگ وتاریك درێژەمان بە پێشڕەوی خۆماندا. کەڕۆشتینە پێش رووناکی چەند مەشخەڵێك دەرکەوت و دەنگی گریانی کۆمەڵێك بەگوێ دەگەشت. ترسام بەڵام مووناك وتی:

هیچ نیە........ دانیشتوانی هۆزن.

دیاربوو ژمارەیەك لە دانیشتوان کە زیندو لەچنگی یوچیەکان رایان کردبوو لەوێدا خۆیان شاردبوویەوە. هەرکام ژمارەیەك لەئازیزانی خۆیان لەدەست دابوو و لەمەرگی ئەوان دەگریان. لەناویاندا چەند کەسێکیش مردبوو. یوری کاتێك پیاوانی بینی بەمووناکی وت: ئەم پیاوانە لێرەن و یوچیەکان هۆزەکە تاڵان دەکەن؟ سەیرە.

مووناك پرسی: دەبێت چی بکەین؟

فەرمانیان پێ بدە چەك هەڵگرن و لەگەڵمدا بێن و یوچیەکان لێرە دووربکەینەوە.

مووناك لەم پێشنیارە شادمان و لەگەڵ دژایەتیەکانی من دەستوریدا پیاوەکان لەگەڵ

یوری بڕۆنە شەڕی یوچیەکان.

ژمارەی پیاوەکان بیست و دوو کەس و لەگەڵ من و یوری دەگەشتینە بیست و چوار.

کاتژمێرێك دواتر تاقمەکە بەرم و خەنجەر و قەمە چەکدار بوون. لەکوونەکە هاتنەدەر و بەسەرۆکایەتی یوری بەرەو هۆز بەڕێکەوتین.

لەرێگاشدا حەوت لەپیاوانی تر کەلەناو دارەکاندا خۆیان شاردبوویەوە پەیوەستان بوون و تاقمێکی سی کەسیمان دروست کرد.

بەبیزارییەوە بەدوایاندا رۆشتم.... مووناك نەیدەویست شەڕ بکەم... دەگریا کەمن لای بمێنمەوە و لەو کوونەدابم. بەلام شەرمم لەژنان دەکرد و بەناچار بەبێزارییەوە بەدوایاندا بەرێکەوتم.

بۆ یوری بینینی ئەم دیمەنە روبەڕوبوونەوە لەگەڵ ئەو رووداوانە کارێکی ئاسایی وناگرنگ بوو ومن وەك داری بیی کە کەوتبێتە بەردەم بای توندی پاییزی دەلەرزیم و لەترسا توانای راگرتنی خۆم نەبوو. دەترسام کەسانیتر لەم حاڵەدا بمبینن گاڵتەم پێ بکەن.

کاتێك لە کوونەکە هاتینەدەر، ترسەکەم زۆرتربوو. ئەوکاتەی لەژێر زەویدا بووین. وەك کەسانیتر دەموت و دەمبیست و بۆچوونم وابوو دەبێت چاونەترس بین، دەبێت شەڕبکەین و دوژمن لەماڵەکەماندا دەرکەین و لەناوی بەرین بەلام هەرئەوەندەی هەوای ئازادم هەڵمژی و دەنگی تەپڵی یوچیەکان بەگوێم گەشت، گۆڕام و دەستم بەلەرزین کرد.

چارەیەك جگە لە رۆشتن نەبوو. ئەگەر گاڵتە بەئەمریکاییەکان نەکەن و هەموویان وەك من بە ترسنۆك نەزانن دەمەوێت شتێکی تر بڵێم بەلام شەرمم بوو، بەخۆمم وت:

باشترە خۆ ببوورێنمەوەو لەم شوێنەدا بکەومە سەر زەوی و تاگەڕانەوەی ئەوان و کۆتایی هاتنی کار وەك مردوو لێرەدا بمێنمەوە.

ئەم بیرۆکەم پەسندم کرد و ئەگەر لەناکاو روبەڕوی یوچیەکان نەدەبووینەوە ئەگەری بوو بیخەمە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە.

کاتێك کەمێك لەحەشارگەکەی مووناك دوور کەوتینەوە، یوری وەستاو بەدابەش کردن و دەستوردان سەرقاڵ بوو.

هەرچەند کەسێکی بۆلایەك ناردو پێشنیازی کرد لەگەڵ دەنگی هەلهەلەی وەحشیەکان خۆیان بگەیەننە شوێنی دەنگەکە.

(( دانیشتوانی هۆزی ئامازۆن هەلهەلەیەکی تایبەتیان بوو کە لەگەڵ هەموو

دەنگەکانی تردا جیاواز و هەموویان بەدەنگیان دەزانی و دەناسی ))

لەگەڵ ئەوەشدا دەستوریدا چۆن شەڕبکەن و چ کات هێرش و بەرگری بکەن. هەردەستە بەرەو لایەك رۆشتن و من و یوری و سیانی تر ماینەوە. دوبارە لەبیری بوورانەوەدا بووم کەلەناکاو دەنگی سەیر لەدەوروبەرمان بیسترا و یەك لەڕەش پێستەکان وتی: پوچیەکان هاتن و ئێمەیان گەمارۆدا.

راستی دەوت. لەچوار دەورەوە کەوتبووینە گەمارۆی پوچیەکان و هیچ رێگایەکی راکردن نەبوو. ژمارەمان زۆر کەم بوو. بەم ژمارە کەمە دەمانتوانی چی بکەین؟

لەهەر لایەکم دەڕوانی گەڵاو بەرگی دارەکان دەجووڵا و دەنگی خشەخش دەبیسترا. یوری دەستی گرتم و وتی: ئاگاداری تیرە ژاراوییەکان بە، ئەو دو فیشەکە ماوەتەوە بەبێهۆ نەیتەقەێنیت. تا دەتوانی بەرم و قەمە درێژە بەشەڕ بدە. بەڵکو کەرەستەی رزگاری دەست کەوێت.

هێشتا قسەکەی تەواو نەببوو لەناکاو دەنگی ویزەیەك لای گوێچکەمەوە بیسترا و شتێك بەر کوڵمم کەوت و تێپەڕی. ئەو شتە ئەوەندە خێرایی بوو و نەمبینی و نەمزانی چیە.

تەنیا یەك شتم هەست پێ کرد. یوری بەهەردو دەست منی بۆلای خۆی کێشا و کاتێك شوێنی من گۆڕا ئەو شتە بەخێرایی لای کوڵمم تێپەڕی و بەحاڵ بەرمکەوت.

هێشتا گێژ بووم کە یوری لەسەر زەوی راکشاو بەهەموو هێزی خۆی کەلەناو بازوە بەهێزو ئاسنینەکانیدا بوو، منیشی بەرەو زەوی کێش دەکرد. چوونکە عادەتم بوو هەمیشە فەرمانبەرداری بکەم بێ خۆراگری لای ئەو خەوتم و سینەم لەسەر خۆڵ و گیا تەڕەکانی جەنگەڵ دانا.

یوری وتی: خوا زۆر رەحمی بەمن وتۆ کرد. سەیرکە....

ئاوڕم دایەوە و سەیری دواوەم کرد وادەزانن چیم بینی؟ لەسەر قەدی دارەکەی پشت سەرم دو رم چەقیبوو. یەکیان لەسەر و ئەویتریان بەئەندازەی نیو مەتر خوارتر. هێشتا رمەکان دەلەرانەوە و نیشانی دەدا رم هاوێژەکان چ هێزو توانایەکیان لەناو بازووەکانی خۆیاندا هەیە. هەرکام لەرمەکان نزیکەی بیست سانتیمەتر لەدارەکە چەقیبوو و ئەگەر یەك لەوان لەسینەی مندا دەچەقی لەولاتر دەردەچوو و بەخێرایی دەیکوشتم.

جارێکیتر یوری بەخێرایی ووشیاری منی لەمردن رزگار و زیاتر لەجاران قەرزاری بووم. سێ رەش پێستەکەی لەگەڵماندا بوون لەناو دارو گیاکاندا خۆیان شاردەوە و

هەرکام لەسوچێکدا خۆیان داشارد بەشێوەیەك نە ئێمە ئەوانمان دەبینی و نەئەوان هەواڵیان لە ئێمە هەبوو. بەڵام چوونکە یوری دەستوریدابوو لەوێ دوور نەکەونەوە دڵنیابووم کەناڕۆن.

یوچیەکان لەدەورماندا بوون و بەگوومانی ئەوەی ژمارمان زۆرە لەسەرخۆ دەهاتنە پێش کە نەکا ناکاوگیر بکرێن.... دەنگی خشەخشی پێی وەحشیەکانی یوچی دەبیسترا و نیشانی دەدا هەرسات زیاتر لەئێمە نزیك دەبنەوە.

لەم ساتەدا دڵم وەك ماتۆڕ لێی دەدا و لێدانەکەی لە گوێچکەمدا دەنگی دەدایەوە. لەناکاو یوری لەسەر سك خزی و لەمن دوور کەوتەوەو. کەمێك ئەولاتر لەشوێنەکەی هەستاو خۆی خستە پشت دارەکان. هۆکاری راکردنی ئەوم نەزانی. سەرم سوڕما بۆ بەتەنیا رۆشت و منی لەگەڵ خۆیدا نەبرد. تەکانێکم بەخۆم دا تا لەشوێنەکەم هەستم بەڵام نەمتوانی.

دەزانن بوو....؟ لەبەرانبەرمدا روخسارێکی مەترسیدار دەرکەوت یوچیەکی زلی چوارشانە گەشتبوویە دوهەنگاوی من. سەری پڵنگێکی لەسەر و پەنجەکانی دەستی لەدەستی پڵنگدا دانابوو. شەرمی خۆی بەتیکەیەك لە پێستی پڵنگ داپۆشیبوو و بەچاوە خوێناوییەکانی و قیافەیەك کەمەرگ و نەمانی لێ دیاربوو، سەیری منی دەکرد.

کاتێك چاوم پێکەوت ئەژنۆکانم لەرزی و هەناسە لەسینەمدا توند و بەپشتا کەوتم. ئەگەر زۆر زەختم لەخۆم نەکردایە بەدڵنیاییەوە بێهۆش دەبووم و لەناو دەچووم لەهەمان کات کە ئەنیشکم لەژێر جەستەمدا دانابوو لەلابەلای پەنجە نیوە داخزاوەکانم سەیرم دەکرد.

بەخۆشحاڵیەوە یوچی ئاماژە پێدراو کە ئەندامی گەورەو جەستەی ماسوولکەیی و بەهێزی بوو، تەنیا و سیلاح لەدەستیا نەدەبینرا.

سیلاحەکەی ئەو رمانەبوو هاویشتبووی و بەخۆشحاڵیەوە مەبەستی نەپێکابوو. بەڵێ رمەکان ئەو هاویشتبووی ئێستاکە بێ سیلاح مابوویەوە و بەئارامی و بەهێواشی بەرەولام دەهات تابەدەست بمخنکێنێت و بەچنگاڵی پڵنگ کە لەرم و خەنجەر تیژتربوو سینەم هەڵدرێت و دڵم دەربێنێت. جوولام. راستیەکەی ئەوەیە لەوساتەدا گیانم نەبوو تەکان بخۆم... بەڵکو دەلەرزیم. ئەم لەرزەیە بۆی سەلماند کەزیندووم و چوونکە بینیبووی رمەکان بەردارکە کەوتبوون و منی نەپێکاوە. رەنگە سەری سوڕمابوو لەبەرچی و بۆ لەوێدا کەوتووم و توانای خۆبزواندنم نیە.

هێواش هێواش لێم نزیك بوویەوە. لەناو پێڵوەکانی چاوم ئەوم دەبینی و کاتێك زیاتر هاتە پێش، خەنجەرێکی کورتم بەکەمەریەوە بینی و زانیم بیّ چەك نیە.

بەخۆمم وت: تەواو بوو. ئێستا بەخەنجەر سینەم هەڵدەدرێت و سەرم لیّ دەکاتەوە و وەك نیشانەی سەرکەوتن لەبەرانبەر ژوورەکەیدا هەڵیدەواسێت و یان پێشکەشی هاوسەرەکەی دەکات. بەڵیّ سەری من باشترین دیاری بۆ هاوسەری ئەم یوچیە وەحشیە دەژمێردرا.

ئەو هەنگاوێکی تریش هاتە پێش. لەناکاو یەخەمی گرت و تەکانێکی سەختی پێدام. دەیویست تێبگات ئایا بەڕاستی مردوم یان بۆ فریودانی ئەو خۆم بەمردوو نیشان دەدەم.

منی تەکان دا بەڵام دوبارە وەك لاشەی مردوێك کەوتمە سەر زەوی. جارێکیتر ئەم کارەی کرد. کاتێك دڵنیابوو مەترسیەك لەلایەن منەوە هەڕەشەی لیّ ناکات بەرەو ڕەمەکانی ڕۆشت ئەوانی لەدارەکە دەرهێنا و بەدەستیەوە گرت. شادمان بووم دەزانن بۆ؟ وام دەزانی ئەو لە کوشتنی من چاوی پۆشیوە و دەیەوێت بڕوات بەڵام لەبەختی ڕەش ئەم شادمانیە زۆری نەخایاند و دوای ئەوە هەردو ڕمەکەی لە دارەکە جیاکردەوە دوبارە بەرەو لای من هات و بەئاسوودەیی ڕمەکانی لەسەر زەوی داناو خەنجەرەکەی کێشا.

هەمووی ئەم ڕوداوانەم لەلابەلای پێڵوەکانی چاوی خۆمەوە دەبینی. بێننە بەرچاو لەوکاتەدا چ حاڵێکم بوو. ئایا ئێوە ئەگەر لەجیاتی من بوونایە دەست بەجیّ لەترسا دڵتان لەلێدان نەدەکەوت.و خەنجەری کێشاو قاچێکی خستە سەر سکم تاسەرم ببڕێت وەك قەصابێك کەدەیەوێت گایەکی بیّ دەست و پیّ قوربانی بکات.؟

لەو گەشتەدا ساتی مەترسیداری زۆرم بینیبوو و ئازارو بەدبەختی زۆرم چەشتبوو بەڵام هیچ کامیان و لەهیچ شوێنێك بەئەندازەی ئەوساتە ترس ئەنگێز و دڵ ستێن نەبوو.

قوڵپی گریان قورگمی گرت. وڕەی هەناسەدانم نەبوو چوونکە ئەگەر سینەم بەرز و نزم ببووایە ئەو بەخێراییەکی زیاتر کارەکەی ئەنجام دەدا ودەست بەجیّ خەنجەرەکەی لەدڵم دەچەقاند. کاتێك بریسکەی خەنجەرەکەیم بینی بەڕاستی دڵم لەلێدان کەوت. ئەو ڕۆژە دڵی من بۆ یەك خولەك و سی چرکە زیاتر یان کەمتر لەلێدان کەوت ودوبارە دەستی بەلێدان کردەوە. ئەو دەستە سەیرەکانی خۆی کە لەپێستی پڵنگ وەك چنگاڵی ئەو

ئاژەڵە دڕەندە لە خەنجەر دا بردەسەر کەسەرەتا سینەم هەڵدڕێت و دواتر بە ئاسوودەیی سەرم ببڕێت.

لەدڵی خۆمدا ماڵئاوایم لەهەموو شتێکی دنیا کرد و بەگیان و ئەوەی لەودایە کە لەناکاو رەش پێست قیژاندی و لەسەر سینەم هەستا. بەبیستنی دەنگی ئەو لەشوێنەکەم بەرزبوومەوە و لەسەر دو ئەژنۆ دانیشتم و روبەڕوی دیمەنێکی دڵخۆشکەر بوومەوە.

یوری جارێکیتریش منی لەمردن رزگار کرد.

دروست لەکاتێکدا دەستی رەش پێست بەرەو سینەی من دەهاتە خوار لەپشت دارەکەوە هێرشی برد و بەقەمە تیژەکەی خۆی کەلەکەی دڕی.

ئەو کات هەستام و لەسەر دو ئەژنۆ دانیشتم. یورچی لەبەردەممدا رەتەڵی دەبردو بەچەپ و راستدا دەچەمایەوە.

دەستێکی لەسەر کەلەکەی دانابوو و بەدەستەکەی تری دەیویست رمەکەی لەسەر زەوی هەڵگرێت کەهێرش بکاتە سەر یوری بەڵام توانای ئەم کارەی نەبوو و لەتاو ئازار دەلەرزی و دەتلایەوە.

خولەکێکیتر بەهەمان شێوە لەسەر پێ وەستا و سەرئەنجام دەستی سست بوو. دەستی لە کەلەکەی بوویەوە و کەوتەخوار. قڵشی کەلەکەی لەلای منەوە بوو. بەدوچاوی خۆم ریخۆڵەکانم دەدی کەلەوێ دەردەچن و دێنە دەر.

لەژێر پێیدا گۆلاوێك لەخوێن دروست ببوو ودواتر کە کەوت ،کەوتە ناو ئەوگۆلاوە خوێنەوە و ئیتر تەکانی نەخوارد. دەمویست سوپاسی یوری بکەم بەڵام دەرفەتی نەداو خۆی خەنجەرو رمێکی هەڵگرت و وتی:

رمەکەی تر تۆ هەڵیگرە و خێراکە وەگەرنە ئەوانیتر دەکوژرێن. نابێت کات بەفیڕۆ بدەین. هێشتا دەلەرزیم و توانای جووڵەم نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانم لێبرد و رمەکەم هەڵگرت و بەدوایدا بەڕێکەوتم. ئەوەندە بەخێرایی دەرۆی ناچار بەدوایدا رامدەکرد و تادوانەکەوم. بەم شێوەیە نزیکەی سەد مەترێ لەوێ دوور کەوتینەوە.

خۆم پێگەیاندو پرسیم: ئەو سێ کەسەی لەگەڵماندا بوون چیان لێهات.

یوری بەخوێنساردی و وەك ئەوەی روداوێك روی نەدابێت وتی:

کاتێك لەپشت دارەکە خۆم شاردبوویەوە و ئەو یوچیە لەسەر سینەی تۆ دانیشتبوو ئەوسیانە بەدەست یوچیەکانی تر کوژران. سەریان برین و بردیانن. وام زانی لەو سێ

کەسە کەس نەماوەتەوە. لەم کاتەدا یوری هەلهەلەی کێشاو تا لەچەندایەتی و چۆنایەتی رووداوەکان ئاگادار بێتەوە و ئەوان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. ئەویٚ کە ئێمەی لیٚ وەستابووین کوشتارگایەکی راستەقینەبوو. لەهەرلایەکم دەڕوانی جەستەی چەند ژن و پیاوێك خەڵتان لەخوێندا دەبینرا.

دەلەرزیم. لەترسا جەستەم تەڕی ئارەق بوو بەڵام نەمدەوێرا لەمبارەوە لەگەڵ یوریدا قسەبکەم. یوری یەك دو جاریتر هەلهەلەی کێشاو و کەم کەم دەنگی خشە خشی دارەکان بەرزبوویەوە و دیاربوو وەحشیانی هۆزی ئامازۆن لێمانەوە نزیکن.

ئەمە گوومانی من بوو. وام دەزانی تەنیا ئامازۆنیەکان گوێیان هەیەو دەبیستن لەناکاو شتێکم بینی کە بەهیچ شێوەیەك چاوەڕێم نەدەکرد. بەقامکە لەشانی یوریمدا و سەرنجم بۆ دەوروبەر راکێشا. ئەو بەسەر ئیشارەی کردو تێی گەیاند ئاگای لێیە. لێرەدابوو کەدوایین هەلهەلەی کێشا.

ئەم دەنگە بەشێوەیەکی سەیر لەجەنگەڵ دەنگی دایەوە. گوێچکەی منیش دەنگی دەدایەوە و دەتوت ڤارگۆنێکی بار یان شەمەندەفەرێك لەچەند هەنگاوی مندا سووت لێدەدات.

ئارەقێکی سارد لەسەر ناوچاوم دانیشت بەڵام بەرووی خۆمدا نەهێنا. دەنگی خشەخشی دارەکان زیاتربوو. تائەوەی لەناکاو دەنگی رمی رەش پێستەکانی یوچی کە بەشێوەیەکی تایبەت بەپەری سپی رازێنرابوونەوە لەم لاولادا دەرکەوت و تازە زانیم چ بەڵایەکی گەورە یەخەی گرتووین؟ ئایا لەوکاتەدا دەمانتوانی رابکەین......! هەرگیز.... چوونکە هیچ رێگەیەك بۆ هەڵاتن نەبوو. لەچوار دەورەوە گەمارۆ درابووین. دەنگی هەلهەلەی یوری لەجیاتی ئەوەی دۆستان ئاگادار بکاتەوە، دوژمنانی هێنایە لامان و ئێستا دەمانتوانی چی بکەین.......؟

نیشاندانی بچووکترین پەچەکردار یان خۆراگریەك یەکسان بوو لەگەڵ لەدەستدانی گیانمان. بەشی خۆم بیٚ ئەوەی دەست لەپیٚ درێژبکەم وەستام و لەچاوەڕوانی مەرگ ئەویش مەرگێکی دڵتەزێن و بەئازار مامەوە. ئێوە ئەگەر لەجیاتی من و لەم بارودۆخەدا گرفتار دەبوون چیتان دەکرد؟ جگە لەخوێنساردی و زاڵ بوون بەسەر خۆ و بەهێزکردنی ئێرادە دەمتوانی کارێکیتر بکەم...؟ کەواتە جگە لەمە کارێکم نەبوو. بەردەوام تەلقینم بەخۆم دەکردو دەموت ئارام بە. رووداوێکی خراپ روونادات. ان شاللە ئەوان دەزانن من بیانیم و نامکوژن.

بەڵام ئەم بیرانە گاڵتە ئامێزبوو کە بەمێشکمدا تێدەپەڕی و لەدەرەوەی سنوری ئەندێشە راست نەبوو. لەم کاتەدا یوری وەك ئاژەڵێکی دڕندە روی چاوە خوێناویەکانی کردە من و وتی: تۆ ئاگات لەپشت سەری من بێت.

خێراو بەناڕەحەتی پرسیم: دەتەوێت چی بکەیت؟

ئەو لەجیاتی ئەوەی وەڵامێکی دڵخۆشکەرو ئارامکەر بەمن بدات وتی:

چەند فیشەکمان هەیە.....؟

وتم: تەنیا دوان. یەکیان لەناو لولەکەدا گیری کردوە! جگە لەتەسلیم بەمەرگ چارەیەکمان نیە بەڵام خۆم باشتر لەهەرکەسێك دەمزانی یوری پیاوێکە بەتەسلیم رازی نابێت. ئەو وەك پۆڵا و ئاسن بەهێزو نەشیاو بۆ شکەست بوو. لەمردن نەدەترسا و تەنیا شتێك لێی دەترسا ئەوەبوو بە پەستی و لەناو جێگەدا بمرێت.

یوری چەند جارێکیتر سەیری دەوروبەری کرد وتی:

دەبێت چارەیەك بدۆزینەوە......؟ یوچیەکان گەمارۆیان داوین و بەزووی تیکە تیکە دەبین. ئایا سلاحی ترت پێیە.

لەجیاتی ئەوەی وەڵامی بدەمەوە قەمەیەك کەلەدەستمدابوو نیشانم دا. مەبەستەکەم تێگەشت. یوچیەکان بەقیافەی زراو تۆقێن، بەڕمە ژاراوی و درێژەکان دەوریان گرتبووین و بەچاوی خوێناوی سەیریان دەکردین. ئاگاییەکی کەم بەنرخی گیانمان تەواو دەبوو. من و یوری پشتمان بە پشتی یەکەوە نابوو بەشێوەیەك کەس نەتوانێت لەدواوە هێرش بکاتە سەرمان.

لە ئاوا حاڵەتێك لەناکاو گیاکانی ژێر پێم تەکانی خوارد و دەنگێك بیسترا.

بەگوومانی ئەوەی یەکێك لە یوچیەکان دەیەوێت لێمان نزیك ببێتەوە قەمەکەم بەرز کردەوە کە بەوپەڕی هێز بیهێنمە خوار لەناکاو دەنگێك بیسترا کە دەیووت:

نەکە...... نەکەی....... منم.

جوان وردبوومەوە قیافەی خەمبارو ئارەقاوی مووناکم لەناو گیاکاندا بینی. دەست بەجێ دانیشتم و وتم: تۆ لێرە چی دەکەیت....

لەکاتێکدا هەناسکە هەناسکی لێدەدا و زیاد لەرادە ماندوو بوو وتی:

یوچیەکان ئێستا هێرش دەکەن. ئەوان عادەتیانە هەمیشە لەیەك لاوە هێرش دەکەن. ئاگادارین. هەرکاتێك دەنگی فیکەتان بیست هێرش دەست پێ دەکات. ئاگاتان لەخۆتان بێت. تاقمێکم لەسەد هەنگاوی ئێرەدا بۆ ئێوە ئامادە کردوە. ئەگەر دەتوانی لەگەڵمدا

وەرە. پرسیم بۆ چی...

وتی: ئایا لەو داردەستانەت دەوێت ئیشارەی بەتفەنگەکەم کرد.

من و یوری هەردوکمان سەیری مووناکمان کرد بەڵام بەداخەوە دەرفەتی پرسیارو جواب نەما چوونکە لەم کاتەدا دەنگی فیکە بیسترا و هێرشی یوچیەکان دەستی پێکردو شەڕگەرم بوو.

من دەموەشاند... یوری دەیوەشاند و یوچیەکانیش. بەڵام مووناك لەناو گیاکان نەهاتەدەر خۆی نیشان نەدا. لەیەکێك لەهەستیارترین ساتەکان مووناك دوبارە دەستی منی گرت و وتی: من شوێنێك دەزانم بڕێکی زۆر لەم داردەستانەی لێیە دەتەوێت....؟

بێ ئەوەی شتێك بڵێم بەدوایدا ڕێکەوتم. ئەو لەناو گیاکاندا لەسەر سك دەخشاو دەڕۆشتە پێش و منیش هەروەها. تەنیا کارێك کردم ئەوەبوو بەیوریم وت:

ئەوەندە بەرگری بکە تا دێم و ئەو بەئیشارەی سەر بەڵێی پێ وتم و بەشادمانی ڕۆشتم. لەماوەی چەند خولەکێکی کورت مووناك منی لەورێگایانەی دەیزانی لەمەترسی دوورکردەوە و بردمیە شوێنێك کە تا ئەو ڕۆژە نەمدیبوو.

ئەوێ بەردەڵانێکی بەربڵاو بوو کەلەهەمان کات پڕبوو لەدار و دیارنەبوو چۆن جەنگەڵ لەناو ئەو بەردەڵانەدا ڕواوە یان ئاوی لافاو چۆن بەردەکانی کێشاوەتە ئەوێ.

لە بەردەڵان تێپەڕین. مووناك وەك مەلێك دەڕۆشت و منی ڕێنوێنی دەکرد. نزیکەی دەخولەك دواتر گەشتینە نزیك ڕووباری تاڤگە ئاودارەکانی ئامازۆن. دەنگی ڕژان و پرژەی ئاوەکە مرۆڤی کەڕ دەکرد و ڕێگربوو لەوەی من و مووناك بەئارامی قسە بکەین.

ئیشارەیەکی کرد و وتی: لێرەیە.

پرسیم: چی لێرەیە....؟

مووناك بێ درەنگ کەمێك گژوگیای لابردو تا چاڵێکی قووڵ لەژێریانەوە دەرکەوت. لەکۆتایی ئەم چاڵە تەپۆڵکەیەك لەتفەنگ و ڕەشاشی دەستی و فیشەکی تفەنگ و ڕەشاش بوو. کاتێك چاوم بەسلاحەکان کەوت نزیك بوو لەشادمانیدا بقیژێنم.... شوێنی خۆی بوو شێت بم چوونکە لەوبارودۆخەدا کەمەرگ و ژیانمان بەتاڵە موویەك بەسترابوو ڕەشاشێك چ کارێکی بۆ نەدەکردین.

بێ درەنگ لەجیاتی ئەوەی لەمووناك بپرسم سیلاحەکان هی کێیە و چۆن لەوێدا کۆکراوەتەوە پەریمە ناو چاڵەکە و دو ڕەشاشم تاقی کردەوە.

کێشەکە لەوەدا بوو ڕەشاشەکان بەهۆی نمی جەنگەڵ کەمێك ژەنگیان هەڵهێنابوو

خاوکاریان دەکرد بەڵام بەگشتی کەڵکی باشیان هەبوو. دو مەخزنن فیشەکم هەڵگرت و بەخێرایی لەچاڵەکە هاتمە دەر.

ئیتر کارێکی گرنگم نەبوو تەنانەت چاوەڕێی مووناکیشم نەکرد. لەورێگاوەی هاتبووم بەڕێکەوتم و دوای چەند خولەك خۆم بەیوری گەیاند

کاتێك گەشتم لەبارودۆخێکی زۆر خراپدا گرفتاربیبوو. لەچواردەورەوە گەمارۆیان دابوو وهەرکام لە یوچیەکان بەشێوەیەك هێرشی دەکردەسەر و نوکی رمەکەی لەجەستەی دەچەقاند.

خوێنی لەسەرو روخساری دەچۆرا بەڵام بەرووی خۆیدا نەدەهێنا و ئازایانە شەڕی دەکرد. گەشتمە چەند هەنگاوی ئەو کەیەکێکیان هێرشی کردەسەرم و خۆی دا بەسەرما.

بەو هەموو شتە قورسەی لەدەستمدابوو دەمتوانی بەباشی بەرگری لەخۆم بکەم و لەئەنجامدا ئەو رەش پێستە بەخێرایی پەڕیە سەر سنگم و خەنجەرەکەی کێشا تا سەرم ببڕێت بەڵام لەوکاتەی دەیویست نوکی خەنجەرەکەی لە قورگم نزیك بکاتەوە بە ئەژنۆ ئەوم لەسەر سینەم فڕێداو بەخێرایی سەری ئەوم بڕی. سەرە خوێناویەکەی لەدەستمدابوو. بەبینینی ئەمە حاڵم تێك چوو...

تا ئەوکات سەری کەسم نەبریبوو... بیریشم نەدەکردەوە تواناو ورەی ئەو کارەم هەبێت.

بەڵام هەرچی بوو سەریم بڕی.

لەسەری بڕاوی رەش پێست دڵۆپ دڵۆپ خوێن دەچۆرا. ماسوولکەکانی روخساری کە هێشتا نیوە گیانیان تیابوو دەکرانەوەو دەبەستران و تەکانیان دەخوارد.

بینینی ئەم دیمەنە ئەوەندە بۆم ترسناك بوو وەسف کردنی ئەگەری نیە. سەرتاپام ببووە پارچەیەکی گەرم. گەرمیەکی ئازاردەرو ناڕەحەت کەرو سەرە بڕاوەکە لەدەستمدا دەلەرزی.

کاتێك ویستم سەرەکە فڕێدەم و خۆم بەیوری بگەیەنم، هەستم کرد رەش پێستێکی تر لێم نزیك دەبێتەوە.

ئەو درەندەتر لەیەکەم بوو. قیافەیەکی ترس ئەنگێزی بوو کەبیرکردنەوەی ئێستاش موو لەسەر جەستەم راست دەکات.

بەخێرایی سەرە بڕاوەکەم فڕێدا و قەمەکەم بە بەهێزی لەدەستمدا گرت بەڵام

نەمدەتوانی شەڕی لەگەڵدا بکەم چوونکە ئەو ڕمی لەدەستا بوو و درێژتر لەقەمەیە و لە ڕێگەیەکی دوورترەوە دەتوانێت کاری خۆی بکات. دەمتوانی چی بکەم......؟

چەند جار شوێنی خۆم گۆڕی. بیرم لەوە دەکردەوە لەڕەشاشەکان کەڵك وەربگرم. بەڵام هێشتا شیاوی کەڵك لێوەرگرتن نەبوون. دەرفەتی دەویست ڕێکی بخەم و نەواری فیشەکی لەسەر دانێم و ئەو کەرەستە کانزاییانە بکەمە سیلاحێکی باش و ئێستاش کاتێئەم کارانە نەبوو.

یەك دو جار نوکە تیژەکەی لەمن نیشانە گرت. مەبەستی ئەوە بوو پەچەکرداری من بزانێت وئاگاداری ڕادەی تواناییم بێت. کاتێك ئاسوودە بوو کەتواناییم نیە وتەسلیم بووم بەورەیکی زیاتر دەستی بردەسەرو خەنجەرەکەی بۆسینەی من ڕەهاکرد.

نەمزانی چی بوو.... لەناکاو خۆم کێشایە دواوە. ئازارێکی توندم لەپشتی خۆمدا هەست پێ کرد و کەوتم لەهۆش چووم... ڕەنگە مردبووم و خۆم نەمدەزانی.

هەندێ کات ڕوودەدات کەمرۆڤ خۆشی نازانێت بەڕاستی مردوە یان نا. منیش لەوکاتەدا ئاوا حاڵێکم هەبوو. ئێستاش کاتێك بیر لەوبارودۆخە دەکەمەوە بەجوانی هەست دەکەم کەمردووم بەڵام چی بوو کەدوبارە زیندوو بوومەوە دیارنیە و ئەمەش بابەتێکی ئاڵۆز و تەماوی دروست دەکات.

ئەگەر مەرگ ئەوەیە کەمن بینیم و هەستم پێکرد زیاد لەڕادە شیرین و چێژ بەخشە. لەسەرەتادا کەمێك هەستم بە ئازار دەکرد. دەتوت ئاسنێکی تیژیان لەپشتم چەقاندووە. جگە لەمە دەردو ئازاری تر نەبوو و ڕەنگە هۆکاریش نەبوو. کۆنترۆڵی دەمارەکان و پەیوەندی دەمارو مێشکم لەدەست دا و هەستم بەئازار نەدەکرد.

ئەمە کەمە دەردو ئازارەش کەم کەم لاواز و لاوازتر دەبوو. تاکاتێك خەوێکی خۆش و شیرین منی بردەوە و لەجیاتی ڕەنج و ئازار چێژێکی بێ کۆتایی لە ڕۆحمدا دروست بوو.

وەك ئامارژەم پێدا کاتێك ڕمی ڕەش پێستەکە ڕەهابوو، من سووتانەوە و دواتر ئازارێکی ناڕەحەت کەرم لەپشتی خۆمدا هەست پێکرد بەڵام ئەم ئازارە کەم کەم لەناو چوو و شوێنی خۆی دا بەخەوێکی شیرین. وەك کەسێك چوبێتە ژێر کاریگەری کولۆرۆفۆرم. لەهۆش چووم و تووشی بێ هۆشیەکی چێژ بەخش بووم کەباس کردنی تەنیا دەبێتە هۆی درێژی وتە. لەمە دەگوزەرێین بەدوای ڕوداوەکەدا دەڕۆین.

لەوکاتەی لەحاڵەتی بێهۆشیدا نوقم دەبووم ودەمویست لەوێ لەسەر وردەبەردەکانی

سەر زەوی بخەوم. بەکەمێك هەست کە بۆم مابوویەوە، دەنگێکی هاوشێوەی دەنگی ڕەگباری ڕەشاشم بیست.

ئێستا لای خۆتان گوومان دەکەن مرۆڤ لەکاتی بێهۆشیدا چۆن دەنگەکانی دەورووبەری خۆی دەبیستێت.....؟ بەڕاستی سەیرە، نەتەنیا بۆ ئێوە کە خوێنەری ئەم دێرانەن نائاسایە بەڵکو بۆ خۆشم باوەڕ پێنەکراوە.

ئەگەر ئەم بابەتە کەسێکی تر دەیگێرایەوە بۆئەوەی باوەڕی پێبکەم هەزاران سوێندی دەخوارد. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ من باوەڕ پێنەکراوبوو و بەدژواری و سەختی دەمتوانی پێی رازی بم بەهەمان شێوە کە ڕەنگە ئێوەش باوەڕ نەکەن.... بەڵام جگە لەراستی شتێك نانوسم و بەپێی سوێندێك کەخواردومە لەم بەرسەرهاتەدا بەهیچ شێوەیەك کەمترین درۆ بەکارناهێنم کەواتە ئێوەش باوەڕ بکەن. بەهەرحاڵ کاتی بێهۆشی دەنگێك هاوشێوەی دەنگی ڕەگباری ڕەشاشم بیست و ئیتر لەهیچ تێنەگەشتم و هیچم نەبیست.

چەند کاتژمێر یان چەند خولەك بەم شێوە تێپەڕی. چ ماوەیەك لەو شوێنەدا مامەوە نازانم. نەمدەزانی چ روداوێك روویداوە و یوری و مووناك و ئەوانیتر چییان بەسەر هات.

لەکاتێك ساردیەکی تایبەتم لەسەر ناوچاوی خۆم هەست پێکرد ساردیەکی تێکەڵاو بەنمی فشارم لەخۆم کرد تا چاوەکانم بکەمەوە بەڵام سەرنەکەوتم. دەتوت پێڵوەکانم بەردی قورسیان پێوە هەڵواسراوە و ناتوانم بەو قورساییە چاوەکانم بکەمەوە.

دوبارە تەڕیم لەسەر ناوچاوم هەست پێکرد و دوای چەند ساتێك دەنگی ژنێکم بیست کەدەیوت: سەیرکە، سینەی بەرزو نزم دەبێت. هەناسەدانی زۆر ئاسایی بۆتەوە دەڵێی بەم زوانە دێتە هۆش. ژنکە بێدەنگ بوو بەڵام دەست بەجێ دەنگی پیاوێك بەگوێ گەشت کەدەیوت:

خوێنێکی زۆری لێ ڕۆشتوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەزانم توانای بەرگری ئەو لەبەرانبەر خوێنرێژیدا چەندەیە ! خەیاڵت ئاسوودە بێت... تا چەن خولەکیتر دێتە هۆش.

دەنگی ژنەکەم نەناسی. لەو کاتەی تازە هاتبوومە هۆش گوێچکەکانم زەنگیان لێدەداو و خشە خشی دەکرد. بەهۆی ئەمە دەنگی ئەو ژنەم نەناسی بەڵام دەنگی پیاوەکەم بەبێ دژواری ناسیەوە. ئەوە یوری بوو کە سەبارەت بەمن قسەی دەکردو دڵنیای دەدا کە زیندوو دەمێنم. یوری لەگەڵ کێدا قسەی دەکر.د ڕەنگە مووناك لەوێ

بوو و لەگەڵ یوریدا قسەی دەکرد....

سینەم تەنگ دەبوو. هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا بەڵام هەناسە نیوە ناچڵ مایەوە چوونکە ئازارێکی زۆرو پڕ ئەشکەنجە لەپشتم دا دروست بوو کە وەسف ناکرێت.

ئەم ئازارە بەناڵەوە بوو کە لە قوڕگم هاتەدەر و لەوناوەدا دەنگی دایەوە.

دوای ناڵەکە دوخاڵی گەرمم لەسەر شانەکانم هەست پێکرد و خێرا زانیم دو دەستی پڕ خۆشەویستی ژنانە لەسەر شانەکانی من جێگیربووە و لەهەوڵی من بۆ هەستان رێگری دەکات.

جارێکیتر زەختم لەخۆم کرد.... هەوڵم دا.... تێکۆشیم و سەرئەنجام سەرکەوتم کە کەمێك پێڵوەکانی چاوم بەرز بکەمەوە.

رووناکیەکی رۆح پەروەر لەناو چاوەکانمەوە هاتە ناو و تاقوولآی رۆحم رۆشت و گیانی پێ بەخشیم... گوومانم نەدەکرد زیندوو بمێنم و بژیم. بەهیوانەبووم هەڵاتن و ئاوابوونی خۆر ببینم.... کاتێك لە هۆش چووم لەدنیاو جوانیەکانی ماڵئاوایم کرد بەڵام ئێستا بەباشی خۆم بەزیندو دەبینی.

چ بەختەوەریەکی گەورە..... ئایا بەڕاستی زیندووم؟

لەگەڵ ئازارێك کە هەرجارە و لەپشتمدا دروست دەبوو جارێکیتر لەشادمانیدا هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو زیاتر پێڵوەکانی خۆم کردەوە تادەوروبەری خۆم ببینم.

یەکەم شت کەدوای رووناکی رۆژ و هەستی زیندوو بوون بووە هۆی بەهێزی رۆحم، بینینی روخسارە جوان و گیان شێتی لئۆنابوو...

کاتێك بینیم دوبارە ئەم گومانە لام دروست بوو رەنگە مردووم و هەمووی ئەمانە لەدنیای مەرگ و نەبووندا دەبینم و دەبیستم.

جارێکیتر پێڵوەکانم تروکاند تا تاریکی چاوەکانم نەماو بەجوانی لە روخساری لئۆنا وردبوومەوە و لەم کاتەدا وتم:

ئاخ.... لئۆنا تۆیت.......؟ ئایا خەو دەبینم......؟ من زیندووم یان مردووم.....؟

دەنگی گەرم و ئارام بەخشی دەستگیرانە خۆشەویستەکەم دوبارە بیسترا کە دەیوت.

بەڵێ ئازیزم..... لئۆنام..... تۆ زیندوویت ! بەخۆشحاڵیەوە زیانی گەورەو مەترسیدارت بەرنەکەوتوە و بەخێرایی چاك دەبیتەوە.

بەم حاڵە شپرزە، پەشۆکاویە کەلەبەردەم دەروازەی نەبوون و بوون دابووم مێشکم باش کاری دەکرد و سەرنجم لەبارودۆخی لئۆنا بوو بیرم دەکردەوە.

لئۆنا لە کوێ بوو؟ لێرە چی دەکات...؟ مووناك چۆن هەڵس وکەوتی لەگەڵ دەکات.... ئەم کچە ئەحمەقە عاشقە لەبەر یارمەتیدانی من دوبارە گیانی خۆی خستۆتە مەترسیەوە و لەمووناك نزیك بۆتەوە بۆ..... چۆن وێرای ئەم کارە بکات....؟

دەمویست هەموو ئەم پرسیارانەی لێبکەم و وەڵامەکەیان لەزمانی خۆیەوە ببیستم توانای قسە کردنم نەبوو.....

یەك دو جار دەمم کردەوە بپرسم بەڵام لئۆنا بەشێوەی پاڕانەوە وتی:

ئازیزم..... قسە مەکە..... ئارام بخەوە ! یووریش سەلامەتە بەم شێوە بووە ڕێگری لەقسەکردنی من.

لەدواپین سات دەنگی یووریم بیست کە فەرماندەرانە زۆر بەجیدی وتی:

بخەوە.... هەوڵ مەدە... قسەکردن بۆ تۆ ئێستا لەزاری ماری کوبرا مەترسیدارترە چوونکە دوورنیە برینی پشتت دەم بکاتەوە و ئەوەندە خوێنت لێبڕوات کەبمریت.

دەنگی یوری و شێوەی وتنی فەرماندەرانەی نەبوو منی بێدەنگ و ئارام کرد. ڕاستیتان بووێت ئیتر نەمدەوێرا قسەبکەم چوونکە دەترسام یوری دەست و قاچم ببەستێتەوە و سەری تەنافەکان لەزەویدا بچەقێنێت. بۆیە بۆ ڕێگرتن لە ئاوا ڕووداوێك مۆری بێدەنگیم لە لێودا.

بەڕێکەوت بەهۆی لاوازی زۆر چاوەکانم دوبارە قورس بوونەوە و خەوم لێکەوت. دواتر زانیم شیفا بەخش و ئارام کەرەوە کە دەرخواردیان دابووم لە ئازارو بێ خەویەکەم ڕێگری دەکرد و ئەوەندە منی ئارام کردبوو کە هەستم بەهیچ ناڕەحەتیەك نەدەکرد.

هەوا بەتەواوی تاریك ببوو کەهەستام. وامزانی تەنیا چەند کاتژمێر خەوتووم ئێستا چاوەکانم بەجوانی دەکرایەوە و باش ببووم... دەمویست لەشوێنی خۆمدا دانیشم بۆیە ئەنیشکم خستە ژێر جەستەم تاهەستم، لئۆنا کە لە سووچێکی ژوورەکە دانیشتبوو، هاتە پێش و منی گرت و بەپاڕانەوە وتی:

بخەوە ئازیزم، بخەوە. تۆ زیاتر لەهەرشتێك پێویستیت بەحەوانەوە هەیە ! زیاتر لە شەو ڕۆژێکە یەکسەر خەوتوویت.

بەخێرایی تەسلیم بووم و لەگەڵ ئەوەی ئازارێکی کەمی شیاوی بەرگە گرتنم بوو لە جێگاکەمدا کەوتم بەڵام بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

چیت وت.......؟ من خەوتبووم........؟

لئۆنا ماچی کردم و لەکاتێکدا بەپەنجە ناسکەکانی دەستی بەقژمدا دەهێنا وتی:

بەڵێ ئازیزم، تۆ دوێنێ نزیك نیوەڕۆ هاتیتە هۆش و دواتر خەوتویت.... بۆ ئەوەی ئارام بخەویت من لەو دەرمانە شیفا بەخش و خەوهێنەرەم دەرخوارد دایت، کەم کەم دەمکردە ناو دەست و تۆ بێ بەرگری دەتخوارد.

ئەمە سەرسوڕمانەکەی زیاتر کردم و دوبارە پرسیم:

چەندە ڕۆژە لەجێگادام؟ جوان هیچ شتێکم بیرنایەت.

لئۆنا پێش ئەوەی وەڵامم بداتەوە پرسی:

ئێستا چۆنیت.......؟ ڕاستی هەست بەئازار دەکەیت.........؟

دڵنیام کردەوە. لێوەکانی لئۆنا لەشادمانیدا بەبزە کرایەوە و وتی:

چەند باش بوو لەمەرگ ڕزگارت بوو. ئەگەر تۆ دەمردیت منیش خۆم دەکوشت. ئێستا کەحاڵت باشە منیش ڕاستیەکەت پێ دەڵێم... ئەمە شەشەمین ڕۆژە تۆ لەجێگادا کەوتوویت.

شەش ڕۆژ......؟ ڕاست دەکەیت...؟

بەڵێ ئازیزم. شەش ڕۆژە تۆ لەم جێگادا خەوتوویت. سێ جار بەهۆش هاتیتەوە و هەرجارەو لەو دەرمانەم ڕژاندە قورگتەوە و دوبارە ڕۆشتیتە خەوێکی قووڵ. لئۆنا لەکاتێکدا بڕێکی زۆر نان و گۆشتی کوڵاوی بۆ دەکردمە پارو تا دەرخواردم بدات وتی:

یوری پێش ڕۆشتن دەستووره پێویستەکانی لەبارەی تۆدا ! کاتێك بەتەواوی خەیاڵی لەلایەن تۆوە ئاسوودەبوو ڕۆشت.

ئەمە ئیتر بەتەواوی گێژی کردم.

ڕۆشت بۆ کوێ؟

لئۆنا دەتوت نایەوێت وەڵامی ئەم پرسیارەم بداتەوە و لەوەی نەیتوانیبوو دەمی خۆی بگرێت و ببووە هۆی نارەحەتی من، هەستی بەشەرمەزاری دەکرد. من ئاگادارم کردەوە و ناچار ڕاستیەکەی بەم شێوە بۆ باس کردم:

ئەو کاتە تۆ بەهۆی ڕمی یوچیەکان کەوتبوویت یوری نازانم چۆن ڕەشاشێکی دەست خست و هێرشی خۆی بۆسەر یورچیەکان دەست پێکرد. ئەوان وەك گەڵای دار دەرژانە سەر زەوی بۆیە بەباشیان زانی رابکەن لەجیاتی ئەوەی بمێننەوە. ڕاکردنی ئەوان بەئاسانی ئەنجامی نەگرت چوونکە لەکاتی ڕاکردن بەکێشان کێشان موونکیان لەگەڵ خۆیان برد.

قسەکەیم بڕی وتم: منداڵەکەیان کوشت؟ ئەویان کوشت؟ قسە بکە !

لئۆنا وتی: لەبابەت مناڵەکە ئاسوودەبە چوونکە مووناك مناڵەکەی فرێدایە ناو گیاکان وئەوی لەچاوەکان دوور کردەوە. بەم گیانبازیە مناڵەکەی ئەو و تۆ رزگاری بوو و ئێستا لای پەرستارەکەیەتی وبەوپەڕی تەندروستی یاری دەکات. ئەگەر حاڵت باش بووایە دەمهێنا تا ببیینی. بەڵام بەیانی دەیهێنم.

کاتێك خەیاڵم لەبابەت مناڵەکە ئاسوودە بوو لئۆنا سوێندی خوارد کە درۆناکات پرسیم: مووناکیان بۆ کوێ برد....؟

ئەویان بۆ هۆزەکەی خۆیان بردو بەدڵنیایەوە ئەشکەنجەی دەدەن.... یوری و تاقمێك چەکدار بۆ رزگاری ئەو رۆشتوون.

لە بیستنی ئەم هەواڵە بەڕاستی ترسام بەڵام بەباشم نەزانی لەبەرچاوی لئۆنا ترسەکەی خۆم ئاشکرا بکەم و تا ئەوشوێنەی دەکرا بەسەر خۆمدا زاڵ بووم و بۆئەوەی لە خەمی خۆم کەم بکەمەوە، خۆم خستە سەر تەختەکە و چاوەکانم بەست.

لەناخمدا ئازارو شۆرشێك دروست ببوو کە دەمویست بقیژێنم و بڕۆمە جەنگەڵ و هەموو شوێنێك بسوتێنم و دنیا لەناوبەرم.

دەزانن ئەو هەموو ناڕەحەتیە لەکوێوە سەرچاوەی گرت بۆ وا پەرێشان ببووم.....؟

ناڕەحەتیەکەم دو هۆکاری بوو: یەکەم ئەوەی لە ونبوونی مووناك خەمبار بووم و ئەویتر ئەوەی لە کردەوەی نابەجێ کەی یوری دەترسام.

یوری کردەوەیەکی مەترسیداری ئەنجام دابوو. ئەو زیندو لەم سەفەرە نەدەگەڕایەوە. دڵنیابووم بۆیە مووەکانم راست ببوونەوە و ئارەقم دەکردەوە.

لئۆنا کەمنی بەناڕەحەت بینی بەدەستماڵ ئارەقی ناوچاوی سریم و دەستی بەکوڵمەکانمدا هێنا، دەستی بەقژمدا هێنا تا لەخەمم کەم کاتەوە. وای دەزانی لەئازاری خۆم دەناڵێنم و بۆ شاردنەوەی ئازار ئارقم کردۆتەوە.

ئەو شەوەشم بەناڕەحەتی بەسەر برد و چوونکە دەمزانی لئۆنا دەرمانی خەوهێنەرم دەرخوارد دەدات تەنانەت لە خواردنی چێشتی ئاسایی خۆم بەدوور گرت. نەخشەیەکم کێشابوو کە ئەگەر خەوم لێدەکەوت ماوەیکی تری بەسەردا تێدەپەڕی و ئەنجامدانی ئەو نەخشە کەلەخۆگری رزگارکردنی یوری بوو ئەگەری نەبوو.

## ٩

شەو تێپەڕی... نزیك بەیانی چەند کاتژمێرێك خەوتم کاتێك چاوم کردەوە هەستم کرد لئۆنا دوبارە دەیەوێت لەشەربەتەکەم دەرخوارد بدات و وەك رۆژەکانی پێشو بێهۆشم کات. بە تووڕەییەوە لە شوێنەکەم هەستام و مەچەکی دەستیم گرت وتم:

چی دەکەیت......؟

لئۆنا دەستی بەگریان کرد وتی:

دویٚ شەو تابەیانی بەئاگابووم، هەموو ناڕەحەتیەکانی تۆم بینی و جوان تێدەگەم لەڕۆشتنی یوری و نەمانی مووناك ناڕەحەتیت بەڵام....بەهەمان تووڕەییەوە پرسیم:

بۆ دەتەوێت بێهۆشم بکەیت......؟

بۆئەوەی دەتەوێت بەدوای ئەواندا بڕۆیت... و حاڵی تۆ باش نیە.

من بۆ تاقی کردنەوەی حاڵی خۆم لە شوێنەکەم هەستام و لەجێگا هاتمەدەر. سووتانەوەم لەپشتی خۆمدا هەست پێدەکرد. دیاربوو هێشتا برینەکەم چاك نەبۆتەوە بەڵام ئەو ئازارو سووتانەوە شیاوی خۆراگرتن بوو و ئەگەر سەرم گەرم بووایە ئازاری نەدەدام.

لئۆنا دەگریا. دەپاڕایەوە، بەڵام سوور بووم و ئەوەندە توندیم نیشاندا کە لئۆنا رەزامەندی نیشاندا بڕۆم بەومەرجەی ئەویش لەگەڵ خۆمدا ببەم. من بەم مەرجە رازی نەبووم. لێم پرسی: بیرمە لەدوایین رۆژ کەبریندار بووم مووناك چەند سیلاحێکی بەمن دا.... ئێستا ئەو سیلاحانە لەکوێن......؟

لئۆنا بیری کردەوە وتی: من دەزانم چەند ساڵ پێش پیاوانی ئێمە وەك ئەم جارە بۆ شەڕ رۆشتبوونە شوێنێکی دوردەستی جەنگەڵ. کاتی گەڕانەوە روبەڕوی تاقمێك سپی پێست دەبنەوە و بۆ دیل کردنیان شەڕیان لەگەڵ دەکەن. چوونکە ژمارەی پیاوەکانی ئێمە زیاتربوو سپی پێستەکان هەموویان کوژران و هەموو شت و کەل و پەلەکانیان وەك دەستکەوت دەستی بەسەردا گیرا. لەناو کەلەوپەلەکانیان بڕێکی زۆر سیلاح دەسکەوت کە چۆنیەتی بەکارهێنانیمان نەدەزانی و مووناك لەشوێنێکدا شاردنیەوە و ئەمە ئەو سلاحانەیە. پرسیم.

کارم بەوەنیە چۆن بەدەست هاتوە ئێستا لەکوێدان.

یوری هەمان ڕۆژ یەکێکیانی چاك کردەوەو بردی. ئەگەر سیلاح نەدەبوو تۆ ڕزگارت نەدەبوو. لئۆنا لەم کاتەدا بیری کردەوە و ئەوسات بەسەرسوڕمانێکی زیاد لەرادە وتی:

نازانم چی بوو چ جادوویەکیان تیادانابوو کەلەناکاو بەنزیك بوونەوەی یوچپیەکان دەنگێکی ترس بزوێنی دەکرد و ئاگر لەدەمەکەی دەردەچوو و یەك لەدوای یەك وەحشیەکانی دەکوشت.

زانیم یوری بەڕەشاش چەکدارەو ئەمەش دڵخۆشیەك بوو بۆمن. داوام لە لئۆنا کرد بمباتە شوێنی سیلاحەکان. لئۆنا ڕازی بوو و منی برد بۆ شوێنێك کەسیلاحەکانیان گواستبوویەوەو بەدەستوری یوری ڕۆنیان لێدابوو. لە لئۆنام پرسی کێ ئەمانەی پاك کردۆتەوە و ڕۆنی لێداون. وتی یوری ئەم کارەی کردوە.

یوری هەمیشە بۆ من بەکەڵك بوو. ئەم جارەش بەخزمەتی خۆی کێشەیەکی گەورەی چارەسەر کردبوو و ڕۆشتبوو. بەم مانایە کاتێك ڕەشاشێکم هەڵگرت بینیم هیچ کەم و کوریەکی نیەو بەباشی کار دەکات.

لەم کاتەدا لئۆنا بەراکردن ڕۆشت و بۆمن کەمێك گۆشتی کوڵاو و میوەی وشك و ڕۆنی هێنا. ئەم ئازوقانەی لەکوڵەپشتێکدا داناو خستیە بەردەستم. بۆ دڵنیایی زیاتر خەنجەرێکیشم هەڵگرت. لئۆنا سووربوو لەگەڵمدا بێت بەڵام چوونکە بردنی ئەو ئەگەری نەبوو بڕیارمدا یەك لەپیاوانی ڕەش پێستی هۆز لەم گەشتەدا هاوڕێیەتیم بکات و ڕێ نیشاندان و پشتیوانی کردنی من لەئەستۆ بگرێت. ڕەشی ئاماژەپێدراو کەسێکی چوار شانە و بەهێز و وەك هەموو ئەوانیتر وەك غولام لەبەردەستی مووناکدا کاری دەکرد و دیلی ئەوبوون. لەش ساغ و بەهێز بوو.

کاتێك لەگەڵ مندا ڕوبەڕوبوویەوە، سەرەتا ناوم لێ پرسی و وتی:

ناوم ((کارانا)) یە.

کارانا لەزمانی ئەوان بەمانای هەڵۆیە و بەراستیش وەك هەڵۆ تیژو گورج و ئازابوو دواتر زانیم بوونی ئەو بۆمن چەند بەسوودبووە و لێی ئاگادار نەبووم.

سەرئەنجام لەبەردەم چاوە پڕ فرمێسکەکانی لئۆنا کە لەدووری من دەگریا لەهۆز دەرچووین و بەرەو شوێنی یوچپیەکان کە لەپشت کوێستانی داپۆشراو لەجەنگەڵ و ئەولای ڕوبار و تاڤگەکان بوو، بەڕێکەوتین. دەتوت لئۆناش بەرلەڕۆشتن دەستورە پێویستەکانی بەکاراناداbوو چوونکە تانزیك نیوەڕۆ بە باشی بەڕێگادا دەڕۆشت. وەك

هەڵۆ لەسەر ئەم بەرد دەپەرییە سەر ئەوبەردەی تر، لەپێش منەوە ڕێگەی دەبری و چاودێری دەوروبەری دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەی هەتاو گەشتە ناوەڕاستی ئاسمان قاچەکانی درێژکردو لەژێر دارێکدا دانیشت. قاچەکانی درێژکرد و وتی:

ماندوو بووین دانیشە بحەسێینەوە.

منیش بەڕاستی هیلاك ببووم. برینی پشتم دەکزایەوە. ئازاری بوو، ئازاری دەدام بەڵام چوونکە بۆ گەشتن بە یوری و رزگاری ئەو پەلەم بوو نەمدەویست کاتی خۆم بەفیڕۆبدەم و بڕیارمدابوو جگە لە شەو هیچ کاتێکی تر نەحەسێمەوە.

کارانا سوور بوو چوونکە من دژایەتیم دەکرد بەتووندی وتی:

ئێوە ماندوون و بریندارن و دەبێت لێرەدا بمێننەوە.... ئەگەر بتانەوێت بڕۆن ناچارم ناچارتان کەم....

سەرەتا ئەم رستە بووە هۆی تووڕەبوونی من لوولەی رەشاشەکەم لەسینەی نیشانە گرت تا بەیەك دوو گولە بیکوژم تا پاداشتەکەی بدەمەوە بەڵام لەناکاو لئۆنام بیرکەوتەوە، دەستم هێنایە خوار و لێم پرسی:

ئایا کەسێك لەم بارەوە دەستووری پێداوی یان خۆت بۆ حەوانەوە حەزت لە کوێستان و وچان گرتنە. ئەو بێ وەچان وەك بڵێی لەکارەکەی رازی نەبێت وتی:

لئۆنا داوای لێکردووم ئاگاداری ئێوەبم و چوونکە دەزانم برینەکەی ئێوە چەندە مەترسیدارە خۆشم سورم ڕێگاکە بە ئارامی و لەسەرخۆ ببڕین و هێزو وزەی ئێوە بەفیڕۆ نەڕوات جیاواز لەم شێوە لەکۆتایی ڕێگادا لەپێ دەکەون.

شادمان بووم و پێکەنیم، سوپاسم کردو لەژێر دارەکەدا دانیشتم.

حەوانەوەی ئێمە نزیکەی دو کاتژمێری خایاند. کەمێك نانمان خوارد و دواتر خەوتین. کارانا بەڕمەوە لەسەر سەری من پاسەوانی دەداو دواتر هەستام. درێژەمان بەڕێگەکەمان دا. سەفەرەکەمان بەهۆی خوارکردنی ڕێگا و تێپەڕین لەکوێستان دو شەو و دو ڕۆژی خایاند. ڕۆژی دوەم لەگەڵ ئەوەی ڕۆشتنی زۆر هیلاکی کردبووین بەڵام هەستم دەکرد حاڵم باشتربووە. دەتوت چالاکی و هەوڵدان و ڕۆشتنە سەر لەکێو و تێپەڕین لەزۆنگاوەکان بۆحاڵی من باش بووە و بۆتە هۆی خێرابوونی باشبوونەوەی من.

لەڕێگادا ئاژەڵی زۆر هێرشیان کردە سەرمان و ئەگەر باسی یەك یەکیان بکەم کتێبێکی تەواوی دەوێت.

جارێك مارێکی گەورە پەلاماری داین و من بەفیشەکێك مێشکم پرژاند بەجیاوازی دو

کاتژمێر پڵنگێك پەلاماری کارانای دا و خۆی بەزەربەی خەنجەر پێش ئەوەی بتوانم یارمەتی بدەم سکی دڕی و کوشتی و فڕێیدا.

دواتریش لەگەڵ ئاژەڵی تردا روبەڕوبووینەوە کە لەهەموویان گرنگتر تیمساحە کوشندە و مەترسیدارەکانی ناو زۆنگاو بوون بەڵام بەخۆشحاڵیەوە لەهەمووی ئەم لەمپەڕانە بەسلامەتی تێپەڕین و لەمەبەست نزیك بووینەوە.

بەیانی رۆژی سێیەم کارانا لەدوورەوە چەندین ماڵی نیشاندام وتی:

ئەمانە ماڵی تایبەتی پاسەوانەکانی هۆزی یوچیە. سنوری هۆز لێرەوە دەست پێدەکات. دەبێت زۆر لەسەر خۆ بڕۆینە پێش چوونکە یوچیەکان زیاد لەڕادە مەترسیدارو لەگەڵ ئەوەشدا وشیارن.

بەسیلاحەکەی خۆم زیاد لەڕادە دڵ گەرم بووم و خەیاڵم ئاسوودە بوو کەدەتوانم بە شریتێکی رەشاش پێنسەد کەس بکوژم. بەڵام چوونکە بەدەست ئەوان بریندار کرابووم و ژاری ئەوانم بەچاوی خۆم بینیبوو دەترسام. کاتێك کارانا ناوی یوچیەکانی هێنا و هۆزەکەیانی بەپەنجە نیشان دا، ئارەقێکی سارد لەسەر ناوچاوم دانیشت.

کارانا وتی: کاتی رۆژ کە هەوا رووناکە ! ناتوانین لە هۆزەکەیان نزیك ببینەوە. ئەم کارە وەك خۆکوشتن وایە چوونکە بەدڵنیاییەوە دەمانکوژن و تیکەتیکەمان دەکەن.

کاتێك هەوا تاریك بوو و بێدەنگی ئەم ناوچەی داگرت بەهێواشی لەهۆز نزیك دەبینەوە و دەست بەگەڕان و پشکنین دەکەین.

بەم پێشنیازە رازی بووم و لەسەر دارێکی کۆن رۆشتمە سەر. لەوێوە لەناو لق و گەڵاکان سنوری هۆزەکە دەبینرا و هەندێ کات ژمارەیەك لەیوچیەکانم دەبینی کە تێدەپەڕین و دەڕۆشتنە ناو هۆز.

یەك دو کاتژمێر کەلە شەو تێپەڕی بە ئیشارەی کارانا لەدارکە رۆشتمە خوار و بەرێنوێنی رووناکی ئاگر کەلەناوەڕاستی هۆزدا هەڵکرابوو، رۆشتینە پێش. لەدوورەوە دەنگی گامپ گامپی تەپڵ دەبیسترا و کارانا. گوێی هەڵخست و وتی:

ئەم شەو جەژنیانە. ئەم جەژنە ساڵی یەك دو جار ساز دەدرێت و تیایدا دوژمنانی سەرۆکی هۆز بەدەست جادو و جادوگەران دەکوژن.

هەرچی زیاتر نزیك دەبووینەوە دەنگە دەنگ و هەلهەلەی وەحشیەکان و گامپ گامپی تەپڵەکان زیاتر دەبیسترا و راشکاوتر دەگەشتە گوێ. سەرئەنجام لەشوێنێکی زۆر نزیکدا وەستاین و سەیرمان کرد. لەوێوە دیمەنێکی سەیرو مەترسیدار بەرچاو

دەکەوت. مووناکیان رووت کردبوویەوە و لەبەرانبەر تەپۆڵکەیەك لەئاگر بەدارێکەوە بەستبوویانەوە. سەری مووناك لە خوارو وادەهاتە بەرچاو کە بێهۆشە.

ژمارەیەك لەوەحشیەکان بەقەمە خوێناویەکانی خۆیان بەدەوری ئاگرەکەدا سەمایان دەکرد و کاتێك لەمووناك نزیك دەبوونەوە، قەمە تیژەکانی خۆیان بۆ حەواڵە دەکردو دوور دەکەوتنەوە.

بە بینینی ئەم حاڵەتە پشتم لەئارەقدا خوسا.

ئارەق لەروخسارم دەتکی و کاتێك لەجەستەی رووتی مووناکم دەڕوانی دڵم دەسوتا، قوورگم دەگوشرا و بیری ئەوشەوە خۆشانەم دەکەوتەوە کە تابەیانی لای ئەو بەسەرم بردبوو و لەگەڵیدا رازونیازمان کردبوو.

بیرم کردەوە و لای خۆم وتم:

ئایا ئەوان مووناك دەکوژن؟ لەم فکرە پەرێشان دەبووم و لەژێر لێوەوە دەموت.

نا، نا، تەنانەت ئەگەر بەنرخی گیانم تەواو بووە رزگاری دەکەم. مووناك نابێت بمرێت. کارانا لە ژێر چاوەوە ئاگای لەمن بوو، وادەهاتە بەچاو بەهەموو وەحشیگەری خۆی هەستی بە پەرێشانی ناخم دەکرد و بە نیگا حەسرەتاوییەکانی خۆی دەیویست ئارامم بکاتەوە و دڵدانەوەم بکات.

دەنگی گامپ گامپی تەپڵ و هەلهەلەی وەحشیەکان سات سات زیاتر دەبوو. ژن و پیاو و منداڵ لەدەوری ئاگرەکە کۆ ببوونەوەو لەم جەژنە گەورەدا بەشداریان دەکرد. لەو قووڵایی دڵەوە شادیان دەکردو بە هەلهەلەی تایبەت و گوێ ئازەردەری خۆیان ئەوپەری شادی و خۆشحاڵیان دەردەبڕی و لەمەرگی مووناك کە دوژمنی سەرۆك هۆز دەژمێردرا شادمان بوون.

لەوکاتەی ئەوان لەمووناك نزیك دەبوونەوەو خەنجەرە تیژو بیرقەدارەکانی خۆیان بۆ حەواڵەدەکرد لێدانی دڵم زیادی دەکرد و هەناسە لەسینەمدا دەوەستا بەڵام کە لێی دووردەکەوتنەوەو سەمایان دەکرد هەناسەیەکی قووڵم هەڵدەکێشاو شادمان دەبووم کە ئەم جارەش نەیانکوشت.

لەخۆم دەپرسی دەبێت چی بکەم؟ لەقەیرانی ئەم بیرەدا نوقم بووم کە لەناکاو دەنگی تەپڵەکان گۆڕا و تەپڵەکان بە ریتمێکی تر دەستیان بە لێدان کرد.

کارانا بەخێرایی وتی: کاتی کوشتنی مووناك نزیك بووەتەوە ئاگادار بن.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کەیەکێك لەناو قەرباڵغی دانیشتوان جیابووەوەو

بەهەنگاوی بەرزو حاڵەتێکی تایبەت کەهەرچەندە هەنگاوێك لەسەر قاچی راستی دەوەستا و سەرو دەستی بەشێوەیەکی سەیر تەکان دەدا، بەرەو دارەکەی کە مووناکیان پێوە بەستبوو بەرێکەوت.

لەم کاتەدا هەمووان بێدەنگ بوون و تەنیا دەنگێك کە دەبیسترا دەنگی تەپڵەکان بوو. کەسی ئاماژە پێدراو کاتێك گەشتە چەند هەنگاوی دارەکە بەدەست ئیشارەیەکی کردو دوانی تر بەخێرایی بەرەو مووناك رایان کرد. بەپیرژاندنی ئاو هەوڵیاندا بیهێنەوە هۆش.

ئەوان سەرقاڵی بەهۆش هێنانەوەی مووناك بوون کەدوان سیانێکی تر لەقەربالغیەکە جیابوونەوە بەرەو لای مووناك هاتن. یەك لەوان کلاوێکی تایبەتی لەسەردابوو و ئەویتریان گەردنبەندێکی سەیر کە کاسە سەرێکی مناڵێکی شیرەخۆرەی پێوە هەڵواسرابوو، لەگەردنیدا بوو.

یەکەمیان کلاوەکەی بەجووڵەی تایبەت لەسەر کردو دوەمیان گەردنبەندەکەو بەخێرایی بەجێیان هێشت و سێیەمی خەنجەرێکی درێژی لەکەمەر کێشاو و دوای ئەوەی ماچی کردو لەچاوی سو، دایە دەستی و پەیوەستی ئەوانیتر بوو.

وەحشیەکە بەوکلاو و گەردنبەندە، دەستی بەسەما کردن کردو کاتێك مووناك هاتە هۆش خۆی لێی نزیك بوویەوە.

مووناك کەتازە هاتبووە هۆش بەچاوە ترساوەکانی لەم دیمەنەی دەڕوانی و چوونکە لەوێ رێورەسمی مردنی خۆی ئاگادار بوو بەناڕەحەتی و ترسەوە چاوەڕوانی مەرگی دەکرد.

کارانا سەری خۆی هێنایە بن گوێم و وتی:

ئەم کەسە کەگەورەترین جادوگەرێکی هۆزە، دەیکوژێت... لەم کاتەدا کەسەما دەکات لەناکاو خەنجەرەکەی لەدڵی دەچەقێنێت. ئاگادار بن دەرفەت لەدەست نەروات.

بە کارانام وت: تۆ ئاگاداری پشت سەرم بە ئەگەر من لەدواوە دڵنیابم و بزانم کەس هێرشم ناکاتە سەر مووناك رزگار دەکەم.

کارانا بەڵێنی دا تاگیانی هەبێت ئاگای لێم دەبێت بەڵام من بەڵێنێکی بێهۆم دابوو. چۆن رزگارکردنی مووناك ئەگەری بوو... چۆن دەمتوانی لەگەڵ ئەو هەموو وەحشیە خوێنخۆرەدا شەڕ بکەم. تەنیا و بێ هاوکاری چیم لەدەست دەهات.

بەئیشارەی جادوگەر دەست و پێی مووناکیان لەدارەکە کردەوە، وەحشی ئاماژە

پێدراو بەوکلاوە ترس ئەنگێزەی خۆی لەمووناکی جوانی من نزیک بوویەوەو قژی بەچنگ گرت.

دروست وەك قەصابێك كە مەڕێك بەرەو كوشتارگە دەبات، ئەوی بردە شوێنێكی تر. مووناكی بەدبەخت بەرگری نەدەكرد بەڵام جادوگەر دەتوت دەیەوێت ئازارو ئەشكەنجەی بدات چوونكە لەگەڵ ئەوەی مووناك بەخێرایی بەدوایدا رایدەكرد سەری بەچەپ و راست و سەروخوار تەكان دەدا.

دەستم دەلەرزی و نەمدەزانی دەبێت كەڵك لەكام یەك لەسیلاحەكانی خۆم وەربگرم.... دەمزانی لە ژیانی مووناك زیاتر لەچەند خولەك یان چەند چركە نەماوەتەوە لەگەڵ ئەمەش منیش كۆنترۆڵی خۆم بەتەواوی لەدەست دابوو و وەك شێتەكانم لێهاتبوو.

تفەنگەكەم هەڵگرت بەڵام دواتر پەشیمان بوومەوە. دام بەدەست كاراناو رەشاشەكەم لێوەرگرت و میلم هێنایەوە.

پەنجەم لەسەر پەلەپیتكەكە دەلەرزی و گوومانم بوو جوان نیشانە بگرم. مووناك و جادوگەر چەند سانتیمەتر لەیەك دوور بوون. ئەگەر تیرەكەم مەبەستی نەپێكایە و چەند مەترێك ئەولاتر برۆشتایە لەجیاتی جادوگەر سینەی جوانی مووناكی كوون دەكرد و دەكوژرا.

هەوڵم زۆردا تا بەسەر خۆمدا زاڵ بم بەڵام نەمتوانی. بۆ ئەوەی دەرفەت لەدەست نەروات لولەی رەشاشەكەم هێنایە سەرو سەری جادوگەرم نیشانە گرت.

لەم كاتە و لەوشوێنە هەستیارەدابوو كە جادوگەر لای ئاگرەكە وەستاو پشتی مووناكی بەدارێكی نارگیلەوەدا و خەنجەرەكەی بردەسەر تاسینەی مووناك كوون بكات. بەڵام بەدبەختانە گولە نەتەقی.

رەشاشەكەم ئەم لاولا پێكرد. ئارەق لەسەرو روخسارم دەباری.

كارانا رەشاشەكەی لێوەرگرتم و بەخێرایی تفەنگەكەی دایە دەستم و وتی:

بەمە بیپێكن.

بەخێرایی تفەنگەكەم هێنایە سەر بەڵام پێش ئەوەی دەرفەتی تەقەكردنم دەست كەوێت دەنگی گولە بیستراو لەناكاو جادوگەر وەك كەری كێوی كە لەدەشت و سەحرادا گوولەی بەركەوتبێت لەزەوی هەڵكەندراو نزیك یەك مەتر بەرزبوویەوە، قیژاندی و بەمێشكەوە درا بەزەویدا و ئیتر تەكانی نەخوارد.

مووناك هەنگاوێك ڕۆشتە دواوەو لەپشت دارەکەوە خۆی شاردەوە و سەیری دەوروبەری کرد. ئەو بەدوای کەسێك جادوگەری کوشتبوو نەدەگەرا. بۆ بینینی ئەوە سەیری دەوروبەری نەدەکرد بەڵکو لەوە دەترسا نەوەکو بکەوێتە بەر نیشانەی ڕم و تیرە ژاراوییەکانی وەحشیەکان.

کۆمەڵێك لە وەحشیەکان لەگەڵ ئەوەی ئەم دیمەنەیان بینی و دەنگی گولەیان بیست تووشی سەرگێژە بوون و بەدوای خۆیاندا دەگەڕان و بێ ئەوەی دەنگیان لێوەبێت بەچاوی کراوە و نیگای سەیر لە دەوروبەریان دەڕوانی. هەندێ کاتیش سەریان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە. وایان دەزانی بۆ نموونە شەیتانەکان جادوگەرایان کوشتووە.

سەرەتا سەرسوڕمان لەواندا دروست بوو بەڵام وەك دەزانین زۆربەی پیاوانی یوچی لەکاتی شەڕ لەگەڵ ئێمە بەکاری تفەنگ ئاشنابیوون و دەیانزانی لە ڕێگەی دوور و ڕەنگە لەناو دارەکانەوە جادوگەریان کوشتووە و بەدڵنیاییەوە بکوژ دەیەوێت مووناك ڕزگار بکات.

ئەوان بوون کە لەناکاو پەلاماری مووناکیان داو ڕەنگە سەرەتا دەیانەوێت مووناك تیکە تیکە بکەن بەڵام دەستی ئەوان بەمووناك نەگەشت چوونکە ڕەگباری ڕەشاش بەرزبوویەوە و وریزێك لە وەحشیەکان کە زیاتر لە دە کەس بوون کوژران و گیانیان دا.

بەهەمان ئەندازە کە ئەم ڕووداوە بۆ یوچیەکان چاوەڕوان نەکراوبوو منیشی سەرسورماو کردبوو چوونکە خۆم دەمزانی کە گوولە لەتفەنگەکەم دەرنەچوە کەواتە کێیە بۆ ڕزگاری مووناك چالاکی دەنوێنێت.

کارانا لەم کاتەدا زەینی لەمن ئامادەتر بوو وتی: یوری...... ئەوە یوریە دەیانکوژێت....لە شادمانیدا دەمویست بقیژێنم.

ئەوان دەوری مووناکیان گرتبوو. لە گۆڕەپانەکە نەڕۆشتنە دەرو لەگەڵ ئەوەی دەکەسیان لێ کوژرابوو دوبارە هێرشیان بردو مووناکیان گەمارۆدا.

یوری تەقەی کردو منیش لەم لاوە بەهێز و ورەی زۆرتر تەقەم کردو چەند کەسێکم کوشت.

کاتێك دەنگی گولە لەدولاوە بەرز بوویەوە قەرەباڵغیەکیان تیا دروست بوو کە گوومان کردنی ئەگەری نیە. ژن و پیاو و مناڵ لەسەر کوڵی یەکتر سەردەکەوتن، دەیانقیژاندو رایان دەکرد. ئاگرەکە لە ژێر قاچی وەحشیەکاندا شێلدراو لەهەمان کات کەڕایان دەکرد بڵێسەکانی ئاگریان بەم لاولادا دەناردو تەپ وتۆزو دوکەڵیان بۆئاسمان

بەرزدەکردەوە.

ئاگرەکە کوژایەوە و ئیتر چاوی من هیچ شوێنێکی نەدەبینی. هەرئەوەندەم هەست کرد وەحشیەکان لەم لاولاو و هەندێ کات لەیەك هەنگاوی من و کارانا تێدەپەڕن.

کارانا وتی: بۆ رزگارکردنی مووناك بڕۆنە پێش و گەرنە دەستان پێی ناگات..... زوو....... خێراکەن.

دەتوت تازە لەخەو هەستاو و رام کرد بەڵام کاتێك گەشتم وەحشیەکان و مووناکی لێ نەبوو. دیارنەبوو چونە کوێ و چیان لێهاتووە. من و کارانا لەگۆڕەپانەکەدا سەرگەردان بووین و نەماندەزانی لە کام لاوە بەدوایاندا بڕۆین کە لەناکاو سەرو کەلەی یوری لەپێش کۆمەڵێکی بیست کەسی لەوەحشیەکانی ئامازۆن دەرکەوت.

یوری لەبینینی ئێمە سەری سوڕنەما تەنیاکاتێك گەشتە من وتی:

ئێوە لەکام رێگاوە هاتن؟

کارانا شوێنێك کەلێی هاتبووین نیشانی دا. یوری وتی:

کەواتە ئەویان بەم لادابردوە...... هەمووتان بەدوای مندا بێن.

من و یوری لەپێش و ئەوانیتر لەدواوە بەراکردن رۆشتین بەڵام هەرچی زیاتر دەگەڕاین کەمتر لەمووناك و فرێنەرانی شوێنەوارێکمان دەدۆزیەوە.

دەبێت چی بکەین....؟

ئەمە پرسیارێك بوو دوای ماوەیکی زۆر لەرێگە لەزەینی ئێمدا نەخشی بەست بەڵام وەڵامێکی راستمان بۆ نەدۆزییەوە.

پێشنیارم بە یوری کرد ببینە دو دەستە و هەرکام بەشێکی جەنگەڵ بگەڕێین. یوری سەرەتا نەیدەویست رازی بێت.

هۆکاری رازی نەبوونی ئەوم دەزانی. ئەو گوومانی دەکرد ناتوانم بەو جۆرەی دەبێت بەرگری لەخۆم بکەم. راستە من لەزانکۆوە بۆ ئێرە روبەڕوی ئەو هەموو مەترسیە هاتبووم بەڵام دەمزانی دەبێت چی بکەم. ئەوەندەش دەست و پێ سپی وترسەنۆك کە ئەو گوومانی دەکرد، نەبووم دەمویست پێچەوانەی بۆچوونەکەی بسەلمێنم.

لەسەر ئەم بیرو بۆچوونە پێمداگرت. سەرئەنجام رازیم کرد بەپێشنیارەکەم رازی بێت. چاوەکانی نیگایەکی تایبەتیان هەبوو و لەوکۆمەڵەدا من بووم لەنیگاکانی تێدەگەشتم.

ئەم وەستانە زۆری نەخایاند. چەندسات دواتر سەیری کارانای کردو وتی تۆ لەگەڵ

سەرۆکدا برۆ. و دواتر بێ ئەوەی شتێك بڵێت رەشاشەکەی لێ سەندم و زامنەکەی تاقی کردەوە.... دوبارە بەستیەوە چوونکە لەکارکردنی دڵنیابوو، رەشاشەکە خۆی پێدام و وتی: زامنی رەشاشەکەی تۆ سستە، ئەمە لەگەڵ خۆتدا ببە.

رەشاشەکەم گرت و لەهەمان کات کە لە کردەوەی توندوتیژی و شێوەی فەرماندەرانەی ئەو تووڕەبووم نەمدەتوانی حاشا لە خۆشەویستی زۆری یوری بەرانبەر بەخۆم بکەم. ئەو بەدڵێکی پاکەوە منی خۆش دەویست و نەیدەویست تەنانەت چقڵێك بەقاچمدا بچێت. کارانا هاتە لا من. رەش پێستەکانیش بە دو دەستەی نایەکسان دابەش کران.

زۆربەیان لەگەڵ مندا بوون. یوری سیانی لەگەڵ خۆیدا برد.

یوری لەدوایین سات دەستی منی گووشی و وتی:

ئێستا هەواتاریکە. بەدڵنیاییەوە وەحشیەکان ئاگر دەکەنەوە. کاتی شەو بەکەڵك وەرگرتن لە رووناکی ئاگر شوێنی ئەوان وەدۆزن و بەرۆژ لەروی شوێن پێکانی ئەوان لەسەر خاکی نمداری جەنگەڵ دەمێنێتەوە و بەدوایاندا بڕۆن. بەهەرحاڵ دڵنیابە لەوەی وەحشیەکان بەبێ رێوڕەسم مووناك ناکوژن. ئەوان بۆ دوورکەوتنەوەی رۆحی شەیتانەکان دەبێت بەرێوڕەسمەوە دوژمنەکانی خۆیان بکوژن. بۆیە دەیدۆزینەوە، دڵنیابە....

بێ ئەوەی شتێکی تر بڵێت لەوێ دوورکەوەتەوە و لەگەڵ ئەوانیتردا رۆشت. منیش شان بەشانی کارانا لەولاتر بەڕێکەوتم.

شتێك کە لەهەمان ساتی یەکەم سەرنجی منی راکێشا ئەوەبوو کارانا لە من دوورنەدەکەوتەوە و کاتێك هەستم بەمە کرد تێگەشتم یوری بەنهێنی رایسپاردوە زیاتر لەجاران ئاگای لەمن بێت تا هیچ مەترسیەك هەرەشەم لێ نەکات.

بەم کارە شادمان نەبووم بەڵام بەرووی خۆمدا نەهێنا. هەموو ئەو شەوە بێ روبەڕوبوونەوە لەگەڵ وەحشیەکان درێژەمان بەرێگەدا. کاتێك هەوا رووناك بوویەوە، کارانا ناچاری کردم بووەستم.

دواتر تێگەشتم سووربوونی ئەو بۆئەوەبوو لانی کەم دو سێ کاتژمێر بخەوم و بحەوێمەوە. ئەم حەوانەوە زیاد لەرادە بەکەڵك بوو و کاتێك دوبارە بەڕێکەوتینەوە، وزەو هێزێکی باشم هەبوو، رێگەمان بەرەو روبار دەڕۆشت. کارانا کە لەشوێن پێ دۆزینەوەدا شارەزابوو وەك پشیلە چەمابوویەوەو لە زەوی دەڕوانی.

ماوەیەك كە لەژێر هەتاو ڕێگەمان بڕی، كارانا وەك ئەوەی دوپشك پێوەی دابێت بەرزبوویەوەو وتی: سەرۆك سەرۆك.... وەرن شوێن پێی وەحشیەكانم دۆزییەوە.

بەخێرایی خۆم گەیاندە لای. ئەو شوێنەی تیایدا جێگیربووین بە پێچەوانەی شوێنەكانی تر كەم دار بوو. لەبەرئەوە هەم هەتاو ئازاری دەداین و هەم زەوی لەگژو گیاو گەڵای وشك دانەپشرابوو وباشتر دەمانتوانی شوێن پێی وەحشیەكان بدۆزینەوە.

كارانا چەند شوێن پێیەكی نیشان دا وتی:

بروانن بەرەو ڕوبار ڕۆشتوون. بەڵام بەپێی بەراوردەكانی خۆم ژمارەی وەحشیەكان زۆر زیاترو دەبووا شوێن پێكان زۆر زیاترین..... هۆكار چییە...؟ ڕەنگە بۆ گومراكردنی ئێمە پشتیان بەفێڵ بەستبێت.

نا....... وانیە........ شوێن پێی ئەو وەحشیانەی مووناكیان دزیوە ئەمە نیە. ئەمە پەیوەندی بەو كەسانەوەیە بۆ پەیوەست بەوانیتر ڕۆشتوون. بەهەرحاڵ دەبێت لەم لاوە بڕۆین.

بێ بەفیڕۆدانی كات بەڕێكەوتین. نزیكەی یەك میل ئەولاتر دەنگی ئاوی ڕوبار و خرۆشانە سەیرەكەی دەبیسترا.

من بەرەو دەنگەكە ڕۆشتم بەڵام كارانا دەستی گرتم و وتی:

ئەستێلك لێرەدایە ئەوان هەمیشە بەلەمەكان لێرەدا رادەگرن.

قسەكەی ڕاست بوو چوونكە لەڕوبارێكی خرۆشاو نەدەكرا بەلەم بكێشرێتە بەستێن و ببەسترێتەوە هەمیشە لەم شوێنانە كەڵك وەردەگرن.

دەبووایە بڕۆینە ناو ئەستێلك. شوێنێكی مەرگ هێنەر و مەترسیدار بوو. لەبیستنی ناوەكەی مووی ئەندام ڕاست بوویەوە بەڵام چوونكە نەمدەویست بەترسنۆك بناسرێم و بۆچوونەكەی یوری بسەلمێت، هاوڕێ لەگەڵ كارانا بەڕێكەوتم.

نیو كاتژمێر دواتر گەشتین و دوای ئەوەی تێپەڕین لەچەند ڕیز لەدارە چڕوپڕەكان كە بەتەواوی ڕێگایان بەستبوو، كەوتینە ناو ئاوەكە.

یەكێك لە ڕەش پێستەكان بەرمەكەی خۆی قوڵایی ئاوەكەی دیاری كرد. لەهەندێ شوێن زیاتر لە مەترێك بەڵام لە زۆربەی شوێنەكان كەمتر لەیەك مەتر بوو بۆیە تێپەڕین ئاسان بوو. تەنیا شتێك ناڕەحەتی دەكردم بوونی تمساحەكان بوو. كاراناش هەستی بەم خاڵە كرد، بازوی گرتم و وتی:

سەرۆك هەوڵ بدە لەقەراغ نزیك ببنەوە. ئارام بڕۆن تا دەنگی ئاو بەرز نەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئاگادارین تمساحەکان پەلامارمان نەدەن و ئەگەر پەلاماریان داین تەقەنەکەن چوونکە دەنگی تەقە وەحشیەکان لە بوونی ئێمە ئاگادار دەکاتەوە. ئێوە کارتان نەبێت رەشەکان بەرم دەیانکوژن و رێگا دەکەنەوە.

ئارام ئارام لەیەك ریزدا دەڕۆشتینە پێش. ئەستێلك بارودۆخێکی تایبەتی بوو. لەناو ئاو دورگەیەکی بچووك بەدرێژی و پانی پێنج مەتر سەری لەئاو دەرهێنابوو ئەم پارچە خۆڵانە کە بەدار و گژوگیا داپۆشرابوو، دیمەنێکی تایبەتی پێ دەبەخشی.

دارەکان بۆسەر ئاوەکە چەمابوونەوە، سەریان بەیەکەوە نابوو، بەگشتی لەگەشتنی تیشکی هەتاو بۆ ئاوەکە رێگریان دەکرد. بیرم دەکردەوە لەناو ئەم دارانە و لەپشت ئەم گژوگیایە، لانی کەم پێنجسەد هەزار وەحشی دەتوانن خۆیان بشارنەوە و لەکاتی گونجاودا هێرشمان بکەنەسەر.

لەم بیرانەدا بووم لەناکاو دەنگی قیژەیەکی دڵتەزێن بەرزبوویەوە. ئەم قیژەیە بەمانای راگەیاندنی مەترسی بوو و سەرنجی ئێمەی بۆ دواوە شوێنێك کە دەنگەکەی لێوە دەبیسترا، راکێشا.

کارانا رۆشتە پێش بەڵام هیچی نەبینی... شتێکی نائاسایی نەدەهاتە بەرچاو. هەمووان سەرگەردان لەناو ئاوکەدا وەستابووین کەلەناکاو یەکێك لەرەشەکان ناڵەیەکی کورتی کرد.

بەکاراناى وت: هاوڕێکەم نیە.....

دیاربوو دوایین کەسیان دزیوە و دەنگی قیژەی ئەوبوو بەگوێی ئێمە دەگەشت.

بۆ دۆزینەوەو رزگارکردنی هیچ کارێکمان نەکرد. چوونکە دەمانزانی ئەم کارە ناکرێت.

لەم کاتەدا جەستەی خوێناوی و بێ سەری کەوتە سەر ئاوەکە.

یەك لەرەشەکان رۆشتە پێش، جەستەکەی گرت و هێنایە پێش. کارانا سەیری کرد وتی: ئەویان کێشاوەتە ژێر ئاو و سەریان بڕیوە، سەیر ئەوەیە سەریان بڕیوە....

ئەو ئەمەی تەنیا بەمن وت چوونکە ئەگەر ئەوانیتر دەیانزانی هاوڕێکەیان کێشاوتە ژێر ئاو و سەریان بڕیوە، لەهاوکاری و هاوڕێیەتی ئێمە خۆیان دەدزیەوەو دەگەڕانەوە بۆ بەستێن.

خێرا دەستوورم دا خێرایی خۆمان زیاد کەین و هەرچی زووتر بگەینە شوێنێکی ئەمن.

تازە کەوتبووینە ڕێ کە لەلای ڕاستی من دەنگی ئاو بەرزبوویەوە. خێرا ئاورم دایەوەو بەچاوی خۆم دوکەسم بینی لەئاوە ڕۆشتنەدەرو دەیانەوێت بڕۆنە قەراغ.

یەکەم کەسیان سەرە براوەکەی لەدەستدابوو. تەقەم کرد. نەمدەتوانی لەتەقەکردن چاو بپۆشم. سێ گوولەم تەقاند. تەنیا گولەی یەکەم مەبەستی پێکا و وەحشی دووەمی لەپێ خست و فڕێدایە ناو ئاوەکە. وەحشی یەکەم کەسەرە براوەکەی لەدەستدابوو خزایە پشت دارێك و لەبەرچاو ون بوو. وەك دڵۆپە ئاوێك بتکێتە سەر زەوی وشك و ون بێت.

نزیك نیوکاتژمێرێك دواتر گەشتینە شوێنێك کە ڕشتەیەکی باریك لەئاوی ڕوبار دەڕۆشتە ناو ئەستێلك و لەولای دەردەچو. کارانا دەیوت:

ئەگەر وەحشیەکان بیانەوێت هەڵبێن دەبێت لەم ڕێگاوە بێن چوونکە ڕووبار بەلەمەکانی ئەوان قووت دەدات.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو یەکێك لەڕەشەکانی هاوڕێم دەستی گرتم و منی بردە پشت دارێك ئەم کارە بووە هۆی ئەوانیتریش خۆیان داشارن.

هەموو خۆیان داشارد و بەڵام هێشتا دیارنەبوو ئەو چی بینیوە و بۆ ئەم کارەی کردوە ! ڕەش لەکاتێکدا لەترسا زمانی گیرابوو بەپەنجە شوێنێکی نیشاندا و وتی:

سەرۆك سەیرکەن..... ئەوان دێن و مووناکیشیان لەگەڵدایە. کارانا پێش من ئەوی بینیبوو و بەخێرایی و لێهاتوویەکی سەیر کە کاریی سەردارێکی جەنگەڵی بیرتیژو لێهاتوو بوو، ڕەشەکانی دابەش کردو دەستورە پێویستەکانی دا.

بەهێواشی سەرم بردە پێش و دیمەنێکم بینی کە بەڕاستی ترسناك بوو.

چەند بەلەمێك بەئارامی لەسەر ئاوەکە دەڕۆشتن. سێ بەلەم لەپێشەوە بوو و هەرسێکیان پڕ بوون لەوەحشیە چەکدارەکان. هەندێکیان ڕمیان لەدەستدا و هەندێکیان تیروکەوان. دوای ئەو سێ بەلەمە بەلەمێکی بچووك دەبینرا. ئەم بەلەمە تەنیا سێ کەسی لەسەر بوو. دوانیان سەوڵیان لێ دەدا.

لەناو ئەواندا مووناك دانیشتبوو. لە پێشی هەموو بەلەمەکان لەسەر پارچەدارێکی کورت سەرێکی بڕاوە دەبینرا. ئەم سەرانە هی کێ بوو.

دواتر زانیم سەری هاوڕێکانی یوریان بڕیوە و لەسەر دارەکان دایاننناون..

بۆئەوەی باشتر بتوانم تەقەبکەم دەمانچەکەی خۆم دەرهێناو لەپشت دارێکی کۆن خۆم داشارد. دڵم لێی دەداو ئەژنۆکانم لەناو ئاودا دەلەرزی بەڵام بڕیارمدابوو

بەهەرنرخێك بێت مووناك رزگار بکەم. بابەتێك نیگەرانی دەکردم ئەویش ئەوەبوو نەکا لەناکاو مووناك بەزەربەیەك لێی بخەن و دڵی کوون کەن. بۆیە سەرەتا هەوڵم دا نزیکترینی وەحشیەکان لەو بکوژم تا مەترسی لەسەر نەمێنێت. هەموو شتێك ئامادەبوو، بەلەمەکان بەهێواشی دەهاتنە پێش. بەهەمان ئەندازەی ئەوان نزیك دەبوونەوە، ترسی من زیادی دەکرد. راستتان بووێت لەگەڵ ئەوەی تەڵقینم بەخۆم دەکرد و هەوڵم دەدا خوێنساردو ئارام بم و بەجوانی تەقە بکەم، گوومانم لادروست ببوو، ئەنجام چی دەبێت....؟

بەخۆمم وت: ئایا کاتژمێرێکی تر سەری منیش وەك ئەو رەشە بەدبەختانە لەجەستە جیاناکرێتەوە و لەسەر یەکێك لەودارانە جێگیرنابێت. ئایا جەستەی بێ سەرم ناکەوێتە سەر ئاوی ئەستێڵکەکە.

ئەم ئەندێشە بەجێ بوو یان نابەجێ، دڵی دەلەراندمەوە. ئەوان گەشتن و منیش دەست بەکاربووم. یەکەم گوولەم تەقاند و بەدەنگی گوولە لەناکاو ئارامی و بێدەنگی نەماو بارودۆخێکی تایبەت دروست بوو. بەلەمەکان کە پشت سەری یەك جێگیربوون و بەرێکی دەڕۆشتنە پێش هەرکام لەلایەکەوە جێگیربوون. بازنەیەکیان دروست کرد تا لەهەرلایەکەوە بتوانن بەرگری بکەن. دووەم گوولە و سێیەم گوولەش تەقێنرا و بەهەر گوولەیەك یەکێك دەکوژرا. دەنگی هەلهەلەی وەحشیەکان بەرزبوویەوە. ئەوانیش بەنۆرەی خۆیان هێرشیان کرد بەڵام چوونکە سلاحی ئەوان جگە لەرم و شمشێر شتێکی تر نەبوو نەیاندەتوانی لەرێگای دوورەوە شەڕبکەن ناچار دەهاتنە پێش و بەمەش دەکوژران.

دوان لەهاورێکانی منیش کوژران و لەناو ئەستێلکەکەدا نوقم بوون. هەر حەوت گوولەی دەمانچەکەی خۆم تەقاند و پێنجم کوشت بەڵام هەستم کرد وەحشیەکان دوبارە پشت بەفێڵ دەبەستن و دەیانەوێت مووناك لەوێ دوورکەنەوە.

دەستم بۆ ڕەشاشەکە بردو رشتمە پێش.

لەهەمان کات کە بەدژواری لەناو ئاوکە دەڕۆشتمە پێش تەقەم دەکرد.

ئاو لەکەمەرم تێپەڕی کرد و تاسینەم دەهات لەبەر ئەمە بەدژواری هەنگاوم هەڵدەگرت و دووری خۆم لەگەڵ بەلەمەکاندا کەم دەکردەوە.

وەحشیەکان لەسەر بەلەمەکە وەستابوون باشتر بەرگریان دەکرد و ڕمەکانی خۆیان بەو پەری هێزەوە بۆ لای من رەها دەکرد.

ڕمەكان بەویزە ویز لەچەپ و ڕاستی ڕوخسار و سینەم دەگوزەران و بەدەنگێكی تایبەت لەئاوەكە ڕۆدەچوون و ون دەبوون. زیاتری سەرنجی وەحشیەكان لای من بوو چوونكە ئەوان لەسیلاحەكەی من دەترسان و دەیانویست ئەم فیكەی مەرگ و مەترسیە لەكاربخەن.

منیش سەرنجم لای مووناك وپارێزەرانی بوو و بۆ یەك ساتیش ئەوانم لەچاو دوور نەدەكردەوە. بەلەمەكەی مووناك لەوێ دووركەوتەوە لەكاتێكدا بەلەمەكانیتر ڕێگایان لەمن بەست و بەرگریان دەكرد. كەبارودۆخەكەم بەم شێوە بینی یەكێك لەسەوڵ لێدەرانی بەلەمەكەی مووناكم نیشانە گرت و كوشتم و دواتر ریزێك گوولەم بە سەر وەحشیەكانی بەرانبەرم تەقاند.

ورده ورده خۆراگری ئەوان تەواو و دڵنیابووم تاچەند خوولەكی دیكە موناك لەچنگی ئەوان ڕزگار دەكەم بەڵام لەناكاو بارودۆخ گۆڕا و مەترسیەكی گەورە ڕوی تێكردم.

ڕوداوەكە بەم شێوەبوو.

بێ ئاگا لەهەموو شوێنێك سەرقاڵی كارەكەی خۆم بووم كە لەناكاو دەستێكی بەهێز وەك ئاڵقەیەكی پۆڵا لەئاوەكە هاتەدەرو مەچكی دەستی گرتم.

من كەچاوەڕێی ئەم ڕووداوە نەبووم ترسام و وتم ڕەنگە بتوانم خۆم لەم مەترسیە ڕزگاربكەم كە لەناكاو كارەكە دژوارتربوو و دەستێكی بەهێزتر لەدەستی یەكەم لە ئاوەكە هاتەدەرو بازووی منی گرت. هەردوو دەستەكە كێشرانە خوارەوە و منیشیان لەگەڵ خۆیان بۆ ناو ئاوەكە برد. بۆ پاراستنی گیانی خۆم ڕەشاشەكەم فردا. ڕەشاش كەتەنیا دڵگەرمی من بوو كەوتە ناو ئاوەكە.

منیان ڕادەكێشاو منیش توانای خۆڕاگریم لەدەست دا و دەڕۆشتمە خوار. كتاوپڕ بیرێك بەزەینم گەشت. بەجووڵەیەكی خێراو لائیرادی دەستێكی خۆم ڕزگار كرد و خەنجەرەكەی كەمەرم دەرهێنا. كاتێك دوبارە دەستی دوەم هاتەسەر تابمگرێت بەشێوەیەك بەخەنجەر لێمدا دەستە خوێناویەكەی لەئاودا ڕۆچوو و ساتێك دواتر وەحشیەكی زل و دێو ئاسا لەئاوەكە هاتەدەر.

هەناسەیەكی قووڵی كێشاو بەدەستە خوێناوییەكەی پەلاماری دام.

شەڕو پێكدادان دەستی پێكرد بەڵام بەخۆشحاڵیەوە سەركەوتن بەمن بڕاو كوشتم.

لەم كاتەدا كەوەحشی یەكەم هێشتا دەستی منی لەدەست دابوو لەئاوەكە دەرپەڕی و

پەلاماری دام. لەم بگرەو بێنەدا وەحشیەکانی تر خۆیان فرێدا ناو ئاوەکە و بەمەلە کردن بەرەو لای من هاتن. ئەگەر ئەوان پەیوەستی یەکتر دەبوون مەرگی من سەد لە سەد بوو.

بۆیە بۆ راکردن لەمەرگ خۆم خستە ناو ئاوەکە و رۆشتمە ژێر ئاو.

ماوەیەك لەژێر ئاودا هەوڵم داو مەودایەك لەوێ دوورکەوتمەوە..... چەند مەترێك لەولاتر سەرم دەرهێنا، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو دوبارە رۆشتمە ژێر ئاو.

بەم شێوە خۆم گەیاندە قەراغ و لەناو دارەکان لە بەرچاو وون بووم.

وەحشیەکان کە ئەمەیان بینی دەستیان لەبەدواداچوون هەڵگرت و سواربوون و رۆشتن. کەمێك دواتر چەند خولەك دەنگی شڵپە شڵپی ئاوی ئەستێلك بیستراو دواتر هەموو شوێنێك بێدەنگ بوو. بێدەنگیەکی ترس ئەنگێز.

لەسەر ئاو جەستەکان دەجووڵان و نەمدەوێرا سەیران بکەم.

لە هیلاکی خۆم چەند خولەك لەژێر دارێکدا دانیشتم و حەسامەوە. لەم کاتەدا بوو دەنگی بەریەك کەوتنی گەڵاو لقی دارەکان بیسترا و شڵەژاو لەشوێنەکەم راپەریم.

بەبێ سیلاح دەمتوانی چی بکەم؟ رەشاشەکەم کەوتبووە ناو ئاو دەمانچەکەشم فیشەکی تیا نەبوو.... تفەنگەکەشم ئەولای ئاو بەدارێکەوە هەڵواسرابوو و لەئێستا دەستم پێی نەدەگەشت. ئەی چی بکەم؟ ئەم دەنگانە لەچیە؟ چ کەسانێك لەدەوروبەر لێم نزیك دەبنەوە....

خەنجەرەکەم کێشاو لەشوێنەکەمدا هەستام. بەڵام پێش ئەوەی ترسی زیاتر بەسەرمدا زاڵ بێت چاوم بەیەکێك لەرەش پێستەکانی هۆزی ئامازۆن کەوت و بەبینینی شادمان بووم. دواتر چەند کەسیتر لەناو دارەکان هاتنەدەرو هاتنەلام. زانیم ئەوان پێشتر لەمن رایان کردوە، زۆر باشە.... خراپ نیە........ ئێستا تەنیانیم...!

ئەم بیرێك بوو بەبینینی ئەوان بەزەینمدا هات. بەیەکیانم وت: کارانا کوا.

هێشتا وەڵامی نەدابوویەوە دەنگی کارانا بیسترا کەوتی:

من لێرەم سەرۆك. گەڕامەوەو ئەوم لەپشت سەری خۆم بینی پێم وت:

رەشاشەکەم لەئاو دەربێنن. ئەمە لەهەمووشتێك گرنگترە. کارانا شوێنی کەوتنە ناو ئاوی رەشاشەکەی لێ پرسیم. بەراکردن رۆشت و نزیکەی چارەکە کاتژمێرێك دواتر بە رەشاشەکە گەڕایەوە بەڵام بەداخەوە فیشەکەکان نمیان کێشابوو بەکار نەدەهاتن.

بەهەرحاڵ بەرێکەوتین. ئەمە پێشنیارێك بوو کارانا کردی. ئەو رێگاشی دیاری کردو بڕیاردرا لە ئەستێلکەوە خۆمان بگەیەنینە رووبار و بەدوایاندا بڕۆین.

بەم بڕیارە ڕۆشتینە ناو ئەستێلك و درێژەمان بەپێشڕەوی دا. هێشتا ماوەیك دوور نەکەوتبووینەوە بەلەمێکی خاڵیمان بینی. ئەم بەلەمە هی وەحشیەکان بوو کەدوای کوژرانیان بێ خاوەن لەسەر ئاوەکە مابوویەوە.

کارانا بەخۆشحاڵی رایکردو بەلەمەکەی گرت وهەمووان سورای بووین و بەیارمەتی یەکێك لەڕمەکان بەڕێکەوتین.

ڕێگا دوبارە لەناو ئەستێلکەوە تێدەپەڕی. هەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش ئەستێلك زیاتر باریك دەبوو و داری زیاتر سێبەریان دەخستە سەر بەشێوەیەك دوای میلێك ئەستێلك بوو بە داڵانێکی تاریك و ترس بزوێن.

ئێستا لەسەرخۆ دەڕۆشتینە پێش. دەنگی نەڕەی ئاژەڵە دڕندەکان و جیرە جیری باڵندەکان و دەنگی سەیرو سەمەری بوونەوەرەکانی نێو ئەستێلك لە دوورو نزیکە دەبیسترا و بێدەنگی دەشکاند. کەمێك ئەولاتر دەنگی ڕەشاش بیسترا و ئیمەی لە شوێنەکەی خۆماندا چەقاند. ئەم دەنگە لە چیە؟ لە کێیە؟ ئایا یوری زیندووە؟

ئەم پرسیارانە بە مێشکمدا هات. بەڵام بەهۆی دووری ماوە نەمتوانی جوان جیایبکەمەوە. گریمان ئەگەر دووریشمان کەم بووایە تایوریم نەدەبینی نەمدەتوانی باوەڕبکەم ئەو زیندووە و دەیەوێت بەرگری لەمووناك بکات.

کارانا بێ راوێژ کردن لەگەڵ من خێرایی بەلەمەکەی زیاد کردو بەرەودەنگەکە بەڕێکەوت.

هەرچەندە زیاتر دەڕۆشتینە پێش دەنگەکە باشتر دەبیسترا بەڵام لەشوێنێکدا کە بۆنی باروتیش بە لووت دەگەشت دەنگەکە نەما. هەرچەندە چاوەڕێ بووین ئیتر دەنگ نەبیسترایەوە. بەئیشارەی کارانا بەلەمەکەمان بردە بەستێن و دابەزین و درێژەمان بەپێشڕەوی دا. سێ سەد مەتر ئەولاتر دوبارە دەنگی ڕەشاش بیسترایەوە و گەڵاو بەرگی دارەکان سەرسەرمان رژانە خوار......

گوولەکان لەسەر سەرمانەوە تێدەپەڕین. دەتوت تەقە لە ئێمە دەکەن. کارانا لە پێشتر بوو، قیژاندی و وتی: تەقەمەکە، تەقەمەکە ئێمەین.

دواتر بەراکردن رۆشتە پێش. بەدوایدا دەڕۆشتم و بەوپەڕی سەرسەورمان مووناکم بینی لەکاتێکدا ڕەشاشەکەی لەچنگی دا دەگوشی و لەسەر جەستەی خوێناوی یوری وەستابوو. زۆر زوو هەمووشتێك ئاشکرابوو و دەرکەوت یوری بەتەنیا ماوەتەوە و تادواین کەس لەوەحشیەکانی کوشتووە و مووناکی رزگار کردوە و خۆشی بەهۆی

برینەکانی بێ هۆش بووە.

خێرا پشکنینم بۆ کرد. دڵی بەئارامی لێیدەدا.

رمێك کەمێك لە کەلەکەی هەڵدڕی بوو، خوێنێکی زۆری لێ رۆشتبوو. پارچەی خوارەوەی شەرواڵەکەی خۆم بەخەنجەر بڕی و کەلەکەی یوریم پێ بەست. دواتر دەستورم بە کارانا دا بیبەن بۆ ناو بەلەمەکە.

درەنگ کردن رەوا نەبوو....... یوریم لەناو بەلەمەکە دانابوو و دەڕۆشتین.

کارانا و ئەوانیتر پارێزگاریان لە مووناك دەکرد و بەدوای مندا دەهاتن.

رێگەمان لەناو ئەستێلکەکەوە تێدەپەڕی چوونکە مووناك باوەڕی وا بوو ئەوێ ئەمنترە. بەم شێوە مووناك رزگاری بوو بەڵام یوری حاڵی خراپ من بۆ ئەوەی زووتر خۆم بگەینمە هۆز پەلەم کرد. بێ ئاگا لەوەی وەحشیەکانی یوچی دوبارە لەرێگا کەمینیان کردوەو چاوەڕێمان دەکەن....

دەڕۆشتمە پێش کە لەناکاو دەنگێك کە هاوشێوەی دەنگی مەلەکانی جەنگەڵ بەرزبوویەوە. ئەگەر کەسێکی تر بوو بەخوێنساردی ئەم دەنگانەی دەبیست و لێیان تێدەپەڕی بەڵام من کە لەگەڵ ئەم جۆرە دەنگانە بەتەواوی ئاشنابووم و دەمزانی وەحشیەکان بۆ ئاگادار کردنەوەی یەکتر لاسایی دەنگی مەل و باڵندەکان دەکەنەوە، وەستام. دڵم لەترسا داکەوت و ئارەقێکی سارد لەم سەر ناوچاوم دانیشت. دەنگەکە نەماو بێدەنگی بوو بەفەرمانڕەوا بەڵام یەك دو چرکە دواتر ئەودەنگە لە شوێنێکی تر بەرزبوویەوە ودەتوت لەوەلاوە وەڵامی یەکەمی داوەتەوە و ئامادەیی خۆیان رادەگەیاند. کاراناش کە ئەم دەنگانەی بیستبوو بەچەند هەنگاوێکی گەورە خۆی بەمن گەیاند و بەرەنگی پەڕاو وتی:

سەرۆك..... دەبیستن؟ یوچیەکان دوبارە بۆ هێرش ئامادەبوونەتەوە. چارەیەك بدۆزنەوە.....

بە کارانام وت: تۆ ئاگات لە مووناك بێت. مەبەستی ئەوان فڕاندن و کوشتنی مووناکە. هەوڵبدەن ئەو لەزیان و دەستی ئەوان بەدووربگرن. من رێگە لە هێرشەکە دەگرم.

کارانا بەرەو مووناك رایکردو منیش تەنافەکەم رەهاکرد و بەرەو بەلەمەکە رۆشتم و رەشاشەکەی یوریم هەڵگرت.

یوری تازە هاتبووە هۆش و چاوەکانی خۆی کردبوویەوە و کە نیشانی شڵەژانی منی

بینی بەدەنگێکی لەرزان و گیراو کە ئازاری پێوە دیاربوو، پرسی:

چی بووە.......؟ هێرشیان کرد......؟

رەشاشەکەم هەڵگرت و لەملم کرد... دواتر بەلەمەکەم بەدەست پاڵ پێوەناو و کردم بە ناوگیاکانی ئەستێلک و بەیوریم وت:

ئارام...... لێرە مەجووڵێ... شتێکی گرنگ روی نەداوە، ژمارەیان زۆر نیە.

بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی ئەوبم بەرەو ناوەڕاستی ئاو کە دارەکان سێبەریان خستبوو سەر بەشێکی زۆری، رام کردو لەوێدا خۆم حەشاردا.

کاراناش موموناکی لەناو گژوگیادا داشارد و دوای ئەوەی دوانی بۆ پارێزگاری کردن دانا هاتە لای من تا لە ئەگەری پێویست پشتیوانی وبەرگریم لێ بکات.

ئەم جارە بارودۆخی هێرش لەگەڵ جارانی تر بەتەواوی جیاواز بوو. پێشتر ئێمەیان بە شێوەی بازنەیی گەمارۆدەدا، کەم کەم ئاڵقەی گەمارۆکەیان بچووك و بچووکتر دەکردەوە چوونکە لە چوارلاوە نەماندەتوانی بەرگری بکەین زیانی زۆرمان بەردەکەوت.

ئەوان لەم شێوە هێرشە ئەنجامیان وەرنەگرتبوو وەك شەرکەرە بەئەزموونەکانی یۆنان و رۆم شێوەی هێرش کردنیان گۆڕی و جۆرێکیتر هاتنە ناو گۆڕەپانی شەڕ.

هێشتا سەیری دەورووبەرم دەکرد و چاوەڕێ بووم لەناو دارەکان وەحشیەکان دەرکەون بەڵام چاوەڕوانیەکەم نەهاتەدی و لەناکاو دیمەنێکی تر دروست بوو کەچاوەڕێم نەدەکرد.

کتوپڕ یەکێك لە وەحشیەکان لەکاتێکدا قەمەیەکی پانی لەدەستدابوو و لەناو پەنجەکانیدا دەیگوشی، لەپشت گژوگیاوە هاتەدەرو بەخێرایی بەرەولای من رایکرد. پشت سەری ئەو یەکیترو بەدوای دوەمی سێیەمی، چوارەمی و پێنجەمی و شەشەمی لەریزێکی درێژدا هێرشیان کرد.

هۆی هەڵبژاردنی ئەم شێوە ئەوەبوو ەسیلاحەکەی ئێمە ترسابوون و چوونکە مەودای کارکردنیان بەزۆر و بەربلاو دەبینی، دەیانویست دەرفەت بەمن نەدەن چوونکە رەشاشەکەم لەدەستابوو. دەترسان لەوەی بەجووڵەیەکی خێرایی رەشاشەکە بیانکوژم.

تەقەم لەکەسی یەکەم کرد.

بە گوولەی دوەم ئەوم کوشت بەڵام ئەوەندە لەمن نزیك بیوونەوە دەرفەتی تەقەکردنم نەبوو... کارانا هاتە پێش و لەگەڵ یەك لەوان کەلەپێشیانەوە بوو، دەرگیربوو. بەخێرایی کوشتی و لەناو ئاوی ئەستێلکدا ونی کرد.

ئەم هێرشە چاو نەترسانە بووە هۆی ئەوەی بتوانم یەکێتریان بکوژم بەڵام بەدبەختانە چوونکە ئەجەلی کارانا گەشتبوو نەمتوانی بەرگری لێبکەم و رزگاری بکەم.

دو سێ لە رەشەکان خۆیان فرێدایە سەری و سەریان بڕی.

کاتێک چاوم بەسەری کارانا کەوت کە هێشتا خوێنی لێدەچۆرا و پێڵوی چاو و لێوەکانی تەکانیان دەخوارد شڵەژام و ئەوەندەی نەمابوو کۆنترۆڵی خۆم لەدەست بدەم. بەڵام بەسەرخۆمدا زاڵ بووم و درێژەم بەتەقەکردن دا.

بەخۆشحاڵیەوە چوونکە ریزەکەی ئەوان تێک چبوو بەجووڵاندنی لوولەی رەشاشەکە سیان چوارم لێ کوشتن و فرمدانە ناو ئاوەکە.

یوچیەکان زۆر بوون و هەرچیم لێ دەکوشتن. کۆمەڵێکی تر لەپشت گیاکان دەهاتنە دەر و هێرشیان دەبرد. لەم کاتەدا لەناوەڕاستی ئاوەکە گێژببووم و نەمدەزانی چی بکەم کە دەنگی یوریم لەپشت سەری خۆم بیست کە بەناڵە ناڵ دەیوت: رەشاشەکە بدە بەمن... ئاوڕم دایەوە بەسەرسوڕمانەوە بینیم یوری بەیارمەتی دەست بەلەمەکەی بەرەو لای من لێخوڕیبوو و تا گۆڕەپانی شەڕەکە هاتبوو.

دەمویست رەخنەی لێبگرم بەڵام لەو شوێنە مەترسیدارە جێگەی ئەم جۆرە قسەو وتوێژانە نەبوو بۆیە لەبەرانبەر داواکاری یوری کە دەستی درێژکردبوو تەسلیم بووم و رەشاشەکەم پێدا. یوری نەیدەتوانی هەستێت و بەپێوە تەقەبکات. بۆیە دانیشت و بەرگری کرد و بەهەمان شێوە کە لەناو بەلەمدا دانیشتبوو تەقەی دەکرد و زۆر باشتر لەمن کوشت و کوشتاری دەکرد. کاتی تەقەکردن ئەو لە توندی هێرشی وەحشیەکان کەم بوویەوە، هانەسەیەکم کێشاو بەپشت دەست ئارەقی ئاوچاوم سری. پێی وتم:

موونا پێش بخە...... دەبێت لێرەدا راکەین.... خێراکە... مووناك لەناو گژوگیاکانەوە ببەرە پێش.

بێ بەفیڕۆدانی کات خۆم گەیاندە ئەو شوێنەی مووناك و دوان لەرەشەکان خۆیان تیا داشاردبوو و قەمەم لەگەڵ خۆمدا برد.

بۆ ئەوەی وەحشیەکان نەمانبینن لەناو گیا و پشت دارەکان بەکۆمە کۆم دەرۆشتین و نزیکەی سەد مەتر بەم شێوە رۆشتین و ولەوێ مووناك و رەشەکانم رەهاکرد و وتم:

لێرەدا بمێننەوە.....

دواتر بەخێرایی خۆم بەیوری گەیاند. لەپشت بەلەمەکە خۆم حەشاردا. یوری وتی:

پاڵ بە بەلەمەکەوە بنێ، هێواش هێواش بیبەرەخوار.

وەحشیەکان پاشەکشەیان کردبوو. روی ئەستێلك لە جەستەی وەحشیەکان داپۆشرابوو و بەلەم لەکاتی رۆشتن هەندێ کات لە جەستەکان گیری دەکرد و ناچار بەلەقە جەستەکانم لەسەر رێگا دووردەکردەوە درێژەم بەکارەکەم دەدا.

لەهێرشبەران تەنیا چەند کەس مابوویەوە وئەوانیش بوێری هێرشی راستەوخۆیان نەبوو و لەمەودایەکی دوورەوە رمەکانیان تێدەگرتین.

کاتێك کار گەشتە ئێرە بەزەختی زیاتر پاڵم بە بەلەمەکەمەوە دەنا و بەخێراییەکی زیاتر بەلەمەکەم لەشوێنی شەڕەکە دوور دەکردەوە. مووناك و دو رەش پێستەکەش پەیوەستمان بوون و بەخێرایی هەرچی زیاتر درێژەمان بە رێگەدا.

وەحشیەکان لە بەدوادا چوونمان چاویان پۆشی و ئێمە کە لەرووبار نزیك بووینەوە گوومانم کرد لەمەترسی رزگارمان بووە و بۆ ماوەیەکی زۆر لەزیانی یوچیەکان لە ئەماندان.

مووناك وتی: ئەوان بۆ ئاگادار کردنەوەی پیاوەکانی خۆیان رۆشتوون، یەك دو کاتژمێری تر دەگەڕێنەوە و دوبارە هێرش دەکەن. یوریش باوەڕەکەی ئەوی پشت راست کردەوە بەڵام یەك دو کاتژمێر تێپەڕی و لە یوچیەکان هیچ هەواڵێك نەبوو.

مووناك لەنێوان دوان لە رەشەکان لەپێش ئێمەوە دەڕۆشت. تەنافی بەلەمەکەم لەسەر شان بوو، رامدەکێشا کە کتوپڕ دەنگی خشە خشێکی توند بیسترا و دواتر ناڵەی لاواز ی یوری بەرزبوویەوەو بەلەمەکە سووك بوو.

بەترسەوە ئاورم دایەوە ویوریم لەباوەشی ماری ئاناکندای گەورەدا بینی. ئاناکندا کە نزیکەی دە مەتر درێژ و پانایی چل سانتیمەتر دەبوو خۆی بەدارەکەوە هەڵواسیبوو و کاتێك بەلەمەکە لە ژێر دارەکەوە دەڕۆشت خۆی لەدەوری یوری ئاڵقەکرد و ئەوی فڕاند. بەلەمەکە لەبەر ئەمە سووك بوو بەڵام چوونکە یوری قورس بوو بەرگری دەکرد، مارەکە لەدارکرایەوە و هەردوکیان کەوتنە ناو ئاوەکە.

مار بەشێوەیەك خۆی لەمل و کەمەری یوری ئاڵاند بوو یوری بەو هەموو توانایی جەستەیی خۆی نەیتوانی بەرگە بگرێت و نزیك بوو چاوەکانی دەرتۆقێت.

سەرەتا دەمویست بەرەشاشەکە تەقە بکەم بەڵام خێرا پەشیمان بوومەوە لەترسی ئەوەی نەوەك لەجیاتی مارەکە یوری بکوژرێت. خەنجەرم کێشاو چەند جارێك لەمارەکەم دا. مار بەکلکی خۆی پیا کێشام و چەند مەترێك ئەولاتر فڕیدام بەڵام دوبارە پەلامارم دایەوە.

کاتی خوێندن لە خوێندنگا خوێندبووم و لەزمانی دایەگەورە و باوەگەورەیەکی پیرم بیستبووم مار بە هەڵدرینی جەستە یان درینی بەشێك لە پێستەکەی ناکوژرێت.

ڕاستیەکەش وایە و بەئاگادار بوون لەم بابەتە زیاترسەرنجم لەسەر و ملی مارەکەدا چوونکە دەمزانی ئەگەریش گریمان مار لەناوەراستەوە ببێتە دوکەرت دوبارە دەتوانێت یوری بگەزێت و یان بەهۆی فشاری بەشی ماوەی جەستەی خۆی بیخنکێنێت.

جیاواز لەهەمووی ئەمانە بەڕادەی پێویست کاتم نەبوو. هەرساتێك کە تێدەپەڕی ئەگەری مەرگی دڵتەزێنی یوری زیاتربوو کە بەهۆی برینەکانی توانای پێویستی بۆ بەرگریکردن لە خۆی نەبوو و دەبوا بەخێرایی کاری خۆم ئەنجام بدەم.

کاتێك دوبارە هێرشم کردە سەرمارەکە، ئەو ئاژەڵە مەترسیدارە کە نەیدەویست بەئاسانی نێچیرەکەی لەدەست بدات، دوبارە پەلاماری دام. ئەم جارە دیانە ژاراوییەکانی خۆی نیشاندام و زمانی دو شاخ و درێژی خۆی وەك هەڕەشە دەردەهێناو دەیبردە ناو.

کاتێك لە چاوە ڕەنگ شینەکانی مارم دەڕوانی، جەستەم وەك بڵێی لەکارەبایان دابێت دەلەرزی و جۆرێك گێژیم لەخۆمدا هەست پێ کرد.

لەهەمان کاتدا زانیم ئەمە کاریگەری چاوەسیحراویەکانی مارە. مار کاتێك سەیری چاوی نێچیرەکەی دەکات بەهێزێکی تایبەت چاوی نێچیرەکەی داگیردەکات و جووڵەی لێدەبرێت.

بۆ منیش هەروای دەکرد بەڵام کاریگەری چاوی مار لەسەر من کەم و ئەنجامەکەی لاواز بوو. لەهێرشی دوەم بەپێی ئەزمون سەیری چاوی ئاناکندام نەکرد و خەنجەرەکەم لەپشتە ملی چەقاند.

تیغی پۆڵایین و تیژی خەنجەرەکەم لەپشتی ماردا چەقی. کەمێك نەرمیم هەست پێکرد بەڵام دواتر لەئێسقان گیری کرد و وەستا.

ئەو ئاژەڵە مەترسیدارە تەکانێکی بەخۆی داو پەلاماری دام. لەم کاتەدا بینیم قڵیشێکی گەورە بەئەندازەی بیست سانتی مەتر لەجەستەی ماردا دروست بووە بەڵام ئەمە ئاناکندای نەدەکوشت تەنیا کاریگەری ئەوەبوو لاواز و بەهێزی سەرەتایی خۆی نەیدەتوانی پەلامارم بدات. سستی مار لە فشار خستنە سەر جەستەی یوریش کاریگەری بوو. لەناکاو دەنگی هاوڕێ بەئەمەکەکەی خۆم بیست کەدەیوت:

گەردنی بگرە.... گەردنی بگرە و مەترسە.

یوری لە سستی مار کەڵکی وەرگرت و بە جووڵەیەکی خێرا توانی قورگ و ملی خۆی

لەناو یەکێك لە ئاڵقەکانی مار دەربێنێت. لەم کاتەدا یوو توانی ئەم دەستورە بەمن بدات.

مار فشاری دەهێناو یوری بەو جەستە لاوازو بێ هێزەی خۆی بەرگری دەکرد و هەندێ کات ناڵەیەك لەقورگی دەهاتەدەر کەمنی پەرێشان دەکرد.

یوری وتبووی گەردنی ماربگرم بەلام ئەم کارە چۆن ئەگەری بوو! لەخۆم دەپرسی: ئەگەر خۆی لەجیاتی من بووایە توانای ئەم کارەی دەبوو؟

لە جیاتی ئەوەی وەلامی ئەم پرسیارە بدەمەوە کەوتمە بیری قیافەی و قسەکانی یوری.... ئەو دیمەنەم هاتە بەرچاو کە کارانای رادەسپارد ئاگای لەمن بێت. یوری منی بەترسنۆك دەزانی کە پێویستم بە پشتیوانی کەسانیترە. زۆر باشە....

ئێستا دەرفەتی گونجاو بەدەست هاتبوو. دەبووا بوێری خۆم بە یوری بسەلمێنم و نیشانی بدەم. ئەم بیرە شۆڕشێکی وای تیادروست کردم گومان ناکرێت. سەرم گەرم بوو. خوێن لە دەمارەکانم بەخێراییەی زۆرتر دەسوڕا. یەك دو چرکە لەدەستوورەکەی یوری و گرتنی بڕیارەکەی خۆم تێپەڕی، هەموو ئەم بیرو ئەندێشانە بە بیرمدا هات و سەرئەنجام خەنجەرەکەم بە دەستی چەپ گرت وخۆم فرێدایە سەر مارەکە.

مار دو سێ جار بەرەولای من پف پف ی کرد بەلام نەیتوانی بمگەزێت. لەم کاتەدا دەستم گەشتە پشتە ملی ئاناکندا و بەهەموو هێزی خۆم گرتم....

هەڵبەت بەدەستێك نەمدەتوانی مارەکە بگرم چوونکە ئەوەندە بەهێزبوو ئەگەر بریندارو لاواز نەبووایە بەجووڵەیەکی خێرا منی چەندین مەتر ئەولاتر فرێدەدا. دەمویست دەستی چەپم ببەمە یارمەتی دەستی راست.

بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە خەنجەرەکەم خستە ناو دەم و لەناو دوریزی دیانەکانمدا دامنا بەلام لەوناوەدا شتێکی تر رویدا کە بڕیارەکەی گۆڕی.

مار بۆ گرتنی من ئاڵقەکانی دەوری یوری کردەوە، یوری ئاسوودەتر بوو بەخێرایی وتی: بۆ وەستاویت..... سەری ببرە. دەرفەتت باشتر لەمە دەست ناکەوێت. وتەکانی یوری منی وشیار کردو بەخێرایی خەنجەرم لەناو دو ریزی دیانەکانم دەرهێنا و پەلاماری مارەکەم دا.

سەرەتا زەربەیەکی توندم لەمێشکی ماردا کە گەردنی لەدەستم دابوو، مار یوری رەهاکرد و کلکی لەکەمەرم ئالاند و زەختی لێکردم و دواتر زەربەیەکم لەچاوی دا و ئیتر نەمتوانی هیچ بکەم چوونکە فشاری مار بەڕادەیەك زۆربوو نزیك بوو بڕبڕەو پەراسوەکانم وردببێت. هەناسە لەسینەمدا توندو دنیا لەبەرچاوم تاریك بوو.

ئەگەر یەک خولەکی تر بەم شێوە تێپەڕیایە ئەگەری بوو ماری تووڕە بمکوژێت. تازە زانیم یوری چ هێزێکی بەکاربردوە و چۆن لەبەرانبەر فشاری ئەو ئاژەڵەدا لەسەرتاوە خۆراگری کردوە. ئەم جارە نووکی خەنجەرم لەژێرقورگی مار گیرکرد، چەقاندم و بەیەک تەکان کێشامە سەر. نیوەی ملی بڕیو و نیوەکەی تریم بەخێرایی بڕی و سەریم فرێدا ناو ئاوەکە.

چاوەڕێ بووم ماری بێ سەرم رەهام بکات و بمرێت بەڵام ئەگەر بڵێم زیاتر لەپێش فشاری لێدەکردم رەنگە باوەڕنەکەن.

فشارەکەی سات بەسات زیاتر دەبوو بەڵام ئێستا هێواش هێواش کەم دەبوویەوە.

سەر ئەنجام یوری مارەکەی وەك تەنافێکی ئەستوورو گۆشتن کەلەمن ئالآبوو کردەوەو فرێدایە ناو ئاوەکە.

لاشەی درێژی مارەکە لەناو ئاوەکەدا چەند جارێك تەکانی خوارد و دواتر رۆشتە ناو ئاوەکە و نەغرۆ بوو.

یوری بەپشتە دەست ئارەقی ناوچاوی سری و دواتر بەهەمان دەست کێشای بەسەر شانی مندا وتی: ئافەرین سەرۆکی ئازیز... دەین و قەرزەکەی خۆت پێدامەوە لەجیاتی ئەو چەند جارەی تۆم لەمردن رزگارکرد ئەم جارە گیانی منت بە ئازایەتی خۆت کڕییەوە.

زیاد لەڕادە سوپاستان دەکەم و شادمانم کە ئیتر حسێبێکمان لای یەك نیە.

یوری ئەم قسانەی کردو چوونکە ئیتر توانای تیانەبوو بەرەو بەلەمەکە رۆشت و خۆی تێفرێدا. منیش تەنافی بەلەمەکەم خستە سەرشان و دەستم بەڕاکێشان کرد. سێ سەد مەتر ئەولاتر مووناك ودو رەش پێستەکە پەیوەستمان بوون و درێژەمان بەرێگاکەماندا.

نیو کاتژمێری تر بەم شێوە رۆشتین تا گەشتینە رووبار. خۆشبەختانە یان بەدبەختانە ژمارەمان زۆر نەبوو و هەموومان دەمانتوانی سوار بەلەمەکە ببین و بەیەکجار بڕۆینە ئەوبەر.

ئەم کارەمان کرد.... مووناك سەری یوری خستبووە سەر رانی. منیش لەخوار قاچی دانیشتم و دو رەش پێستەکە بەیارمەتی دارە درێژەکان بەهەمان شێوە کە خۆیان دەیانزانی بەلەمەکەیان دەبردە پێش.

## ١٠

ڕەوتی ئاوی ڕوبار توند دو ڕەش پێست بەهەموو شارەزایی خۆیان نەیاندەتوانی لەو دو دارە وەك سەوڵ کەڵك وەربگرن و لە ڕێ دەرچوونی بەلەمەکە ڕێگری بکەن.

لەبەرئەمە هەرچەندە لەبەستێنێکی تر نزیك دەبووینەوە لەهێڵی ڕاست دوور دەکەوتینەوە و دەڕۆشتینە خوار بەجۆرێك بەپێی بەراوردکردن یەك میل خوارتر لەخاڵی بەرانبەر شوێنێك کە سوار بەلەمەکە بووین، دەگەشتینە بەستێن.

ئەم بابەتە زۆر نیگەرانی نەکردم چوونکە وامدەزانی لەمەترسی ڕزگارمان بووە و لەناو بەلەمەکە بەوپەڕی ئاسوودەیی دانیشتبووین کەلەناکاو دەنگی خش خشی تایبەت لەدەوری بەلەمەکە بیسترا. سەیری دەورووبەرم کرد بینیم دوبارە یوچییەکان بەدواماندا هاتوون و لەقەراغ ڕووبارەوە بە هاویشتنی ڕم هەوڵ دەدەن بمانکوژن.

ڕمەکان بەهۆی دووری ماوەوە مەبەستیان نەدەپێکا و بەهەمان دەنگی خش خش دەکەوتنە ناو ئاوەکە. مووناك دەستووری بەرەشەکان دا خێراکەن.

بەڕێکەوت تاشەبەردێکی گەورە لەناوەڕاستی ڕووبار سەری لەئاو دەرهێنابوو و ئاو کاتێك پێی دەگەشت و کەفاوی و خرۆشاو لەدولاوە دەگوزەرا.

یەکێك لە بەشەکانی ئاو بەلەمەکەی ئێمەی لەخۆ گرت و بەخێراییەکی چاوڕوان نەکراو لەقەراغ دووری کردینەوە و لە بەستێنەکەی تر نزیکی کردینەوە. ئەوێ قووڵایی ئاو کەمتر بوو، ڕەشەکان دوای پێنج خولەك بەلەمەکەیان گەیاندە بەستێن و لێی دابەزین و بۆئەوەی بەلەمەکە دەست وەحشیەکان نەکەوێت دامانە دەم ئاوەکەو نوقم مان کرد.

یوری ئەوەندە لاوازببوو نەیدەتوانی بەڕێگادا بڕوات. خوێنێکی زۆری لێ ڕۆشتبوو ڕەنگی سپی ببوو بۆیە یەکێك لە ڕەشەکان خستیە سەرشان و بڕیاریدا لەنیوەی ڕێگادا ڕەشەکەی تر یارمەتی بدات. من و مووناك لە پێشەوە دەڕۆشتین و سەبارەت بەرابردوو و داهاتووی خۆمان وتوێژمان دەکرد. دەیوت:

ئەگەر یوچییەکان منیان بکوشتایە تۆ بەئاسوودەیی لئۆنات دەهێنا و چوونکە کچەکەمان دەبوو سەرۆکی هۆز کەس کاری بە ئێوە نەبوو و ژیانێکی ئاسوودەتان بەسەر دەبرد...

له وەڵامدا وتم: لئۆنا منی چارەسەرکردو کاتێك باش بوومەوە داوای لێکردم بۆ رزگاری ئێوە بەرێکەوم ئەو بۆ تۆ زۆر نیگەرانە... دڵنیام کەس لەناو هۆز بەقەدەر لئۆنا تۆی خۆش ناوێت. ئەو هاورێی راستەقینەی تۆ دەژمێردرێت و تۆ بێ هۆ لێی بێزاریت.

قسەکانم لەمووناك کاریگەری بەجێ هێشت و سەرئەنجام بەڵێنم لێوەرگرت رێگەی مانەوەی لەهۆز بدات و کاری پێی نەبێت.

ئەویش بەڵێنی دا وەك هاورێی خۆی بەدانیشتوانی هۆزی بناسێنێت. هێشتا زۆر لەهۆزەوە دوور بووین کە دەنگە دەنگمان بیست و کاتێك نزیکتر بووینەوە، دانشتوانی هۆز خۆیان بۆ هێرش کردنە سەر هۆزی یوچی ئامادە دەکرد و بەرەو رووبار دەرۆشتن... مووناك لەم کارە بێ سوودە پەشیمانی کردنەوەو ئەوانی گەراندەوە.

ئەو شەوە جەژنێکی بەشکۆ لەهۆزدا سازدراو ژنە جوانەکانی ئامازۆن تا بەیانی سەمایان دەکرد و شادیان دەربری.

روداوی سەرنج راکێشی ئەو شەوە روبەرووبوونەوەی مووناك و لئۆنا بوو. جگە لە رووداوە بچووکە کە لەسەرەتا دا بەباوەری من زۆر بچووك دەهاتە بەرچاو، شتێکی سەرنج راکێشی تر رووی نەدا.

وامدەزانی مووناك و لئۆنا روبەرووی یەك دەکەمەوە و ئامادەکاریەکانی ئاشت بوونەوەی ئەوان ئامادە دەکەم و بەم شێوە ئەوان دەبنە هاورێ. ماوەیەك کە بۆ ئاشت کردنەوەی ئەو دوانە لای خۆم دیاریم کردبوو تەنیا چەند خولەك و ئەو پەری نیو کاتژمێر بوو.

بەم گوومانە، لەنیوە شەو تێپەری و کەسێکم نارد بەدوای لئۆنادا. ئەو لەگەڵ هاتنی بۆ هۆز و بەرپا بوونی جەژن لەترسی ئەوەی نەوەك دووبارە کەوتبێتە بە رەق و بزەیەکی من و پێکەنینی ئەو دووبارە مووناك شێت بکاتەوە، پەنای بردبووە سووچێك و خۆی داشاردبوو. دەمویست لە جەژنەکەدا ئامادەبێت و لەم شادیەدا بەشداربێت. لە قووڵایی دڵەوە لەگەڵ ئەوەی بەڵێنم لە مووناك وەرگرتبوو، دەترسام. دوور نەبوو مووناك بەڵێنەکەی بخاتە ژێر پێ و ئەم جارە لئۆنا بەدەستی خۆی بکوژێت.

کەسێك بەدوای لئۆنادا رۆشتبوو گەرایەوە و هەواڵی گەرانەوەی هێنا. پێش هاتنی لئۆنا بۆ جەژنەکە بەئارامی دەستی مووناکم خستە ناو دەستی خۆم و بەنەرمی گوشیم، وتم: مووناکی ئازیز، دەتەوێت لەگەڵ لئۆنادا ئاشت ببیتەوە......؟

سەرەتا وەڵامی نەدایەوە و سەری داخست. روخساری نیشانی دەدا قسەکەی منی

بیستووە و نایەوێت وەڵام بداتەوە....

دوبارە پرسیارەکەم دوبارە کردەوە و وتم:

تۆ بەڵێنت پێدام لەگەڵ لئۆنا میهرەبان بیت و ئەو وەك هاوڕێی خۆت بەدانیشتوانی هۆز بناسێنیت. وانیە.....؟ ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بەڵێنەکەت ببەیتەسەر...

ئەو بۆ چارەسەر کردنی من ئازاری زۆری کێشاو ئەوەندە سوور بوو و پێداگری کرد بەبرینداری و بۆ رزگار کردنی تۆ خۆم دایە دەست مەترسیەکان. دەبێت خۆشەویستی ئەو قەرەبوو بکەیتەوە. ئەم جارە مووناك زەق زەق سەیری کردم و کاتێك قسەکانم تەواو بوو وتی: تۆش بەڵێن دەدەیت خۆشەویستی ئەو لە دڵ دەرکەیت...؟ دڵنیام تۆ زۆرت حەز لە لئۆنایە.... ئەویش تۆی خۆش دەوێت و هەردوکتان دەتانەوێت عەشقەکەتان لەمن بشارنەوە بەڵام بە مۆڵەتی من و رەزامەندی من لە پشت دەرگاوماڵەکەم سەرقاڵی عاشقێنی خۆتان بن. ئەمە کارێکی دژوارو ئازار دەرە کەلای من چاوەڕێیت و کەمتر ژنێك لە ئامازۆن ئەم مۆڵەتە بە هاوسەرو دەزگیرانی هاوسەرەکەی دەدات....

دوبارە دەستم بە بەڵگە هێنانەوە کرد و بەشێوەیەکی کاتی رازیم کرد بە بۆ چوونەکەم رازی بێت.

وتم: بەرانبەر بە لئۆنا هەستی هاوڕێیەتیم هەیە و هیچ پەیوەندەیەکی عاشقانە لەنێوانماندا نیە کاتێك بزەیەك لە رەزامەندی و ئەوپەڕی شادمانی لەسەر لێوەکانی دانیشت وتم: لەدنیادا کەسم بە ئەندازەی تۆ خۆش نەویستوە و خۆش ناوێت. تۆ جوانترین ژنی سەر زەویت و کەمتر ژنێك جوانی و شیرینی و رێکی ئەندامی تۆی هەیە.

مووناك بەڕاستی و بەتەواوی مانا جوان بوو بەڵام وەك هەموو ژنە جوانەکانیتر ئەخلاق و دوور ئەندێشی نەبوو.... کەسێك کە دوور ئەندێش نەبێت شعوری نیە و ئەوکەسەی شعوری نەبێت زوو باوەڕ بەدرۆ دەکات.

درۆم لەگەڵدا ئەکرد. رۆژێك مووناکم تارادەی پەرستن خۆش دەویست و دەمویست تا بەیانی لای دانیشم و سەری بخەمە سەر رانم و یاری بە قژەکانی بکەم. ئەو رۆژانە بەعەشقەوە مووناکم خۆش دەویست بەڵام سەرئەنجام لێی تێر بووم. ئەمە یاسایەکی سروشتیە کە بەیەك گەشتن لە توندی عەشق کەم دەکاتەوە تا ئەو شوێنەی دەیگەێنێتە پلەی سفر. لەعەشقی خۆم بەڕاستی قسەم بۆ کردبوو بەڵام باسی دواترم نەکرد و ئەویش نەیدەزانی لێی تێر بووم......

ئەو درۆی منی بەو شێوە باسم کرد، باوەڕ کرد و سەری خستە سەرشانم و

بەشێوەیەکی عاشقانە وتی:

زۆر باشە لەگەڵیا ئاشت دەبمەوە بەڵام ئێستا کاتم نیە.. ئەوەندە بۆ بەیانی نەماوە.

بەسەر سوورمانەوە پرسیم:

ئاشتی کردن کاتی پێویست نیە... کەسێکم بەدوای لئۆنادا ناردوە و ئێستا دێتە ئێرە ئەم کارە زووتر ئەنجان بدەن تا خەیاڵی من ئاسوودە بێت. خۆم بە لێپرسراوی بەدبەختی و ئاوارەیی لئۆنا دەزانم....

مووناك وەڵامی دایەوە:

ئاشتی کردن لای کەم چارەکە رۆژێکی دەوێت.

سەرم سوڕما و بەخێرایی ئەم گوومانە لای من دروست بوو کە رەنگە لەهۆزەکەی ئەوان لەرێوڕەسمی تایبەت ئەنجام دەدرێت کە کات و دەرفەتی زۆری دەوێت.

پێش ئەوەی لەم بارەوە پرسیار بکەم و شتێك بپرسم مووناك سەری بەرزکردەوەو لەچاوەکانی من لە رووناکی ئاگری ناوەڕاستی گۆڕەپانی جەژنەکەی روانی چوونکە حەزو تامەزرۆی منی بۆ ئاشتی کردن لەچاو و نیگام دا خوێندەوە، بەخێرایی وتی:

زۆر باشە....... ئاشت دەبمەوە.....

بێ درەنگ چەند جارێك دەستی بەیەکدا دا. بە دەنگی دەستی ئەو دوان لەپیاوانی ئامازۆن نزیك بوونەوە. لەکاتێکدا دەستیان لەسینە ئەڵقە کردبوو سەریان بەنیشانەی رێز دانەواند و وەستان. مووناك وتی:

لەپەرستگا ئاگر هەڵکەن..... دەمەوێت بە ئامادە بوونی خواکانی جەنگەڵ و ئاگر لەگەڵ یەکێك لە دوژمنەکانی خۆم ئاشت ببمەوە... ئامادەکاریەکان ئامادە بکەن......

دوو پیاوەکە رۆشتن. چەند خولەك دواتر دەنگی تەپڵی تایبەت دەبیستراو کۆمەڵێك لەناو قەربالغی جیابوونەوە. سەرسورماو وەك بڵێی لە بانگهێشت کردنی خۆیان لەو کاتەی شەو ناڕەحەت بوون، بەلایەکی تردا رۆشتن. دواتر زانیم ئەوان خزمەتکاران و کارەکەرانی پەرستگای خواکانن، ئەوە تەپڵەش تەپڵی تایبەتی پاڕانەوەو ئەنجامدانی رێوڕەسمە مەزهەبیەکانە.

کاتێك ئەو تاقمە رۆشتن تەپڵ چیەکەش بەدوایاندا رۆشت و لەرێی دەنگ کە کەم کەم دوور دەکەوتەوە تێگەشتم مەودایەکی تاڕادەیەك زۆر لەنێوان پەرستگاو هۆزدا هەیە. هێشتا دەنگی گامپ گامپی تەپڵ لە دوورەوە دەبیسترا کە دەنگێکی نەرم لە پشت سەری خۆم بەگوێ گەشت. ئاورم دایەوە لئۆنام بینی وەستاوە.

شوێنەواری ترس و نیگەرانی لە چاوەکانی دیاربوو.

هەوڵی دەدا قیافەی خۆی ئارام و بێ گۆڕانکاری رابگرێ، بەڵام لەرەنگدانەوەی ناڕەحەتی لە چاوەکانی نیگای خۆیدا نەیدەتوانی ڕێگری بکات. لە بینینی نیگاو روخساری ئەو گوومانم برد کە هێشتا باوەڕی بە ئارامی و ئاشتی نیە ناتوانێت باوەڕ بکات مووناك لەگەڵی ئاشت دەبێتەوە.

لەم کاتەشدا مووناك گەڕایەوەو لئۆنای بینی.

لئۆنا و موناك وەك دو پڵنگی خوێنخۆر، دوو ئاژەڵی دڕندە کە دەیانەوێت یەکتر بدڕن و تۆڵە بسەنن‌ەوە چاویان بڕییە یەك و چەند ساتێك لەم حاڵەتەدا مانەوە.

سەرەتا لئۆنا پێکەنینێکی دەسکردی هێنایە سەر لێو و سەری داخست. دواتر مووناك پێکەنی وەك سوڵتانێك کە تاوانباری مەحکوم بەئیعدامی بەخشیبێت دەستی بە قسەکردن لەگەڵیا کرد.

زۆر باشە من لە گووناحەکەی تۆ چاو دەپۆشم و ڕێگە دەدەم وەك رابردو لەناو هۆزدا بمێنیتەوە و لەگەڵ خەڵکدا هەڵس و کەوت بکەیت. تاوانەکانی رابردوت بەتەواوی لەبیردەکەم کە تۆ ناڕەحەتیت نەبێت.

لئۆنا هیچی نەدەوت. مووناك سەیری منی کرد و دوای بزەیەکی کورت وتی:

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی هەمیشە لەگەڵ مندا دۆست و هاوڕێ بێت دەستورم داوە پەرستگا بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی ئاشتی کردن ئامادە بکەن و....

لئۆنا دوبارە هیچی نەوت بەڵام کاتێك مووناك وتی:

ئەمشەو لەبەردەم خواکان من و تۆ پەیمانی خوشکایەتی دەبەستین و سوێند دەخۆین هیچ کات خیانەت لەیەك نەکەین.

لەناکاو لئۆنا سەری هەڵبڕی و هەناسەیەکی هاوشێوەی قیژە کیشاو بەرەنگێکی پەڕاو و چاوێکی نیوە کراوە وەك کەسێك کە لەدوایین ساتەکانی ژیان لەبەردەم گیوتین یان تەنافی دار لەسەیر کەران و لێپرسراوان ئیعدام داوای یارمەتی بکات و لەگەڵ ئەوەشدا زمانی لەترسا گیرابێت سەیری من و مووناکی کرد.

لەرووناکی ئاگری گۆڕەپان سەما چاوەگەورەکانی ئەوم بینی کە بە پەردەیەك لە فرمێسك داپۆشرابوو نیشانی دەدا ئەشکی شادمانی نیە.

لئۆنا چارەیەکی جگە لە رازی بوون بەم پێشنیارە نەبوو، بە ئامادەبوونی مووناك نەمدەتوانی هۆکاری نارەزامەندی ئەو بپرسم:

بەهەرحاڵ رەزامەندی نیشاندا و لەهەمان کاتدا سەرم سوڕمابوو لەخۆم دەپرسی بۆ لئۆنا لەوەی دەبێتە خوشکی مووناك ناڕازییە.

چەند خولەك بەم شێوەیە تێپەڕی. لەم کاتەدا پیاوێك لە پەرستگاوە گەڕایەوە و خەبەریدا کەهەموو شتێك ئامادەیە و دەتوانن بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمەکە بڕۆن.

لئۆنا و مووناك شان بەشانی یەك دەڕۆشتن. ڕێگەم نەبوو لەپەرستگاو لەم ڕێورەسمەدا بەشداربم. بۆیە لەوێ مامەوە و بەسەیرکردنی جەژن کەلای کەسانیتر درێژەی بوو سەرقاڵ بووم.

تازە خۆر هەڵاتی ئاسمان رووناك ببوویەوە هاتنی بەیانی رادەگەیاند کە مووناك و لئۆنا گەڕانەوە لای من.

مووناك زیاد لەرادە شادمان دەهاتە بەرچاو بەڵام لئۆنا رەنگی بەروخسارەوە نەمابوو و برۆکانی هێنابووەیەك، قیافەی مۆن و چاوەکانی پڕ فرمێسك.

دوبارە دەرفەتی قسەکردن لەگەڵ لئۆنا نەبوو. مووناك دەستوری دا یەکێك لەماڵەکانی خۆی بۆ لئۆنا کە لەو رۆژەوە بەخوشك ناوی دەبرد و شانازیەکی گەورەی لەناو هۆزدا پێبڕا، برازێننەوەو ئامادە بکەن تا لئۆنا لەوێدا بژی.

دەستووری تریشی بۆ ئاسوودەیی لئۆنا دا و تێگەشتم ئەو لەماڵیاتی دانیشتوانی هۆز کە لەبەردەست مووناکدا بوو کەڵك وەردەگرێت و لەوە بەدوا کارناکات. چەند رۆژ تێپەڕی. نە توانیم چاوم بە لئۆنا بکەوێت نە ئەو هاتە بینینم. رۆژێك لەگەڵ یوری کەتازە باش ببوویەوە و دەستی لەسەر شانی من دانابوو لەقەراغ جۆگەی ئاو پیاسەمان دەکرد. لەناکاو لەگەڵ لئۆنا روبەڕو بووم. بە شادمانیەکی زۆرسڵاوم لێکردو گوومانم دەکرد ئەویش لەبینینی من شادمان بێت بەڵام بەپێچەوانەی گوومانی خۆم بزەیەکی تاڵی هێنایە سەر لێو و سەری تەکان داو رۆشت. دەمویست بەدوایدا بڕۆم، ڕێگەی لێبگرم و هۆکاری ئەم گوێنەدانەی لێی بپرسم بەڵام چوونکە یوری پاڵی بەمن دابوو پەشیمان بووم و تەنیا بەسەیرکردنی ئەو کە کەم کەم دوور دەکەوتەوە بەسندم کرد.

ئەو شەوە و رۆژی دواترم بەناڕەحەتی بەسەرم برد. ئەوەندە لە رووداوەکەی ئەو رۆژە خەمباربووم سنووری بۆ نیە. دەمویست بقیژێنم و لە لئۆنا کە خۆشم دەویست هۆکاری ئەم کارەی بپرسم:

دو رۆژ دواتر بە بڕیارێکی ناعەقڵانەم گرت و بۆ بینینی لئۆنا پلانێکم داڕشت.

پلانەکەم ئەوەبوو شەو بڕۆمە ناو ماڵی لئۆنا و چاوم پێی بکەوێت. وامدەزانی

گوێنەدانی لئۆنا هۆکارێکی گەورەی هەیەو نەکات دەرگای ماڵەکەیم لێ نەکاتەوە بۆیە نزیک ئاوابوونی خۆر بەڕێکەوتم کە پێش گەشتنی ئەو لەماڵەکەی ئەودا خۆم داشارم.

سەبارەت بەپلانەکەی خۆم لەگەڵ یوریدا قسەم نەکرد. دڵم لێی دەدا، وردە وردە پەرێشان بووم. سەرئەنجام هەتاو کەم کەم خۆی کۆکردەوە و ئاوابوونی خۆر نزیک بوو.

لەپشت دارەکانەوە خۆم گەیاندە ئەو ماڵەی لئۆنا بەتەنیا تیادەژیا و کاتێک دڵنیابووم کەس لەو دەوروبەرەدا نیە لە حەشارگەکەم هاتمە دەرو بەخێرایی پەڕامە ناوماڵەکە.

ناو ماڵەکە بێدەنگ و تاریک بوو. بۆنی عەتری دڵ ئەنگێز و ڕۆح بەخشی گول بەلووت دەگەشت و نیشانی دەدا ئەوێ ماڵی کچێکی جوان وتەنیایە.

بەکوێرە کوێر ڕۆشتمە پێش تا سەرئەنجام خۆم لەپشت خومرەیەکی ئاوقۆرەی ترێ داشارد.

لەم جۆرە خومرانە لەماڵی ئامازۆنیەکاندا زۆر دەست دەکەوێت و تیایدا قۆرەی ترێ و میوەکانیتر لە ئاوی خوێ دەخەن و بۆ وەرزی دواتر کە میوەنیە کەڵکی لێوەردەگرن.

نزیک کاتژمێرێک تێپەڕی لەناکاو دەنگی کرانەوەی دەرگا بەگوێم گەشت. خولەکێک دواتر مەشخەڵ ڕۆشن بوو و سوچە تاریکەکانی ماڵ ڕووناک بوویەوە.

بەهێواشی سەرم لەپشت خومرەکە دەرهێنا بەڵام لەسەرسوڕماندا لەجێگای خۆم وشك بووم چوونکە کەسێکم بە ژوورەکەدا بینی کە بەهیچ شێوەیەك چاوەرێم نەدەکرد........

ناتوانم سەرسوڕمانی خۆم وەسف بکەم. ئێوەش ئەگەر لەجیاتی من بوونایە ئەم حاڵەتەتان پێ دەبڕا. لەوکاتەدا زۆر بوێر بووم کەنەمقیژاند و لەپشت خومرەکە نەهاتمەدەر. لێوی خواروی خۆم لەناو دوریزی ددانمدا گرت و ئەوەندەم فشاردا تا کەمێك ئارام بووم و توانیم لە شوێنەکەمدا بمێنمەوە. بەڵام سەیری کەسەکەم دەکرد.

دەزانن ئەو کێ بوو.........؟ مووناك...... بەڵێ........ مووناك.

من لەشەڕی مووناك و لەترسی ئەو بەنهێنی هاتبوومە ئێرە کەچاوم بە لئۆنا بکەوێت. ترسم لەوەبوو نەکا بمبینێت و بەڕاست ئەگەر دەیدیم کارم تەواو بوو و ئەم جارە بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی پێی بسەلمێنم لئۆنا بێ تاوانە و بەدڵنیایەوە هەردوکمان دەکوژراین. ئێستا کە بەدژواری خۆم گەیاندە ژوورەکەی لئۆنا و لەپشت خومرەکە خۆم داشارد، دەرگا کرایەوە و ئەو کەسەی لێی دەترسام و لەدەست ئەو رامدەکرد هاتە ژوور. جیاواز لەهەمووی ئەمانە ئەوکاری بە لئۆنا چیە.....؟ چی

بوو.......؟

سەرەتا وام دەزانی مووناك دەیەوێت لئۆنا بەنهێنی بکوژێت. دواتر ئەم گوومانەی خۆم رەدکردەوە چوونکە ئەو ئەگەر مەبەستی وای بووایە بەئاشکرا دەیکوشت و کەس دەستی نەدەگرت. جیاواز لەوەش سوێندی خواردبوو و کەهیچ کات هەڕەشە لەگیانی لئۆنا نەکات.

لەم شێوەدا لێرە چی دەکات؟ بەهەمان شێوە کە لەپشت خومرەکە خۆم داشاردبوو، کتوپڕ دەنگی پێ لەدەرەوە دەبیسترا و جارێکیتر دەرگای ژورەکە کرایەوە و لئۆنا هاتە ژوور. ئەو لە رۆشن بوونی چرای ژوورەکە سەری سوڕنەما،.... دەتوت چاورەێی ئەمەی دەکرد...

بەشێوەی رەسمی هۆز سلاوی لەمووناك کرد. بزەیەکی شیرین لێوەکانی کردەوە مووناکیش بزەی لەسەر لێوە بوو. لەنیگای هەردوکیان لەوکاتەدا، شوێنەوار نیشانەی دۆستی و خۆشەویستی دەبینرا و بەمە شادمان بووم.

لئۆنا رۆشتە سووچێکی تری ژوورەکە و کەدوییەکی سەرداخراوی شەربەتی مۆزی هێنا. ئامازۆنیەکان لە مۆز شەربەتێکی تایبەت دروست دەکەن کە زۆر شیرین و بەتامە. ئەم شەربەتە بەشیرینی سروشتی خۆی لە ماوەی زیاتر لەمانگێك هەویر دەکرێت و برێکی زۆر ئیسپرتۆی لێ بەدەست دێنن. ئەوان شەربەتی مۆز دەکەنە ناو کەدووە وشك کراوەکان کە بەڕۆن چەوری دەکەن و سەری کەدووەکە بەگڵ دادەپۆشن. دوای ساڵێك یان دوان شەربەتی مۆز وەك شەرابی لێدێت.

بەجۆرێك هەرکات شەرابی هەنجیری یوریم دەست نەدەکەوت پەنام دەبردە بەر شەرابی مۆز و لێم دەخوارد و سەرم گەرم دەبوو.

لئۆنا کاتێك لەم شەربەتەی بۆ مووناك تێدەکرد وتی:

من ئەم شەو چاوەڕێی بینینی تۆ نەبووم. گوومانم دەکرد دوای دوێ شەو لانی کەم سبەی شەو دێن، دیارە بەرانبەر بەمن زۆر بەبەزەیین.

مووناك پێکەنی و وتی:

راست دەکەیت..... هەروایە. داخ دەخۆم کە بۆ لە سەرەتاوە هاوڕێیەتی تۆم بۆلای خۆم رانەکێشاوە. ئێستا درەنگ نەبووە چوونکە من بەرنامەی زۆرم هەیە. دەمەوێ کاری گرنگ ئەنجام بدەم رەنگە ئێوە..........

لێرەدا قسەکەی خۆی بە ناتەواوی بەجێ هێشت. تا ئێرە لەچەند خاڵێك گەشتبووم.

یەکەم ئەوەی دویٚ شەو لئۆناو مووناک چاویان بەیەك کەوتبوو. دووەم ئەوەی مووناک پلان و بەرنامەیەکی تەواوی ئامادە کردبوو.... زۆر باشە. ئەم بەرنامە چیە؟ خاڵەکانی چین؟

مووناک پەشیمان بوویەوە و بەلێزانی بابەتی قسەکەی گۆڕی و باسی منی هێنایە پێش و وتی: پێیان وتووم ئەویان ئەمشەو لەدەوروبەری ماڵەکەی تۆدا بینیوە.

بە بیستنی ئەم رستەیە پشتم لەرزی. رەنگ بەروخسارمەوە نەما. کێ ئاگاداری کردبوویەوە کە من هاتوومە ئێرە، لەکوێوە بەخێرایی ئەم هەواڵە بەمووناک گەشتبوو چ بەدبەختیەکی گەورە ! ئەگەر مووناک ژوورەکە بگەڕێت و بمدۆزێتەوە چی دەبێت.......؟ لەئارەقدا خوسابووم و لە گەرم و ساردبوونەوەی جەستەی خۆم هەستم دەکرد بێ رەنگ دەبم.

هەناسەم لەسینەدا زیندانی کردو گوێم گرت لئۆنا وتی:

دەبینیت....... من ئێستا هاتووم و ئاگام لەونیە. رەنگە لێرەوە تێپەڕیبێت. چەند رۆژ پێش ئەوم بینی بەڵام هیچ وتوێژێك لەنێوانماندا دروست نەبوو و بەخێرایی رۆشتم ئێستاش ئاگاداری نیم و جیاواز لەوەش دوای سوێند دەبێت باوەڕتان بەمن هەبێت.

مووناک وتی:

تەنیا دەمویست ئەمەت بیر بهێنمەوە. ئەم شەو زیاتر بۆ ئەم مەبەستە هاتمە ئێرە. من و تۆ سوێندمان خواردوە و بووینەتە خوشك. دەزانی ئەگەر خیانەتم لێ بکەیت دەبیتە پاروی ماری کوبرا. بیستووتە کەسانێتر کە سوێندیان خواردوە و دواتر بەڵێنیان شکاندوە چیان بەسەر هاتووە و چۆن ماری کوبرا تۆڵەی لێ سەندوونەتەوە.

بزەیەك روخساری مووناکی گرتەوە، ئاوچاوی لئۆنای ماچ کردو ماڵئاوایی لێ کرد و رۆشت. کەمێك دوای رۆشتنی مووناک لەپشت خومرەکەدا بووم. ئەو وتوێژە هەموو شتێکی بۆ روون کردمەوەو وە پێویستم بە بینینی لئۆنا نەبوو. دیاربوو مووناک ئەوی بەفێڵ سوێند داوەو پێبەندی کردوە....

زۆرباشە گرنگ نیە.

ئەم بیرانە ماوەیەك مێشکی منی سەرقاڵ کرد و کاتێك لئۆنا دەیوست بگاتە سەر جێگاکەی و بخەوێت هاتمە خۆم و بڕیارمدا لە ژوورەکە بڕۆمەدەر.

بۆ ئەم مەبەستە بەهێواشی لەجێگاکەم هەستام بەڵام دەترسام نەکا سیخورەکانی مووناک لەکاتی رۆشتنە دەرەوەدا بمبینن و ئاگاداری بکەنەوە. ئەوکات بەدەمی

خوێناوی و مەڕی نەکوژراو تاوانبار دەکرام.

لەم کاتەدا هەستم کرد پشت سەرم پەنجەرەیە ! کراوەبوو هێواش خۆم گەیاندە قەراغەکەیی و خۆم پەڕاندە دەر. دوای من ئینجانەیەك کەوتوو دەنگی لێوەهات بەڵام من بەڕاکردن لەوێ دوورکەوتمەوە و ڕۆشتم. کاتێك گەشتمە ماڵ مووناك لەجیگادا خەوتبوو و بەڕۆشتنە ناوەوەی من ئاگای نەبوویەوە.

بەیانی ڕۆژی دواتر ڕۆشتمە بینینی یوری. حاڵی زۆر باش و بەبینینی من شادمان بوو. یوری لەکاتی قسەکردن دا پێی وتم:

سەرۆك دەڵێی دەتانەوێت بۆ هەمیشە لەئامازۆندا بمێنن.... کەواتە ڕێگەم بدەن بەجێتان بێڵم. من دەڕۆم بۆ لای هۆزی باوکی خۆم.... هەرچی بێت ئەوان ڕێزم لێ دەگرن و بەرانبەر بەنیشانەی بنەماڵەی ئێمە باوەڕێکی تایبەتیان هەیە. ڕەنگە بتوانم دانیشتوانی هۆزەکە هێواش هێواش بەرەو شارستانیەت ببەم و لەوەحشی گەری دوریان بکەمەوە.

پێکەنیم و پێم وت:

پێویست ناکات بڕۆیتە ئەوێ پێکەوە دەگەڕێینەوە بۆ دنیای شارستانیەت. منیش لە ژیانی ئەم شوێنەدا بێزارم بووم بەتایبەت ئەوەی کە مووناك بەکردەوە ناشرینەکانی خۆی ژیانی لێ حەرام کردووم و ڕێگە نادات لەگەڵ ژنێکی تر جگە لە خۆی هەڵس و کەوت بکەم.

یوری بە بیستنی ئەم قسانە شادمان بوو وتی:

کاتێك بۆ سەفەر لە ئێستا گوونجاوتر نیە. بە ئەندازەی پێویست سیلاحمان هەیە. من هەمان ڕۆژی هێرشی یوچیەکان شوێنی شاردنەوەی سیلاحەکانیان دۆزییەوە.

ئەوێ جگە لە سیلاح بڕێك جل و بەرگیشی لێیە. وەهەروەها شتی تریش وەك کامێراو چەندین یاداشت. ئەگەر دەتانەوێت رابکەن تا وەرزی باران نزیك نەبۆتەوە بەڕێکەوین جیاواز لەم شێوە گیرۆدەی بارانە وەرزییەکانی ئامازۆن دەبین و لەجەنگەڵدا دەمێنینەوە.

وتوێژی من و یوری ماوەیەکی خایاند و سەرئەنجام ڕۆژی ڕۆشتنمان دیاری کرد. دەبێت ئەمەش بڵێم حسابی ساڵ و مانگم لەدەست دەرچبوو بۆ نموونە نەمدەزانی ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکی هەفتەیە مانگ چ مانگێکی ساڵە... تەنانەت ئەوەشم نەدەزانی چەند ساڵە لە ئامازۆندا دەژیم.

یوری وتی:

ڕاکردنی ئێمە زۆر دژوارە. ئەگەر مووناك ئاگادار ببێتەوە دەمانکوژێت. دەبێت بەبیانووی ڕاو لێرە دوور بکەوینەوەو بەهەموو هێزمان ڕابکەین. دڵنیام لەوە کە مووناك ئاگادار نابێت و ڕۆژی ڕاکردنیشمان دیاری کرد. بەم شێوە بڕیاردرا بەیانی شەوێك کە مانگ بەتەواوی دەردەکەوێت بەڕێکەوین یانی ناوەڕاستی مانگی ئەستێرەیی.

بەم شێوەیە لە یوری جیابوومەوەو گەڕامەوە بۆماڵ دڵنیابووم یوری هەموو ئامادەکاریەکان ئامادەدەکات.

دو سێ ڕۆژ دواتر مووناك منی لەگەڵ خۆی بردە جەنگەڵ و شوێنی سیلاحەکان لەگەڵ ئەوەی خۆڵەکەی لابرد هەستی بەوەکرد بڕێك لەسلاحەکان دیار نەماون بەڵام گرنگی نەدا چوونکە وایدەزانی کەس جگە لە ئێمە ناتوانێت کەڵکیان لێ وەرگرێت. ئەو چەند دەست جلی هەڵگرت. یەکێکی بۆ یوری نارد و دەستێکی خۆی لەبەری کرد و دەستێکی دا بەمن و لەبەرم کرد.

مووناك لە جل و بەرگی پیاوانەو بەو پۆساڵە ڕەشانە زۆر جوان ببوو.

لەگەڕانەوەدا ئاگاداریان کردینەوە ژمارەیەك لە پیاوەکانی هۆز لەکاتێکدا سەرقاڵی بڕینەوەی دار و دروست کردنی ماڵ بوون بەدەست یوچیەکان کوژران.......

من و مووناك بەو جل و بەرگەی لەبەرمان بوو ڕۆشتینە شوێنی ڕووداوەکە. دو نەفەر کوژراو لەسەر زەوی کەوتبوون و دیمەنێکی دڵتەزێنیان دروست کردبوو. مووناك دەستووریدا بەخاکیان بسپێرن و پێکەوە گەڕاینەوە بۆ هۆز لە ڕێگا بەمنی وت:

لە ژیان لەم هۆزەدا بێزاربووم، دەتوانی من و کچەکەت ببەیتە هۆزەکەی خۆت؟ بەڵێن دەدەم بەپێی حەزی تۆ بژیم !

چاوەڕێ بووم هەموو شتێك لەمووناك ببیستم جگە لەم ڕستەیە.... کاتێك لەگەڵ مووناکدا دەڕۆشتم و ئەم قسانەی دەهێنایە سەر زمان، بەدوای وتەکانی خۆیدا زەق زەق سەیری دەکردم. ڕاچڵەکیم و پشتم ئارەقێکی ساردی کردەوە. مووناکم خۆش دەویست مافی خۆشم بوو هەتا ئەو ڕادەیە خۆشم بووێت چوونکە بە بەراورد لەگەڵ ژنانی وڵاتە پێشکەوتوەکانی دنیا بەتایبەت بە بەراورد لەگەڵ ژنانی ئەمریکا ئەو جوانترو خۆشەویستتر بوو..... لەلایەکیتر ئەو تارادەی پەرستن منی خۆش دەویست بەڵام ئەو بۆ ژیان لەناو شارستانیەتدا نەخولقێنرابوو.

ئەو ژنێکی وەحشی و خوێنخۆر و تاڕادەیەك دڕەندەبوو..... وئەگەر لەگەڵ مندا بۆ ئەمریکا بهاتایە دەبووە هۆی دژواری بۆ من و بەحەسوودی و ڕقی کێوی خۆی، ژیانی لێ

حەرام دەکردم.

جیاواز لە هەموو ئەمانەش چاوەڕێ نەبووم ئەم پێشنیارەم پێ بکات و بەدڵنیاییشەوە خۆم بۆ وەڵام دانەوەی ئامادە نەکردبوو.

کاتێک مووناک بێدەنگ منی بینی بازومی گرت و بەشێوەیەکی پڕ داواکاری وتی:

لات سەیرە.....؟ مافی خۆتە.......... ئەگەر دانیشتوانی هۆزیش لەم نهێنیە ئاگادار بن لێم یاخی دەبن و تیکە تیکەم دەکەن، بەڵام دەتوانم چی بکەم باوەڕبکە لەژیان لێرە گیانم گەشتۆتە سەر لێو..... دایکم سەرۆکی ئەم هۆزەبوو من لەم شوێنەدا چاوم بەدنیا کردەوە و لەناو شەڕو خوێن ڕێژیدا گەورەبووم. بەڵام کاتێک تۆم بینی تێگەشتم لە دەرەوەی ئەم شوێنە دنیایەکی ترو هۆزی تریش هەن کە لە ئێمە باشتر دەژین. شتێکی تریش کە بۆ ئەم پێشنیارە هانم دەدات زۆر گرنگە و گرنگی ژیانی هەیە بۆم ئەوەیە دەزانم ڕۆژێک تۆ دەڕۆیت و بەتەنیا جێم دێڵیت...... من تۆم زۆر خۆش دەوێت...... پیاوانی زۆر هاتونەتە ناو ژیانم یان کوژراون و یان ڕۆشتوون بەڵام هەرگیز هیچ پیاوێکم بەقەدەر تۆ خۆش نەویستوەو ناوێت. باوەڕبکە ئەگەر ڕۆژێک بڕۆیت لەخەفەتا دەمرم.

مووناک قسەی دەکرد بەڵام من لە دنیای بیرو ئەندێشەدا نوقم ببووم و پەلەقاژەم دەکرد. پێشنیارەکەی ئەو زۆر گرنگ بوو و من نەمدەتوانی رازی بم.

مووناک جارێکی تر بازومی گرت و وتی:

سەیری چاوەکانم کە.

کاتێک لەچاوە جوانەکانیم ڕوانی درێژەی دا:

لەچاوەکانی تۆدا دەخوێنمەوە کە تۆ منت خۆش دەوێت کەواتە من لەگەڵ خۆتدا ببە. بەڵێن دەدەم حەسوود نەبم..... لەگەڵ ژنانی هۆزەکەی خۆتدا هەڵس و کەت بکە بەڵام ڕێگە مەدە من ئازار بەرم...... بزەیەکم گرت و وتم:

مووناک مەگەر تۆ شێت بوویت ! بردنی تۆ زۆر دژوارە ! ڕێگەیەکی دوورو مەترسیدارمان لەبەردەمدایە.... جیاواز لەوە کێ بەتۆی وتوە من دەڕۆم؟ دڵنیابە بۆ هەمیشە لات دەمێنمەوە وهاوسەرێکی باش بۆ تۆ دەبم. من تازە پلانێکی بەربلاوم بۆ کشتوکاڵ و دروست کردنی کارگەی ڕستن و چاندنی پەموو لە دەوروبەری هۆزی ئامازۆندا ئامادە کردووە.....

مووناک کە بەهیچ جۆرێک باوەڕی بەقسەکانی من نەدەکرد شانەکانی بەرزکردەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشاو بێ دەنگ بوو. چەند خولەك بێ دەنگ و بێ قسە بەبێ ئەوەی

قسەبکەین بەرێگادا ڕۆشتین. سەرئەنجام بێ دەنیگم شکاند و وتم:

ڕێگەبدە لەگەڵ یوریدا قسە بکەم. مووناك بەشادمانیەوە دەستەکانی لە دەوری ملم ئالاندو چەندین جار ماچی کردم و وتی:

ئەگەر یوری رازی ببێت تۆش رازی دەبیت..... بە بۆچوونی ئەو رازیت؟

چوونکە دڵنیابووم یوری دژایەتی ئەم کارەدەکات وەڵامم دایەوە:

هەڵبەتە یوری هەرچی بڵێ رازی دەبم پێی و ئەگەر ئەو رەزامەندی نیشان دا تۆ لەگەڵ خۆماندا دەبەین. شادمانی مووناك نەشیاو بۆ وەسف کردن بوو. هەڵبەزو دابەزی دەکرد و دەستەکانی لەیەك دەدا، لقی دارەکانی سەرە رێگای دەشکاند و بەدەوری سەری خۆیدا دەیسوڕاندو فرێیدەدا.

کاتێك گەشتینە هۆز دانیشتوان بۆ بینینی مووناك لە جل وبەرگی پیاوانەو پۆساڵەکانی پێی کۆبوونەوەو بەنارەزامەندییەوە بەیەکتریان نیشان دەدا. مووناك بەمنی وت: دەبینی..... ئەوان لەوەی وەك ئێوە جل وبەرگم پۆشیوە نارازین چ بکات بەوەی تێبگەن برۆم....

مووناك بەراکردن بۆ گۆرینی جلەکانی رۆشت و من لەسەر دوڕیانێك وەستابووم تا ئەو جل و بەرگی خۆیانی لەبەرکردەوە. ئەوسا پێکەوە رۆشتینە لای یوری.

یوری کە مووناکی لەگەڵمدا بینی لە شوێنەکەی هەستا و چەند هەنگاوێك بۆ پێشوازیمان هات و دواتر هەرسێکمان لەسەر راخەری حەسیری ژوورەکە دانیشتین و سەرقاڵی وتوێژ بووین. بۆ وتنی بابەتەکە بەزمانی ئینگلیزی دەستم پێکرد بەڵام مووناك خێرا دەمی گرتم و قسەکەمی بڕی. کاتێك هۆکەیم پرسی پێکەنی و وتی:

بەزمانێك قسەبکە منیش تێبگەم.

ئەو ژنێکی وشیاربوو دەترسا نەوەك بەیوری بڵێم و دژایەتی پێشنیارەکەی بکات بۆیە سووربوو بەزمانی ئامازۆنی قسەبکەین. ناچار بەزمانی ئەوان هەموو شتێکم بۆ یوری باس کردو لەکۆتاییدا وتم:

ئایا تۆ بەم پێشنیارە رازیت؟ هەڵبەت دەزانی چ مەترسیەك لەرێگادایە و ژنانی هۆزی ئێمە لەگەڵ ژنانی تردا باش هەڵس و کەوت ناکەن.

ئەم رستانەم وت و مەبەستم ئەوەبوو ئەو بەدرۆوە دوژمنی ژنانی ئەمریکایی بکاتە بیانو بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانی من یوری پێکەنی و وتی:

چ پێشنارێکی باشە......؟ لەمە باشتر نابێت.......؟ بەڕاستی مووناك ژنێکی وشیارە

قسەکەیم بری و بە ئینگلیزی وتم: مەگەر شێت بوویت یوری......؟

ئەویش بە ئینگلیزی وەڵامی دامەوە:

بەهەڵەدا چوویت.... کاتێك گەڕانەوە بۆ ئەمریکا هیچ شتێکتان بەدەستەوە نیە. چەند ساڵ کاتی ئێوە بێ هۆ بەفیڕۆ ڕۆشتووە و ئەنجامێکتان بەدەست نەهێناوە. بەڵام ئەگەر مووناك لەگەڵتانا بێت کتێبێك لەبارەی سەفەرەکەی خۆتان دەنووسن و کاتێك رەسمی ئەوتان دا لەبەرگی کتێبەکە و کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسیتان سازدا و مووناکتان روبەڕوی رۆژنامە نوسان کردەوە، کتێبەکەتان چەند ملیۆن دانەی لێ دەفرۆشرێت و پارەیەکی باشتان دەست دەکەوێت. سامان و ناوبانگ، مەگەر زیاتر لەمە دوانە شتێکی ترتان دەوێت.

راست دەکەیت بیرۆکەیەکی خراپ نیە.... بەڵام ئەو.... دەترسم ببێتە ئەرك بۆم. مەترسن... من چارەی ئەوکارەش دەزانم، رەزامەندی نیشان بدەن.

مووناك بەنیگەرانی سەیری دەمی من و یوری دەکرد و چاوەڕوانی راگەیاندنی ئەنجام بوو.

سەرئەنجام رووم تێکردو پێکەنیم و وتم: یوری رازیە، منیش رازیم...

مووناك لەشادمانیدا قیژاندی و لەجیاتی ئەوەی من ماچ بکات دەستی لەملی یوری ئاڵاندو چەندین جار ماچی کرد. ئەو ئەم بەختەوەریەی لە یوری دەزانی نەك لەمن. لەو دانیشتنەدا زۆرمان قسەکرد و رۆژی رێکەوتنیشمان دیاری کرد. مووناك وتی:

دەبێت بەنهێنی رابکەین... چونك ئەگەر تێبگەن من و ئێوە تیکە تیکە دەکەن.

پرسیم: کێ لەجێگای خۆت دادەنێیت. هەڵبژاردنی سەرۆکی داهاتو لەدەست تۆدایە یان دانیشتوان؟

مووناك وەك بڵێی لەم بارەوە بیری کردبوویەوەو بڕیاری گرتبوو وتی:

مافی هەڵبژاردن بەمنە و منیش لئۆنا لەجیاتی خۆم وەك سەرۆك دەست نیشان دەکەم ئەو بۆتە خوشکی من ئەگەر پێویست بکات یارمەتیمان دەدات.

من و یوری هەڵبژاردنەکەیمان پەسەند کردو دوای دانانی بڕیاری پێویست لەیوری جیابووینەوە. چەند رۆژ دواتر مووناك کۆبوونەوەی شورای گشتی سازدا. ئەگەر خوێنەران لەبیرتان بێت لەسەرەتای هاتنی ئێمەش ئاوا دانیشتنێك گرێدرا. لەم دانشتنەدا هەموو دانشتوانی هۆز ئامادە بوون و هەرکام لەشوێنی خۆیدا دانیشتبوون. مووناك بەتەنیایی رۆشتە ناو دانشتنەکە و دوای چەند خولەك وتی:

من هیلاك بووم.... نەخۆشیەکم هەیە کە ڕێگری کارکردن و خزمەت کردن بەمن نادات بۆیە لەپۆستی خۆم چاو دەپۆشم و خوشکەکەی خۆم لئۆنا لەجیاتی خۆم دادەنێم. هیوادارم گواستنەوەی پۆست لە بنەماڵەی ئێمەوە بۆ بنەماڵەی لئۆنا بەختەوەری بەدواوە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕێم هەموو دانیشتوان بە لئۆنا و منداڵەکانی خزمەت بکەن و پێی ئەمەك داربن.

مووناك بێدەنگ بوو بەڵام دەنگە دەنگێکی سەیر لە دانشتوان بەرز بوویەوە. هەرکەس لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی قسەی دەکرد و من لە دوورەوە دەمدی سەریان تەکان دەدا و نیشان دەدەن لەم رووداوە سەریان سوڕماوە، لئۆنا زیاد لەڕادە لەم رووداوە چاوەڕوان نەکراوە سەری سوڕمابوو. مووناك لەپلەکان ڕۆشتە خوار و دەستی لئۆنای گرت و لە جێگای خۆی دانیشاند. ئەوکات سەرشانی پێستی پڵنگی لەسەر شانی خۆی هەڵگرت وخستیە سەرشانی لئۆنا.

کاتێك سەرشان لەسەر شانی لئۆنا دانرا، دەنگی شادمانی دانیشتوان بەرزبوویەوە و سەماو ئاواز دەستی پێکرد. هەموو نیشانیان دەدا لەم گۆڕانکاریە زۆر نارازی نین. مووناك خەڵکی خستە سەرشادی کردن، لەناو قەربالغی هاتەدەر و بەمن و یوری کە لەسوچێکدا وەستابووین پەیوەست بوو وتی: زۆر باشە ئاسوودە بووم....

سێ ڕۆژ تێپەڕی. لەم سێ ڕۆژەدا ئێمە بەپەلە دەستمان بە ئامادەکاریەکانی سەفەرەکەمان کرد و بە دزییەوە چالاکیمان دەکرد. بەیانی ڕۆژی چوارەم هێشتا لەناو جێگادابووم کە لەناکاو دەنگی قیژەم بیست. لەخەو هەستام، ترساو دانیشتم.... مووناکیان بردبوو چەند کەس لەرەش پێستەکان بۆ دەستگیری من هاتبوون. بە توورەییەوە پرسیم:

ئێوە لێرە چیتان دەوێت......؟

یەك لەوان وتی: بەدەستوری لئۆنا سەرۆکی هۆز دەبێت دەستگیرتان بکەین.

رەشەکان منیشیان دەستگیرکردو بردیانمە زیندان بۆ لای یوری.

دواتر زانیم لئۆنا لەمەبەستی راکردنی ئێمە ئاگادار بۆتەوە و لەبەرئەوەی منی خۆش دەویست و نەیدەویست لەهۆز بڕۆم، دەستوری دەستگیرکردنی هەمووسانی دەکردبوو. من و یوری لە زیندانداماینەوە بەڵام مووناك و دو سێ کەس لەهاوڕێکانی هەر ڕۆژەو کاری سەختیان پێدەکرد و بە بەردکێشان و دار بڕینەوەو کاری تر ناچاریان دەکردن.

سەرەتا باوەڕم نەدەکرد چوونکە ئەگەری بوو دانیشتوان بۆ دروست کردنی توورەیی

لەمن بەدرۆ ئەم هەواڵەنم پێبگەیەنن. یەك دو رۆژم بەم بیرانەوە بەسەرم برد و زیاتر چاوەڕێ بووم یوری بەتەواوی باش ببێتەوە و بۆ هەڵاتن ئامادەبێت چوونکە ئەو بەبرینەکانی نەیدەتوانی کاری مەترسیدارو گەورە ئەنجام بدات.

لەگەڵ ئەوەی هەوڵم دەدا ئارام بم نەدەکرا و دواتر گوومانم لادروست بوو کە ئەگەر لئۆنا بەڕاستی نایەوێت موناك بکوژێت بۆ ئەوی لەمن دوورکردوە؟ مەگەر ئەو هاوسەری من نیە؟

بڕیارمدا چاوم بەلئۆنا بکەوێت بەڵام ئەو کەشەرمی لەمن دەکرد لە چاو پێکەوتنی من بەبیانووی جۆراو جۆر خۆی بەدوور دەگرت. بابەتەکەم لەگەڵ یوریدا باس کردو وتم:

موناك بەو هەموو دڵرەقیەی خۆی لەبارەی لئۆنا تەنیا لەبەر یەك داوای من میهرەبانی و نیەت باشی خۆی نیشاندا بەڵام لئۆنا ناجوامێر بوو و بەکاری قورس ناچاری کردوە !

بەبۆچوونی تۆ دەبێت چی بکەین؟

دوای چەند ساتێك وتم: ئەگەر بمانەوێت لەچاوەڕێی بینینی ئەودا دانیشین دەبێت یەك ساڵ لەزینداندا بمێنینەوە ئەو نایەوێت. باشترین رێگا ئەوەیە لەزیندان هەڵبێین و موناك بەزەبری گولەی رەشاش رزگار بکەین و رێگەی جەنگەڵ بگرینەبەر.

یوری وتی: ئەم کارە زۆر دژوار نیە بەڵام لەسەدا سەد هاورێ نیە لەگەڵ سەرکەوتن چوونکە ئێمە دوانە زۆرباش دەتوانین ئەم پلانە جێ بەجێ بکەین و لەدەست پاسەوان و شەڕکەرانی هۆز گیان بەدەرببەین بەڵام موناك توانای نیە و جیاوز لەوەش چۆن دەتوانین بیدۆزینەوە تا رزگاری بکەین. گریمان ئەویشمان رزگارکرد ئەی چی لەمناڵەکە دەکەیت؟

قسەکانی یوری وەك هەمیشە لۆژیکی و شیاری رازی بوون بوو بۆیە تەسلیم بووم. یوری وتی: ئێستا ئەو کە لە چاوپێکەوتن خۆی بەدوور دەگرێت بەناردنی پەیام ناچاری دەکەین. بەدڵنیاییەوە پەیامەکەی پێدەدەن و ئەو ناچارە وەڵام بداتەوە پۆزەتیڤ یان نەگەتیڤ.

ئەم بیرۆکەیەش باش بوو. دەست بەجێ بەئیشارەی دەست پاسەوانی پشت نەردە حەیزەرانیەکانی زیندان بانگ کرد و پێم وت:

پەیامێك بۆ لئۆنا سەرۆکی هۆز دەنێرم کە دەبێت پێیبگەیەنن.

ئەو بە نیشارەی چاو رەزامەندی ئەم کارەی نیشان داو وتم:

لە منەوە بە لئۆنا بڵێ، لەهۆزی ئێمە دا ژنان ئەشکەنجە نادەن و ئەم کارە بەکارێکی ناشرین و قێزەون دەزانن. لەلایەکیتر باوەڕم نەدەکرد تا ئەم رادە بەرانبەر بەمن بێ سەرنج و نامیهرەبان بێت. ئەگەر بەڕاستی هەموو پەیوەندیەکانت بڕیوە منیش ئاگادار بکەرەوە تا بیرەوەریەکانی رابردو لەبیربکەم و بۆ داهاتووش هیچ بەرنامەیەك دانەرێژم.

پاسەوان زەق زەق سەیری دەکرد. سەری سوڕمابوو چۆن بەبوونی مووناك پەیامی عاشقانە بۆ لئۆنا دەنێرم و بەمانگرتن و رووگرژی و تۆران دەیترسێنم ! بەهەرحاڵ چوونکە بەڵێنی دا بوو، رۆشت. وەك گوومانم کرد پەیامەکەم کاری خۆی کرد. لئۆنا تەنیا لەبەرئەوەی ئێمە مەبەستی راکردنمان بوو، بڕیاری دابوو دەستگیرمان کات و چوونکە منی خۆش دەویست کاتێك پەیامەکەی بیست بەداهاتوو هیوادار بوو، بڕیاریدا مووناك و ژنانی تر بنێرێتە لای ئێمە بۆ زیندان. ئێمە چاوەڕێی گەڕانەوەی پاسەوان بووین تاوەڵامەکەمان بۆ بێنێتەوە بەڵام نیوکاتژمێر دوای رۆشتنی ئەو سەرو کەلەی مووناك دەرکەوت.

دوژنی جوانتر لەگەڵیا بوون کە بۆ زیندانەکەی ئێمە نێردران. مووناك کاتێك منی بینی دەستەکانی لەملم ئاڵاندو سەری خستە سەر شانم و دەستی بەگریان کرد. لەم حاڵەدا وتی:

چ هەڵەیەکم کرد. وامدەزانی ئەو بە سوێندەکەی وەفادار دەبێت و بەرانبەر بەمن توندی نیشان نادات. لەسەر ئەم بیرۆکە ئەوم کردە جێگری خۆم و گەر نە ژنانی تر بوون کە زیاتر لەو شیاو بوون.

دەستم بەقژیدا هێنا و بەهێواشی بەگوێیدا چرپاندم و وتم:

کاتێك دەبێت ناڕەحەت بیت و داخ بخۆیت کەمەبەستت مانەوەبێت.... بەهەرحاڵ چ لە زیندان چ ئازاد بین دەڕۆین و ئیتر گریان مانای نیە. ئارام بە.

مووناك ئارام بوو چوونکە زیاد لەڕادە هیلاك بوو سەری خستە سەر رانی من و خەوت. کاتێك هەستا هەوا تاریك ببوو. کەمێك خواردنمان خوارد و سەرقاڵی قسەکردن بووین. من ویوری و مووناك لەسوچێکی زیندان دوور لە چاوی کەسانیتر دەستمان بەقسەکردن کرد پێش هەرشتێك بابەتی سیلاح هاتە ئاراوە.

مووناك وتی: خەیاڵتان ئاسوودە بێت. لەم چەند رۆژەدا پلانی کارەکەم کێشاوە و کاریشم بۆ کردوە. تەنانەت لەبارەی منداڵەکەمان نیگەران نیم چوونکە ئەویش لەگەڵ خۆماندا دەبەین.

ئەو سەبارەت بە وردەکارییەکانی نەخشەکە هیچی نەوت بەڵام بۆ چۆنیەتی راکردن چەند پێشنیارێکی دا کە زۆر گرنگ بوو. لەبەیانیەوە دەست بەکاربووین.

موناك بۆ لئۆنا پەیامی نارد کە چوونکە ناتوانین خواردنی کەسانیتر بخۆین رێگەبدرێت خۆمان لەناو زیندان خواردن ئامادە بکەین. ئەم پێشنیارە قبووڵ کرا چوونکە لای لئۆنا زۆر سادەو ساکار بوو لەکاتێکدا گەورەترین بەشی بەرنامەکەمان ئەمە بوو کە بەخۆشحاڵیەوە بەبێ دەردەسەر جێ بەجێ کرا. لەو رۆژەوە میوو گۆشت و شتی کاڵ خرایە بەردەستی مووناك.

مووناکیش بەدەستە ناسکەکانی خۆی خواردنی دروست دەکرد و پێکەوە دەمانخوارد. ژنانیتر کە لە زینداندا بوون لەو خواردنەی ئەوان دەیانهێنا، دەیانخواردو کاریان بە ئێمە نەبوو.

رەنگە بەباوەڕی ئێوەش ئەم بابەتە زۆر سادەبێت و بەدڵنیاییەوە لەخۆتان دەپرسن دروست کردنی خواردن چ پەیوەندیەکی بە هەڵاتنەوە هەیە.

راستە.... بەڵام ئێمە دەمانزانی قامیش حەیزەران کەلەدەوری ئێمەدا و بەچەپ و راست بەشێوەی پەنجەرە دانرابوون بەهیچ شتێك مەگەر بەئاگر نەدەشکێنرا. بۆ تاقی کردنەوە یوری چەندین جار بە بەهێزی خۆی کێشای بەقامیشەکاندا کە زۆر ئەستوریش نەبوون و بەلەقە پیای کێشان رەنگە بشکێن بەڵام نەتەنیا کاری بۆنەکرا بەڵکو بەهۆی پەچەکرداری زەربە و هێزی توانای چەمانەوە کە حەیزەران هەیبوو بەئاسانی دەچەمایەوەو دوبارە دەگەڕایەوە سەر شوێنەکەی یەکەمی خۆی. مووناك کە لە بەهێزی حەیزەران ئاگاداربوو کەرەستەی ئاگر کردنەوەی ئامادە کردو بەبیانووی دروست کردنی خواردن کوچکاورێکی دروست کرد. کاتی شەو بەدارێك کەمێك گژوگیای وشکمان لەناو پەنجەرەکەوە هێنایە ژوور. پاسەوانەکان بە رمەدرێژەکانی خۆیان لەولاوە دانشتبوون و باوێشکیان دەداو چوونکە لێمان دڵنیابوون، ئاسوودەبوون.

گژوگیای وشکمان کۆکردەوەو ئاگرمان دا... ئاگر لەبەشی دواوە هەڵگرا، بەشێوەیەك ئەگەر پاسەوانەکان وورد ببوونایەتەوە لەپشت لقەکانەوە تەنیا رۆشنایەکی کەمیان دەبینی و ئەویشیان بۆ دروست کردنی خواردن بەپێویست دەزانی.

ئاگرەکە کەم کەم زیادی کردو چەند خولەك دواتر دەنگی ترەق ترەق تایبەت بیسترا کە زانیم لە ترەکێنی حەیزەرانە.... وەك شوشە یان بلوور کە لەئاگر نزیك دەبێتەوە قامیشەکان سەرەتا ترەکین و دواتر دەستیان بەسووتان کرد.

چەند خولەك دواتر بەئەندازەی نیومەتر لەپەنجەرەی حەیزەران سووتا. مووناك خێرا ئاگرەکەی کوژاندەوە و وتی:

درەنگ مەکەن.... خێراکەن کە دەرفەت لەدەست نەڕوات.

کچان و ژنانی کە لەگەڵ مووناکدا زیندانی کرابوون لە سووچەکەی تری زینداندا خەوتبوون ئاگایان لە هیچ شتێك نەبوو بۆیە کاتێك ئێمە بەخێرایی ڕۆشتینەدەرو قاچمان خستە ناو جەنگەڵ ئەوان هەر لەخەودا بوون.

نزیکەی دو سەد مەتر بەئارامی ڕێگامان بری لەترسی ئەوەی نەکا بەهۆی بەرکەوتنی گەڵاکان پاسەوانەکان بە ئاگا بێنەوە و سەرنجیان راکێشرێت. دوای ئەوەی مەترسی گەشتنی دەنگ نەما دەستمان بەراکردن کردو بەخێرایی لەوێ دوورکەوتینەوە.

مووناك ڕێگاکەی بەباشی دەزانی بەڵام بەداخەوە لەوکاتەدا کارێکی گرنگترمان لەبەردەمدابوو ئەویش رفاندنی سیلاحەکان بوو. ئەم کارە بەخێرایی و بەئاسانی ئەنجامدرا چوونکە مووناك تفەنگ و برێك فیشەکی و سێ خەنجەرو رەشاشێکی دەستی لەناو چاڵێك دوور لەهۆز شاردبوویەوە. یوری وەك کەمتیارێك کە گۆڕی تازە بۆ خواردنی جەستەیەك هەڵدەکەنێت، خۆڵی بە نینۆك و چنگ لابرد و سیلاحەکانی دەرکێشا. کاتێك چەکداربووین هەناسەیەکمان بەئاسوودە هەڵکێشا.

بوونی خەنجەرێك لەکەمەر و رەشاشێك بەدەست و گیرفانی پر فیشەك و جیاواز لە ریزێکی گوولە بەملمەوە، بووە هۆی دڵگەرمیم.

دوای ئەم کارە مووناك وتی: ئێستا بۆ هێنانی منداڵەکە دەبێت یەکێك لەئێوە دوانە بڕوات... پەرستارەکەیم راسپاردوە لەپشت پەنجەرەی ماڵەکە چاوەڕوانتان بکات و چوونکە ئەوێ پاسەوانی لێ نیە مەترسی تیانیە.

یوری ئەم کارەی گرتە ئەستۆ و رۆشت. گەڕانەوەی ئەو زۆری خایاند، کاتژمێرەکان بە دوای یەکدا تێدەپەڕین، هەرسات کە تێدەپەڕی ترسی ئێمە زیادی دەکرد. مووناك بۆ منداڵەکە نیگەران بوو... منیش کە باوك بووم دەبووایە ئەم حاڵەم هەبووایە بەڵام من زیاتر نیگەرانی یوری بووم و بیرم دەکردەوە نەکا مەترسیەك هەڕەشەی لێ بکات و زیانی بەربکەوێت.

مووناك لەگەڵ ئەوەی بەمەبەستی خەوتن سەری خستبووە سەر رانی من بەهۆی ئاسوودە نەبوونی بیرو خەیاڵ لەسەر ئەم لا دەتلایە سەر ئەولا و هەندێ کات هەناسەیەکی پر سۆزی هەڵدەکێشا و نیشانی دەدا تا چ رادەیەك بۆ منداڵەکەی نیگەرانە.

سەرئەنجام دەنگی خشە خشی دارەکان بیسترا و چەند خولەك دواتر یوری لەکاتێکا مناڵەکەی لەسەر دەست بوو، دەرکەوت. یوری لەگەڵ ئەوەی گەشتە ئێمە بەهەناسکە هەناسك وتی: هەستن..... راکەین.... کتوپڕ لەراکردنی ئێمە ئاگاداربوونەتەوە و بەلێۆنایان وتووە. کۆمەڵێك بەدواماندا هاتوونە ناو جەنگەڵ... خێراکەن...

یوری بەڕاستی هیلاك ببوو، هەناسکە هەناسك و رەنگ بەروخساریەوە نەبوو ئەگەر جوان گوێم بگرتایە دەنگی لێدانی دڵیم دەبیست و چوونکە لەم ماوەکەمەدا نەیتوانیبوو هێزە لەدەست چوەکەی بەدەست بێنێتەوە ئەو کەمە راکردنە بۆی کوشندەو بێزارکەربوو. بۆ ئەوەی دەرفەتی حەوانەوەم پێ دابێت خێرا مناڵەکەم لەباوەش گرت. مووناك لەسەر مناڵەکە چەمایەوەو سەیری کرد. دەتوت باوەڕناکات مناڵی خۆیەتی... بۆنی کرد... ماچی کرد و کاتێك دڵنیابوو یوری مناڵەکەی ئەوی هێناوە و هەڵەی نەکردوە باوەشی کردەوە تا لەمنی وەربگرێت بەڵام منیش لەم رووداوەدا بەشم هەبوو، ئاخر منیش باوکی بووم بەهەست کردن بەوەی مووناك ناتوانێت ئەگەر مناڵەکەی لەباوەشدابێت رابکات، مناڵەکەم لێسەند و وتم: راکەن. بۆ وەستاون.

یوری یەکێك لە سیلاحەکانی بەدەستەوە گرت و لەپێشەوە بەڕێکەوت. مووناکمان لەناوەراستدا دانابوو و منیش بەدوای ئەودا رێم دەکرد. مەبەستمان ئەوەبوو کە مووناك لەدواوەو پێشەوە لەئەماندابێت ولەلایەنی ئاژەڵەوەحشیەکانەوە هێرشی نەکرێتەسەر.

تا ئەوسات زۆر رامان کربوو بەڵام هیچ کام لەو کەرەتانە دەرفەتی گونجاو و لەباری وەك ئەوجارەمان نەبوو. ئەم جارەیان سیلاحی چاك و دڵنیامان پێ بوو. لەلایەکی تر ڕێ نیشاندەرێکی وردو شارەزامان لەگەڵدا بوو کە هەموو کوێرە رێگاکانی جەنگەڵی دەناسی وتەنانەت بەچاوی بەستراو دەیتوانی ئێمە لەو شوێنە دوورکاتەوە. ئەم رێنیشاندەرە جگە لەمووناك کەسێکی تر نەبوو.

بەهەرحاڵ بەرێکەوتین و بەخێرایی دەڕۆشتینە پێش. لەیوریم پرسی پیاوانی هۆز چەندە لە ئێمە دوورن و کەی پێمان دەگەنەوە؟ یوری لەوەڵامدا وتی:

ئەگەر بووەستین چارەکە کاتژمێرێکی تر لێرەدا دەبن بەڵام ئەگەر بڕۆین بەلەبەرچاوگرتنی خێراییەکی زیاتر کە ئەوان دەتوانن هەیانبێت کاتژمێرو نیو تا دو کاتژمێری تر پێمان دەگەن. ئەگەر وابێت جێگەی نیگەرانی نیە چوونکە تا یەك کاتژمێری تر ئێوە دەگەیەنمە رووباری ئامازۆن. دوای تێپەرین لە رووبار دەتوانم دڵنیاتان کەمەوە چیتر دەستیان بە ئێمە ناگات. خەیاڵتان ئاسوودە بێت.

وتەکانی مووناك تا رادەیەك لەنیگەرانی منی کەم کردەوەو بەداهاتوو هیواداری کردم. لای خۆم بیرم کردەوە ئێستا کە ئەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ دنیای شارستانیەت، حەیفە بکوژرێین... ئەگەر لە هەمان مانگە سەرەتاییەکاندا دەکوژراین جێگەی داخ نەبوو بەڵام ئێستا کە ئەو هەموو روداوە مەترسیدارەمان تێپەڕاندبوو و لەو هەڕەشانە رزگارمان بووە، رەوانیە گیانی خۆمان لەدەست بدەین. لەرێگادا بیرم لەم بابەتانە دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەبیری داهاتوودا بووم و بۆ ژیانی ئەمریکا لەگەڵ مووناك نەخشەم دەکێشا و بەرنامەم ئامادە دەکرد.

لەم بیرانەدا بووم لەناکاو مووناك وەستاو بەوەستانی ئەو رشتەی بیرکردنەوەم پچرا... بینیوتانە ئاسکێك لەبیابان کاتێك دەنگێك دەبیستێت و هەست بەمەترسیەك دەکات، چۆن دەوەستێت و گوێکانی هەڵدەخات و بەوردی گوێ لەدەورووبەر دەگرێت؟

مووناکیش لەم حاڵەدا بوو.... چاوەکانی لەخاڵێکی نادیار بری و سەری بەنەرمی بۆ چەپ و راست دەسوڕاند تا باشتر دەنگەکانی بەگوێ بگات.

من و یووریش وەستاین. لەو بارودۆخە مەترسیدارەدا تەنانەت چرکە ساتێك بەنرخی گیانمان تەواو دەبوو. دیاربوو مووناك بێهۆ نەوەستاوە... ئەو کۆتایی بەم نارەحەتیە هێناو وتی: دەبیستن.... دەنگی ئەوان دەبیستن.... لێمان نزیك بوونەتەوە.

یوری پرسی:دەبێت چی بکەین....؟ دەمزانی ئەوان بەدواماندا دێن.... بەهەرحاڵ دەبێت چاوەڕێ بین.

وتم: ئەگەر دەزانی ناتوانین رابکەین و ئەوان پێمان دەگەن و گرفتارمان دەکەن، باشترە لێرەدا خۆمان داشارین و کاتێك بەیانی مەترسی نەما درێژە بەرێگای خۆمان بدەین.

مووناك قسەی منی بڕی و وتی: ئەگەر خۆمان داشارین مەترسی زیاتر دەبێت و بەهەرحاڵ دەبێت بڕۆین، چوونکە لە راکردندا رێگەی رزگاری دەدۆزرێتەوە.

مووناك راستی دەکرد چوونکە دانشتوانی هۆز، ژن و پیاو بە دەستووری لئۆنا بۆ دۆزینەوەی ئێمە چالاکی بێ وێنەیان دەکرد و تەنانەت سەردارەکان و ناو گیاکانیش دەگەڕان. وام هەست دەکرد لئۆنا دەستوریداوە بەهەر شێوەیەك دەکرێت ئێمە بگەڕێننەوە. زیاتر جەختی لەسەر من دەکردەوە و ئەگەر من بگەڕامایەتەوە رەنگە ئەو کاری بە مووناك و یوری نەبوو و ئەوانی ئازاد دەکرد.

خێرایی خۆمان زیاد کرد و لەوێ دوورکەوینەوە. وەك وتم یوری لەپێشەوە دەڕۆشت

بەڵام دوایی بڕینی ماوەیەك مووناك دەستی گرت و وتی:

تۆ بەدوای مندا وەرە، دەمەوێت لە لاڕێوە بڕۆم.... یان دەگەینە ڕێگای سەرەکی یان بەهۆی ڕوبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەترسیەکان ناچار بگەڕێینەوە بۆ ئێرە... بەهەرحاڵ بۆ ماوەیەك لەسەر ڕێگای گەڕانی ئەوان دوور دەکەوینەوە و ئەمەش دەرفەتێکی گونجاوە.

مووناك پێش کەوت و بۆلای چەپ سوڕا، یوری لەگەڵ ئەوەی لەپشتە سەری بوو بەقۆناغی سیلاحی خۆی لقی دارەکانی کەسەرە ڕێگایان گرتبوو، دەشکاند و لەمپەرەکانی لەسەر ڕێگا هەڵگرت تا مووناك بێ زەحمەت بڕواتە پێش.

منیش لەدواوە ئاگادار بووم و هەندێ کات دەگەڕامەوە کە ئەگەر کەسێك پێمان گەشتبێت لەپێی بخەم.

بەم شێوە تا بەیانی درێژەمان بە ڕێگە دا و تاکاتێك هەوا ڕوون بوو هیچ ڕووداوێك ڕوونەدا. بەرەبەیان گەشتینە ڕووباری لاوەکی ئامازۆن. ئەم ئاوە لە شوێنێکی بەردەلان بەشێوەی چەندین تاڤگەی کورت لەڕووباری سەرەکی جیابۆتەوە و دوای تێپەڕین لەناو دارەکان دەکەوتە سەروخوارییەکی تایبەت و جێگەیەکی جیاواز بۆ خۆی دروست دەکرد.

ئەم بەشە لەڕووبار لەبارەی پانیەوە گرنگی نەبوو ئەگەر ئاوەکەی ئارام بووایە مووناکیش دەیتوانی بەمەلە خۆی بگەیەنێتە ئەو بەر بەڵام سەرو خوارییەکی توند بوو، ئاو بەخێرایی دەڕۆشتە پێش و لەهەندێ شوێن ئەم خێراییە دەبووە هۆی دروست بوونی گێژاو کەزۆر مەترسیدار و مرۆڤی ڕادەکێشاو لەناوی دەبرد.

کاتێك گەشتینە قەراغ ئاو، مووناك بەپشتی دەستی ئارەقی ناوچاوی سڕی و سەیری ئاوەکەی کرد. کەمتر لە یەك خولەك سەیری سەرو خواری کردو دواتر وتی:

لێرەدا گێژاونیە بەڵام خوارتر سێیەم گێژاو لە گێژاوە مەترسیدارەکانی ئەم ڕووبارە جێگیرە و دەبێت لێرەوە تێپەڕین.

یوری سەیرێکی منی کردو منیش سەیرم کرد. نیگاکانمان بۆ ئەوە ئاڵ و گۆڕ کران کە بە بۆچوونی ئێمە تێپەڕین لە ڕووبار بەو خێراییە سەرسوڕهێنەری ئاو ئەگەری نەبوو و کارێکی زۆر دژوار دەهاتە بەرچاو. هەندێ کات قەدی دارێك لەسەر ئاو دەردەکەوت و دەڕۆشتە ژێر ئاو. بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن ئاو ئەو دارە قورسەی لەخۆیدا قووت دەدا و دەیبردە ئاو. مووناك پێشنیاری کرد بەخێرایی دەست بە دروست کردنی بەلەم بکەین.

مەبەستی ئەو لە بەلەم ئەوەبوو بڕێك لقەدار پێکەوە ببەستین. ئەم بیرۆکە باش دەهاتە بەرچاو بەڵام دەرفەتی ئەم کارەمان نەبوو چوونکە هەرسات ئەگەری ئەوەبوو دانشتوانی هۆز بگەن و بمانگرن. دوای راوێژ چوونکە چارەیەکمان جگە لەمە نەبوو بڕیاردرا مووناك و یوری بەلەمەکە دروست بکەن و منیش پاسەوان بم.... لەو کاتژمێرەوە دەستمان بەکار کرد.

بەخۆشحاڵیەوە ئەوانەی بەدوامانداد دەهاتن شوێنەواریان نەبوو و کاتی ئێواریٚ بەلەمێك بۆ تێپەڕین لەئاو ئامادەبوو، یوری و مووناك دارەکانیان پێکەوە بەست. مووناك پێشنیاری کرد شەوانە لەئاو بپەڕینەوە. بڕیار وابوو ئەم کارە بەیانی ئەنجام بدەین. لەم وتوێژەدا بووین لەناکاو دەنگی قیژەی یەکێك لەوەحشیەکان بیسترا و مەترسی دەرکەوت. یوری بیٚ درەنگ تفەنگەکەی هەڵگرت و بەدەمدا خەوت و پێی وتین: سواربن.

من و مووناك پەڕینە ناو بەلەمەکە. منداڵەکەشمان برد. یوری تەقەی دەکرد و لەنزیك بوونەوەی ئەوان رێگری دەکرد بەڵام ئەوان لەگەڵ ئەوەی زۆر نەبوون بەتووندی پەلاماریان داین و بەو تیرانەی دەیانهاویشت گۆڕەپانیان لیٚ بچووك کردینەوە. بەخۆشحاڵیەوە هەوا سات بەسات تاریکتر دەبوو. تاریکی هەوا دەرفەتێکی باشی بۆ راکردنی ئێمە دروست دەکرد.

یەکێك لەتیرەکان لەبەردەم قاچی مندا لەبەلەمەکە رۆچو و یەکێك لە بەندەکانی پچراند.

قیژاندم و بە یوریم وت: وەرە وەرە من تەقە دەکەم...

بەم قسە سیلاحەکەم هەڵگرت و دەستم بەتەقەکردن کرد... یوری لەم دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و لە شوێنەکەی هەستا و بەڕاکردن خۆی خستە ناو بەلەمەکەو بەڕێکەوتین.... ئاو کاتی شەو خێراییەکی زیاتری بوو و بەلەمەکەی ئێمە بەئاسانی لە بەستێن دوورکەوتەوە بەڵام لەجیاتی ئەوەی بمانباتەبەستێن لەگەڵ خۆیدا دەیبردینە پێش و بەم پێیە لەگێژاوی نزیکی دەکردینەوە.

ئەوان بەدوامانداد دەهاتن و تیریان دەهاویشت بەڵام چوونکە دەستیان بەئێمە نەدەگەشت بیٚ هیوا بوون و سەیریان دەکرد. مووناك منداڵەکەی لەناو بەلەمەکە داناو یارمەتیدایین بەڵام بەهەموو زەحتێك کە دەمانکرد نەمانتوانی لەگەڵ فشاری ئاوەکە دا شەڕبکەین. لەلایەکیتر ئەو بەندەی پچرابوو زیاتر دەکرایەوەو دارکانی لەیەك

جیادەکردەوە بەجۆرێك لە ناوەڕاستی بەلەمەکە کەلێنێك دروست بوو و هەڕەشەی نوقمبوون کەوتە سەرمان...

بەخۆشحاڵیەوە شەپۆلێك ئێمەی بەرەو بەستێنی چەپ برد بەڵام بەدبەختانە هەر ئەو شەپۆلە بووەهۆی تێك شکانی بەلەمەکەمان و هەرسێکمانی خستە ناو ئاوەکە. لەناکاو نەمزانی چی بوو و چی روویدا مووناك لەکاتێکدا مناڵەکەی لەباوەشدا بوو گەشتە کۆتایی رووبار و لەزیانی شەپۆلەکان رزگاری بوو. من و یوری کەوتینە دەست شەپۆلەکان و بەهۆی زەختی ئاو لەبەستێن دوور کەوتینەوە.

لقێکی دار لەبەرانبەرمدا بوو. هەوڵم دا بیگرم و ئەگەر دەمگرت یوریشم رزگار دەکرد. ئاو لەگەڵ ئەوەی زۆر قووڵ نەبوو و قاچمان دەگەشتە ئەرز بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر و مەترسیدار فشاری بوو. دەمویست لقی دارەکە کە لەبەستێندا بوو بگرم و خۆم بکێشم بەڵام هەرجار دەستم درێژ دەکرد شەپۆلێکی ئاو منی لەوێ دوور دەکردەوە و چەندین مەتر ئەولاتر فرێی دەدام. کێشە لەوەدابوو دەمانویست سیلاحەکانمان تەر نەبێت. یوری ڕەشاشەکەی بەدەستەوە گرتبوو لەبەرئەمە جگە لەقاچی کەرەستەیەکی تری بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئاودا نەبوو. منیش سیلاحەکەی خۆم لەبەستەیەکەوە پێچا و خستبوومە سەرشان. ئەگەر ڕوە بۆشەکەی تەڕ دەبوو ئاو دەڕۆشتە ناو سیلاحەکە و بەهۆی تەڕبوون لەکاتی تەقەکردندا روبەڕوی کێشە دەبوومەوە. کەمێك ئەولاتر ئاو ئەرزی رووبارەکەی شوردبوو و ریشەی گیاکان دەرکەوتبوو. یەك لە ریشەکان کە درێژتربوو سەرنجی راکێشام و دەستم درێژ کرد تابیگرم. دوبارە ئاو لەوێ دووریکردەوە.

هێواش هێواش بارودۆخمان مەترسیدار دەبوو. یوری لە بەستێنەوە دوور و ئەگەر کەمێك سستی دەکرد ئاو ئەوی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

کتوپڕ بیرۆکەیێکم بەزەیندا هات و مووناکم بانگ کرد. نزیك بوویەوە، وتم:

ئەمە بگرە.... ئاگادار بە بەرزەوی نەکەوێت. فشارم لەخۆم کردو قاچەکانم لەبەردێکی ناو ئاوەکە گیر کردو بەهەموو هێزمەوە بەستەکەم فرێدا. مووناك پەری و لەکاتێکدا نزیك بوو بەستەکە بکەوێت، گرتییەوە. بەم شێوە دەستەکانم ئازاد و باشتر دەمتوانی هەوڵ بدەم.

پێشنیارم بەیوری کرد تفەنگەکەی هەڵدات بۆ بەستێن بەڵام ئەو رازی نەبوو. دەیوت سلاحەکە قورسە یان سەرو دەستی مووناك دەشکێنێت و یان دەدرێت بەزەوریدا ورد

دەبێت.

چەند هەنگاو بۆ لای ئەو رۆشتم و سیلاحەکەم لێ گرت و چوونکە لەبەستێنەوە نزیکتر بووم، بۆ مووناکم هەڵدا. مووناک وەك مەلێك پەری و لولەی سلاحەکەی گرت و لە سوچێکدا داینا.

دەستەکانی یوریش ئازاد و ئێستا دەیتوانی بەئازادی چالاکی بکات.

نازانم چی بوو ئاو بۆ ساتێکی زۆر کورت فشاری نەما، رەنگە بەردێکی گەورە رەوتی ئاوی دەگۆڕی و یان رووداوێکی تر رویدا. بەهەرحاڵ ئەم دەرفەتە بۆ من شانسێکی گەورەبوو بۆ من چوونکە لەوکاتەدا توانیم دەست درێژ بکەم و ریشەی دارەکە بگرم.

کاتێك دەستم بەریشەی دارەکە گرت، کەوتمە ناو ئاوەکە، ئاو لەسەرم تێپەڕی بەڵام دەستم لەریشەکە بەرنەدا چوونکە دەمزانی ئەگەر ریشەکە لەدەستم دەرچێت لەچەند ساتێکدا چەند کیلۆمەتر و رەنگە زیاتر لەوێ دووردەکەومەوە و نوقم دەبووم.

بەهەرحاڵ چەند قومێکم ئاو خواردەوە. بەزۆری بازوو خۆم کێشایە پێش یەك مەتر ئەولاتر ئاو قولآیی و فشاری کەمتر بوو. کاتێك قاچم لەسەر زەوی دانا هەستم کرد دەتوانم لەبەرانبەر فشاری ئاوەکە خۆڕاگری بکەم بەڵام لەناکاو شەپۆلێکی تر منی فرێدایە ناو ئاوەکە.

دووبارە لەگەڵ ئاوەکەدا شەڕم دەکرد. شەڕێك کە دیاربوو سەرکەوتنی کۆتایی بۆ ئاو و بەشکەستی من کۆتایی دەهات.. لەوکاتەدا یوری کە توانیبووی خۆی رزگار بکات، بیرۆکەیەکی لادروست بوو خۆی گەیاندە یەکێك لە دارەکان، یەکێك لە لقەکانی بریەوەو بەرەو بەستێن رایکرد. ئەو لقە نزیەکی سێ مەتر درێژی بوو ئەگەر من کەمێك زەختم لەخۆم دەکرد دەمتوانی بیگرم.

لقەکەی بۆ لای من درێژکرد و وتی:

بیگرە...... سەری ئەم لقە بگرە.... بەهێزەو من و مووناك تۆ رادەکێشین...

شادمان بووم و دەستم بۆ گرتنی لقەکە درێژ کرد.

بەڵام لەناکاو هاوارێکی دڵتەزێنم کرد چوونکە بوونەوەرە نەبینراوەکان هێرشیان کردەسەرم. بە توندی بەمشت و ئەنیشك ئەمکێشا بە ئاوەکەدا بەڵام نەمدەزانی چی بووە... یەك دو جار رۆشتمە ژێر ئاوەکەو هاتمەدەر. جاری دوایین تا کەمەر لەئاوەکە هاتمەدەرو قیژاندم.

لەوپەری سەرسوڕمان و ترس بینیم شان و ملم هەڵدراوەو غەڵتانی خوێنە.

چی بووە......؟ نەمزانی.

مووناك كە بۆ ئارام كردنەوەی منالەكە رۆشتبوو كاتێك دەنگی قیژەی منی بیست بەراكردن هات وكاتێك شان وملی خوێناوی منی بینی بەهەردودەست كێشای بەئەژنۆكانی خۆیدا و بەترس وسەرسوڕمانەوە وتی: شیوا..... شیوا.

نەمزانی شیوا چیە !

بەلأم هەستم كرد ئاژەڵەكان بەددیانی تیژ هەموو جەستەی من دەجوون.

مووناك ئیتر قسەی نەكرد. ئەوەندە ترسابوو توانای قسەكردنی نەبوو. لەترسی ئەوەی نەكا بكوژرێم دووبارە یوری خۆی فرێدایە ئاوەكە و مووناك هانی دەداو بەگریانەوە دەیوت:

خێراكە.......؟ مەگەر شیواكان نابینی......؟ شیوا !، شیوا ماسی گۆشتخۆرە سەیركە چۆن گەمارۆیان داوە.... ئەگەر تا یەك خولەكی تر رزگاری نەكەیت ئەوانیتر دەیخۆن و لەماوەی یەك خولەكدا دەیكەن بە مشتێك ئێسقان.

نزیك بوو لەترسا بێهۆش ببم. قورگم گیرابوو نەمدەتوانی بەجوانی هەناسە بكێشم. لەم كاتەدا بیستم یوری بە مووناك دەڵێت.

دەبێت چی بكەین؟

مووناك لەجیاتی ئەوەی وەلأمی یوری بداتەوە بەخێرایی بەرەو پارچەیەك كە لەدەوری سیلاحەكە پێچرابوو رۆشت و كردیەوە و سەرەكەی لە لقی دارەكە ئالأند و گەڕایەوە.

ئەوەندە خێرا ئەم كارانەی ئەنجامدا رەنگە دوو سێ خولەك زیاتری نەخایاند. سەری پارچەكەی بەدەست گرت و لقی دارەكەی خستە ناو ئاوەكە و بەدەنگی بەرز وتی:

بیگرە، بیگرە

زۆر شادمان بووم و بەهەموو هێزێك كەلەخۆمدا هەستم دەكرد پارچەكەم راكێشا. مووناكیش یارمەتیدام و دروست چەند سات دواتر لەكاتێكدا لەچەن شوێنێكی جەستەمەوە خوێن دەچۆرا، منیان كێشایە بەستێن.

## ١١

کاتێك گەشتمە بەستێن زمانم گیرابوو و چوون دڵنیابووم رزگارم بووە و ئیتر نابمە خواردنی شیواکان لەترس و رەنگە لەشادمانیدا چاوەکانم بەسترا.

ساتێك دواتر دەنگی مووناکم بیست کە بەپەنجە روی ئاوەکەی نیشان دەداو دەیوت: سەیرکە.

سەیری رووبارەکەم کرد و بینیم رووی ئاوەکە شین و سووربووە، پێستی ماسیە مرۆڤ خۆرەکان یانی شیوا لەسێ رەنگی شین و سوور و خۆڵەمێشی پێك هاتووە و شێوەیەکی سەیری هەیە.

ئەم شیوا بەدیانە تیژەکانی گۆشتی مرۆڤ یان ئاژەڵ بەخێراییەکی وا هەڵدەدرێت و دەیخوات کە هیچ ئامرازێك ئاوا خێراییەکی لە وردکردنی گۆشت دا نیە.

شیوا لەشوێنێکی تایبەت لەناوەڕاستی رووبار دەژی و لەدەوری یەك کۆدەبنەوە بەڵام رێکخستنێکی تایبەتەیان هەیە و لەگەڵ ئەوەی گامێش و یان مانگا و هەر ئاژەڵێکی پر گۆشتی تردێتە ناو رووبار بەهۆی پاسەوانەکانی خۆیان ئاگادار دەکرێنەوەو گەمارۆی دەدەن.

خێرایی کاری ئەوان ئەوەندە زۆرە لە خولەکێکدا گامێشێك دەخۆن و تەنیا ئێسکە پەیکەرەکەی لەئاودا بەجێ دێڵن.

رەحمی خوا منی گرتەوە کەهێشتا دەستەی سەرەکی شیواکان نەهاتبوون و لەوکاتەی گەشتمە بەستێن و مووناك ئاوەکەی نیشان دام سەدان هەزار ماسی گۆشت خۆر لەسەر ئاوەکە هەڵبەز ودابەزیان دەکرد.

ئەم جۆرە ماسیە بچوکە دەتوانێت بەئەندازەی دوو مەتر لەئاو بەرزبێتەوە و دووبارە بڕواتەوە ناو قووڵایی.

جەستەی من لە پێنج شەش لاوە هەڵدڕابوو، ئەوان بەخێرایی دەست بەکاربوون و برینەکانی منیان بە پارچەیەك لەجل و بەرگی مووناك بەست و لەخوێن بەربوونی زیاتر رێگریان کرد.

مووناك لە رزگاری من هەم زۆر شادمان بوو هەم سەری سورمابوو و دەیوت:

خوا دووبارە تۆی بەئێمە داوەتەوە..... تا ئێستا نەبووە کەسێك بەزیندوویی لە شیواکان رزگاری بێت. بەڕاستی سەیرە.

کاتێك خۆشم لەچۆنیەتی کارو مەترسی شیواکان ئاگادار بوومەوە زیاتر لەمووناك سەرم سوڕما.

مووناك تیکە تەختەیەکی بەدەستەوەت گرت و بەچەقۆ بەخێرایی پارچە پارچەی کرد و فرێیدا و وتی:

سەیرکە.... شیوا بەم خێراییە گۆشتی مرۆڤ لێدەکاتەوە و دەیخوات و چوونکە ژمارەیان زۆرە لەیەك دوو خولەك مرۆڤ هیچی نامێنێتەوە.... لەم شێوەدا تۆ چۆن زیندوو مایتەوە بەڕاستی سەیرە. ماوەیەك کاتمان لەدەوروبەری شیواکان تێپەڕی.... مووناك دواتر رۆشتە سوچێکی جەنگەڵ و بەپێشینەیەك کەهەیبوو لە سوچێکدا کەپرێکی دروست کرد، منالەکەی خەواندو دواتر هاتە لای ئێمە بەیوری وت من هەڵگرێت و بمباتە ژێر کەپرەکە.

دووبارە بێهۆش بووم دووکاتژمێر دواتر هاتمە هۆش. حالم زۆر خراپ نەبوو. تەنیا بەهۆی خوێن بەربوون کەمێك بێ هێز بووم.

شیواکان زۆر نەبوون لەگەڵ ئەوەشدا سەرم سوڕمابوو بۆ زیندووم چوونکە دەزانم ئەم ماسیانە تا چ رادەیەك مەترسیدارن... زیاتر لە چوار تا پێنج شیوام لەدەوری خۆمدا نەدەدی لەهەمان ساتی یەکەم دوانیانم بەمشت کوشت و یەکیانم بەدەستی چەپ گرتبوو نەمدەهێشت پەلامارم بدات. سیانی تر مابوو بەلام هەرسات و چاوەڕێی هێرشی ئەوانیتر بووم. تا ئەوەی دەنگی ئەوانم بیست و گەڕامەوە. کاتێك دەمویست سەری دارەکە بگرم، دوو ماسیەکەم بەخێرایی دا بەیەکدا و گەرنە ئەو چوار ماسیە بۆ کوشتنی من بەس بوو.

پێش ئاوابوونی خۆر مووناك رۆشتە دەوروبەر، کەمێك گەڵای کۆکردەوەو لەسەر بەردێك کوتای و ئاو و پڵتەکەی لەسەر برینەکەی من دانا و دووبارە بەستیەوە. ئەو رۆژەو شەوەکەشی تێپەڕی و بۆ بەیانیەکەی کەمێك باشتر بووم و دەمتوانی بێ یارمەتی کەسانیتر بەرێگادا بڕۆم و درێژە بەرێگا کەمان بدەین. بەرەو لێواری جەنگەڵ رۆشتین. کەم کەم لەزونگاوەکان نزیك دەبووینەوە......

جارێکیتر سەبارەت بەم ناوچە قسەم کرد و خوێنەران کەم تا زۆر شتێکیان لەبیرە. باران جەنگەڵی قامچی کاری دەکرد و لەسەر زەوی ئاو کۆدەبێتەوە و لەبەرئەوەی بەهۆی بوونی دارەچڕەکان تیشکی هەتاو بەزەوی ناگات زۆنگاوەکان دروست دەبن.

ئەو ئاوانەی لەزۆنگاو جیادەبنەوە دێتە ناو زۆنگاوەکان و لەئەنجامدا دەبنە بەشوێنێکی مەترسیدار. لەزۆنگاودا زەوی نەرمە، کاتێک مرۆڤ یان ئاژەڵێک قاچ دادەنێت کەمێک دەڕواتە خوار بۆ رزگاربوونی خۆی هەوڵ دەدات بەڵام زیاتر دەچەقێت، هەرچەندە زیاتر هەوڵ بدات زیاتر دەچێتە قووڵایی تا ئەوەی بەتەواوی ون دەبێت و لەناو خۆڵە نەرمەکاندا بەخاک دەسپێردرێت. چەند ساڵ پێشتر کە من و یوری بۆ ئەم ناوچەیە دەهاتین روبەڕوی زۆنگاوەکان بووینەوە و من چەقیم بەڵام ژنانی ئامازۆن کە بە دوامانەوە بوون گەشتن و منیان رزگارکرد.

ئەو رۆژە مووناک ئێمەی رزگارکرد بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ دەچەقین کێ رزگاری دەکردین....

مووناک رێگاکانی جەنگەڵی باش دەناسی و تاڕادەیەکی زۆر یارمەتی دەداین بەڵام کێشە لەوەدا بوو هەندێ کات ئەویش رێگاکە بەپێچەوانەوە دەڕۆشت.

لەسەر زۆنگاوەکان قامیش دەڕوێت. ئەم قامیشانەیە مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێت و بە گومانی ئەوەی زەوی رەقە، قاچ دادەنێت و دەچەقێت.

بەهەرحاڵ کاتێک گەشتینە زۆنگاوەکان مووناک پێش کەوت.

منداڵەکەم لەباوەش گرتبوو، لەدواوە دەڕۆشتم. یوریش لەپێش منەوەبوو.

زۆر لەسەرخۆ دەڕۆشتینە پێش و بەم شێوە رۆشتینە ناو قامیشەڵان و سنووری زۆنگاوەکان. مووناک بەدارەکەی دەستی سەرەتا زەوی تاقی دەکردەوە و بەهێزیەکەی هەڵی دەسەنگاند و ئەوسا دەڕۆشتین.

لە قامیشەڵان دار نەبوو سێبەریش نەبوو. هەتاوی سووتێنەر گیانمانی هێنابووە سەر لێو. زیاتر نیگەرانی منداڵەکە بووم بۆئەوەی هەتاو لێی نەدات سەریم دادەپۆشی و خۆم دەکردە کەپری ئەو.

نزیک نیوەرۆ گەشتینە قامیشەڵان. لەچوار لاوە جەنگەڵ دەبینرا بەڵام قامیشەکان ئەوەندە بەرزبوون ئەگەر بمانویستایە بێدەنگ برۆین لەیەک جیادەبووینەوەو ون دەبووین.

مووناک دەیوت: دەبێت خێرابکەین و پێش تاریک بوونی هەوا لەقامیشەڵان دەربچین چونکە کاتی شەو پڕە لەشێرە دڕندەکان...

شێر لە هەرکوێ دابێت شەوانە بۆ حەوانەوەو شیردان بەبێچووەکانی دێتە ناو قامیشەڵان و لەم شێوەشدا پارویەکی باش بۆ شێرەکان دەبین.

ئەو قسەی بۆکردین و بەم شێوە بەقسەکردنی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێمە دەپاراست تا ون نەبین.

لەم کاتەدا کە ئێمە ئاسوودە لە دەوروبەر گوێمان لەقسەکانی مووناك دەگرت و دەڕۆشتین لەناکاو دەنگی هەلهەلە بیسترا.

مووناك دەنگی خۆی پچراندو وەستا، ئێمەش وەستاین. دەنگەکە دووبارە بیسترایەوە و ئەم جارەیان تێگەشتم لەچوارلاوە وەحشیەکان بەهەلهەلە کێشان بەرەولامان دێن.

لەبەر قامیشە بەرزەکان هیچ شوێنێکمان نەدەدی، نەماندەزانی لەکام هۆزن و نەلە مەبەستەکەیان ئاگادار بووین. هەرئەوەندەمان دەزانی لێمان نزیك دەبنەوە و لەچوارلا گەمارۆ دراوین.

مووناك وتی: دانیشن.... دانیشن.

خێرا دانیشن و بۆ ئەوەی شوێنێکی کەمتر بگرین لەدەوری یەك کۆبووینەوەو جوامیلکەمان دا، یوری رەشاشەکەی ئامادە کرد تا لەئەگەری پێویست تەقە بکات بەڵام ئەگەر هێرش دەکرا بەرگری کردن بێ ئەنجام بوو چوونکە ژمارەی وەحشیەکان ئەوەندە زۆرە کەبڕی فیشەکە پاشەکەوت کراوەکانی بۆ کوشتنی ئەوان بەس نەبوو.

چەند خولەکێك بە بێ دەنگی گوزەرا، دووبارە دەنگی هەلهەلەی ئەوان بیسترا.

مووناك بەشادمانیەوە بزەیەکی گرت و وتی:

ئەوان ئێمەیان نەبینیوە.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

پێشگوویش دەزانی... لەکوێوە دەزانی ئەوان ئێمەیان نەبینیوە.

مووناك لە وەڵامدا وتی:

ئەوان بۆ راوی شێر هاتوون. یاسای راوی شێر وایە کە گەمارۆی قامیشەڵان دەدەن و سات بەسات هەلهەلە دەکێشن و ئاڵقەی گەمارۆکە تەنکتر دەکەنەوە.

شێر لەترسی دەنگی وەحشیەکان بۆ چەقی بازنە رادەکات و گرفتار دەبێت. کاتێك دەوری شێریان دا و رێگەی هەڵاتنیان لێ بەست بە ڕمەکانی خۆیان ئەو ئاژەڵە دەکوژن.

یوری وتی: من وتم:

گەر بەدەستی وەحشیەکان نەکوژرێن شێرەکان تیکە تیکەمان دەکەن چوونکە بەم شێوە کە تۆ باسی دەکەیت ئێمە لەناو چەقی بازنەکەداین.

مووناك وتی: هێشتا نازانین لەکام هۆزو رەچەڵەکن... ئەگەر لە دوژمنەکانمان بن و من لەگەڵ ئێوەدا ببینن کار خراپ دەبێت و دەکوژرێین بەڵام ئەگەر هۆزەکانی هاوڕێ بن کەرەستەی رۆشتنی ئێمە ئامادە دەکەن. ئێستا دەبێت چاوەڕێ بین تا ئەنجام دەرکەوێت.

یوری پرسی: نازانی کام هۆزە لەم نزیکانەیە.

مووناك وتی: بۆ نا..... ژمارەی هۆزەکانی ئەم سنورە دەزانم بەڵام ئێرە قامیشەڵانە و شوێنێکە کەوتۆتە نێوان چەندین هۆز و مڵکی هاوبەشی ئەوانە.

هەرچەند رۆژ هۆزێك بۆراوی شێر دێنە ئێرە.... هۆزەکانی لای هەڵاتنی خۆر دوژمنمانن، هۆزەکانی لای ئاوابوونی خۆر من ناناسن و ئەوانەی لەم لا، مەبەستی باکوور بوو دەژین، لە هاوڕێکانی ئێمە دەژمێردرێن.

بیری کردەوە وتی:

من ئەگەر نیشانەکانی سەر قەڵغانەکانیان ببینم دەڵێم لەکام هۆزن.

بینینی نیشانەکانی سەر قەڵغانەکانیان پێویستی بەوەبوو لەئێمە نزیك ببنەوەو ئەگەر نزیك دەبوونەوە هەرجۆرە چارەو ئەندێشەیەك درەنگ دەبوو.

چەند خولەکێك بەترس ولەرزەوە تێپەڕی. زیاتر لەوانی تر دەترسام چوونکە بێ هێزو برینداربووم و لەئەگەری پێویست نەمدەتوانی لەگەڵ کەسدا دەرگیر ببم.

هەر خولەکێك تێدەپەڕی دەنگی هەلهەلەی ئەوان بۆ ترسانی شێر نزیکتر و ترسی ئێمە زیادی دەکرد.

سەرئەنجام مووناك وتی: بخەون.... لەسەر زەوی راکشێن.... ئەوان نزیك بوونەتەوە و ئەگەری هەیە بمانبینن.

بەقسەی مووناکمان کرد و بەسینگەوە لەسەر زەوی راکشاین.

من مناڵەکەم دا بەمووناك چونك بەقسەی منی نەدەکرد و لەم کاتە مەترسیدارەدا دەیتوانی بووەستێت و سەیری دەوروبەر بکات.

مووناك ئارامی کردەوە ! بەهێواشی لەبن گوێیدا هەندێ شتی وت و ئەوی خەواند. لەوساتەدا کتوپڕ دەنگێکی ترس ئەنگێز بیسترا کە بەهۆیەوە دنیا لەرزی.

من ترسام و کەوتمە سەرپشت و سیلاحەکەم ئامادە کرد.

یوریش میلی هێنایەوە چوونکە دەنگێك کە لەنزیکمان دەبیسترا دەنگی شێربوو. کاتێك دەنگی شێر دەنگی دایەوە هەلهەلەی وەحشیەکان زیاتر بوو سەرنجیان بۆلای

دەنگەکە راکێشرا.

هەلهەلەی وەحشیەکان شێری زیاتر ترساند و نەڕاندی. نەڕەی دووەم لەنەڕەی یەکەم توندترو رقاویتربوو.

راستی دڵی مرۆڤ دەتوێتەوە چوونکە دەنگەکە زۆر نزیك و لەچەند هەنگاویەوە بەگوێ دەگەشت. من ویوری بەرەو دەنگەکە گەڕاینەوە و لەگەڵ ئەوەی لەناو قامیشەلآن بەرزو چڕەکان شتێکمان نەدەبینی لوولەی تفەنگمان بەرەو لایان نیشانە گرت کەلەناکاو گیرنەکەین.

ئێستا وەحشیەکانمان لەبیربردبوو. هەموو سەرنجمان بەشێردابوو.

ئەو ئاژەڵە دڕندە بەبێ بەزەیی و بەیەك زەربەی دەست مرۆڤ ورد دەکات بەڵام لەگەڵ وەحشیەکان بەشێوەیەکی تر دەتوانێن هەڵس و کەوت بکەین کە گیانمان لەئاماندا بێت.

لەسەر ئەم گوومانە بوو ئێمە وەحشیەکانمان لەبیرکرد و سەرنجمان بەشێردەدا.

ئاژەڵی وەحشی کە زۆر ترسابوو دووبارە نەڕاندی.

نەڕەی سێیەمی زۆر بەهێزتر لەودووانەی تر و منالەکەی کردە گریان. منالً بەدەنگی بەرز قیژاندی..

مووناك بەدەست دەمی گرت و لەبەرزبوونەوەی دەنگی رێگری کرد بەڵام ئیتر درەنگ ببوو چوونکە وەحشیەکان دەنگی قیژەی منالەکەیان بیست و بەخێرایی بەرەولای ئێمە هاتن.

من و یوری هەرکام بۆ ئارام کردنەوەی منالەکە پێشنیارێکمان بە مووناك دەدا بەوهیوایەی رەنگە وەحشیەکان دەنگی ئەویان نەبیستبێت.

هێشتا سەرقاڵ بووین کە دەنگی خشە خشی بەریەك کەوتنی قامیشەکان بەرزبوویەوە و چەند سات دواتر سەروکەلەی وەحشیەکان دەرکەوت.

یوری تا نیوە هەستاو قامکی لەسەر پەلەپتکەکە دانا تا تەقەبکات بەڵام دەرفەتی ئەم کارەی دەست نەکەوت چونك مووناك هەستاو لوولەی رەشاشەکەی لێ سەندو کێشایە خوار و وتی:

تەقە مەکە.... کار خراپتر دەبێت. بێستە ئەوان دەماننناسن. رەنگە کاریان بەئێمە نەبێت. سەرەتا وەحشیەکان لەبینینی ئێمە سەریان سورما. چاوەرێ نەبوون لەناوقامیشەلآن و لەقەراغ زۆنگاوەکان دوو پیاو و ژنێك و منالێکی سپی پێست ببینن.

چەند سات واق ورماو سەیریان کردین و سەرئەنجام یەکیان هاتە پێش و هەندێك

شتی وت کە من تێنەگەشتم....

رمەکەی تەکان دەداو هەندێکات قاچی لەزەوی دەکووتا....

مووناك هەستا، دەستی راستی بەنیشانەی سڵاو بەرزکردەوەو دەستی بەقسەکردن کرد. مووناك زمانی ئەوانی دەزانی. بۆیە وتی:

دەڕۆینە هۆزەکەی خۆمان، کاتێك گەشتینە ئێرە زانیمان ئێوە بۆ راوی شێر هاتوون و بۆ ئەوەی شێرەکان لە دەستتان رانەکەن خۆمان داشارد... ئێمە هاوڕێی ئێوەین مووناك دواتر باسی وتوێژەکەی خۆی و ئەوانی بۆ باس کردین.

رەش پێستی ئامازە پێدراو بەخێرایی رۆشت.

مووناك وتی: بۆ وەرگرتنی مۆڵەت لەسەرۆکەکەیان دەڕوات.....

وەحشیەکانیتر گەمارۆیان دابووین. چەند خولەك دواتر بەتەپڵ دەستوردرا بەڕێزەوە بمانبەنە لای سەرۆکی هۆز کە ئەویش بۆ ڕاوهاتبوو.

لەم دەستورە شادمان بووین ئەوان ئێمەیان بردە هۆزەکەی خۆیان. نیوە شەو مووناك منی لەخەو هەستان و وتی: دەبیستی..... دەنگی تەپڵ دەبیستی ئەوان بەتەپڵ دەڵێن (( دووپیاو.... ژنێك.... ومناڵێك لە هۆزەکەی ئێمەدان. ئەگەر لەشوێنێك رایان کردوە ئاگادارمان بکەنەوە ))

دەبیستی...؟ ئەوان بە تەپڵ دەپرسن. ئیستا کە دانیشتوانی هۆزەکەی من لئۆنا هەڵدەستێنن و دەستوری وەڵامی لێوەردەگرن. ئەگەر لەهۆزەکەی ئێمە وەڵام بدرێتەوە کارمان خراپە. دەبێت چارەیەك بدۆزینەوە.

دەنگی تەپڵ دەبیسترا. هێشتا وەڵام لەهیچ شوێنێکەوە نەگەشتبوو. یوریم لەخەو هەستاند.

یوری بەهێواشی رۆشتە پشت دەرگای حەسیری ژوورەکەو گەڕایەوە و وتی:

چەند پاسەوانێکی چەکدار بەڕم و تیروکەوانەوە لەدەوری ژوورەکەی ئێمە پیاسە دەکەن.

دڵم بەشێوەیەکی سەیر لێی دەدا. لەزۆری ترس بچووکترین دەنگێك کە لەدەوروبەر بەرز دەبوویەوە دەمبیست.

هەندێ کات مرۆڤ لەترسا کۆنترۆڵی خۆی لەدەست ئەدات و روداوەکانی دەوروبەری نابینێت و نازانێت بەڵام لەوکاتەدا هەستەکانم پێچەوانەبوو یانی چی هەردەنگێکم دەبیست.

دەتوت پاسەوانەکان لەسەر دڵ و گوێچکەو سەری من بەپێگادا دەڕۆن.

گوێم لەدەنگی تەپڵەکان گرتبوو، مووناك بەردەوام بۆی وەردەگێرامەوە و دەیوت:

دوو سپی پێست و ژنێك و منداڵێك لەهۆزەکەی ئێمەدان.... ئایا ئەمانە لەهۆزەکەی ئێوە رایان نەکردوە، وەڵام بدەنەوە..... چاوەڕێین.

ئەمە ئەو رستانەبوو وەحشیەکان بەتەپڵ دەیانناردو بەشێوەیەك کە مووناك دەیوت چاوڕێی وەڵامن... چەند خولەکێك بەهێواشی تێپەڕی.

دەڵێم چەند خولەك...! سەیرە... راستیەکەی ئەوەیە حسێبی سات و شوێنم لە دەستدا نەبوو. وەك شێتم لێ هاتبوو.

لە ژووەکەدا دەڕۆشتم و بیرم دەکردەوە و لەگەڵ ئەوەی دەنگی تەپڵێك دەبیسترا بەخێرایی دەڕۆشتمە لای مووناك و دەموت:

چی دەڵێن.... وەڵام گەشت؟ ئەوان چییان وەڵام دایەوە.

بەڵام بەدبەختانە مووناك دەیوت: نە..... ئەم دەنگی تەپڵە لەهۆزی دراوسێیەوەیە. ئەوان دەڵێن ئەم تاقمە ناناسین، یەك یەکی هۆزەکانی دراوسێ وەڵامیان دایەوە. تەنیا هۆزی ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن وەڵامیان نەدابوویەوە.

وەحشیەکان دووبارە تەپڵیان لێ دەداو چاوڕێی وەڵام بوون.

لەم جۆرە بارودۆخەدا لەنێوان هۆزەکانی دراوسێی ناو جەنگەڵ هاوکاریەکی سەیر فەرمانڕەوایی دەکات.

راستی ئەگەر پۆلیسی وڵاتە پێشکەوتوەکانیش بەم شێوەیە هاوکاری یەك بکەن بەدڵنیاییەوە دزی و جەنایەت لەسەر زەوی نامێنێت و دزو جەنایەتکارەکان لەکارە قێزەونەکانی خۆیان پەشیمان دەبنەوە.

خولەکەکان بەهێواشی تێدەپەڕین. دەتوت هەرخولەك بۆتە کاتژمێرێك و هەرکاتژمێرێك بۆتە مانگێك.

رەنگە ئەوان زیاتر لەنیو کاتژمێر تەپڵیان لێ ئەدا... بەڵام ئەم ماوە کەمە بۆ من درێژو بێزارکەرو گیان ستێن بوو.

زۆر بۆخۆم نیگەران نەبووم. دەمزانی لئۆنا منی خۆش دەوێت ورازی نابێت بکوژرێم بەڵام نیگەرانی مووناك بووم.

ئەگەر لئۆنا دوبارە دەستی بە مووناك بگەشتایە بەو دەسەڵاتەی دەستی کەوتبوو، دەیکوشت. ئەو شادمان بوو چوونکە ئێستا سەرۆکی هۆز و منی بۆ بەرژەوەندی خۆی

هەڵدەگرت و مووناکی دوور دەکردەوە و چوونکە پێشتر لەنێوان من و ئەودا پەیوەندی عاشقانە هەبوو، دڵنیابوو من مووناك لەبەر ئەو بەجێ دێڵم.

لئۆنا ئەم گوومانانەی بوو لەناکاو ئاگادار کرایەوە کە من و مووناك و منالەکە رامانکردووە.

باش پێم زانیبوو ئەم هەواڵە تا چەند نیگەرانی و ناڕەحەتی لەودا دروست کردوە.

بۆیە چاوەڕێ بووم وەڵامی تەپڵی وەحشیەکان بەشێوەیەکەی تایبەت بدرێتەوە.

لەمبارەوە بەهێواشی لەگەڵ یوریدا قسەم کرد و وتم:

ئایا لەناو هۆزەکاندا باوە دەستووری کوشتنی تاقمێك بدەن.

یوری بەسەرسوڕمانەوە پرسی: مەبەستت چیە؟

وەڵامم دایەوە: مەبەستم ئەوە لئۆنا بەتەپڵ دەستووری کوشتنی مووناك و منالەکەی بدات. ئەگەر ئاوا وەڵامێك بدرێتەوە وەحشیەکان دەیکوژن.

یوری بیری کردەوەو هیچی نەوت بەڵام مووناك کە دەتوت وتوێژەکانی ئێمەی بیستوە، وتی: بەڵێ..... باوە..... بەڵێ من چەندین جار دەستووری کوشتنی پیاوە هەڵاتوەکانم بە هۆزەکانیتر داوە و دڵنیام ئەوانیان کوشتووە. ئەم رەسمە لەکۆنەوە لەنێوان هۆزەکانی جەنگەڵی باران باوەو ئێستاش بەردەوامە بەڵام..

دەست بەجێ قسەکەیم بڕی و وتم:

بەڵام چی....؟

ئەو بیری کردەوەو دەتوت لەوەی دەیڵێت زۆر دڵنیا نیە. وەڵامی دایەوە:

وا هەست دەکەم.... لئۆنا ئەم دەستوورە نەدات... ئەو ئەوەندەش گوومان دەکەین شەیتان نیە کە پاداشتی چاکەکانی من بەخراپە بداتەوە. ئەگەر دانشتوانی هۆز نەزانن ئێوە دووانە باش دەزانن من تا چەند بەرانبەر ئەو میهرەبان بووم.... لێی خۆش بووم.... ئایا پاداشتی ئەم هەموو چاکەیە ئەوە دەستووری کوشتنی من دەرکات....

مووناك چەند ساتێك بیری کردەوە. دەتوت دەیەوێت ئەم بابەتە بەجوانی لەمێشکی خۆیدا شی بکاتەوە و ئەنجامی لێ بەدەست بێنێت. من و یوری بێدەنگ بووین و هیچمان نەوت دوای چەند ساتێك مووناك دووبارە سەری بەرز کردەوە هەناسەیەکی پر سۆزو ئازاری هەڵکێشاو وتی: ئایا تۆ دوای مردنی من لەگەڵ لئۆنا دا دەژیت....

ئەم پرسیارەی لەمن کرد.... حەسوودی ژنانەی ئەو ئازاری دەدا و ئێستا کە دەیزانی لئۆنا دەستوری کوشتنی دەدا دەیویست تێبگات ئایا دوای مردنی، من لەگەڵ لئۆنا دا

دەژیم یان نە....

قوڵپی گریان قوورگمی گرتبوو، نزیك بوو بخنكێم. مووناك ئەم پرسیارەی بەجۆرێك كرد و بەشێوەیەك وتی كە بەڕاستی بەئازارو جەرگ بڕبوو.

توانای وەڵامدانەوم نەبوو، بۆیە بێدەنگ بووم بەڵام مووناك بێدەنگی منی وەك نیشانەی وەڵامی پۆزەتیڤ لە قەڵەم دا و بیٚ ئیرادە دەستی كرد بەگریان.

مناڵەكە لە خەوێكی خۆشدا بوو نەیدەزانی چی بەسەر ئێمە دا دەگوزەرێت.

مووناك لەم كاتەدا باوەشی بەمناڵەكەدا كردو و لەكاتێكدا بەخەستی دەگریا بەدەم هەنسكدانەوە وتی:

كەواتە كچەكەم لەژیان بپارێزە.... ئەو لەم مناڵە بیٚ تاوانەش تۆڵە دەستێنێتەوە هەر جۆرێك دەتەوێت بژی. كاتێك من زیندوو نەبم تۆ بەحەزی خۆت لەگەڵ هەرژنێكدا بتەوێت دەژیت بەڵام رازی مەبە كچەكەم بەدەست لئۆنا بكوژرێت. ئەو یادگاری منە، زۆر لەمن دەچێت، تۆ هەركات لە روخساری ئەو بڕوانی بیری من دەكەیتەوە.

گریان رێگەی نەدا قسەكانی تەواو بێت، سەری لەسەر سینەی مناڵەكە داناو گریا. ئەوەندە بەتووندی دەگریا شانەكانی دەلەریەوە.

ناڵێم هیچ كاتیش ئەم وتووە عاشقی مووناك بووم یان ئەوم تارادەی پەرستن خۆش دەوێت بەڵام ناتوانم حاشا لەوەش بكەم بەتەواو مانا خۆشم دەویست. بەو شێوەی پیاوێك بەرانبەر بە ژنێكی باش خۆشەویستی دەردەبڕێت.

مووناك ژنێكی حەسوود بوو ئەم حەسوودییە ئەوی زیاتر لای من ئازیز كرد. پیاوان ژنانی حەسوودیان خۆش دەوێت چوونكە حەسوودی ژنەكە بەشێوەیەكی تایبەت هەستی غرور و لەخۆرازی بوونیان تێردەكات.

منیش لەم روانگەو لەبەر چەند هۆكارێكی تر كەیەكیان جوانی زیاد لەرادەی مووناك بوو ئەوم خۆش دەویست.

كاتێك ئەم رستانەم لیٚ بیست كاسەی سەبرم لێی رژاو بەخێرایی خۆم پێگەیاند و شانەكانیم خستە نێوان بازوەكانم و وتم:

مووناك گویٚ بگرە... مەگری.... ئێستا كاتی گریان نیە.

مووناك پێشتر گوێی لەقسەكانی من نەدەگرت و بەقسەی نەدەكردم. بەڵام لەوكاتەوەی سەرۆكایەتی دابوو بە لئۆنا ببووە ژنێكی ئاسایی هەرچیم دەوت جیٚ بەجێی دەكرد.

ئەم جارەش دەست بەجێ گریانی لەقورگیدا خنکاند، سەری هەڵبڕی و ئامادەیی بیستنی قسەکانی من بوو پێم وت:

گوێ بگرە.... یەکەم ئەوەی تا گیانم هەبێت ناهێڵم تاڵێك لە قژت کەم بێتەوە. منیش دەبێت لەگەڵ تۆدا بکوژرێم، دووەم ئەگەر تۆ کوژرایت و من زیندوومام، تۆڵەی تۆ بەستەختی لە لئۆنا دەسەنمەوە.

من و مووناك بەهێواشی قسەمان دەکرد. وتوێژەکەمان دەتوت ماڵئاواییە لەم کاتەدا بوو کەدەنگی تەپڵێکی لاواز بیسترا.

مووناك گوێی گرت و دواتر هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەم شێوە بۆ وەرگێڕاینەوە.

پەیامێك بوو کە لئۆنا بۆ سەرۆکی هۆزی وەحشیەکانی ناردبوو. کاتێك لەوەڵامدا کە ئاگاداربووینەوە دەستمان لە گیان شۆرد. تەنیا یوری بە هیچ هێزێك نەدەبەزێنرا و لەوکاتەشدا نەخشەی هەڵاتنی کێشا.

هێشتا ماڵئاوایی من و مووناك تەواو نەببوو کە یوری بەخەنجەرەکەی خۆی قامیش و حەسیری دیواری ژوورەکەی کون کرد و ڕێگەی بۆ ڕۆشتنەدەر کردەوە، ڕۆشتمە پێش و وتم: ئەم کارە مەترسیدارە.

بەڵام وتی: تۆ لێرەدا بمێنەو بۆ ئەوەی بزانن ئێمە لەناو ژوورەکەداین و خیاڵیان ئاسوودە بێت، گۆرانی بخوێنە من مووناك و مناڵەکە لەم ڕێگاوە دەبەمە جەنگەڵ و لەشوێنێکدا دایاندەشارم.

ئەم پێشنیارە سەرەتا سەیر و نەکران ئەهاتە بەرچاوم بەڵام بە ڕوونکردنەوەکانی یوری رازی بووم و ڕەزامەندیم نیشان دا ئەوان لەپشت ژوورەکە رابکەن و بڕۆنە ناو جەنگەڵ.

یوری بەخەنجەر قامیشەکانی بڕیبوو ڕێگەکەی کردبوویەوە و خۆی مناڵەکەی کە هێشتا لەخەودا بوو گرتە باوەش و مووناکیش بەڕێکەوت. دوای ڕۆشتنی ئەوان من وەك مردو لەناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابووم. یوری وتبووی گۆرانی بخوێنم بەڵام لەوکاتە مەرگاویەدا چۆن دەمتوانی بخوێنم ! چی بخوێنم... چ ئاوازێك؟ ژیان چەند سەیر و پڕ گاڵتەیە....!! بەهەرحاڵ چارەیەك نەبوو و بەدەنگێکی لەرزان و ناڕەحەت دەستم بەخوێندن کرد. دەنگی من بێدەنگی شکاندو لەدەوروبەر دەنگی دایەوە.

چەند خولەك دواتری من بەخوێندنی ناچاری تێپەڕی یەك دوو جار چاوە درەوشاوەکانی پاسەوانە ڕەش پێست و وەحشیەکانم بینی کە لە دەلاقەی ژوورەکەوە

سەیری ناوەوە دەکەن.

نەمزانی چی بوو کە لەناکاو دەنگی هاوارێك بەگوێم گەشت. یەك لەوەحشیەکان لەپشت ژوورەکە لەو شوێنەی کە یوری و مووناك رایان کردبوو دەیقیژاند و قسەی دەکرد کەتێی نەدەگەشتم... هەر ئەوەم زانی ئەوان بەفێڵەکەی ئێمەیان زانیوە.

چەند خولەك دواتر رۆشنایی چەند مەشخەڵێك دەوروبەری رووناك کردەوە.

دواتر دەرگای ژوورەکە کرایەوە و تاقمێك کە لەپێش هەموویانەوە سەرۆکە ناحەزو ناشرینەکەی هۆز بوو هاتە ژوور.

سەرۆکی هۆز بەتوورەیی هەندێ شتی وت کە حاڵی نەبووم. دیار بوو لەمن پرسیار دەکات بەڵام چوونکە زمانی ئەوانم نەدەزانی بێدەنگ بووم. بێدەنگی من ئەوی زیاتر توورە کرد و دەستوریدا دەست و پێی من ببەستنەوە، چەند وەحشێکی چوارشانە خۆیان فرێدایە سەرم دەستیان لەدواوە بەستمەوە.

تەنافێکی رەشیان بەدەوری قاچەکانم بەست بەشێوەیەك توانای هەرجووڵیەکم لێ سەندرایەوە و وەك جەستەیەکی بێ گیان لە سوچێکی ژورەکەدا کەوتم. کاتێك درام بەزەویدا چەندین لەقەیان لەسەرو چاوم داو بەراکێشان منیان بردە ناو گۆرەپانی هۆز و دەنگی تەپڵەکان دەبیسترا و کاتێك گەشتینە نزیك هۆز، چەند کەسێك بەقامچی لێیاندام. ئەوان بە ئاهەنگی تەپڵەکان لەمنیان دەدا.

لەگیانی خۆم دەستم شۆرد و چاوەڕێی مەرگم دەکرد بەڵام لەم کاتەدا دووبارە سەروکەلەی یوری دەرکەوت ئەو لەکاتێکدا قەمەیەکی پانی لەدەستدابوو، رایدەکرد و هەلهەلەی لێدەدا. وەك وەحشیەکان هەڵس و کەوتی دەکرد تا بیانترسێنێت.

دەستخۆشیم لە بوێری و ئازایەتی ئەو کرد بەڵام دڵنیابووم پێش رزگارکردنی من دەکوژرێت.

بەڕاستی ئەم کردەوە شیاوی دەستخۆشی کردن بوو.

کەمتر ئەگەری هەیە پیاوێك ئەوەندە ئازابێت و تەنیا خۆی بخاتە ناو کۆمەڵێك وەحشی خوێنخۆر و درندە.

لەگەڵ چاوم بە یوری کەوت بەو شێوە سەیرە بەرەو لامان دێت دەتوت هەموو دەرگا داخراوەکانی دنیایان بەرومدا کردۆتەوە، شادمانیەکی بێ وێنە دڵ و رۆحی داگیرکردم.

خاڵێکی تر کەلەهەمان نیگای یەکەم بووە هۆی شادمانی من، نەبوونی مووناك لەگەڵ یوریدا بوو. هەر کەچاوم بەیوری کەوت تێگەشتم کە ئەو مووناك و کچەکەمانی بردۆتە

شوێنێکی ئارام و خۆی بەتەنیایی بۆ رزگارکردنی من هاتووە.

یوری سات بەسات نزیکتر دەبوو، وەحشیەکان دەنگی هەلهەلەی ئەویان بیست و لە بینینی ئەو سەریان سورمابوو.... چوونکە هیچ شێتێك ئەم کارە مەترسیدارەی ئەنجام نەدەدا مەگەر ئەوەی دەستی لەگیان شوردبێت و بۆ پێشوازی مەرگ هاتبێت.

چەند کەس لەوەحشیەکان جیابوونەوەو بەرەولای یوری رۆشتن. ئەوانیش رایان دەکرد لەئەنجامدا بەخێرایی لەیەك نزیك دەبوونەوە چوونکە هەم یوری رایدەکرد و هەم ئەوان.....

کاتێك ئەو چەند کەسە گەشتنە دەمەتری یوری، ئەو وەستا.... وەك ترومبیلێك کە ئستۆپی کردبێت و بووەستێت لەشوێنی خۆیدا چەقا و چاوەرێ بوو وەحشیەکان بگەن. رەشەکان بەگوومانی ئەوەی یوری بۆ شەڕ وەستاوە لەخێرایی خۆیان کەم کردەوە لەم کاتەدا یوری ئاوری دایەوەو دەستی کرد بەڕاکردن، ئەم جارە بەپێچەوانەوە رایدەکرد.

وەحشیەکان بۆ گرتن و کوشتنی ئەو رایان کرد ومن سەرم سوڕما یوری بۆ بەو ئازایەتیە هاتە پێش و بەو شێوە پێکەنیناویە رایکردو رۆشت. یانی چی.....؟

ئەوانیتر کەمنیان گرتبوو هێشتا لێیان دەدام. قامچیەکان دەڕۆشتنە سەرو دەهاتنە خوار. نووکی یەکێك لە قامچیەکان لە ژێر چاوم چەقی و برینێکی قووڵی تیا دروست کرد، خوێن بەربوو بەسەرو مل و کراسەکەمدا رژا.

شوێنەکانیتری جەستەم بریندار ببوو. چارەیەکم جگە لە بەرگەگرتنی ئەم ئازارە نەبوو. کاتێك یوری دەرکەوت و ئەوان بەدوایاندا رایاندەکرد، لەراکێشانی من دەستیان هەڵگرت و لەوێدا وەستان. منیان لەو حاڵەدا کە کەمێك لە گۆڕەپانەکەوە دوور بوو راگرت و درێژەیان بەلێدانم دا. ئەوانیتر بەدوای یوریدا رۆشتن تابیگرن. تازە یوری و ئەو تاقمە لەپشت دارەکان ون ببوون کە لەناکاو دەنگی تەقە بەرز بوویەوە و بەدوای ئەودا قیژە دڵتەزێنەکان بەگوێ گەشت.

کێیە تەقە دەکات....؟ یوری سیلاحی لەدەستدا نەبوو.. جوان بیرم کردەوە وبیرم هێنایەوە کە لەدوایین سات ئەوم بەقەمەیەك لەکاتی راکردندا بینی. کەواتە ئەمە کێیە تەقە دەکات؟ دووبارە دەنگی گوولەو قیژە بیسترا.

ئەم جارە ژمارەیەکیتر لەوەحشیەکان دەوری منیان چۆڵ کرد و بەرەولای دەنگەکە رۆشتن چەند خولەکێك بەهێواشی تێپەڕی. لەم خولەکانەی تێدەپەڕی هەندێ کات دەنگی گوولە دەبیسترا و هەندێ کات دەنگی هاوار و هەلهەلەی وەحشیەکان.

سەیرێکی دەوروبەری خۆم کرد و بینیم منیان بەدەست و پێی بەستراو لەناو ئەو دوو کەسەی تەپڵیان لێ دەدا رەهاکردوە و رۆشتوون.

تەپڵ لێدەران بەپێچەوانەی دانیشتوانی هۆز زۆر بەهێز نین و لەبەر لاوازی و لاغری ئێسقانەکانیان سینەو پەراسویان دەبینرا.

بە بینینی ئەمە بیری هەڵاتن لەمندا دروست بوو، لای خۆم بەراوردم کردو ئەنجامم گرت ئەگەر کەسانیتر نەیەن بەئاسانی دەتوانم ئەم دوانە بکوژم.

بەڵام کێشە لەوەبوو دەستی منیان بەستبوویەوە، بەدەستی بەستراو دەمتوانی چی بکەم....؟ لەم بیرەدا بووم لەناکاو لەبەرانبەرم، لەورێگای یوری و وەحشیەکان رۆشتبوون رەشپێستێکی خەڵتانی خوێن بینرا.

ئەو رایدەکرد، بەڵام لەچەند شوێنێکی جەستەیەوە خوێن دەرژا و بەبینینی زانیم گوولەی بەرکەوتوە. رەش پێست چەند هەنگاوێك رایدەکرد، یەك دوو چرکە دەوەستا و دووبارە دەستی بەراکردن دەکردەوە. ئەم بارودۆخە درێژەی بوو تا ئەوەی گەشتە بەرانبەرم، کە ئەو تەپڵ لێدەری لای من بینی وەستا ولەکاتێکدا دەنگی دەلەرزی لەگەڵ ئەو دووانە دەستی بە قسەکردن کرد.

ئەو بەخێرایی درێژەی بەراکردن داو لەوێ دوور کەوتەوە. ئەو دوانەش منیان بەجێ هێشت و رۆشتنە پشت تەپڵەکانیان و دەستیان بەلێدان کرد.

دەنگێکی سەیر لە تەپڵەکان بەرز بوویەوە.

دڵنیابووم لەوەی وەحشیەکان بەتەپڵ یەکتر ئاگادار دەکەنەوە و هەواڵەکان بەیەك دەگەیەنن بەڵام نەمدەزانی ئەم هەواڵانە چیەو چی دەڵێن.

هەروەها نەمزانی ئەوان پەیوەندی لەگەڵ هۆزەکانی تر دەگرن و یان بەتەپڵ پیاوەکانی خۆیان ئاگادار دەکەنەوە.

مووناك لەوێ نەبوو زمانی تەپڵەکانم بۆ وەرگێڕێت. لەبیری رزگاریدا بووم کە کتوپڕ لەلایەکیتر دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە و تاقمێکی تر لە وەحشیەکان چەکدار بەرم وتیروکەوان دەرکەوتن.

تەپڵ لێدەرەکان هێشتا تەپڵیان لێ دەدا و کە ئەو تاقمە گەشتنە ئەوێ یەکێك لە تەپڵ لێدەرەکان بە پەنجە شوێنی شەڕەکەی نیشانداو دووبارە سەرقاڵی کاری خۆی بوو. وەحشیە چەکدارەکان لەهەمان رێگاوە رۆشتن و من و بەنیگا رەوانەم کردن تا لەچاو ون بوون.

دەنگی تەپڵ رێگر بوو لەوەی دەنگەکانی تر بەجوانی ببیستم هەرچەندە تەپڵەکانیان لەنزیک گوێی من لێی دەدا بەڵام دەنگی رەشاش لەدوورەوە دەبیسترا.

هەموو هێزو توانای خۆم لە گوێچکەکانمدا کۆکردەوە تا ئەوەی زانیم یوری چالاکانە تەقە دەکات و وەحشیەکان دەکوژێت.

شادمان بووم بەڵام لەناکاو بیرێکم بەزەیندا گەشت کە بووە هۆی ترساندنی من. بیری تازەم ئەوەبوو ئەگەر وەحشیەکان بەتێك شکاوی بگەرێنەوە تیکە تیکەم دەکەن و تۆڵەی قورسم لێ دەکەنەوە. ئەم گوومانە منی بزواندو بەخۆمم وت: (( ئەوان من هەر دەکوژن کەواتە باشترە بۆ رزگاری خۆم هەوڵ بدەم تا لانی کەم ئەگەر لەم رێگادا کوژرام لای خۆم شەرمەزار نەبم )).

تەپڵ لێدەرەکان لەنزیك من سەرقاڵی کاری خۆیان بوون و گوێیان بەمن نەدەدا. زەوی لەگیا بەرزەکان داپۆشرابوو ئەگەر چەند هەنگاو لەوێ خۆم دوورخستایەتەوە، دەمتوانی لەپشت گیاکان خۆم وەشارم.

ئارام ئارام دەستم پێکرد و چەند مەتر رۆشتمە پێش. دەنگی تەپڵەکان رێگر بوو لەوەی وەحشیەکان دەنگی وردبوونی گیاکانی ژێر جەستەم ببیستن و من لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و خۆم گەیاندە پشت گیاکان.

ئەو چەند مەترە بەئەندازەی سەد کیلۆمەتر هیلاکی کردم. هەموو گیانم لەئارەقدا خوسا وکراسەکەم بەپشتمەوە نووسابوو. کەمێك وەستام تا هیلاکی ئەژنۆکانم برەوێتەوە.

لەم ناوەدا چاوم بە شتێکی بریقەدار کەوت کە لەناو گیاکانەوە بەدژواری دەبینرا. نەسیمێکی فێنك هەڵیکردو گیاکانی بەچەپ و راستدا دەچەماندەوە. بەهۆی جووڵەی گیاکان هەندێ کات ئەو شتە درەوشاوەتر دەردەکەوت و هەندێ کات لەچاو ون دەبوو.

دەتوت کەسێك لەناخمدا قسەدەکات و دەڵێت:

برۆ پێش مەترسە.... برۆ پێش....

بەخزان رۆشتمە پێش تا ئەوەی خۆم گەیاندە ئەوێ. بەسەر گیاکانم لابرد و لەوپەری شادمانیدا بینیم قەمەیەکی پان لەو قەمەی یوری لەدەستیدا بوو لەوێدا کەوتووە.

ناتوانم باسی خۆشحاڵی خۆم لەوێدا بکەم، دەست و پێی خۆم ون کردو نەمدەزانی چی بکەم. خولەکێك دواتر بەپشتا تلام و دەسکی قەمەم بە دەستە بەستراوەکانی خۆم گرت. دواتر بەری دوقاچم لە پشتمەوە هێنایە سەر و قەمەکەم خستە نێوان دوو پاژنەی

قاچم. کاتێك ئەم کارە بە دژواری زۆر ئەنجامدرا، دەستی خۆم بردە پێش و ئارام ئارام تەنافەکەم لەلێواری قەمەکەدا.

قەمەکە چوونکە بەتوندی نەگیرابوو دەڕۆشتە دواوە و نەیدەتوانی بەباشی تەنافەکە ببڕێت. چەند جارێك ئەم کارەم دووبارە کردەوە تاسەرئەنجام بەشێك لەتەنافەکە پچڕا، دواتر بەتەکانێك ئەوەی کەشم پچڕاند. و دەستەکانی خۆم ئازاد کرد. ئەم رووداوە وەك موعجیزە ئەنجامی گرت کاتێك دەستمکانم کرایەوە و بەخۆمم وت هەم دەستەکانم کراوەتەوە و هەم قەمەیەکم دەست کەوتووە کە لەئەگەری پێویست دەتوانم بەرگری پێبکەم. دیاربوو هێشتا رۆژی مردنم نەگەشتووە....

بەهێواشی سەرم بەرز کردەوە و بینیم تازە بەتازە یەکێك لەتەپڵ لێدەرەکان لە شوێنەکەی هەستاوەو بەدوای مندا دەگەرێت. چەند هەنگاو بەم لاو بەولادا رۆشت کاتێك منی نەدۆزیەوە قیژاندی و ئەویتریشی ئاگادار کردەوە.

ئەوان دەستیان بەگەڕان کردو ویستیان دووبارە دەستگیرم بکەنەوە. ئێستا کاتی راکردن بوو بەلاّم نەمدەزانی لەکام رێگاوە دەبێت بڕۆم کە رووبەڕوی وەحشیەکان نەبمەوە.

ئاشکرابوو نەمدەتوانی رووبەڕوی تەپڵ لێدەرەکان بڕۆم و دەبووا رێگەی ناو گژوگیاکان هەڵبژێرم. بێ ئەوەی هەستم خۆم کێشایە دواوەو بەکۆمەکۆم لەناو گژوگیاکانەوە رۆشتم بەلاّم خێراییەکەم کەم بوو و ئەو دوو رەش پێستە کە شوێنی ئەژنۆکانی منیان لەسەر زەوی دۆزیبوویەوە بەخێرایی بەرەو لای من دەهاتن.

خولەکێك وەستام.... بڕیارمدا چەند خولەکێك لەوێدا خۆ بشارمەوە بەلاّم بەداخەوە گیاکان ئەوەندە بەرز نەبوون من لەچاو بشارێتەوە.

کەواتە دەبێت رابکەم... راکردنیش بەو شێوە ئەگەری نەبوو، ناچار لە شوێنەکەم هەستام و دەستم بەڕاکردن کرد.

ئەو چەند کەسە منیان بینی و بەدوامدا هاتن.

پێشتریش نوسیومە وەحشیەکان بەبالآی بەرزو بەری پێی پان و ئەستووری خۆیان باش رادەکەن... لەگەڵ ئەوەشدا توانای جەستەیی باشیان هەیە و درەنگ هیلاك دەبن. ئەم زانیاریانەم لەسەر راکردنی وەحشیەکان هەبوو. بۆیە باش دەمزانی تا چەند خولەکێکی تر پێم دەگەن و دەستگیرم دەکەن.

رێگەی خۆم بەرەو جەنگەڵ خوارکرد بەوهیوایەی لەناودارەکان لەچاویان ون ببم...

تازە گەشتبوومە ناو جەنگەڵ و بەخێرایی رام دەکرد کە دەنگی پێم لەپشت سەری خۆم بیست کە ئاوڕم دایەوە یەك لەوەحشیەکانم بینی خەنجەر بەدەست تا دووهەنگاوی من هاتووەو ئەوەندەی نەماوە خەنجەرەکە لەدواوە لەپشتم بچەقێنێت.

کتوپڕ هەنگاوێك بەرەولای چەپ رۆشتم و وەستام. وەحشی کە خێرایی زۆری بوو چەند هەنگاوێك دوورکەوتەوەو دواتر گەڕایەوە و بەرەو لای من هات.

وەستانی من و پەلاماری ئەو چەند چرکەیەکیان بەین بوو، ئەو وەك شێرێکی درندە پەلاماری دام بەڵام نەمزانی چی بوو دەستم بەخێرایی رۆشتە سەرو هاتەخوار. ناتوانم ئەوە بڵێم چاو نەترسی و لێهاتووی من هۆکاری ئەم کارەبوو، دەتوت کەسێك دەستی بەرز کردومەتەوە و قەمەکەی کێشای بە ناچاوی رەشەکەدا.

رەش پێستی بەخت رەش قیژاندی و بەسەری قلشاوەوە کەوت. وەك گا خوێن لە جەستەی دەرژا. بێ درەنگ لەوێ دوورکەوتمەوە چوونکە دڵنیابووم ئەوانیتر دێن و تیکە تیکەم دەکەن.

نزیك دە خولەك بێ ئەوەی مەبەستێکم هەبێت لەناو دارەکان رامدەکرد و چوونکە کەسم بەدوای خۆمەوە نەبینی زانیم وەحشیەکان ونیان کردووم.

ئەوسات وەستام دوای ئەوەی دەنگی رەشاش لەدوورەوە دەبیسترا، زانیم لەکوێوە دێت و بەرەو لای بەڕێکەوتم...

لە شوێنێکی چڕ لە جەنگەڵ کە دارەکان لەیەك ئاڵابوون و نووری هەتاو کەمتر دەگەشتە زەوی، شەڕێکی قورس لەنێوان یوری و مووناك و وەحشیەکان بەردەوام بوو.

یوری و مووناك گەمارۆ درابوون بەڵام وەحشیەکان نەیاندەوێرا لێیان نزیك ببنەوە چوونکە زۆریان لێ کوژرابوو، دەترسان.

مووناك مناڵەکەی لەسەر لقی دارێك دانیشاندبوو و وەك پیاوانی سیلاح بەدەست شەڕی دەکرد.

کاتێك منی لای خۆی بینی نزیك بوو لەشادمانیدا گیانی دەرچێت. قیژاندی و یوری کە چەند مەتر ئەولاتر بەدەوری خۆی دەسورا و ئاگاداری دەوروبەری بوو، لەهاتنی منی ئاگادار کردەوە. کاتێك پەیوەست بووم کارێکیتر نەمابوو، سیلاحەکەم لەمووناك وەرگرت و ئەو مناڵەکەی لەئامێز گرت و بەڕێکەوتین.

وەحشیەکانیش بەدواماندا دەهاتن بەڵام نەیاندەوێرا پەلامارمان بدەن چوونکە لەسیلاحەکانی ئێمە ترسابوون.

نزیك ئێواری گەشتینە گۆلاوێك.

یوری وتی: ئەمە دوایین ئەستێری سەرەریگایەو لەمە بەدوا رێگا ئاسان دەبێت.

ئەو راستی دەوت بەڵام ئەو ئەستێرە. بە مەترسیدارترین شوێنی دنیا دەژمێردرێت چونك پرە لە تیمساحە درندە و خوێنخۆرەکان. لەلایەك وەحشیەکان و لەلایەکیتر تیمساحە خوێنخۆرەکان ئەویش لەو تاریکی شەوە.

بۆ دۆزینەوەی رێگا چەند هەنگاوێك لێیان دوورکەتمەوە. لەنزیك ئەستێر لەناکاو هەستم بە شتێکی ئەستوور لەژێر پێم کرد و تا هاتم خۆم بکێشمە دواوە شتێك وەك قامچی بەرکەمەرم کەوت و بەر زەوی کەوتم.

ئەم ئاژەڵە لەرووناکیەکەی ئێواری دیمەنێکی مەترسیداری بوو.

تیمساح لە ئەستێرەکاندا دەژین و تامەزرۆی کوشتنی مرۆڤە، هەر ئەوەندەی هەستیان بە بۆنی ئێمە کرد پەلاماریان داین.

بیستبووم و پێشتر لە کتێبە زانیستیەکانی سروست دا خوێندبووم کە مەترسیدارترین تمساحەکان لە رووباری نیلی ولاتی میسر و هەندێ شوێنی تر وەك باکووری ئەفریقا دەژین بەڵام ئەو رۆژە بەچاوی خۆم بینیم مەترسیدارترین تمساحەکانی جیهان لە دەوروبەری ئامازۆندان. نازانم دەتوانن بارودۆخی من لەو کاتەدا هەست پیێ بکەن یان نە؟

ناکاو گیرببووم لە بارودۆخێکدا کە هەرسات تیایدا چاوریێی پەلاماری وەحشیەکانم دەکرد و ئەو درندە تۆڵەستێنەرانە بەدوای دەرفەتێکی گونجاودا دەگەران، خۆم لەگەمارۆی چەند تمساحێکدا بینیەوە.

دەتوت زۆر دەمێکە گۆشتی مرۆڤیان نەخواردوە و تامەکەیان نەچێشتووە چوونکە زۆریان حەز لەخواردنی من بوو.

یەکەم تمساح کەنەزانراوانە قاچم لەسەر پشت یان کلکی دانابوو، بە کلکی خۆی بەتوندی لێی دام و کەوتم. دواتر بەخزان خۆی گەیاندە من و دەمە ترس ئەنگێزەکەی کردەوە.

چاوەکانی بەحاڵەتێکی تایبەت لەمنیان دەڕوانی، کاتێك دەمی کرایەوە و دیانە تیژو نارێکەکانی کە دەوری دەمیان گرتبوو، دەرکەوت ترسی من سەد بەرانبەر زیادی کرد.

لەناو دەمی ئەو ئاژەڵە هەڵم وبۆنێکی ناخۆش دەهاتە دەر و بەلووت دەگەشت و دەتوت لەناو سکی گۆشتی ئاژەڵەکانیتر بۆگەنیان کردوە و بۆگەنەکەی لەڕێگەی

دەمیەوە دەداتەدەر، کاتێك دەمی خۆی کردەوە بە لووتی منیش گەشت.

لەم کاتەدە تمساحێکی تریش هات و لەدوورەوە چەندین تمساحی تر دەبینران کە بەخێرایی بەرەولای من دێن.

ئەم جارە ئەنیشکم لە زەوی گیرکردو لەقەیەکی توندم لەپۆزی تمساحەکە دا، بەخێرایی لەم کارەی خۆم پەشیمان بوومەوە.خۆشبەختانە ئەو خوێنخۆرە بەهۆی لەقەکەی من کەمێك درەنگی کردو تا ئەندازەیەك دوورکەوتمەوە بەڵام هەستم بەمەترسیداربوونی کارەکەی خۆم کرد.

ئەگەر لەوکاتەدا تیمساح پەلاماری دەدام، قاچم دەڕۆشتە ناودەمی و لەجیاتی ئەوەی بەر دەمی بکەوێت لەسەروی قوولاپەمەوە دەقرتا.

ئەو دەمەو دیانانەی من بینیم توانای ئەوەیان بوو بەیەك زەربە ئێسقانەکانی کەمەری مرۆڤ وردبکەن چ بگات بەقولاپەی پێ کە ئێسقانی نەرم و ناسکتری هەیە.

کاتێ تمساحی دووەم و سێیەم هاتن بارودۆخم زۆر مەترسیدار بوو. دووبارە رۆشتمە دواوە بەڵام ئەم جارە قاچم کەوتە شوێنێکی نەرم و تاهاتم هاوسەنگی خۆم بپارێزم، کەوتمە ناو ئاو. بۆ ئەوەی سیلاحەکەم تەڕنەبێت بەدەستمەوە گرت و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زیاتر بڕۆمە ناو ئاوەکە.

تمساح لەناو ئاودا باشترد پەلاماری نێچیرەکەی دەدات و تیکە تیکەی دەکات.

شێوەی کاری ئەو ئاژەڵە بەم شێوەیە لەناکاو دەرواتە ژێر ئاو و لەوێ قاچ یان کەمەری نێچیرەکەی دەگرێت و دواتر بەدەوری خۆی لە کەلەکەوە دەسورێت.

بێننە بەرچاوی خۆتان کاتێك کەمەری مرۆڤ کەوتبێتە نێوان دوو شەویلگەی بەهێزی تمساح و تمساح لەلاوە چەند جارێك بەدەوری خۆیدا بیسوڕێنێ، چی دەبێت.

نێچیریش بەسەرەوە دەکەوێتە ناو ئاوەکە و ئەگەر خۆڕاگری بکات ئێسقانەکانی ورگ وسکی هەڵدەدڕێت و جەستەی تیکە تیکە دەکات. ئەم بابەتەم دەزانی بۆیە ترسێکی زیاتر بەسەرما زاڵ بوو. ئەم ترسە کاتێك گەشتە تروپك کە بینیم تمساح هاتۆتە ناو ئاو بەرەو لای من دێت. ژمارەی تمساحەکات لە دە یان بیست زیاتر بوو. رەنگە لەوێ دوو سەد یان سێ سەد و رەنگە زیاتریش تمساح دەژیان و ئەوانیتر هێشتا ئاگادار نەبوون. بەهەرحاڵ یەك لەوان بەس بوو بۆ ئەوەی من لەناوبەرێت.

یەك لە تمساحەکان لەکاتێکدا دەمی خۆی کردبوویەوە بەخێرایی بەرەولای من دەهات و من کەخۆم لەبەردەم مەترسیەکی گەورەدابینی، ویستم بەرگری لەخۆم بکەم و

بەتفەنگ تەقەم لەناو دەمی تمساحەکە کرد. گووله بەر قورگی تمساح کەوت. سوڕاو ڕۆشتە ژێر ئاو... تمساحەکانیتر دەتوت هیچ ڕوینەداوە بەرەولای من هاتن.

یەك دوو گوولەکی تریشم تەقاند، لەگەڵ ئەوەشدا دەستم لەگیان شۆرد و چاوەڕوانی مەرگم دەکرد کە لەناکاو شتێك کەوتە ناو ئاو.

خێرا ئاوڕم دایەوە تالێی بڕوانم بەڵام دەنگی یوریم بیست کە دەیوت:

بیگرە...... سەری ئەم دارە بگرە....

بۆ لای دەنگەکە ئاوڕم دایەوەو یوری و مووناکم بینی لای ئەستێرەکە وەستاون و سەری دارێکی درێژیان لەدەستدایە..... مووناکیش تەڕ ببوو. دیار بوو ئەویش کەوتۆتە ناو ئەستێر و ڕزگاری بووە.

مووناك دەیوت: خێراکە بیگرە.

نازانم چی بوو بەچ خێراییەك سەیری دارەکەم کرد کە تمساحەکان دەرفەتی گرتنی منیان نەبوو. کاتێك سەری دارەکە کەوتە دەستم و ئەوان دەستیان بەراکێشان کرد باشترین دەرفەت بۆ تمساحەکان هاتبووە پێش چوونکە ئێستا نەمدەتوانی تەقە بکەم و ئەوان لە دواوە بەباشی قاچی منیان دەگرت. بەخۆشحاڵیەوە زیانم بەرنەکەوت و لەم بەڵایەش بەسەلامەتی گیانم دەرباز کرد. کاتێك لەئاو هاتمەدەر هەستم کرد بەشێك لەجەستەم بەتووندی دەسوتێتەوە... دەتوت بەچەقۆ پێستەکەیان هەڵدڕیوە و خوێیان کردۆتە ناوی. سووتانێکی وادروست ببوو بێ ئیرادە دەمناڵاند و نەمدەتوانی ڕێگری لە ناڵاندی خۆم بگرم.

سات بەسات ئازارەکەی زیاتر دەبوو. مووناك بەگوومانی ئەوەی تمساحەکان زیانیان پێ گەیاندووم سەری خستە سەر سینەم و منی ئارام دەکرد بەڵام چوونکە هۆکاری ناڵاندنی خۆمم پێوت سەری ڕەهاکردو دەرلینگی شەڕواڵەکەی بەرزکردەوە.

کاتێك سەیری کرد هەناسەیەکی کورتی هەڵکێشاو وتی:

ئاخ......... سەیرکە، سووتاندنی جەستەت بێ هۆ نیە..... سەیرکە.

بەدەنگی ئەو یوریش هاتە پێش و خۆی بەئێمە گەیاند، منیش سەرم خوارکردەوەو سەیری قاچی خۆمم کرد و سەیرترین دیمەنەکانم بینی.

ژمارەیەکی زۆری خوێنمژەی ناحەز و ڕەش بەقاچمەوە لکابوون و خوێنی ناو دەمارەکانمیان دەمژی. هەندێکیان ئەوەندەیان خوێن خواردبوو ئاوسابوون و توانای جووڵەیان نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا مووناك دەستی کرد بەلێکردنەوەیان لەقاچم. لە

گۆشتەکە نەدەبوونەوە و نەیاندەویست لە خوێنی من چاو بپۆشن بەرادەیەك بەتووندی بەقاچمەوە نووسابوون کە مووناك ناچار ئەوانی دەکوشت و فرێیدەدان. هەردوو قاچم کون کون ببوو. تاماویەك لەکوونەکان و شوێن دەمی خوێنمژەکان خوێن دەهاتەدەر. دوای ئەم کارە یوری بەمن و مووناکی وت خێراتر هەستین و درێژە بە رێ پێوانەکەمان بدەین. ئەگەری ئەوەبوو وەحشیەکان هێرش بکەن و بۆیە مانەوە لەو شوێنەدا عاقڵانە نەدەهاتە بەرچاو. مووناك مناڵەکەی کە لەناو گیاکاندا خەواندبووی، لەباوەش گرت و بەرێکەوتین. بەدژواری بەرێگادا دەڕۆشتم.

دوورەیەك ئەولاتر دارە میوەدارەکانی جەنگەڵ دەرکەوت.... ئەم دارانە زیاتر مۆز بوون و مۆزیش بەهێزترینی میوەکانە و چوونکە دەستمان بەخواردنی تر نەدەگەشت بەخواردنێکی گەورە دەژمێردرا وەك خواردنە بەهەشتیەکان.

مۆزێکی زۆرمان خوارد و بڕێکی زۆرمان لەگەڵ خۆماندا برد کە ئەگەر لە رۆژەکانی داهاتوو دەستمان بەخواردن نەگەشتایە، لەبرسانا ئەمرین.

مووناك سەیری دەوروبەری کردو هەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش، شادمان دەهاتە بەرچاو. ئەو رۆژە بێ هیچ رووداوێك تێپەڕی. شەو لەسەر دار دەخەوتین. دار لقی زۆری بوو. هەرکام لە ئێمە لە سەرلقێك بە دانیشتنانەوە خەوتین و شەومان کردە بەیانی.

بەیانی زوو پێش ئەوەی لەدارەکە بێینە خوار، زانیمان ئەو شوێنە لە جەنگەڵ ئاژەڵی مەترسیداری زۆری هەیە.

ئەم جۆرە ئاژەڵانە مووناك نەیبینیبوو و نەیدەناسی بەڵام من و یوری جوانمان دەناسی. یوری روداوخواز پێشتر بەچاوی خۆی بینیبووی و منیش لە کتێبەکاندا خوێندبووم.

یەکەم ئاژەڵ کە لەژێردارەکە بەدوای نێچیردا دەگەرا و بەدوای بۆنی مرۆڤ بەم لاولادا دەڕۆشت پشیلەی وەحشی بوو. پشیلەی وەحشی رەنگێکی زەردی جوانی هەیە. تووکەکەی ئەوەندە بریقەدار و جوان بوو دەتوت رۆنیان لەجەستەی داوە. لەسەر یەك ئاژەڵێکی جوان بوو ئەگەر ترسی نەبووایە حەزم دەکرد بیگرم و رایبگرم.

پشیلەی وەحشی لە نەژادی شێرو پڵنگە و مەترسی پەلاماردانی بۆ مرۆڤ لە شێرو پڵنگ زیاترە. یوری کە لەسەر دارەکە سەیری پشیلەکەی دەکرد هەواڵێکی سەرنج راکێشی پێداین و وتی:

دەزانن پشیلەی وەحشی نیشانەی چیە....؟

بە حەزەوە پرسیم:

نیشانەی چیە...؟ هەست دەکەم بابەتێکی گرنگمان پێ بڵێیت؟

بەڵێ بابەتێکی گرنگە چوونکە لەیەك دوو ڕۆژی داهاتوودا دەگەینە قەراغەکانی جەنگەڵ و کێشەکان بەجێ دێڵین.

چاوەکانم دەبریسکایەوەو وام دەزانی لانی کەم یەك دوو مانگی تر لەجەنگەڵدا دەبین. باوەڕ پێنەکراو بوو جەنگەڵمان بەو گەورەییە لەماوەی هەفتەیەکدا بڕیبێت. یوری کە شادمانی منی بینی وتی:

ئەوەندەش شادمان مەبە.

ئەم جارەیان زیاتر سەرم سورما و پرسیم:

بۆ؟ مەگەرنە ئەوەی جەنگەڵ تەواو دەبێت؟ ئەگەر لەقسەکانتدا هەڵەت کردوە، ڕاستی جێگەی شادمانیە. هیوادار نەبووم بەمووناك و ئەم منداڵەوە بەزیندوویی لەجەنگەڵ بڕۆینە دەر ئێستا کە دەڵێیت لەبەیانی و دوو بەیانیدا جەنگەڵ تەواو دەبێت...... بۆ شادمان نەبم.

یوری بزەیەکی گرت و هیچی نەوت.

بزەکەی زیاتر بووە هۆی سەرسوڕمانم و نارەحەتیم. ئێوەش کە لەم داستانەدا لەگەڵ ئەخلاقی یوریدا ئاشنابوون لەگەڵ مندا هاوباوەڕن و دەزانن یوری بێ هۆ پێناکەنێت و قسەناکات و بەڵنیش نادات.

ئەی بۆ پێدەکەنی و لە درێژەدانی قسەکانی خۆی دەپاراست. بڕیارمدا پرسیاریکەم بەڵام چوونکە لەم کاتەدا پشیلەی وەحشی و دوو گورگی تێر لەژێر دارەکەدا بوون، یوری خۆی بەلقەکەوە هەڵواسی تابڕواتە خوار.

ناچار ئێمەش ڕۆشتینە خوار. لەخوارەوە درێژەم بە بابەتەکە دا. قۆڵی یوریم گرت و وتم: وازت لێ ناهێنم، پێم بڵێ بۆ پێدەکەنیت؟

یوری دووبارە پێکەنی و لەبەرانبەر پێداگرتنی من وتی: سەرۆك زۆر زوو شتەکانت بیر دەچێتەوە....؟ تەنیا چەند ساڵ لە جەنگەڵدا ژیاوین ئەم ماوە نابێت ئێوەی گۆڕیبێت.

پرسیم: مەبەستت چیە.....؟

مەبەستم ئەوەیە ئێوە کالوویی و سینگوالاتان لەبیرکردوە. گریمان ئەوەی لە چەند ڕۆژی داهاتوو لەجەنگەڵ دەڕۆینەدەر، تازە دەگەینە سنووری دەسەڵاتی کالوویی و

ڕووبەڕووی دەبینەوە و بەو دوژمنایەتیە کۆنەی لەنێوان ئێوەدا هەیە گوومان ناکەم بەئاسانی لێمان خۆش بێت. بەتایبەت ئەم جارە کە ژنێکی جوانی وەك مووناکمان لەگەڵدایە، چاو ناپۆشێت..... تێدەگەن..؟

تازە هەستم بەقسەکانی یوری دەکرد و بەهەمان ئەندازە کەرابردوو و داهاتوم بیر دەهێنایەوە، ترسێکی زۆرتر بەسەرما زاڵ دەبوو.

دەتوت سەتڵێك ئاوی گەرم وردە وردە دەکەنە ناو دەمارەکانم و بەهۆیەوە هەمووگیانم گەرم دەبێت و ناوچاوم ئارەق دەکاتەوە.

بیرم هێنایەوە کەجاری پێشوو بە چ بەدبەختیەك لەدەست کالوویی رزگارم بوو. ئەو پووڵەکانی منی لەقوماردا بردەوە و دواتر ویستی بمکوژێت، چاکەو خۆشەویستی زیاتر بووە هۆی ئازاردانم چوونکە بووە هۆی ئەو ڕووداوە پڕ ترس و سەیرانە.

دواتر قیافەی سینگوالام بیرهێنایەوە. سینگوالا بەور چاوە گەورەو ڕەش و قژە پرەکەی. بەراوردی مووناك و سینگوالاشم کرد. مرۆڤ لەبیرکردنەوەدا ئازادە و لەخەیاڵدا هەمووشتێك، هەموو شوێنێکی دنیا دەتوانێت هی ئێمە بێت. لەوکاتەدا ئەو دووانەم هەڵسەنگاند. هەردووکیان جوان بوون بەڵام مووناك جوانیەکی وەحشی و تایبەتی بوو کە سەرنجی پیاو بەتایبەت پیاوێکی ئەمریکایی زیاتر رادەکێشا.

لەم بیرانەدا بووم و دەگەڕامەوە بۆ دواوە دەتوت بیرەوەریەکانی رابردوو جارێکیتر زیندوو بوونەتەوە یەك لە دوای یەك دێنە بەرچاوم.

لەم کاتەدا یوری رشتەی بیرەکانمی پچراند و وتی:

زووتر بڕۆین.... کات بەفیڕۆ دەڕوات. لەقەراغی جەنگەڵ زۆرنزیك بووینەتەوە.

دووبارە پرسیم:

ئایا وەحشیەکان ئیتر دەستیان پێمان ناگات؟

یوری پێکەنی و شانەکانی بەرز کردەوە و وتی:

ئەوان بێکارنین کە ماڵ و ژیانی خۆیان بەجێ بێڵن و تائێرە بەدوامانندا بێن. وەحشیەکان تا ئەوشوێنەی بکرێت کەمتر لە قەراغی جەنگەڵ نزیك دەبنەوە بۆیە لێرە بەدواوە بەخەیاڵێکی ئاسوودە دەڕۆین.

مووناك مناڵەکەی لەباوەش گرتبوو. بەقامکم قژەکانی شانە دەکرد و قسەی لەگەڵ دەکرد.

مناڵ تازە دەیتوانی هەندێك ووشە بڵێت. مووناك هەوڵی دەدا کچەکەی پێش

هەرشتێك زمانی ئامازۆنی فێرببێت. دەتوت گوومان دەکات هەموو شوێنێکی دنیا لەگەڵ ئامازۆندا لە پەیوەندیدایە و ئەم زمانە کچەکەی لەهەموو شوێنێکی دنیادا دیارو کەم وێنە دەکات ئامازۆنیەکان و زمانەکەیان لە جەنگەڵدا کەم وێنەن. بەئەشرەفزادەو نەجیبزادەی وەحشیەکان دەژمێردرێن بۆیە مووناك هەوڵیدەدا ئەم ئیمتیازە بەفێرکردنی زمانی ئامازۆنی کچەکەی بگوازێتەوە و گرنگی رەچەڵەکی ئەو بپارێزێت.

کاتێك منداڵەکە یەك ووشەی وت مووناك منی بانگ کردو منداڵەکەی ناچار کرد دووبارە ئەو ووشە بڵێتەوە تا من ببیستم و تێبگەم کە کچەکەمان وردە وردە قسە دەکات.

یە یوریم وت: لێرە بەدواوە پێویستمان بە فیشەکی زۆر هەیە و ئەم پێویستیەمان تا کاتێك لەسنووری دەسەڵاتی کالوویی دەڕۆینەدەر بەردەوامە بۆیە دەبێت پێش هەرکارێکی تر حسێبی فیشەکەکانی خۆمان بکەین و چاوێك بەچەکەکانمان بخشێنین.

یوریش رەزامەندی نیشاندا. هەردوکمان روبەڕوی یەك دانیشتین و دەستمان بەپاك کردنەوەی چەکەکان و ژماردن ودابەش کردنی فیشەکەکان کرد.

رەشاشەکە تەنیا دوو نەوار فیشەکی بوو ناچار بڕیارماندا تا ئەو شوێنەی دەکرێت کەمتر بەکار بێنین. فیشکەی تفەنگەکە زیاتر بوو. یوری تفەنگەکەی هەڵگرت و وتی:

تفەنگەکە لای من بێت و تۆش لەدەمانچە کەڵك وەربگرە. هەڵبەت لەکاتی پێویست رەشاشەکە بەکار دەبەین..... هەرچەندە نابێت لەگەڵ کالوویی گاڵتە بکەین بەڵام نابێت سیلاحەکان لەخۆمان دوور بخەینەوە.

هێشتا یوری قسەکەی نەکردبوو هەستم بەنەمانی مووناك کرد. مووناك تا چەند خولەك پێشتر لەوێدابوو و منداڵەکەی لەباوەش گرتبوو پێدەکەنی و شادمان دەهاتە بەرچاو ئێستا لەکوێیە.......؟

چی لێهاتووە.......؟

بەخێرایی لەشوێنەکەم هەستام و بەنیگەرانیەکی هەست پێکراو بەناو بانگم کرد و چەند جارێك وتم: مووناك....... مووناك............ لەکوێیت؟

وەڵام نەبیسترا. یوریش هەستاو کاتێك نیگەرانی منی بینی وتی:

لەم دەوروبەرەدایە..... بۆهیچ شوێنێك نەڕۆشتووە، چری دارەکان لەمپەرە لەرێگەی گەشتنی دەنگ..... تۆ لێرەدابە..... ئێستا دەڕۆم دەیدۆزمەوە.

یوری ئەمەی وت و بەرەو رۆژهەڵات رۆشت. ئەوێ هەر ئەورێگایە بوو لێوەی

ڕۆشتبووینە ناو شوێنە کەم دارەکە.

یوری ڕۆشت. دەنگی ئەوم بەجوانی دەبیست کە مووناك بەناو بانگ دەکات. بە بیستنی ئەم دەنگە ناڕەحەتیم زیاتر و بەخۆم وت:

ئەگەر چڕی دارەکان ڕێگرە لەوەی دەنگی من بەوبگات ئەی بۆ کاتێك یوری قسە دەکات من بەجوانی دەیبیستم.... یانی چی....؟ بەدڵنیاییەوە مووناك بەڵایەکی بەسەردا هاتووە. بەهیچ جۆرێك لەبیری وەحشیەکاندا نەبووم. تەنیا شتێك کەلەوێ منی ناڕەحەت و نیگەران دەکرد ئەوەبوو وەحشیەکان بۆ گرتن و کوشتنی ئێمە بێنە ئەوێ.

بەجۆرێك کەیوری دەیوت لەقامیشەلان و ئەستێر بەم لاوە ئێمە بەتەواوی لە ئەماندا بووین و لەدەست وەحشیەکان دوورکەوتبووینەوە، کەواتە جێگەی نیگەرانی نەبوو.

ئەی مووناك چی لێهاتووە.....؟

گوومانم دەکرد ڕەنگە مار پێوەی داوە ! جەنگەڵی ئامازۆن زیاتر لە هەر ئاژەڵێکی مەترسیداری تر ماری هەیە. مارەکانی جەنگەڵی باران لەهەموو شوێنێکی دنیادا بەناوبانگن و بە مەترسیدارترین مارەکان دەژمێردرێن.

هەندێ کات مار نیو مەتری درێژی هەیە بەڵام ماری واش دەست دەکەوێت دەمەتر درێژی هەبێت و پانی سکی حەفتا سانتیمەتر بێت.

ئەگەر یەکێك لەم مارانە کەوتبێتە سەر ڕێگای مووناك، کاری تەواوە و ئەو منداڵەکەی بە گەستنە ژاراوییەکەی خۆی ڕەش کردوە و فڕێیداوەتە سوچێك. لەم کاتەدا دووبارە دەنگی یوریم بیست. ئەم جارەیان دەنگی لاوازبوو وا دەهاتە بەرچاو کەزیاتر دوورکەوتبێتەوە. دوو سێ جاری تر دەنگی یوری بەگوێ گەشت بەڵام دەنگی ئەویش پچڕاو ئیتر هیچ دەنگێك نەبیسترا. بێدەنگیەکی سەیرو و نیگەران کەر لەو شوێنەدا بوو بەفەرمانڕەوا.

لە ئارەقدا خووسابووم، لە هەموو شوێنێکی جەنگەڵ دەترسام. دەتوت قاچمیان بەزەویدا داکوتاوە هەر جۆرە توانایەکم لێ سەندراوەتەوە.

نەمدەزانی دەبێت چی بکەم... کەمێك سەیری دەورروبەرم کرد. لق و گەڵای دارکان دەجووڵانەوە دەنگی ئەوان دەیترساندم.

گوومانم دەکرد هەموو شوێنێکی جەنگەڵ ترس ئەنگێزە. و توانای ڕۆشتن و جووڵەم نیە. بەڵام چارە نەبوو دەبووایە بەدوایاندا بگەڕێم. ئازایەتی و چاونەترسیم بەخۆم تەڵقین کرد و وتم:

چ پیاوێك ترسنۆکیت..... چی دەبێت؟ برۆ.... برۆ یوری مووناك بدۆزەرەوە. ڕەنگە مەترسیەك هەڕەشەیان لێ بکات.

بەم گوومانە دەستم بردە پێش و سیلاحەکەم لە لقی دارەکەوە کردەوەو بەڕێکەوتم. ڕێگا دیار بوو چوونکە دەبووا لەو ڕێگای یوری ڕۆشتبوو، منیش بڕۆم، بەڵام ئەژنۆکانم دەلەرزین و دڵۆپە گەورەکانی ئارەق لەسەر ناوچاوم دەرکەوتبوو.

لەوکاتەدا تەقەکردن ئەگەری نەبوو چوونکە کاتێك دەستی مرۆڤ دەلەرزێت هیچ تیرێك نیشانەکە ناپێکێت.

هێشتا لە شوێنەکەم دەرنەچبووین که لەناکاو لە شوێنەکەی خۆم وەستام. دەزانن چی بوو دەنگی گوولە بێدەنگی شکاند. گوولەیەك تەقێنرا و لە دەوروبەردا دەنگی دایەوە بەڵام دووبارە بێدەنگی بوو بەفەرمان ڕەوا.

تێگەشتم تەقەی گوولە بۆئەوەیە من ئاگادار ببمەوە. یوری بۆ ئەوەی منی ئاگادار کردبێتەوە ئەم تەقەی کردوە و گەرنە هۆیەکی تر نیە.

شادمان بووم خێرا سیلاحەکەم بەرەو ئاسمان گرتوو تەقەم کرد. بەم شێوەیە دەمویست یوری حاڵی بکەم کە دەنگی گوولەکەیم بیستوە و بەڕێکەوتووم. بێ ئاگا لەوەی دەنگی گوولە بووە هۆی بەدبەختی من.

بەخیاڵێکی ئاسوودە بەڕێکەوتم چوونکە ئەم گوومانەم لادروست بوو کە ئەگەر مەترسیەکی گەورە هەڕەشەی لە مووناك و یوری دەکرد، دەرفەتی تەقەکردنیان دەست نەدەکەوت. کەواتە بابەتەکە ئەوەندە گرنگ نیە. بەدوای ئەم گوومانە دەستم بەراکردن کرد. ڕیگاکەش دیاریکراو بوو. دوای ئەوەی لەو شوێنە کەمدارە ڕۆشتمەدەر لەورێگاوەی هاتبووین کە بەهۆی ڕێکردنی ئێمە گیاکان خەوتبوون و لقەکان شکابوون، ڕۆشتمە پێش. نزیك پێنج سەد هەنگاو لەوێ دوورکەوتبوومەوە کە لەناکاو لەپشت سەرمەوە دەنگێکم بیست. ئەم دەنگە جۆرێکی سەیر بوو، ناتوانم باسی بکەم کە ئێوە جوان تێبگەن.

هیچ کات لە شەوێکی تاریك و ئەنگوستە چاو لەباخێکی گەورەو چۆڵدا بەرێگادا ڕۆشتوون کاتێك مرۆڤ دەڕواتە پێش هەست دەکات کەسێك بەدواوەیەتی و کە دەگەڕێتەوە کەس نابینێت.

دەنگێکە نەلەدەنگی پێ و نەلەدەنگی قسەکردن و نەلەدەنگی هیچ شتێکی تر دەچێت بەڵام هەرچی هەیە مرۆڤ تێدەگەیەنێت کە کەسێك بەدواوەیەتی.

بەخێرایی ئاورم دایەوەو سەیری دواوەم کرد بەڵام کەسێك یان شتێك نەبینرا دووبارە درێژەم بە رێگەدا بەڵام ئەم جارە هەم ئاگام لە بەر پێی خۆم بوو و هەم گوێم لەدەنگەکانی تر گرتبوو. چەند هەنگاوێك ئەولاتر ئەو دەنگە بیسترایەوە ! ئەم جارەیان بەشێوەیەك بوو کە کەسێك لەسەر لقەکان پەڕییە سەر گیا وشکەکانی سەر زەوی و ئەوەندە نزیك بوو تەنانەت دەنگی هەناسەشیم بیست.

جێگەی گوومان نەبوو، میلم هێنایەوەو گەڕامەوە، بەڵام هیچ شتێك نەدەبینرا. دووبارە بێدەنگی قوورسایی خستە سەر هەموو شوێنێك و تەنانەت بایش نەبوو کە گەڵای دارەکان تەکان بدات. ئەم ئەندێشەم لادروست بوو کە رەنگە رادەی ترس و خەیاڵی و گوومانی لادروست کردووم لەراستیدا کەس بەدوامەوە نیە.

دووبارە سەیری دەوروبەرم کرد. بێ ئەوەی لەشوێنەکەی خۆم بجووڵێم، ناو لق و پشت دارکانم لە چاو گوزەراندو وردبوومەوە تا جوان سەیری هەموو شوێنێك بکەم.

چوونکە هەموو شوێنێکم بە ئارام و بێدەنگ بینی، تاڕادەیەك خەیاڵم ئاسوودە بوو بڕیارمدا درێژە بەڕۆشتن و گەڕان بەدوای یوری و مووناك بدەم.

لەسەر ئەم بڕیارە گەڕامەوە. بەڵام هێشتا دووهەنگاو نەڕۆشتبووم لەناکاو شتێکی قوورس وەك کێوێکی مەزن بەر سەرم کەوت و دنیای لەبەرچاومدا تاریك کرد.

هەوڵمدا هاوسەنگی خۆم بپارێزم بەڵام لەوکاتەی سەرم گێژی دەخوارد و دنیا لەبەرچاو لێڵ بوو هەستم کرد، تاقمێك لە دارەکان دەپەڕنە خوار و هەلهەلە لێ دەدەن.

لەهەمان کاتیشدا هەوڵم دەدا چەکەکەم لەدەست نەدەم. ئەگەر کاتێك بمتوانیایە گیانی خۆم رزگار بکەم بەیارمەتی ئەو سیلاحە بوو. کەواتە ئەگەر سیلاحەکەم لەدەست دەدا هەموو شتێك تەواو دەبوو. کەسێك خۆی خستە سەر من و یەکێتر ملی گرتم و بایدا. یەکێتر بەمشت کێشای بەسکمدا و یەکێتر قاچی راکێشام ودواتر نەمزانی چی بوو.

جەنگەڵ وەك شەوی رەش بەخێرایی بەدەوری سەرمدا دەسووڕا. بەو حاڵە کەم کەم چاوەکانم هاتە یەك و لەگەڵ هەموو خۆڕاگریەك کە لەبەرانبەر بێهۆشیدا دەمکرد نەمتوانی خۆم رابگرم و لە ئەنجامدا بێهۆش بووم.

دیار نەبوو چی بووە و چیم بەسەر هاتووە و لەیوری و مووناکیش کەمترین هەواڵێکم نەبوو. کێشە لەوەدابوو ئەگەر منیان بکوشتایە ئەوان تاماوەیەك سەرگەردان دەبوون.

مووناك داماو دەبوو چوونکە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ هۆز و نەیدەتوانی لەگەڵ

یوریدا بژی، نەمزانی چەند كاتژمێر یان چەند رۆژ تێپەڕی. وردە وردە هاتمە هۆش...

یەكەم شت كەهەستم پێكرد، تینوویەتی بوو.

لێوەكانم وشك ببوو... قوڕگم دەسووتا و دەتوت لەناو سنگما زۆپایەكی پر ئاگریان داناوە....

نەمدەزانی لەكوێم. پێڵوەكانم كردەوە و بۆ هەستان تەكانێكم بەخۆم دا. بەڵام زانیم دەستەكانم لەدواوە بەستراونەتەوە و تەنیا بەری پێم لەسەر زەویدایە.

چەند خولەك لەم حاڵەدا مامەوە، زەختم لەخۆم كرد تا رابردو بیربێنمەوە.

كەمێكی تر چاوەكانم كردەوە و كاتێك بەدژواری سەرم بەرزكردەوە مووناك ویوریم لای خۆم بینی.

ئەوانیان وەك من بەدارەوە بەستبوو. یوری كەزانی هاتوومەتە هۆش وتی:

ئێمەیان گرتووە.

پرسیم: لەكوێین.....؟

لەهۆزی ئامازۆن.

**كۆتایی بەرگی یەكەم**

لە بەستێنەکانی رووباری ئامازۆن هۆزێك هەیە هەمو کەسەکانی لە ژنانی زۆر جوان و دلرفێن پێك هاتوون، دەوروبەری ئامازۆن بە دارستانە چڕو مەترسیدارەکان کەمارۆ دراوە و لەم بەشەی دارستانەدا دەژین. تا ئێستا هیچ گەشتیارێکی ناودار و هیچ روداوخوازێکی چاو نەترس نەیتوانیوە بگاتە ناوچەی ژێر دەسەلاتی ئەوان چونکە جگە لە مەترسیە زۆرەکانی رێگا، ژنانی ئامازۆن ئەوەندە مەترسیدارن کە گومان ناکرێت بێگانەیەك بەدەست بێنن و بەزیندوویی رزگاری کەن و بۆ شارو دیاری خۆی بگەڕێتەوە.

ئەم کتێبەی خوارەوە لە یاداشتەکەکانی کەسێك ئامادە و نوسراوە کە شەش سالّ لە ناو دانیشتوانی ئەم هۆزەدا ژیاوە و لەئەنجامدا بە لێهاتوویی تەواو لە دەستیان رایکردوە و گیانی بە سەلامەت دەربردووە.

ئەم کتێبە بۆ زۆربەی زمانە زیندوەکانی دنیا وەرگێڕدراوە و لە هەر زمانێك زیاتر لە دەجار چاپکراوە لە هەمان رۆژەکانی یەکەمی چاپ و بلاوبوونەوە بەخێرایی فرۆشراوە و چونکە نوسەر بینینەکانی خۆی تیادا رەنگ پیّ داوەتەوە، لە راستی و دروستی نوسراوەکان ناتوانین گومانمان بێت، هەر بۆیە ژیانی ژنانی ئامازۆن لە ئەفسانە دەرچووە و بۆتە راستیەکی حاشا هەڵنەگر.

Design: Harem Osman

نرخ 6000 دینار





لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی چوارچرا